ئەم ڕۆمانە
لە چاپی
چل و پێنجەمەوە
وەرگێـــڕدراوە

لە ڕیزبەندی یەکەمی پڕفرۆشترینەکانی نیویۆرک تایمز

# من پێش تۆ





جوجو مویز



وەرگێڕانی
کەیهان مستەفا

**لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

زنجیرە: (٧٦٣ )

## ناسنامەی کتێب

✓ ناوی کتێب: من، پێش تۆ

✓ نوسینی: جوجو مویز

✓ بابەت: ڕۆمان

✓ وەرگێڕانی: کەیهان مستەفا

✓ دیزاین: فواد کەوڵۆسی

✓ چاپخانە: چاپەمەنی گەنج.

✓ ساڵی چاپ: ٢٠١٨

✓ نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم.

✓ تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٤٨٠)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە

ناونیشان:

سلێمانی، نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە ڕووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

هەندێك لە كتێبەكان كاتێك دەیانگریت بەدەستەوە و دەست دەكەیت بە خوێندنەوەیان، ناتوانیت دایانبنێیت. هەربۆیە ئێمە پێشنیار دەكەین كە كتێبی (من پێش تۆ) بە پاكەتێك كلینسەوە بفرۆشرێت.

(ئاسوشیتد پرێس)

(من پێش تۆ) خوێنەر غافڵگیر دەكات، سوتێنەر و كاریگەر و ئومێدبەخشە. كتێبێكە كە تاوەكو درەنگانێك، بە بێداری دەمێننەوە و لاپەڕە لەدوای لاپەڕە بەرەو پێشەوە دەچن و ناتوانن دایبنێن.

(نوسەری كتێبی (خوشكانی نامۆ)

ڕۆمانێكی سەرنجڕاكێش و شیاوی خوێندنەوەیە، سەرسوڕهێنەر و گونجاو لەگەڵ داخوازییەكانی دونیای ئەمڕۆدا.

(بڵاوكراوەی ئەمریكی (پابلیشرز ڤیكلی).

عەشقێكی پڕ جۆش و خرۆش و نامومكین و نارمانگەرلو ئایدیالیستانە.

(رومنتیك تایمز)

ئەم كتێبە فێرمان دەكات كە هیچكاتێك بۆ ژیان درەنگ نییە.

(گۆڤاری (بوك پیج)

نوسەری ئەم كتێبە، خوێنەر دەخاتە بارودۆخێكەوە كە بە فرمێسك ڕشتنەوە بخوێنێتەوە و بەردەوام بەرەو پێشەوە بڕوات و واز لە خوێندنەوەی نەهێنێت.

(نیۆیۆرك تایمز)

بخوێننەوە و فرمێسك بڕێژن

(گۆڤاری (گود هاوسینگ).

{١}

٢٠٠٧

کاتێك لە گەرماو دێتە دەرەوە، ژنەکەیش خەبەری بووەتەوە، پاڵیداوە بە پاڵپشتەکەوەو لاپەڕەکانی کتێبە بچوکەکەی ڕێنماو دەلیلی گەشتەکەیان هەڵدەداتەوە. یەکێك لە بلوزەکانی پیاوەکەی لەبەرکردووە و قژە درێژەکانی بەجۆرێك ئاڵۆز بوون و بژاون، کە ناخودئاگا شەوی ڕابوردو وەبیر دەهێنێتەوە. پیاوەکەش هەر لەوێدا دەوەستێت و بە خاولی سەری خۆی ووشك دەکاتەوەو سەرمەستە لەوەبیرهاتنەوەی یادو یادگارییەکان.

ژنەکە سەری لەسەر کتێبە بچوکەکە بەرز دەکاتەوە و لێوەکانی کۆدەکاتەوە. لەوانەیە تەمەنی بۆ ئەمکارە کەمێك زۆر بێت، بەڵام ئەو ماوە کەمەی ئاشنایی، ئەم هەلە بە ژنەکە دەدات کە کەمێك نازو مەکر بکات.

—هەردەبێت کارێك ئەنجامبدەیت کە پەیوەندی بە شاخڕەوییەوە هەبێت، یان هەر دەبێت لەناو چۆمە تەنگ و باریکەکاندا بسوڕێیتەوە؟ ئەمە یەکەمین پشوی ڕێکوپێك و خۆشی ئێمەیە.

بەڕاستی کامە گەشت و سەفەرە کە تێیدا دەتوانیت هەم لە دەست جلوبەرگ ڕزگارت ببێت و هەم....

وا خۆی نیشاندەدات کە چەندە بەجەرگ بووە. دواتر بەردەوامدەبێت:

—هەمیش خوری مەڕ لەبەر بکەیت.

کتێبە بچوکەکە دەخاتە خوار سیستەمی نوستنەکەوە و دەستە قاوەییە تۆخەکانی دەخاتە ژێر سەری. بە دەنگە نزم و خیزەدارەکەیدا دیارە کە چەند کاتژمێرێکی شەوی بەبێداری بەسەر بردووە.

-کانیە لۆکسەکانی ئاوی کانزایی ناو بالی چۆنە؟ دەتوانین لەسەر لمەکان پالبکەوین.... بەجوانی پێشوازیمان لێبکرێت.... شەوانێکی دوورودرێژو هێمن....

-ئەمجۆرە پشووانەم پێخۆش نییە. بەدڵنیاییەوە دەبێت کارێك بکەم.

-بۆ نمونە خۆت لە فرۆکەکە بخەیتە خوارەوە؟

-تاوەکو تاقیت نەکردوەتەوە بەبێمانا ڕەتی مەکەرەوە!

ژنەکە نێوچاوانی دەهێنێتەوە یەك.

-ئەگەر بەلای تۆوە کێشە نییە، پێمباشترە ڕەتیبکەمەوە.

شێی جەستەی پیاوەکە بلوزەکەی بەری نمدارو کەمێك تەڕ کردووە، قژەکانی سەری خۆی شانە دەکات و مۆبایلەکەی دادەگیرسێنێت. بەبینینی ژمارەی نامەکان کە یەك لەدوای یەك لە لاپەڕەی بچوکی مۆبایلەکەدا دێنەجوڵە، سەروفەسالی دەچێتەوە ناویەك و ڕوی گرژ دەبێت. دەڵێت:

-باشە ئێستە هەستەو نانی بەیانی بخۆ.

لەسەر سێتی نوستنەکەوە دەچەمێتەوە و ماچێکی ژنەکە دەکات. ژنەکەیش هەست بە گەرماو بۆنی جەستەی دەکات.

-دیسانەوە کۆتایی هەفتە دەڕۆیت؟

-پەیوەندی بەم مامەڵەیەوە هەیە. کەمێکیش بە کەشوهەوای ئەمڕۆوە. لەوانەیە ناچار بم بچم بۆ نیۆیۆرك. بە هەرحاڵ ڕۆژی پێنج شەممە ئێوارەکەی دەچین بۆ ڕیستوران و نانێکی باش دەخۆین، تۆ ڕیستورانەکە هەڵبژێرە.

جلوبەرگە چەرمییەکەی ماتۆڕسوارییەکەی لەپشتی دەرگاکەوە هەڵدەگرێت.

ژنەکە چاوەکانی دەهێنێتەوە یەك.

-نانی ئێوارە لەگەڵ جەنابی بلاك بێریدا یاخود بەبێ ئەو؟

-چۆن یانی؟

-جەنابی بلاك بێری دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەستبکەم بەلایەکی بۆگەنم.

ژنەکە دووبارە لێوەکانی دەهێنێتەوە یەك.

-هەمیشە وادەزانم کەسێکی سێیەم هەیە کە هەوڵدەدات سەرنجت ڕابکێشێت.

-جەرەسەکەی دادەخات.

ژنەکەیش بە بێزارییەوە دەڵێت:

–ویل ترینەر، هەندێك کاتیش دەبێت بێدەنگی بکەیت.

–دوێنی شەو بێدەنگ بووم، ئەی نەبووم؟

–بەڵێ بەزۆر.

پیاوەکە زەردەخەنەیەك دەکات.

–ئێستە دەڵێیت بەزۆر؟

قاچەکانی دەکات بەناو جلوبەرگە چەرمییەکانیداو هەڵیدەکێشێت. لە کۆتاییدا سەرنجی پیاوەکە لەسەر ئیلیسا لادەچێت. قەمسەڵەی ماتۆڕسوارییەکەی دەخاتە سەر دەستی و لەوکاتەدا کە لە ژورەکە دەچێتە دەرەوە ماچ بۆ ژنەکە فڕێدەدات.

بیست و دوو نامە لەناو مۆبایلە بلاك بێرییەکەی خۆیدا هەیە. یەکەمین نامە کاتژمێر ٤٢ :٣ ی بەیانی لە نیۆیۆرکەوە گەیشت. کێشەیەکی یاسایی دروستبووە. لە ئاسانسۆرەکە سەردەکەوێت بۆ ئەوەی بچێت بۆ پارکینگی ژێر زەمینەکە. هەوڵ دەدات کە هەواڵەکانی کۆتایی شەوی ڕابوردوو بزانێت.

–بەیانیت باش جەنابی ترینەر.

پاسەوانەکەیش لە ژورەکەی دێتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەی کە ژێر زەمینەکە باوباران نایگرێت، ژورە بچوکەکە لەمادەیەکی جۆری دژە باوباران دروستکراوە. بەڵام ویل حەزدەکات بزانێت ئەم پیاوە، بەم بەیانییە زووە، لێرەدا و لەنام ئەم ژێر زەمینەدا کاتێك واقی بە تەلەفیزیۆنی هەڵواسراوو دیرعی بریقەداری ئۆتۆمبیلە ٦٠٠٠٠ هەزار پاوەندییەکەدا ووڕ دەمێنێت، بیر لە چی دەکاتەوە.

ویل دەستی دەکات بەناو پاڵتۆکەیدا.

–مایك هەوای دەرەوە چۆنە؟

– زۆر پەشێو. بەجۆرێك باران دەبارێت هەروەك بڵێی سەقفی ئاسمان دڕاوە.

ویل دەوەستێت.

–بەڕاست؟ مرۆڤ ناتوانێت بە ماتۆڕ بڕوات؟

مایك سەرێك ڕادەوەشێنێت.

–نەخێر قوربان. مەگەر بەلەمی هەوایی ببەستیت. یان بتەوێت خۆت بکوژیت.

ویل واقی بە ماتۆڕسیکلەکەیدا ووڕ دەمێنێت. جلوبەرگە چەرمییەکە دەردەهێنێت. گرنگ نییە لیسا بیر لەچی دەکاتەوە، بەڵام ئەو کەسێك نییە کە بەبێ بەردەباز بدات بەناو ئاوەکەداو بەبێمانا خۆی بخاتە مەترسییەوە. سندوقی سەر ماتۆڕەکە دەکاتەوە و جلوبەرگە چەرمییەکە دەخاتە ناوییەوە. دووبارە قوفڵی دەکاتەوە و کلیلە هەڵدەدات بۆ مایك. مایکیش بە یەك دەست لەهەوادا دەیگرێتەوە.

—لەژێر دەرگای ئاپارتمانەکەمەوە بیخەرە ژورەوە، گرفتێکی نییە؟

—نەخێر هیچ گرفت نییە. دەتەوێت تەکسیت بۆ بگرم.

—نەخێر، ئەوکات هەردوکمان تەڕ دەبین.

مایك دەستدەنێت بە دوگمەی بوەستەکەدا و ویل دەچێتە دەرەوە. ویل دەستی بەرز دەکاتەوەو سوپاسی دەکات. بەیانی زووە و هەوایش تاریك و باراناوییە. ترافیکی شەقامەکانی ناوەندی شاری لەندەن، لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا نەبووەتە کاتژمێر حەوت و نیو زۆر سەخت و خاوو قەرەباڵغن. یەخەکەی بەرز دەکاتەوە و دەچێتە ناو شەقامەکەوەو بەرەو لای یەکتر بڕەکە دەچێت، بۆ ئەوەی تەکسییەك بگرێت. شەقامەکە بەهۆی بارانەوە زۆر خلیسك بووە، پیادەڕەوەکە وەك ئاوێنەی لێهاتووەو ڕووناکییەکی خۆڵەمێشی لێوە دەدرەوشێتەوە. کاتێك خەڵکانێکیتر دەبینێت کە لەقەراخ شۆستەی جۆگەلەی شەقامەکەدا وەستاون، لەدڵی خۆیدا جنێو دەدات. باشە لەکەیەوە خەڵکی لەندەن بەیانیان هێندە زوو لە خەو هەستاون؟ هەر دەڵێی هەموویان یەك بیرکردنەوە و بەرنامە و کارییان هەیە. نازانێت لەکوێدا بوەستێت بۆ ئەوەی بە ئیسراحەتتر تاکسی دەستبکەوێت. لەوکاتەدا مۆبایلەکەی جەرەس لێدەدات، ڕۆبەرتە.

—ئەوە خەریکم دێم. ئێستە چاوەڕێی تەکسی دەکەم.

لەوبەری شەقامەکەوە ڕووناکی نارنجی تەکسییەك دەبینێت کە نزیك دەبێتەوە. هەنگاوێك بەرەو پێشەوە هەڵدەگرێت، هیوادارە کە تەکسییەکە بەوی زانیبێت. پاسێك تێدەپەڕێت، لە دوایەوە کامیۆنێك دێت، ئیستۆپەکانی بەجۆرێك دەنگیان لێوەدێت کە ناتوانێت دەنگی ڕۆبرت ببیستێت. لەبەر دەنگ و ژاوەژاوی ئۆتۆمبیلەکان ناچارە کە هاوار بکات.

—ڕوپ گوێم لە دەنگت نییە، دووبارەی بکەرەوە.

ئێستە خۆی بەتەنیا لە شوێنێکی بێوەیدا وەستاوەو ئۆتۆمبیلەکان بەخێراییەوە بەلایدا تێدەپەڕن. ڕووناکی نارنجی تەکسییەکە دەبینێت و دەستە بەتاڵەکەی تری بەرز دەکاتەوە، خۆزگایە لەو بارانە لافاوییەدا شۆفێرەکە ببینێت.

—دەبێت تەلەفۆنێك بکەیت بۆ جف لە نیۆیۆرك. هێشتا لەوێیە. چاوەڕوانی تۆیە. دوێنی شەو هەوڵێکی زۆرماندا کە پەیوەندیت پێوە بکەین.

—چ کێشەیەك ڕویداوە؟

—کێشەی یاسایی. لەگەڵ دوو بەندی یاساکەدا کێشەیان هەیە. واژوەکە.... لاپەڕەکان....

لەوکاتەدا ئۆتۆمبیلێك تێدەپەڕێت و ئیتر دەنگی ڕوپرت نایەتە بەرگوێ. تایەکانی ئۆتۆمبیلەکە بەهۆی بارانەکەوە ڤیژەیان دێت.

—تێنەگەیشتم چیت گوت.

شۆفێری تەکسییەکە ئەوی بینیوە. خێراییەکەی کەمدەکاتەوە و هەروا لەوبەری شەقامەکەوە بە هێمنییەوە دێت، ئاوێکی زۆر بەملاو ئەولادا دەپرژێت. ویل پیاوێك دەبینێت کە بە بینینی ئەم بەدڵتەنگییەکی تەواوەوە هەنگاوە بەپەلەکانی هێمن دەکاتەوە، بەدڵنیاییەوە زانیویەتی ویل زووتر دەگاتە تەکسییەکە. ویل پێش پیاوەکە دەگاتە لای تەکسییەکەو بەجۆرێك لە جۆرەکان هەست بە سەرکەوتن دەکات و بەدەنگی بەرز دەڵێت:

—سەیرکە، کارەکانی دەفتەری سەر مێزەکەم بدە بە (کلی). تاوەکو دە خولەکیتر دەگەم ئەوێ.

سەیرێکی ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە دەکات، دواتر سەری دادەخات و بەپەلە کۆتا هەنگاوەکانی بەرەو لای تەکسییەکە هەڵدەگرێت. ووشەی (بلك فرایزر) لەسەر زمانییەتی. لەقەراخی یەخەکەیەوە باران دەچێتە ناو کراسەکەی، ئەم ماوە کەمە پیادەڕەوییە لەناو شەقامەکەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی وەك زەرنەقوتەی تەڕ بگاتە نوسینگەکەی. لەوانەیە ناچار بێت کە سکرتێرەکەی بنێرێت و کراسێکی بۆ بهێنێت.

—دەبێت پێش ئەوەی مارتین بگاتە ئێرە، هەوڵ و کۆششی پێویست بدەم.

دەنگێکی گوێکەرکەر دێت، ویل سەیردەکات. دەنگی نالەباری هۆڕینی ئۆتۆمبیلە. تەکسییەکی ڕەشی درەوشاوە لەبەردەمیدا دەبینێت، شۆفێرەکە جامەکەی هێناوەتە خوارەوە.

لە گۆشەیەکی چاوییەوە شتێك دەبینێت و ناتوانێت بەباشی جیای بکاتەوە و بزانێت چییە. ئەو شتە بە خێراییەکی باوەڕپێنەکراوەوە بەرەو لای ئەم دێت.

لادەکاتەوە بەلای ئەو شتەدا، یەکسەر دەزانێت کە لەسەر ڕێگەکەیەتی و بەهیچ شێوەیەکی ناتوانێت خۆی لەسەر ڕێگەکەی لابدات. لە ترساندا دەستی شل دەبێت و دەکرێتەوە و مۆبایلە بلاك بێرییەکە بەردەبێتەوە و دەکەوێتە سەر زەوییەکە. هاوارێك دەبیستێت کە لەوانەیە لە گەرووی خۆیەوە هاتووەتە دەرەوە. کۆتا شت کە دەیبینێت دەستکێشە چەرمەکانن و ئەو دەموچاوەی کە لەناو کڵاوی پارێزگارییەکەدایە، ئەو ترسەی کە لەناو چاوەکانی پیاوەکەدایە لەنێوچاوی ئەمیشدا خۆی دەنوێنێتەوە. دواتر تەقینەوەیەك ڕوو دەدات و ئیتر هیچ شتێك نامێنێتەوە.

## ٢٠٠٩

مەودای وێستگەی پاسەکە تاوەکو ماڵەوە سەدو پەنجا هەنگاو دەبێت. بەڵام ئەگەر پەلەت نەبێت و هەنگاوی بچوکتر هەڵبگری دەگاتە نزیکەی سەد و هەشتا هەنگاو، ڕێك وەك ئەو کاتانەی کە پێڵاوی لۆچ و دڕاوت لەپێدا بێت. کاتێك لە سوچی شەقامەکەمانەوە پێچم کردەوە(٦٨ هەنگاو)،ماڵەکەمان دەرکەوت. ماڵەکەمان کە دیوارێکی هاوبەشی لەگەڵ دراسێکەی پاڵماندا هەبوو، چوار ژووری نوستن و لە ڕیزی ئەو خانوانەدا بوو کە سێ ژووری نوستن و چوار ژووریان هەبوو. بە بینینی ئۆتۆمبیلەمەی باوکم زانیم کە هێشتا نەچووەتە سەرکار.

لەدوامەوە، خۆریش لە پشتی قەڵاکەوە ئاوادەبوو، سێبەرە ڕەشەکانی هەروەك مۆمێك کە لەحاڵی توانەوەدایە، لە تەپۆڵکەکە دەخلیسکاو بەرەو خوارەوە دەنیشت. ئەگەر بارودۆخەکان بەمشێوەیە نەبونایە، ئەوا هەموو یادگارییەکانی خۆم لەم گەڕەکەدا بۆ باسدەکردن: لەم گەڕەکەدا بوو باوکم فێری کردم کە بەبێ تایەی یارمەتی سواری پاسکیل ببم، خاتوو داهرتی بە قژە باڕۆکە لارەکەیەوە، کێکی بۆ دروستکردین، ترینا، دارێکی کرد بەناو هێلانەی زەردەواڵەکاندا و ئاڵۆزکاندی و ئێمەش بە قیژەو هاوارەوە هەموو ڕێگەی گەڕانەوەمان بەرەو قەڵاکە بەڕاکردن بڕی.

پاسکیله سیّ تایەکەی (توماس سروته) له سەر ڕێگەکه کەوتبوو، دەرگای حەوشەکەم داخست و پاسکیله سیّ تایەکەم بە ڕاکێشان هێنایه ژورەوه و خستمه ژێر هەیوانەکە. دەرگای ماڵەوەم کردەوه. هەرەمی گەرما دایله دەموچاوم، چونکه دایکم بەردەوام سەرمایەتی و هەمیشه ماڵەکەمان بەگەرمی دەهێڵێتەوه، باوکیشم هەمیشه بۆڵەو هاوار دەکات که دایکم بەمکارەی ڕیشکی هەمومانی دەرهێناوەو بێزاری کردوین. دەیگوت تێچوی ئەم ماڵ گەرمکردنەی دایکم هێندەی بەرهەمهێنانی ناپاڵفتەی ناوخۆی وولاّتێکی بچوکی ئەفریقاییه.

—تۆی ئازیزەکەم؟

—بەڵێ.

به زۆر جێگەیەکم له ناو کەوانتەرەکەدا که پڕیەتی له جلوبەرگ، دۆزییەوه و چاکەتەکەم هەڵواسی.

—کامتانن؟ لـــو(لوئیزا) یان ترینا؟

— لــــو(لوئیزا).

سەیرێکی ژوری دانیشتنەکەم کرد. باوکم لەسەر قەنەفەکان دانیشتبوو، سەری داخستبوو دەستی لەسەر گۆشەکان دانابوو، هەر دەتگوت گۆشەکان دەستیان قوت داوه. توماس خوشکەزای پێنج ساڵانم، لەسەر قاچەکانی دانیشتبوو به حەزو ئارەزوەوه سەیری باوکمی دەکرد.

باوکم ئاوڕیدایەوه بۆلای من. دەموچاوی بەهۆی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی که کردبوی ڕەش هەڵگەڕا بوو.

—تێناگەم بۆچی دەبێت ئەم پارچه قوزەڵقورتانەی لیگۆ ئەوەنده بچوك دروستبکەن!

—دایه له کوێیه؟

—لەقاتی سەرەوه. باشه پارچه گەورەکان باشتر نین؟

سەرم بەرزکردەوه. دەنگی هەمیشەیی فیشه فیشی ئوتوەکه بەرگوێم کەوت. (جوسی کلارکی) دایکم هەرگیز به هێمنییەوه دانەدەنیشت و هەمیشه سەرقاڵی ئیشکردن بوو. هەروەك دەڵێن بەو سەرقاڵییه گەزگەز قالآی دەکرد. کاتێك هەموومان لەسەر مێزی نانخواردن بوین و سەرقاڵی کەباب خواردن بوین، ئەو بەسەر پەیژەکەوه لەدەرەوه وەستاوه و پەنجەرەکه بۆیاخ دەکات و هەندێکاتیش دەستمان بۆ ڕادەوەشێنێت.

—وەرە یارمەتیم بدە و ئەم نەفرەتییە بدۆزەرەوە. نیوسەعاتە کە لێرەدا بەشوێن ئەمانەدا دەگەڕێم. دەبێت بڕۆم بۆ سەرکار.

—کاری شەوانە؟

—بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئێستە کاتژمێر بووەتە پێنج و نیو.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد.

—نەخێر، ڕێك سەعات چوارو نیوە.

دەستی لەناو گۆشەکانەوە هێنایە دەرەوە، بەلاچاوێکەوە سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و پرسی:

—چۆن بوو ئەوەندە زوو هاتیتەوە بۆ ماڵەوە؟

هەروا سەرێکم ڕاوەشاند، وادیارە پێیوابوو کە لەپرسیارەکەی تێنەگەیشتوم. چومە ناو چێشتخانەکەوە.

بابەگەورەم لەسەر کورسییەك و لەبەردەم پەنجەرەی چیشتخانەکەدا دانیشتبوو، خشتەو جەدوەلی ناو گڤارو ڕۆژنامەکانی حەل دەکرد. پاش ئەوەی جەڵتەی مێشك لێیدابوو، لێپرسراوی تەندروستی دەیگوت بۆ تەرکیزی زۆرباشە، کەلەوشوێنەدا دابنیشێت. پێموابوو تەنها کەسێکم کە زانیومە خانەکانی ناو خشتەی کۆتایی ڕۆژنامەکە بە هەر ژمارەیەك کە بەمێشکیدا دێت پڕیاندەکاتەوە.

—سڵاو بابە گەورە.

سەری بەرزکردەوەو زەردەخەنەیەکی کرد.

—چای دەخۆیتەوە؟

سەری وەك نیشانەی نەخێر ڕاوەشاند. کەمێك دەمی کرایەوە.

—ئەی خواردنەوەیەکی فێنکت ناوێت؟

بەسەری تێگەیاندم کە بەڵێ.

دەرگای بەفرگر (سەلاجە)کەم کردەوە.

—شەربەتی سێومان نییە، ئاوت دەوێت؟

بیرم کەوتەوە کە شەربەتی سێو زۆر گرانە.

ئەویش بە سەر ڕاوەشاندن گوتی بەڵێ. کاتێك پەرداخە ئاوەکەم دەدا بەدەستییەوە، لەژێر لێوەوە شتێکی دەگوت، وادیاربوو ئەیویست سوپاسم بکات.

دایکم هاتە ناو چێشتخانەکەوە، سەبەتەی گەورە جلوبەرگە شۆردراوو هەڵخراوەکانی بەدەستەوە بوو. جوتێك گۆرەوی بەرزکردەوە و گوتی:

—ئەمە هی تۆیە.

—وابزانم هی ترینایە.

—بەڵێ، وابزانم. چەندە ڕەنگەکەی ناشیرین بووە، وابزانم بلوزو پانتۆڵە ئەرخەوانییە گوشادەکەی باوکم ڕەنگی داوەتەوە. خێرا گەڕایتەوە، دەتەوێت بڕۆیت بۆ شوێنێك؟

پەرداخێکم خستە بەر بەلوعەی ئاوەکە و پڕم کرد و دواتر هەڵمقوڕاند.

—بڕیار وایە پاتریك بێت بۆ ئێرە؟ تەلەفۆنی کردبوو. مۆبایلەکەت کوژابویەوە؟

—بەڵێ.

—گوتی هەوڵ دەدات بۆ پشووەکان جێگەیەکتان بۆ بگرێت. باوکت دەڵێت لەناو بەرنامەی تەلەفیزیۆندا شتێکی لە بابەتەی بینیوە. حەزدەکەن بۆ کوێ بچن؟ ئیپسوس؟ کالیپسوس؟

—ئسکیاتوس[1].

—بەڵێ مەبەستم هەر ئەمە بوو. ئاگات لە هەڵبژاردنی ئوتێل بێت. یارمەتی لە ئینتەرنێت وەربگرن. پاتریك و باوکم لەناو هەواڵەکانی نیوەڕۆدا شتانێکیان بینیوە. وادیارە ئەیانەوێت کارەکان وەرێبخەن، بەدڵنیاییەوە بە نیوە قیمەت و خێرا. تاوەکو نەچیت نازانی. برنارد، چایی ناخۆیتەوە؟ لو بۆی نەهێناویت؟

کترییە کارەباییەکەی داگیرساند، دواتر سەیرێکی منی کرد. تازە زانی کە من بێدەنگم و هیچ نالێم.

—ئازیزەکەم تۆ باشیت؟ ڕەنگت خراپ پەڕیوە.

دەستی هێنایە پێشەوە و خستە سەر نێوچاوانم. بەناخێری تەمەنم بیست و شەش ساڵان بوو!

باوەڕناکەم بچین بۆ گەشت!

---

[1] دورگەیەکی بچوکە لە یۆنان.

دەستی دایکم لە جوڵە وەستا. هەر لەمنداڵی منەوە، چاوەکانی تیشکی ئێکسیان هەبوو، دەیتوانی ناوەڕۆکی هەر شتێك ببینێت.

—تۆو پت کێشەتان هەیە؟

—دایە، من....

—مەبەستی دەستێوەردانم نییە. بەڵام ئێوە ماوەیەکی زۆرە کە بەیەکەوە هاوڕێن. شتێکی سروشتییە کە هەندێکجار کێشەیەك دروستببێت. مەبەستم ئەوەیە کە من و باوکت...

—کارم نەماو ئێستە بێ ئیشم.

بێدەنگ بووم، بەڵام ووشەکانم هەروا لە هەوادا هەڵواسرابون، لەپاش بەرقەراری بێدەنگییەکەیش توندوتیژی و کاردانەوەی خۆیان کۆنترۆڵ کردبوو.

—چیت گوت؟

—لەبەیانییەوە فرانك ئەیەوێت قاوەخانەکەی دابخات؟

دەستم بردە پێشەوە. ئەو پاکەتە شێدارەی کە بە درێژایی ڕێگەی ماڵەوە (واتە هەموو ئەو سەد و هەشتا هەنگاوەی کە لەنێوان وێستگەی پاسەکەو ماڵەوەماندا هەبوو) بەدەستمەوە بوو بەرەو ڕوی دایکوباوکم بردم.

—موچەی سێ مانگی پێداوم.

***

ڕۆژم وەك هەمیشە دەستپێکردبوو. هەرکەسێکم دەناسی ڕقی لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە بوو، بەڵام من گرنگییەکی ئەوتۆم بەو بابەتە دەدەدا. حەزم دەکرد بەیانی زوو بچم بۆ قاوەخانەی باترد بان، کترییە تایبەتەکەی چاییەکە لەو سوچەدا دابگیرسێنم، پاکەتی شیرو نانەکان لەناو حەوشە چۆڵەکەدا بهێنم و هەروا تاوەکو ئامادە دەبم بۆ دەستپێکردنی کارەکەم لەگەڵ فرانکدا دەمەتەقێ بکەم.

زۆر حەزم لە هەوای پێگەیشتوی قاوەخانەکە بوو کە بۆنی ژامبونی دەدا، دەرگای قاوەخانەکەیش بەردەوام دەکرایەوە و دادەخراو شنەیەکی نەرم لە هەوای سارد دەهاتە ژورەوە. دەنگی قسەو دەمەتەقێ دەهات و دواتر بێدەنگی باڵی دەکێشا بەسەر شوێنەکەدا. ڕادیۆکەی فرانك لە سوچێکدا بۆ خۆی گۆرانی دەگوت. قاوەخانەیەکی زۆر کەشخە نەبوو، دیوارەکانی بە دیمەنەکانی قەڵای سەر تەپۆڵکەکە داپۆشرابوون، هێشتا مێزەکانی ڕوکەشی

فۆرمیکایان هەبوو. لەوکاتەوە کە من دەستم بەکار کرد، فەهرەستی خواردنەکان بێجگە لە کێك و شوکولاتە کە زیاد کرا، هیچ شتێکیتر نەگۆڕدرابوو.

بەلاّم لە هەموشتێك زیاتر، موشتەری و کرپارەکانم خۆشدەویست. کیو و ئانجیلۆی وەستای بۆری کە ڕۆژانە دەهاتن و سەریان دەخستە سەر فرانك و پرسیاری ئەوەیان لێدەکرد کە گۆشتەکانی لە کوێوە هێناوە. خاتونی گوڵە گەزیزەمان زۆر خۆشدەویست، ئەم ناوەمان لەبەر خەرمانی قژە سپییە جوانەکانی لێنابوو. لە دووشەممەوە تاوەکو پێنج شەممە دەهات و پەتاتەی سورەوکراوو هێلکەی دەخوارد. دادەنیشت و ڕۆژنامە خۆراییەکانی دەخوێندەوەو دوو کوپ چایشی دەخواردەوە. هەمیشە هەوڵمدەدا کە سەری قسەی لەگەڵدا دابمەزرێنم، پێموابوو کە تاکە گفتوگۆیەکە کە ئەو پیرەژنە بەدرێژایی ڕۆژ هەیەتی.

کاتێك گەشتیارەکان دەهاتن بۆ قەلاّکە یان دەگەڕانەوە، لەسەر ڕێگەکەیان لە قاوەخانەکە لایان دەدا. مندالاّنی قوتابخانەیش بە قیژو قاو لەپاش پشووی قوتابخانە سەریان دەدا، لە دائیرەو فەرمانگەکانی ئەو ناوچەیشەوە کۆمەڵێك موشتەری هەمیشەییمان هەبوو، منیش هەر هەمویانم خۆشدەویست. نیناو شری کە ئارایشتگەر بوون و ئەندازەی کالۆری هەموو ناو قاوەخانەکەیان بەتەواوەتی دەزانی. تەنانەت بەهۆی کۆمەڵێك موشتەری نالەبارو تەبیعەت خراپی وەك ژنە قژ سورەکەیش کە خاوەنی لەعابە فرۆشی بوو، بەلایەنی کەمەوە هەفتەی جارێك لەسەر باقی پارەکەی هات و هاوارێکی وەڕێدەخست، هیچ بێتاقەت نەدەبووم.

چیم لەسەر ئەو مێزانە نەبینی، هاوڕێیەتیگەلێك کە دەستیان پێکرد، یان کۆتاییان هات، ژن و مێردە پێشوەکان کە منداڵەکانیان دەهێنا بۆ یەکتری بۆ ئەوەی بیانبینن. ئەو دایکوباوکانەی کە سەبرو حەوسەڵەی چێشت لێنانیان نەبوو، لەگەڵ ئەوەدا کە هەستیان بە گوناح دەکرد، بەلاّم هەناسەیەکی ئیسراحەتیان هەڵدەکێشا. شادی بەردەوامی کەسانی ڕەشبگیر کاتێك دەهاتن و بۆ نانی بەیانی و خواردنی سورەوکراویان دەخوارد. هەموو جۆرە کەسانێك دەهاتن و زۆربەیان یەك دوو قسەیان لەگەڵ مندا دەکرد، گاڵتەیان دەکرد، یاخود کۆمەڵێك داواکارییان سەبارەت بە چای گەرم دەکرد. باوکم هەمیشە دەیگوت هەرگیز ناتوانێت پێشبینی بکات کە قسەی دواتری من چی دەبێت، بەلاّم ئەم شتانە هەرگیز لە قاوەخانەکەدا باسنەدەکران، چونکە گریمانی هەر قسەیەك بوونی هەبوو.

فرانکی، خاوەنی قاوەخانەکە، زۆر لەمن ڕازی بوو. خۆی مرۆڤێکی هێمن و ئارام بوو. دەیگوت هەبونی من لەناو قاوەخانەکەیدا هۆکاری هاتنی موشتەرییەکانە و جۆش و خرۆش دەبەخشێت بە شوێنەکە. بەجۆرێك لە جۆرەکان هەر دەتگوت لە مەیخانەیەکدا کار دەکەم، تەنها باسی شەڕوشۆڕی مرۆڤە مەستەکان نەبوو.

تا ئەوە بوو ئەو ڕۆژە، لەپاش نانی نیوەڕۆ. تازە قەرەباڵغیمان کەمبوبویەوەو قاوەخانەکە خەریکبوو چۆڵ دەبوو، کاتێکمزانی کە فرانکی لەپشتی ئوچاقی سەر مێزەکەوە هاتە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەی کە دەستی خۆی بە پەڕۆکەی کەمەری دەسڕی، چویە پێشەوە و نیشانەی داخراوەی هەڵگێڕایەوە و ڕویکردە شەقامەکە.

دەستماڵەکەی بەدەستیەوە ڕادەوەشاند. هەرگیز ناوبراوم بەوجۆرە بێزارو بێتاقەت نەبینیبوو. حەزم دەکرد نهێنییەکە بزانم، بەخۆمم دەگوت لەوانەیە کەسێك شکات و سکاڵای لەمن کردبێت. دواتر ئاماژەی بۆکردم کە دابنیشم و گوتی:

—لوئیزا، شەرمەزارم، بەلاّم دەبێت بگەڕێمەوە بۆ ئوستراليا، چونکە حاڵی باوم هیچ باش نییە. وادیارە بۆفەی ناو قەلاّکەیش دەکرێتەوە. ئاگاداری و موژدانەی کردنەوەکەیان هەڵواسیوە.

توشی شۆك بووم، پێموابو لە سەرسوڕماندا دەمم کرایەوە. دواتر فرانکی ئەم زەرفەی دابە دەستمەوە و پێش ئەوەی کە پرسیار بکەم وەلاّمەکەیم وەرگرت.

—هەرچەندە بڕیارنامەیەکی فەرمی لەنێوانماندا نەبوو، بەلاّم موچەی سێ مانگی تۆم خستوتە ناو ئەم زەرفەوە. چونکە لە بەیانییەوە قاوەخانەکە دادەخرێت.

***

توڕەیی باوکم تەقییەوە.

—سێ مانگ...!

دایکیشم کوپێك چای شیرینی دابە دەستمەوە، باوکم لە قسەکانی بەردوام بوو:

—ئێ باشە هەردەبوو بیدابایە. ئەی مەگەر ئەوە بۆ ماوەی شەش ساڵ نییە لو (لوئیزا) لەو شوێنەدا وەك کەر کاری بۆ کردووە.

دایکم بە لاچاو سەیری باوکمی کرد و بە سەر ڕاوەشاندن ئاماژەی بۆ تۆماس کرد. دایکو باوکم لەپاش پشوی قوتابخانە ڕۆژانە چاودێری تۆماسیان دەکردو ئاگاداری بوون، تاوەکو ترینا لەسەر کارەکەی دەگەڕایەوە.

—ئێستە ئەیەوێت چ غەڵەتێك بکات. دەبوایە فرانك زووتر ئەمەی بگوتبایە، نەوەك بوەستێت و یەك ڕۆژ پێشتر ئەم هەواڵە نەفرەتییە ڕابگەیەنێت.

—ئیّ زۆر باشە، کارێکیتر دەدۆزێتەوە.

—جوسی، کوانێ ئیش و کار کەی هەیە، خۆ تۆ لەمن باشتر دەزانی. ئێستە هەلاوسانێکی ئابوری زۆر خراپ لە وولاتدا بوونی هەیە.

دایکم چرکەیەك چاوەکانی داخست، هەروەك بڵێی ئەیویست پێش ئەوەی قسە بکات کەمێك خۆی هێمن بکاتەوە.

—کچێکی زیرەکە. هەر کارێك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. پێشینەی کاری باشیشی هەیە، ئەی وانییە؟ بەدڵنیاییەوە فرانکی پێناس و ئەستۆپاکییەکی وزۆر باشی بۆ دەنوسێت و پێی دەدات.

—ئۆو ئەمە زۆر باش و نایابە... بەدڵنیاییەوە بۆی دەنوسێت کە لوئیزا زۆر بەباشی کەرە لەسەر نان پاندەکاتەوە، زۆر بە لەسەرخۆییەوە دەست لە قۆرییە کۆنەکە دەدات...!

—سوپاس بابە، بۆ ئەو متمانە بەخۆ بوونەی کە پێت بەخشیم.

—ئێستە هەروا شتێکم گوت.

هۆکاری ڕاستەقینەی نیگەرانییەکەی باوکم دەزانی. ئەوان حیسابیان لەسەر داهاتەکەی من دەکرد. دەتوانم بڵێم ترینا بە نیمچە خۆڕاییەك لە گوڵفرۆشییەکدا کاری دەکرد. دایکیشم دەبوایە چاودێری و خزمەتی بابەگەورەم بکات، هەربۆیە هەلومەرجی کارکردنی نەبوو. موچەی خانەنشینیەکەی بابەگەورەیشم زۆر کەم بوو. باوکیشم هەمیش خەمی کارەکەی بوو لە کارگەی مۆبێلیاتەکەدا. سەرۆکی کارگەکە چەند مانگێك بوو کە باسی سەبارەت بە چاککردنی ووزە دەکرد. لەناو ماڵدا کۆمەڵێك چپەم دەبیست کە باسیان لە قەرزداری و گۆڕانی کارتی بانکی بوو. دوو ساڵ لەمەوبەر ئەو شۆفێرەی کە بیمەی نەبوو سەیارەکەی باوکمی داغان کرد، ئەم ڕووداوەش ئەوەندە خراپ بوو، کە زۆرێك لە شتەکان گۆڕدران و لە کۆتاییدا باوك و دایکم توشی کێشەی دارایی بوونەوە. هەربۆیە بۆ خەرجییەکانی ماڵەوە پشتیان بەو موچە و حەقدەستە

کەمەکەی من بەستبوو. خۆشبەختانە ئەوەندە هەبوو کە دەستباری ماڵەوە بدات و ژیانی ڕۆژانەمانی پێ بگوزەرێنین.

—ئێستە واز بهێنن و هێندە مەچنە قوڵاییەوە. بەیانی دەتوانێت بچێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، بۆ ئەوەی بزانێت کارێك هەیە یان نا. خۆی ئەوەندە پارەی هەیە کە ماوەیەکی پێ بباتەسەر.

بەجۆرێك قسە دەکات هەروەك بڵێی من لەوێ نیم.

—کچێکی زیرەکە، ئەی وانییە ئازیزەکەم؟ دەتوانیت بڕۆیت و بەشداری خولی تایپ کردن ببینی، برۆ بەشوێن کاری نوسینگەیەکدا.

دانیشتم و گوێم بۆ دایکوباوکم گرت کە دەمەقاڵێیان دەکرد، بە سەرنجدان لە توانا سنوردارەکانم، دەتوانم چ کارگەلێك بکەم. کار لە ماڵەوە، مەکینەی خەیاتی درومان، دروستکردنی ساندویچ، ئەو ڕۆژە پاشنیوەڕۆ بۆ یەکەمینجار لە تەمەنمدا ئەمویست بگریم. تۆماس بە چاوانێکی ئەبڵەقەوە سەیری دەکردم، بەبێ ئەوەی کە قسەیەك بکات نیوە بسکیتەکەی خۆی کە قەپی لێگرتبوو پێدام.

—سوپاس تۆماس.

دواتر لە بێدەنگیدا بسکیتەکەم خستە ناو دەممەوە.

هەروەك خۆم گومانم بردبوو، پاتریك لە باشگا وەرزشییەکەدا بوو. لە دوو شەممەوە تاوەکو پێنج شەممە، هەروەك خشتەی کاتەکانی وێستگەی پاس، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەچوو بۆ باشگاکە. هەمیشە یان لەناو هۆڵی لەشجوانییەکەدا بوو، یان لەناو گۆڕەپانەکەدا کە بە بلاجکتۆر ڕووناك بوبویەوە سەرقاڵی ڕاکردن بوو.

کاتێك نزیکم بوویەوە بە دەنگی پچڕ پچڕەوە گوتی:

—وەرە لەگەڵ مندا ڕابکە.

هەناسەکانی کەمێك هەڵمیان لەگەڵدا بوو.

—دەبێت چوارجاریتر بسوڕێینەوە.

کەمێك گومان لەلا دروستبوو. لە تەنیشتیەوە دەستمکردە ڕاکردن. ئەوە تەنها ڕێگەیەکبوو کە دەمتوانی لەگەڵیدا قسە بکەم. پێڵاوێکی وەرزشی پەمەیی قەیتانی فیروزەیی ڕەنگم لەپێدا بوو، تەنها ئەم پێڵاوە گونجاو بوو بۆ ڕاکردن.

هەموو ڕۆژەکە لەماڵەوە بووم، ئەوپەڕی هەوڵی خۆمم دابوو بۆ ئەوەی بە کەسێکی بەسود و کەڵك بم. لەوانەیە تەنها یەك سەعات لەناو دەست و قاچی دایکمدا نەبوبم. دایکم و بابەگەورەم ئەرکی ڕۆژانەی خۆیان هەبوو، هەربۆیە ئامادەبونی من دەبویە هۆی بێزاری و بێتاقەتی بۆ ئەوان. باوکیشم کە هەموو ئەومانگە بەشەوکاری کردبوو، خەوتبوو نەدەبوو هیچکەسێك بێزاری بکات. ژورەکەمم ڕێکخست، دواتر دانیشتم و دەستمکردە سەیرکردنی تەلەفیزیۆن، دەنگەکەیم کەم کردبویەوە. هەرکاتێك بەبیرم بهاتبایەوە کە بۆچی لەناوەڕاستی ڕۆژدا لەماڵەوەم، هەستم بە ئازارێکی سوك دەکرد لەنا قەفەسەی سینەمدا.

—پێموانەبوو لەم ناوەدا بتبینم.

—لەماڵەوە حەوسەڵەم نەبوو بێتاقەت بوبوم. گوتم بێم بۆلات، بەڵکو بەیەکەوە کارێك بکەین و بچین بۆ شوێنێك.

یەك چرکە سەیرێکی کردم. چینێك ئارەق لەسەر نێوچاوانی بوو.

—ئازیزەکەم باشتر وایە هەرچی زووە کارێك بۆ خۆت بدۆزیتەوە.

—تەنها بیست و چوار سەعاتە کە ئیشم نییە و بێکارم. واتە بۆ ئەم یەك ڕۆژەیش ئەوەندە بێچارەو ماتڵم و تیاماوم؟

—بەلآم تۆ تەنها نیوەی پڕی پەرداخەکە دەبینی، خۆت باش دەتزانی کە ناتوانیت بۆ هەمیشە لەوێدا کار بکەیت، ئیتر دەبێت گەشە بکەیت.

دوو ساڵ لەمەوبەر، پاتریکی کار ئافەرێنی گەنج، لە ئوستور تفلد نازناوی پەیدا کردبوو، هێشتا لە بارودۆخ و کەشوهەوای لە خۆبابیانەی ئەو نازناوو ناوبانگە دەر نەچوبوو. لەوکاتەوە، هاوەڵ و شەریکێکی ئیش و کارم بەناوی جینجر پیت پەیدا کرد، کە سەرپەرشتی ناوچەیەکی شەست و پێنج مەتری دەکرد و لێپرسراوی شەخسی کەسەکان بوو، دوو هۆدەی داریان بە شێوەی قیستی گرتبوو.

پاتریك سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، ئەیویست بزانێت یەك سوڕ چەندێکی خایاندووە، گوتی:

—لوئیزا، نیگەران مەبە، هەندێکجار بێکارو بێ ئیش بوون، ژیانی کەسەکان دەگۆڕێت. ئێستە چ بەرنامەیەکت هەیە؟ دەتوانیت بچیت بۆ زانکۆ. من دڵنیام یارمەتی تێچوو خەرجی بە کەسانێکی وەك تۆ دەدەن.

–کەسانێکی وەك من؟

–بەڵێ، ئەو کەسانەی کە بەشوێن هەلێکی نوێدا دەگەڕێن. دەتەوێت ببیت بەچی؟ دەتوانی ببیت بە ئارایشتگەر. بەپێی پێویستیش جوان و قەشەنگی.

هەروا کە ڕامدەکرد، بە ئانیشکی خۆی بە هێمنییەوە دایلە کەلەکەم، چاوەڕوان بوو کە بۆ یەکەمین پیاهەڵدانی بە مندا سوپاسی بکەم.

–تۆ دەزانی ڕۆژانە چ شتانێك دەدەم لە دەموچاوم. سابون و ئاوو ئەم شتە ئاساییانە.

وادیاربوو پاتریك خەریکبوو کەللەیی دەبوو.

کەمێك خاوم کردەوە و لەپشتیەوە ڕامدەکرد. ڕقم لە ڕاکردن بوو. ڕقم لەو بوو کە توند رایدەکرد و خاوی نەدەکردەوە.

–سەیرکە... فرۆشیار، سکرتێر، نوسینگەی کڕین و فرۆشتنی موڵك، نازانم.... بەدڵنیاییەوە کارێك هەیە کە حەز بکەی ئەنجامیبدەیت.

بەڵام نەبوو. من حەزم لە ئیشکردن بوو لە قاوەخانەدا. کاتێك خۆمم دەبینی کە هەموو شتەکانی پەیوەست بە قاوەخانەی (باترد بان) دەزانم، چێژم وەردەگرت. زۆر حەزم لە بیستنی داستان و بەسەرهاتی ئەو کەسانە بوو کە دەهاتن بۆ قاوەخانەکە. لەوێدا هەستم بە ئارامی دەکرد.

–ئازیزم، ناکرێت بەبێ حەوسەڵە بەملاو ئەولادا بسوڕێیتەوە، خۆت مەدۆڕێنە. باشترین کارئافەرین و کارامەکان لە سفرەوە دەستیانپێکردووە، وەك جفری ئارچر و ڕیچارد برنسن و هتد....

کێشای بەدەستمدا بۆ ئەوەی بەتەواوەتی ئاگام لەو بێت.

–بەدوری دەزانم کە جفری ئارچر کێکی بەیانیانی ئامادە کربێت و دواتر کارەکەی لە دەستدابێت.

هەناسەم لەبەر بڕابوو. جلوبەرگەکەی ژێرەوەم گوشاد نەبوو. هەنگاوەکانم خاو کردەوە و دەستم هێنایە خوارەوەو خستمە سەرقاچەکانم.

پاتریك سوڕایەوە و بەرەو دواوە گەڕایەوە. دەنگی بەناو هەواسارده بێ ڕەشەباکەدا خولایەوە.

–من تەنها بۆچونی خۆمم گوت. دواتر بیری لێبکەرەوە. جلوبەرگێکی جوان لەبەر بکە و برۆ بۆ بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزی. ئەگەریش ویستت دەتوانم فێرت بکەم کە لەگەڵ مندا کار بکەیت. خۆت دەزانی کە پارەی تێدایە. خەمی گەشتەکەیشت نەبێت، من تێچوەکەی دەدەم.

زەردەخەنەیەکم بۆ کرد.

ماچێکی بۆ فرێدام و لەناو ستادیۆمە خاڵی و خەڵوەتەکەدا دەنگیدایەوە.

–هەرکاتێك بارودۆخی دارایت باش بوو دەتوانیت قەرزەکەم بدەیتەوە.

***

یەکەمین عەریزە و داواکاریم پێشکەشی بەڕێوبەرایەتی کاردۆزی شار کرد. نزیکەی چلوپێنج خولەك چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کرا. ئەو گروپەی کە لەگەڵیاندا دانیشتبوم، نزیکەی بیست کەس لە پیاوو ژنی جۆراوجۆر بوون. نیوەیان سەروفەسالێکی سەرسامیان هەبوو، گومانم دەکرد کە خۆیشم بەجۆرە بم. دەموچاوی کەسەکان کە یەکەمجارییان نەبوو هاتبون بۆ ئەو شوێنە، زۆر بێحاڵ و بێتاقەت بوون. جلوبەرگێکی جوان و ڕێکوپێکم لەبەردا بوو، هەروەك باوکم دەڵێت وەك مرۆڤ جلوبەرگم لەبەر کردبوو.

دەرئەنجامی هەوڵ و کۆششەکان ئەوەبوو ڕەزامەندی بدەم کە لە کارگەی لە قوتونانی گۆشتی مریشکدا شەوانە کار بکەم، (تاوەکو چەند هەفتەیەك کابوسم دەبینی)، دوو ڕۆژیش دەورەی فێرکاری بۆ کاری ڕاوێژکاری سوتەمەنی خانوو ببینم. بەڵام بەخێراییەوە زانیم کە دەورە فێرکارییەکە ئەوەیە کە ڕاهێنان بە کەسانی گێژی بەتەمەن بکەم، بۆ ئەوەی پێداویستیەکانیان دابینبکەن، بە (ساید)ی ڕاوێژکاری بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایتی کاردۆزیم گوت، من ناتوانم ئەمکارە بکەم. بەڵام لەبەر پێداگری ئەو فەهرستێکم لەوکارانەی کە دەبوایە ئەنجامیان بدەم، ئامادە کرد. ئەوەبوو لە کۆتاییدا خۆشبەختانە ساید ڕازی بوو ئێمە بەشوێن کارێکیتردا بگەڕێین، (لەگەڵ ئەوەی کە یەکێك لەم دوانەمان بەشوێن کاردا دەگەڕاین و ئەویترمان کارمان هەبوو، بەڵام هەمیشە سودی لە زاراوەی ئێمە وەردەگرت).

دوو هەفتە لە زنجیرە ڕیستورانتەکانی فوست فوددا کارم کرد. کێشەیەکم لەگەڵ سەعاتەکانی کارکردندا نەبوو. تەنانەت توانیم لەگەڵ ئەو مەسەلەی کە یونیفرم لە قژەکانمدا کارەبای هێمنی دروستدەکرد و قژەکانم بژ دەبوونەوە ڕابێم. بەڵام دەبینم شتێکی زۆر نەگونجاوە کە هەمیشە بتوانم ڕستەگەلێکی وەك (ئەمڕۆ دەتوانم چۆن خزمەتتان بکەم؟)،

(پەتاتەی سورەوکراوی گەورەیشت دەوێت؟) بڵێم و بەپێی چاوەڕوانی ئەوان هەڵسوکەوت بکەم. کاتێك کارەکەمم لەدەستدا، بەهۆی ئەوەوە بوو کە یەکێك لە کچەکانی لێپرسراوی دونات بینی کە خەریکم لەسەر لەعابەیەك دەمەقاڵێ لەگەڵ کیژۆڵەیەکی چوارساڵاندا دەکەم. دەتوانم چی بڵێم؟ کچێکی چوارساڵانی زۆر وریا بوو. پێموانەبوو کە جوانە مت و بێدەنگەکانیش زیرەك بن.

ئێستە بۆ چوارەمینجار لەگەڵ سایددا سەرقاڵی قسە کردن بووم، ساید لەناو ئینتەرنێتدا بەشوێن کاردا دەگەڕا بۆم. مرۆڤێکی پڕ لە جۆش و خرۆش و موشتاق بوو، بەڕاستی دەیتوانی ئیش بۆ هەموو کەسێك بدۆزێتەوە. تەنانەت ئەو کەسانەی کە بەڕواڵەت نەیاندەتوانی هیچکارێك بکەن. لەگەڵ ئەمەدا ئەویش حەوسەڵەو سەبری نەمابوو بێتاقەت بوبو.

—باشە ئایا هیچکاتێك بیرت لە پیشەی سەرگەرمی کردووەتەوە؟

—چۆن؟ واتە ببمە ئەکتەری پانتومیم(شانۆی بێدەنگ) یان گۆرانیبێژی ئۆپرا؟

—نەخێر، ئەمانە نا، بەڵام بەرنامەیەکی سەمای ئەڵقەیی دەکرێتەوە، لەڕاستیدا چەند دانەیەکیش.

یەکێك لە برۆکانم بەرزکردەوە و گوتم:

—بێزەحمەت بڵێ گاڵتە دەکەم.

—لە هەفتەیەکدا سێ سەعات لەسەر بنەمای خۆ کارکردن. پێموابێت بەخشیشێکی باشی هەبێت. گوتت کەسێکی هەڵسوکەوت و مامەڵە جوانی. وادیارە لەوانەیە حەزت لە جلوبەرگی تایبەتی نمایش بێت.

سەیرێکی پانتۆڵەکەمم کرد کە سەوزێکی درەوشاوە بوو. خۆم پێموابوو کە ئەم پانتۆڵە ڕۆحییەم دەگۆڕێت. لەسەر مێزی نانی بەیانی لەماڵەوە هەمیشە تۆماسی خوشکەزام گۆرانی پەری دەریایی بۆ دەگوتم.

ساید تەق تەق لە لاپەڕەی سەرەکی دا و شتێکی نوسی.

—ئەی چاودێری هێڵی گفتوگۆی گەورەکانت پێ چۆنە؟

واقم بەناوبراودا وڕما.

ئەویش شانەکانی بەرز کردەوە.

—خۆت گوتت حەزت لە قسەکردن هەیە لەگەڵ خەڵکیدا.

—نەخێر، نەخێر بۆ کاری ڕوت و ڕەجاڵانە. نامەوێت مەساج بکەم یاخود ببمە ئۆپراتۆری کامێرای ئینتەرنێت. واز بێنە ساید، بەدڵنیاییەوە کارێك هەیە کە دەتوانم بەبێ ئەوەی باوکم جەڵتە لێی بدات ئەنجامیبدەم.

قسەکەم ناوبراوی گێژ کرد.

—هەلی کار لەگەڵ سەعاتی کارکردنی گونجاودا نادۆزمەوە.

—ڕیزکردنی سندوقەکان لەپاش داخستنی فرۆشگایش نییە؟

هاتوچۆیەکی زۆرم بۆ بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزی دەکرد و فێر بوبوم کە بەزمانی ئەوان قسە بکەم.

بە ئاوازێکی پۆزشخوازانەوە گوتی:

—ژمارەیەك ناوی خۆیان بۆ ئەمکارە تۆمار کردووە، زیاتر دایکوباوکەکان حەزیان لێیەتی، چونکە لەگەڵ کاتژمێرەکانی کارکردنی قوتابخانەدا دەگونجێت.

دووبارە سەرقاڵی لاپەڕەی نمایشەکە بوویەوە.

—زۆر باشە، ئێستە تەنها کاری یارمەتی بەردەستی پەرستار ماوە لە نەخۆشخانەدا.

—واتە شۆردنی سمت و کەلەکەی پیرەژن و پیرە پیاوەکان.

—لوئیزا، داوای لێبوردن دەکەم. بۆ هیچکارێکیتر گونجاو نیت. ئەگەر بڕۆیت و دەورەیەك ببینی، زۆر خۆشحاڵ دەبم و یارمەتیت دەدەم. دەورەگەلێکی زۆر لە ناوەندی فێرکردنی گەورەکاندا هەیە کە دەتوانیت بەشدارییان تێدا بکەیت.

—ساید، لەمبارەیەوە باسمان کرد. ئەگەر بمەوێت ئەمکارە بکەم، ئەوکات موچەی بێکارییەکەم لەدەستدەدەم، ئەی وانییە؟

—بەڵێ، ئەگەر ناوت بۆ کار تۆمار نەکردبێت.

چەند ساتێك هەردوکمان بە بێدەنگییەوە دانیشتین. سەیرێکی دەرگای هاتنەژورەوەکەم کرد. دوو پاسەوانی بەهێزو هەیکەل گەورە لەوێدا وەستابون. حەزم دەکرد بزانم ئایا کارەکەیان لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزییەوە دۆزیوەتەوە.

—ساید، من تاقەتی پیرو پەککەوتەکانم نییە. لەوکاتەوەی بابەگەورەم جەڵتەی کردووە، لەلای ئێمە دەژی. ناتوانم لەگەڵیدا ڕابێم.

—ئێ، کەوابوو لەبواری پەرستاریدا ئەزمونگەلێکت هەیە.

—زۆریش نا. چونکە دایکم هەموو کارەکانی بۆ دەکات.

—ئەی دایکت بەشوێن کاردا ناگەڕێت؟

—چەندە پێکەنیناوی.

—پێکەنیناوی نییە.

— بۆ ئەوەی دواتر من بمێنمەوە و چاوێری بابەگەورەم بکەم؟ نەخێر، سوپاست دەکەم، بابەگەورەیشم وەك من حەزناکات. هیچکارێکتان لەناو قاوەخانەدا نییە؟

—لوئیزا، باوەڕناکەم ئیتر قاوەخانەیەك هەبێت کە بتوانیت تێیدا دابمەزرێیت. دەکرێت مریشکی کنتاکیش تاقیبکەینەوە. بەڵکو لەوێدا زیاتر بتوانی بەردەوامبی.

—نەخێر، خۆم بەوجۆرە بیرناکەمەوە.

—باشە، کەوابوو ناچارین هەندێك دورتر بکەوینەوە.

—خۆت دەزانی کە تەنها چوار پاس هاتوچۆی شارەکەی ئێمە دەکەن. لەبیرمە گوتت ناچارم بە پاسی گەشتیاری هاتوچۆ بکەم. تەلەفۆنم بۆ وێستگەکەی کرد، گوتیان تاوەکو کاتژمێر ٥ی عەسر زیاتر کارناکەن. بێجگە لەوەش، نرخی بلیتەکەی لە پاسی ئاسایی گرانترە.

ساید پاڵیدایەوە بە کورسییەکەوە.

—لوئیزا، ئێستە کە لەم قۆناغەداین دەبێت بڵێین ئەگەر دەتەوێت ناوت لەناو پێڕستی موچەی بێکاریدا نەسرێتەوە دەبێت....

—دەزانم، دەبێت نیشانی بدەم کە بەردەوام بەدوای ئیش و کاردا دەگەڕێم.

چۆن دەمتوانی ئەم پیاوە تێبگەیەنم کە بەهەر شێوەیەك بووە دەبێت کارێك بدۆزمەوە. ئەو چوزانێت کە چەندە دڵم بۆ کارەکەی پێشوم تەنگ بووە؟ بێکاری تەنها چەمك و مانایەك بوو، شتێك کە تەنها لە هەواڵەکانی تایبەت بە ئۆتۆمبێل سازی یان کەشتی سازیدا دەبیسترا. هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوویەوە کە لەدەستدانی ئیش و کار وەك لەدەستدانی دەست و قاچ بێت، شتێك کە بەبێ ویستی خۆت و بۆ هەمیشە لەدەستی دەدەیت. هەرگیز بیرم لە پارەو داهاتو نەکردبویەوەو خەمی هیچ شتێکم نەبوو. هەرگیز پێموانەبوو کە لەدەستدانی ئیش و کار، هەستی بێتوانایی و نەشیاوی تاوەکو ئاست و سنوری بێهودەیی لەناخی مرۆڤدا دروستبکات. بەیانیان مرۆڤ خۆی لە خەو هەستێت زۆر لەوە سەختترە کە کتوپڕ بە دەنگی جەرەسی کاتژمێری زەنگۆڵەدار خەبەری ببیتەوە و لەخەوراپەڕێت. مرۆڤ دڵی بۆ هاوکارەکانی تەنگ

دەبێت، هەرگیز گرنگ نییە کە لایەنی هاوبەشی کەمیشت لەگەڵیاندا هەبێت. تەنانەت دەبینی کە لەناو شەقامدا بەشوێن دەموچاوە ناسراوەکاندا دەگەڕێیت. یەکەمینجار کە خاتوو گوڵە گەزیزەم بینی، کە بەبێ ئیش بەبەردەم فرۆشگاکاندا دەڕوات و ڕێك وەك خۆم سەرگەردانە، حەزم دەکرد بچمە پێشەوەو باوەشی پێدا بکەم.

دەنگی سایدمنی لەناو جیهانی خەیاڵدا هێنایە دەرەوە.

—هێی، لەوانەیە ئەمەیان باشبێت.

هەوڵمدا لاپەڕەکە ببینم.

—هەرئێستە دایانبەزاند. پەرستارییان دەوێت.

—خۆمن پێمگوتیت کە بەکەڵکی ئەمکارە نایەم.

—بۆ بەساڵاچوانیان ناوێت. کارێکی شەخسییە. کارکردنە لە ماڵی کەسێکدا. تەنها سێ کیلۆمەتریش لەماڵەکەتانەوە دوورە، پەرستاری و هاوڕێیەتی لەگەڵ پیاوێکی توانادوستدا، شۆفێری دەکەیت؟

—بەڵێ، بەدڵنیاییەوە دەبێت سمتیشی بۆ بشۆم.

—نەخێر، پێویستناکات سمتی بشۆیت.

بە وردییەوە دەیخوێندەمە.

—هەرچوار ئەندامەکەی جەستەی ئیفلیجن. پێویستی بە کەسێك هەیە کە بەدرێژایی سەعاتەکانی کارکردن خواردنی پێبدات و یارمەتی بدات. بۆ ئەمجۆرە کارانەیش کاتێك بیانەوێت بچنە دەرەوە دەبێت ئامادە بێت و یارمەتیان بدەیت. ئەی هاوار چ پارەیەکی باشیش دەدەن. زۆر زیاتر لە لایەنی کەمی مووچە.

—بەدڵنیاییەوە لەبەر ئەوەیە کە دەبێت سمتیشی پاکبکەمەوە.

—تەلەفۆن دەکەم و هەموو شتێك دەپرسم، ئەگەر هەموو شتێك باشبوو، ئایا خۆت بەتەنهایی دەچیت بۆ چاوپێکەوتن؟.

بە ئاوازێکی پرسیارکەرانەوە گوتبوو، بەڵام هەردوکمان وەڵامەکەمان دەزانی.

ئاهێکی قوڵم هەڵکێشا. جانتاکەم هەڵگرت و ئامادەی گەڕانەوە بووم بۆ ماڵەوە.

***

باوکم گوتی:

–یا عیسای مەسیح! دەتوانی تەسەوری بکەیت؟ هەروەك بڵێی سزای دانیشتن بەسەر کورسی مودەوەر بەس نەبوو دەبێت تامڵی هاوڕێیەتیشی بکات.

دایکیشم بە ئاوازێکی لۆمەکارانەوە گوتی:

–برنارد.. !

بابەگەورەیشم لەدوامەوە و لەوکاتەی کە پەرداخە چاییەکەی بەدەمەوە بوو پێدەکەنی.

## {٢}

من کەسێکی گێلۆکە نیم. زۆریشم پێناخۆشە کەسێك بەوشێوەیە بیرم لێبکاتەوە. بەڵام ژیان لەگەڵ خوشکێکدا کە لەمن بچوکتر بوو، بەڵام لە خوێندندا نەك تەنها گەیشتەوە بە مندا، بەڵکو یەك ساڵیش کەوتە پێشمەوە، زۆر سەخت بوو نەدەکرا بیرنەکەمەوە کە کەسێکی کەم هۆش نیم.

هەمیشە کارە ژیرانە و هۆشیارانەکان سەرەتا کاترینا ئەنجامیدەدان، لەگەڵ ئەوەی کە هەژدە مانگ لەمن بچوکتر بوو، هەرکتێبێکم دەخوێندەوە ئەو پێش من خوێندبویەوە. لەسەر مێزی نانخواردن سەبارەت بە هەر بابەتێك قسەم دەکرد، ئەو بەباشی دەیزانی. تەنها کەسێك بوو کە دەزانم حەزی لە تاقیکردنەوە و ئیمتیحانە. هەرچەندە هەندێکجار پێموایە تەنها لە پۆشینی جلوبەرگدا لەگەڵ ئەودا جیاوازم، چونکە تەنها کارێك کە کاترینا نایزانێت ئەنجامیبدات بریتیە لە پۆشینی جلوبەرگ. لەو کچانەیە کە هەمیشە چاکەتی ملیوان قەپات و پانتۆڵی ئەستوری لە بەن چنراو دەپۆشێت. هەمیشە لە پێش هەموانەوە پانتۆڵە ئەستورەکەی ئوتودەکات.

باوکم پێم دەڵێت نۆبەرەکەیت هێنا، چونکە لەو سەرەتایەوە هەرچییەك بە بیرمدا بێت یەکسەر دەیڵێم. دایکیشم ناوینام شاکار. ئەمەیش شێوازی دایکمە بۆ ئەوەی پێمبڵێت کە شێوەو شێوازی جلوبەرگەکانی منی بەلاوە پەسەند نییە.

بەڵام بێجگە لە سەردەمێکی کورتی مێردمنداڵی نەبێت، هیچکاتێك حەزم نەکردووە وەك کاترینا، یان لە کچەکانی قوتابخانە بچم. تاوەکو تەمەنی چواردەساڵی جلوبەرگی کوڕانەم پێباشتر بوو. ئێستەیش بە هەرشێوەیەك کە حەزم لێی بوو جلوبەرگ لەبەر دەکەم، تەنها پەیوەندی بە ڕۆحیەت و بارودۆخی ئەو ڕۆژەمەوە هەیە. هەرگیز بەلامەوە گرنگ نییە کە بە کۆنەپەرست بنوێنم.

جەستەیەکی بچوك و قژێکی ڕەشم هەیە و هەروەك باوکم دەڵێت دەموچاوم وەك پەرییەکانە. ئەڵبەتە نەك لەڕوی جوانییەوە. خۆ ناشیرینیش نیم، بەلأم باوەڕناکەم هیچکەسێك بە جوانم بزانێت، چونکە شتێکی جوانم نییە. پاتریك هەرکاتێك ئەیویست نزیکم ببێتەوە، دەیگوت کەسێکی جوانم. بەگشتی ئەو کەسێکی کاتناس بوو. نزیکەی حەوت ساڵ دەبوو کە یەکتریمان دەناسی.

تەمەنم بیست و شەش ساڵ بوو، بەلأم خۆم باوەڕم نەدەکرد. تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە ئیش و کارەکەم لە دەستدا هەرگیز بیرم لە تەمەنم نەکردبویەوە. گومانم دەکرد و پێموابوو کە لەوانەیە هاوسەرگیری لەگەڵ پاتریکدا بکەم. چەند منداڵێکم دەبێت و لە مەودای چەند شەقامێکی لەولاتری ئەو شوێنەی کە ئێستە تێدا دەژیم جێگیر دەبم و لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانمدا ژیان دەگوزرێنم. بێجگە لەو سەلیقە سەیروسەمەرەیەی کە لە پۆشینی جلوبەرگدا هەمبوو، بالأی نیمچە کورتیشم، جیاوازییەکی زۆرم لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەبوو کە لەشەقامەکاندا بەلایاندا تێدەپەڕن. لەوانەیە ئەگەر بەلاتاندا تێپەڕیمایە هەرگیز ئاوڕ نەدەنەوە بۆ ئەوەی دووبارە سەیرم بکەنەوە. بە کورتی کچێکی ئاسایی بە ژیانێکی ئاساییەوە. هەلومەرجی ژیانم زۆر گونجاو بوو لەگەڵ ڕۆحییەتمدا.

***

دایکم بە پێداگرییەوە دەیگوت:

—بۆ چاوپێکەوتن دەبێت چاکەت و تەنورە(ئاواڵ کراس) لەبەر بکەیت، لەم سەردەمەدا هەموان خراپ دەستیانداوەتە پۆشینی جلوبەرگی سپۆرت.

—چونکە کاتێك بمەوێت بە کەوچك خواردن بکەم بەدەمی پیرە پیاوو پیرەژنەوە، دەبێت تەنورە و چاکەتم لەبەردا بێت.

—قسەی بێمانا مەکە!

—پارەم نییە کە چاکەت و تەنورە بکڕم. ئەی ئەگەر بیکڕم و کارەکەم دەستنەکەوێت ئەوکات چی بکەم؟

—دەی باشە، ئەوەی من لەبەر بکە. بلوزێکی جوانیشت بۆ ئوتودەکەم. ئەگەر بۆ یەکجاریش بووە قژەکانت بەمجۆرە دامەهێنە. ئاماژەی بۆ قژەکانم کرد کە لەناوەڕاستەوە دەمکردن بە دوو بەشەوە. دواتر هەر بەشێکیانم دەپێچاو لەهەردولای سەرمەوە کۆم دەکردنەوە.

–هەروەك مۆدێلی قژەکانی پرنسس لیا[٢]، تەنها هەوڵ بدە وەك مرۆڤەکانیتر بیت.

دەمزانی نابێت دەمەقاڵێ لەگەڵ دایکمدا بکەم. دڵنیام کە دایکم بە باوکمی گوتبوو، کاتێك لەماڵەوە دەچمە دەرەوە، سەبارەت بە جلوبەرگەکانم هیچ نەڵێت. بە چاکەت و تەنورەکەی دایکمەوە کە زۆر تەسك بوو، نەمدەتوانی برۆم بەڕۆم بەڕێگا.

باوکم گوتی:

–خودات لەگەڵ ئازیزەکەم.

کەمێك دەمی لارکردەوە.

–سەرکەوتو بیت. وەك مرۆڤە پیشەگەرەکانت لێهاتووە.

مەسەلە ئەوە نەبوو کە جلوبەرگەکانی دایکم لەبەر کردبوو، یاخود لەبەر ئەوە نەبوو کە مۆدیلەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی دەیەی ساڵی ١٩٨٠، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی بچوکبوو بۆم. هەستمدەکرد کە خەریکە کەمەرم دێتە ناو سکمەوە. چاکەتە چوار دوگمەکە لەبەرمدا دەکشا.

سواری پاسەکە بووم، بۆ ئەوەی ئەو ماوە کەمە ببڕم، دڵەخورپەم بوو. بەهەموو تەمەنم نەچوبوم بۆ چاوپێکەوتنی ئیش و کارێکی رێکوپێك. کاتێك دەستمکرد بە کاری ناو قاوەخانەکە، ترینا گرەوی لەگەڵدا کردبوم کە هەرگیز ناتوانم ڕۆژێك لە ڕۆژان کارێك بۆ خۆم بدۆزمەوە. منیش لەپاش ئەو قسەی خوشکەکەم چوبومە ناو قاوەخانەکەوە و زۆر بەسادەییەوە پرسیارم لە فرانك کردبوو شاگردی پێویستە یان نا. یەکەم ڕۆژ بوو کە قاوەخانەکەی کردبویەوە. تەنانەت نەیدەزانی بە چ زمانێك سوپاسم بکات.

ئێستە کە سەیری رابوردووم دەکرد، بەبیرم نەدەهاتەوە سەبارەت بە پارەو موچە قسەم لەگەڵ فرانکدا کردبێت. ئەو پێشنیاری موچەی هەفتانەی پێدام، منیش قبوڵم کرد. ساڵی یەکجار موچەم بۆ زیاد دەبوو، کەمێك لەوەش زیاتر بوو کە من دەمویست.

با واز لەمە بێنین، باشە لە چاوپێکەوتنەکەدا چ جۆرە پرسیارانێك دەکەن؟ساید گوتبوی پەرستارە بنەڕەتیەکەی پیاوێکە کە (پێداویستیە شەخسیەکان)ی بۆ دابیندەکات. (کاتێك ئەم قسەیەم بیست گرژ بومەوە)، ساید گوتبوی کە هێشتا نازانین ئەرکی پەرستاری یاریدەدەر

[٢] شازادەخاتونی فیلمی شەڕی ئەستێرەکان، کە خاوەنی لایەنگرێکی زۆرە.

چییە. خۆمم دەهاتە پێشچاو کە خەریکم ئاوو لیکی دەمی پیرەپیاوێك لە لایدەمییەوە دەسڕم و لەوانەیە بپرسم (چای دەخۆیتەوە؟).

بابەگەورەم لەپاش ئەو جەڵتەیەی کە کردبوی، تەنانەت کاتێکیش بەرەوباشتر چوو، نەیدەتوانی کارەکانی خۆیشی ئەنجامبدات. دایکم هەموو کارێکی بۆ ئەنجامدەدا. باوکم دەیگوت: (دایکت فریشتەیە)، بەبڕوای من بەڵگەی ئەوەبوو کە دایکم پاکیدەکردەوە بەبێ ئەوەی کە ڕوی وەربگێڕێت و بیکات بە هات و هاوارو لەماڵەوە بچێتە دەرەوە. ئەڵبەتە هیچکەسێکیش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژەی بە وەها شتێك نەکردبوو ئەم قسەیەی بۆ من نەکردبوو. منیش لەناو قاپدا خواردنەکەی بابەگەورەم دەبرد و دەمکرد بە تیکە بۆی. بەڵام وەك هەمیشە دڵنیانەبوم چ شتکم تێکەڵکردووە.

گرنتا هاوس، لەولای تری قەڵاکەوە بوو. نزیکی دیوارەکانی سەدەی ناوەڕاست و ڕێك لەناوەڕاستی ناوچە گەشتیارییەکەدا و لەو شوێنەدا کە سەنگچن نەکرابوو، تەنها چوار خانوو مەغازەی نشنال تراست، لەوێدا هەبوون. بە درێژایی تەمەنم لەوانەیە هەزاران جار لەبەرامبەر ئەم خانوەوە تێپەڕیبم، بەڵام هەروەك بڵێی نەمبینیبوو. لە پارکینگی قەڵاکە و سکەی شەمەندەفەرەکەوە تێپەڕیم، هەردووکیان چۆڵ و هۆڵ بوون. ڕێك بەهەمان ئەندازەی کە سەرنجڕاکێشیەکی گەشتیاری هاوینە لەمانگی فورییەدا دەتوانێت پڕ بێت لەخەڵکی. ئێستە دەبینم خانووەکە زۆر گەورەترە لە تەسەوری من، کە بەخشتی سور دروستکرابوو دەرگایەکی دووتاکی هەبوو. مرۆڤ دەتوانێت شێوازی ئەمجۆرە خانوانە لە نوسخە کۆنەکانی کانتری لایف و لەسەر مێزی چاوەڕوانی پزیشکەکان ببینیت.

لەسەر ڕێڕەوی ئۆتۆمبیلەکان هەنگاوم هەڵگرت. هەوڵم دەدا بیر لەوە نەکەمەوە کە کەسێك لەودیوی پەنجەرەوە سەیرم دەکات. ڕۆیشتن بەناو ڕێڕەوی دوورودرێژی ئۆتۆمبیلەکاندا مرۆڤ دەخاتە بارودۆخێکی نالەبارو نەخوازراوەوە، خۆبەخۆ هەست بە سوکایەتی دەکەیت. لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە کە چۆن سڵاوو هەواڵپرسین بکەم، کاتێکمزانی دەرگاکە کرایەوە و هاتمەوە بەرخۆم.

ژنێك کە زۆر لەمن گەورەتر نەبوو هاتە دەرەوەو پێی خستە دالآنە هەشتپاڵوەکەوە، پانتۆڵێکی سپی و ڕوپۆشێکی پزیشکی لەبەردا بوو. پاڵتۆیەك و پۆشاکێکی لەبن دەستدا بوو. کاتێك لە تەنیشتمەوە تێپەڕی، زەردەخەنەیەکی زۆر بەڕێزانەی بۆ کردم.

لەناو ماڵەکەوە دەنگێك دەبیسترا،

-سوپاس کە هاتن، پەیوەندیتان پێوە دەکەین.

دەموچاوی ژنێك دەرکەوت، ژنێکی تەمەن مامناوەند بەڵام جوان. قژەکانی بەشێوەیەکی زۆر جوان کورتکرابونەوە. چاکەت و پانتۆڵێکی ژنانەی لەبەردا بوو، کە بێگومان نرخەکەی لە داهاتی مانگانەکەی باوکم زیاتر بوو.

-بەدڵنابییەوە خاتوو کلارکن.

دەستم بردە پێشەوە و گوتم:

-لوئیزا.

ئەوکارەی کە دایکم گوتبوی هەردەبوو ئەنجامی بدەم. باوك و دایکم دەیانگوت گەنجەکانی ئەم سەردەمە تەوقە لەگەڵ کەسدا ناکەن. جاران هەرگیز بیریان لێنەدەکردەوە کە تەنها یەك سلاو بکەن، یان خراپتر لەوە ماچێکی هەوایی. وادیاربوو کە نابێت سلاو ماچی هەوایی بکەم.

ژنەکە بە هێمنیەوە دەستی لەناو دەستم دەرهێناو گوتی:

-بەڵێ، راستە، فەرمونە ژورەوە.

بەڵام بەردەوام سەیری دەکردم. هەروەك بڵێی خەریکە هەڵمدەسەنگێنێت.

-نافەرمون بۆ ژورەوە؟

زۆر ماندو دیار بوو، بەدڵنیاییەوە ئەو رۆژە ئەم رستەیەی چەندینجار دووبارە کردبویەوە.

بەشوێنیدا رۆیشتم و چومە ناو ژورێکی گەورەوە کە پەنجەرە فەرەنسییەکانی لە بنەوە تاوەکو سەقفەکە دەبوون. پەردەگەلێکی قورس بە شێوازێکی زۆر بە سەلیقەیەك لە مەیلی پەردەی قاوەیی سوتاو هەڵواسرابون. ناوەکەیشی بە قاڵی ئێرانی فەرش رێژ کرابوو. کەشوهەوای ژورەکە بۆنی تازەیی فەرش و قەنەفەی تازەی دەدا. مێزی بچوك و زۆر جوان و کەشخە لە هەموو لایەکەوە دەبینرا. لەسەر ئەو مێزە جوانانەشدا سندوقی جوانی دانرابوون، کە هەموو سەری مێزەکانی داپۆشیبوو. حەزم دەکرد بزانم ئایا خێزانی ترینەر کوپی قاوەکەیان لەکوێدا دادەنێن.

-لەلایەن بەرێوەبەرایەتی کارەوە دێیت. وایە؟ فەرمون دابنیشن.

ژنەکە سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی کاغەزەکانی ناو ئیزبارەکە بوو، منیش لە ژێرچاوەوە سەیرێکی دەورووبەرم کرد. لەبەر خۆمەوە بیرم لەوە کردبویەوە کە دەبێت هاوشێوەی خانەی

بەسالاچوان بێت، مەسعەد و سەقفی تەپوتۆزاوی هەبێت. بەلام ماڵەکەی تریندەر وەك یەکێك لە ئوتێلە زۆر گرانەکان بوو، پڕ بوو لە کەرەستە و شتومەکی کۆنەی بەنرخ، لەگەڵ کۆمەڵێك کەرەستەی بێوێنەی زۆر جوان کە زۆر بەنرخ دەهاتنە بەرچاو. چەندین چوارچێوەی وێنەی زیوی لەسەر بۆفەکە بوون، بەلام لەمنەوە دور بوون و نەمدەتوانی دەموچاوەکانی ناو وێنەکان بناسمەوە. ژنەکە بەردەوام سەرقاڵی کاغەزو وەرەقەکانی بوو. منیش لەسەر قەنەفەکە کەمێك جولام و جێگۆرکێم کرد بۆ ئەوەی باشتر ببینم.

دواتر دەنگێکم بیست. ڕێك دیار بوو کە شتێك دڕاوە. سەرم دانەواند و دەبینم دوو پارچە قوماش کە لە تەنیشت قاچی ڕاستمەوە بەسترابون بەیەکەوە لەیەکتری پچڕان،(تەنورەکەم) پارچەی ڕزیوی بەنی ئاوریشمی بە شێوەیەکی زۆر خراپ بەناو هەوادا بلاوبونەوە. هەستمکرد دەموچاوم سور بووەتەوە.

—باشە، خاتوو کلارك، ئایا ئەزمونت لەبواری کارکردن لەگەڵ کەسانێکدا هەیە کە دەست و قاچیان ئیفلیجی هەیە؟

لامکردەوە بەلای خاتوو تریندەردا، خۆم پێچ دەدا بۆ ئەوەی بتوانم بە پێی توانا دڕاوی تەنورەکەم بشارمەوە.

—نەخێر.

ئەی لە پەرستاریدا هیچ پێشینەیەکت هەیە؟

—نەخێر، هیچکات کارم نەکردووە.

دواتر هەروەك بلێی کە دەنگی سایدم لە گوێمدا دەبیست، لە قسەکانم بەردەوامبوم:

—بەلام دڵنیام کە فێر دەبم.

—باشە تۆ دەزانیت کەسێك کە هەرچوارپەلی ئیفلیجە مانای چییە؟

بە هێمنیەوە گوتم:

—واتە کەسێك کە لەسەر کورسی تایەدار (ویلچەر) دەبێت؟

—دەتوانین ئەمەش بلێین، بەلام پلەو دەرەجەکانی جیاوازییان هەیە. بەلام ئێستە سەبارەت بە کەسێك قسە دەکەین کە بەهیچ شێوەیەك قاچەکانی ناجوڵێن و دەستەکانیشی زۆر بەکەمی دەجوڵێن، خۆ بێزار نابیت؟

گوتم:

–نەخێر بەهیچ شێوەیەك، نەك بەو ئەندازەیەی کە خۆی بێتاقەت دەبێت.

زەردەخەنەیەکم کرد، بەڵام دەموچاوی ژنەکە بێ حاڵ و بێ هەست بوو. لە قسەکانم بەردەوامبوم:

–ببورن، مەبەستم ئەمە نەبوو....

–خاتوو کلارك شۆفێری دەکەیت؟

–بەڵێ.

–مۆڵەتی شۆفێریت هەیە؟

بە سەر ڕاوەشاندن گوتم بەڵێ.

کامیلا ترینەر نیشانەو خەتێکی لەناو پێڕستەکەیدا کێشا.

دڕاوی دامێنی تەنورەکەم بەردەوام زیاتر دەبوو. تەنانەت بەرەو سەرتریش دەچوو خەریکبوو دەگەیشتە لای ڕانم. دەبوایە هەستمەوە. کاتێك وەستام ڕێك وەك یەکێك لەو کچانەم لێهاتبوو کە نمایشی کۆمیدی ئەنجامدەدەن.

خاتوو ترینەر بە سەرسوڕمانەوە واقی بە مندا وڕمابوو.

–خاتوو کلارك شتێك بووە؟

–نەخێر تەنها کەمێك گەرمم بووە، گرفت نییە چاکەتەکەم داکەنم؟

پێش ئەوەی هەلی وەڵامدانەوەی هەبێت، خێرا چاکەتەکەم داکەند و پێچام بە کەمەرمەوەو دڕاوییەکەم داپۆشی، زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم:

–زۆر گەرمە. مرۆڤ کاتێك لە دەرەوە دێت گەرمی دەبێت.

خاتوو ترینەر ساتێك وەستاو دیسانەوە سەیری کاغەزەکانی کردەوە. تەمەنت چەندە؟

–بیست و شەش ساڵ.

–شەش ساڵیش لە شوێنی پێشوتدا کارت کردووە.

–بەڵێ نوسخەی پێناسنامەتان هەیە.

خاتو ترینەر پێناسنامەکەی بەرز کردەوە بەچاوی نیمچە داخراوەوە سەیرێکی کرد.

–خاوەنکارەکەی پێشوتان گوتویەتی کە ئێوە کەسێکی خۆشەویست و ئەهلی قسەی خۆشن و خاوەنی وورەیەکە ئەرێنین.

–بەڵێ، ئەوە ڕاستە.

دووباره دەموچاوی ووشك و جیدی بوویەوە. بەخۆمم گوتم ئەی نەفرەتی!

وادیاربوو دوباره ئەیویست هەڵسەنگاندنم بۆ بكاتەوە، بەڵام نەوەك بەشێوەیەكی باش، جلوبەرگەكەی دایكم كتوپڕ لەبەرچاوانم بە پەست و بێ نرخ هاتە پێشچاوم. بەنەكانی لەبەر ڕووناكی لاوازی ئەو شوێنەدا دەدرەوشانەوە. دەبوایە پانتۆڵە ئاساییەكەو بلوزەكەی خۆمم لەبەر بكردایە، لەڕاستیدا هەرشتێكی بێجگە لەم تەنورە و چاكەتە.

—ئەی باشە بۆچی وازت لە كارەكەت هێنا؟ خۆ لەوێدا هەموو شتێك باشبووە.

—فرانكی خاوەنی قاوەخانەكە، ئەو شوێنەی فرۆشت. قاوەخانەكە لە خوار قەلاگەوە بوو. ناوی باتردبان بوو، خۆمن حەزم دەكرد لەوێدا بمێنمەوە.

خاتوو ترینەر سەرێكی ڕاوەشاند، لەوانەیە بە پێویستی نەدەزانی كە شتانێكی زیاتر بپرسێت، لەوانەبوو ئەویش زیاتر حەزیدەكرد كە من لەو قاوەخانەیەدا بمێنمەوە.

—چ بەرنامەیەكت هەیە بۆ ژیانت؟

—ببورن تێنەگەیشتم.

—بەرنامە و مەبەستێكی تایبەتت هەیە بۆ داهاتوو؟ ئیش؟ كار؟ ئێرە بۆتۆ وەك سەكۆی فڕێدان و هاویشتنە؟ ئایا ئامانج و مەبەستێكی تایبەتت هەیە كە دەبێت بەردەوامبیت لەسەری؟

واقم بەناو براودا وڕمابوو، هیچ هەستێكی تایبەتم نەبوو. مەبەستی چی بوو؟ ئایا لەوجۆرە پرسیارە بەلارێدابەرانە بوو؟

—نەخێر، هێشتا بیرم لەوە نەكردووەتەوە. لەوكاتەوەی كارەكەم لەدەستداوە تەنها....

تفی دەمم قوتدایەوە.

تەنها ئەمویست دووباره بگەڕێمەوە بۆ سەركارەكەم.

وەلامێكی بێتامم دابویەوە. بە سەروفەساڵی خاتوو ترینەردا دیاربوو ئەویش لەبەر خۆیەوە بیردەكاتەوە ئەمە چ جۆرە مرۆڤێكە كە هاتووە بۆ چاوپێكەوتن و خۆیشی نازانێت بەشوێن چییەوەیە!

پێنوسەكەی دانا.

—زۆرباشە، خاتوو كلارك، ئادەی پێمبڵێ بزانم كاتێك داخوازی پێشوو حەوت ساڵ پێشینەی كاری لەگەڵ كەسانی ئیفلیجدا هەیە، ئیتر بۆچی دەبێت ئێوە دابمەزرێنم؟

کتوپڕ دەموچاوی دایکم هاتە بەرچاوم. نەمدەتوانی تەسەوریشی بکەم کە بە جلوبەرگی دڕاوو شڕەوە لە چاوپێکەوتنێکی ترەوە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. هەقدەستی ئەمکارە بۆ هەر کاتژمێرێکی نۆ پاوەند بوو. کەمێك خۆم ساف کرد.

–ئێ باشە، من زۆر زوو فێر دەبم، هەرگیز نەخۆشیش ناکەوم. ماڵمان لەولای قەلاگەوەیە. زۆر لەوە بەهێزترم کە دێمە پێشچاوی ئێوە... بەدڵنیاییەوە هێندە بەهێزم کە بتوانم هاوسەرەکەتان ئەملاو ئەولا پێبکەم.

–هاوسەرم؟ ئەوە هاوسەری من نییە کە ئێوە دەبێت پەرستاری بکەن، بەڵکو کوڕمە.

چاوەکانم لێکنا.

–کوڕەکەتان؟ من لە کاری قورس ناترسم. زۆر باشیش شارەزام کە لەگەڵ هەموو جۆرە مرۆڤێکدا هەڵبکەم... لەگەڵ هەموو هەلومەرجێکدا دەگونجێم. بارودۆخی گەورەم ڕێکدەخەم.

وازم لە زۆر بلێیی هێناو بێدەنگ بووم. بیرکردنەوە لەوەی کە کوڕییەتی سەرسامی کردبوم. دووبارە دەستمکردەوە بە قسە کردن:

–من پێموایە کارێك نییە کە ئەنجامنەدرێت. هەرچەندە باوکم قبوڵی نییە.

خاتوو ترینەر بە حاڵەتێکی سەیرەوە واقی بە مندا وڕمابوو. تاوەکو ئاگاداری قسەکەم بوومەوە.

بە پچڕپچڕ گوتم:

–ببورن مەبەستم ئەمە نییە کە دەتوانم بارودۆخی ئیفلیجی هەرچوارپەلی کوڕەکەتان دەگۆڕم.

–خاتوو کلارك دەبێ بە ئێوە ڕابگەیەنم کە بڕیارنامەکە هەمیشەیی نییە. ماوەکەی بەلایەنی زۆرەوە شەش مانگە. هەر لەبەر ئەمەیە کە موچەیەکی باش دەدەین. تەنها ئەمانەوێت مرۆڤێکی گونجاو بدۆزینەوە.

–کاتێك مرۆڤ بەشێوەی سوڕانەوە لە کارگەی کەمپوت دروستکردنی مریشکدا کاری کردبێت، کارکردن لە کەنداوی گوانتانامۆ بۆ شەش مانگ دەتوانێت سەرنجڕاکێش بێت. باوەڕ بکەن.

(ئۆو لوئیزا بێدەنگ بە)، لێوم خستە نێوان ددانەکانمەوە.

وادیاربوو خاتوو ترینەر ئاگای لە قسەکانم نییە، هەربۆیە ئیزبارەکەی داخست.

-ویلی کوڕم نزیکەی دوو ساڵ لەمەوبەر لە شەقامدا ئۆتۆمبێل لێیدا. ئێستە پێویستی بە چاودێری شەوو ڕۆژ هەیە. زۆربەی کارەکانی پەرستارە پێشەگەرەکەی ئەنجامیان دەدات، من لەم دواییانەدا گەڕامەوە بۆ سەرکارەکەم، پێیوستمان بە کەسێك هەیە کە بەدرێژاسیی ڕۆژ لێرە بێت. لەلای بێت و یارمەتیبدات و خواردن و خواردنەوەی بۆ ئامادە بکات بۆ ئەوەی بیخوات. ئاگاداری بێت کێشەیەکی بۆ دروست نەبێت. بەکورتی هێزی یارمەتیدەرمان دەوێت.

کامیلا ترینەر سەری داخست و واقی بە قاچەکانیدا وڕما.

-کەسێك دەبێت لەلەگەڵ ویلدا بێت و گرنگی لێپرسراوییەتیەکەی بزانێت، ئەمە لە هەموو شتێك گرنگترە.

هەموو قسەیەکی دەکرد، تەنانەت جەختکردنەوەی لەسەر ووشەکان، بەشێوەیەك لە شێوەکان ئاماژە بوو بە بێئەقڵی من.

جانتاکەم هەڵگرت و گوتم:

-بەڵێ، ئەوە ڕاستە.

-هێشتایش حەزت لەمکارە هەیە؟

قسەکەی بە ئەندازێك چاوەڕواننەکراو بوو، کە سەرەتا پێموابوو بە هەڵە گوێم لێبوو.

-ببورن، تێنەگەیشتم؟

-دەبێت هەرچی زووە دەستبەکار بن. موچەکەتان هەفتانە پێدەدرێت.

نەمدەزانی چی بڵێم هیچ ووشەیەکم بۆ نەدەگوترا.

-پێمباشترە من لە جێگەی....

-کاتژمێرەکانی کارکردن دوورودرێژن. لە هەشتی بەیانییەوە تاوەکو پێنجی ئێوارە عەسر. هەندێکجاریش زیاتر. کاتێك زۆرت بۆ نانی نیوەڕۆ نییە، هەرچەندە (نیتن)ی پەرستاری کاتی نانی نیوەڕۆ دێت، هەربۆیە ئێوە نیوسەعات کاتی ئازادو بێکارتان هەیە.

-پێویستمان بە شتانێکیتر نییە، مەبەستم لەڕووی پزیشکیەوە؟

-هەموو جۆرە پێداویستیەکی پزیشکیمان بۆ ویل فەراهەم کردووە. تەنها پێویستم بە مرۆڤێکی گورج و گۆڵ و سەری حاڵە. بابەتەکە زۆر ئاڵۆزە. ویل دەبێت هێزی دڵ و دەروون پەیدا بکات و دڵگەرم بێت بۆ ئەوەی...

له قسەکەی بەردەوام نەبوو. سەرنجی دایە شتێك کەلەولای پەنجەرە فەرەنسیەکەوە بوو. لەکۆتاییدا ئاوڕی دایەوە بۆلای من.

–دەبێت ئەوەتان پێبڵێم کە تەندروستی ڕۆحی ویل هێندەی تەندروستی جەستەی بۆ ئێمە گرنگە. ئاگات لە قسەکانم هەیە؟

–بەڵێ ئاگام لێیە. دەبێت جلوبەرگی ڕازاوە و جوان لەبەر بکەم.

–نەخێر، جلوبەرگی جوان نا(یونیفرم).

سەیرێکی قاچەکانی کردم.

–هەرچەندە باشتر وایە کە جلوبەرگێك لەبەر بکەن کە کەمتر جەستەتان دەربکەوێت.

سەرم داخست و دەبینم چاکەکەتەم کە بەستبوم بە کەمەرمەوە لادراوە و قاچم دیارە.

–ببورن، ئەوە دڕاوە و سوڕاوەتەوە، جلوبەرگی من بەمجۆرە نییە.

بەڵام وادیار بوو کە خاتوو ترینەر زۆر گوێی بە مەسەلەکە نە دەدا.

–کاتێك دەستبەکار بویت ڕونکردنەوەی زیاترت پێدەدەم. خاتوو کلارك، ویل کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ نییە، بێجگە لە شارەزاییە تایبەتەکان کە دەبێت بیانزانی، دەبێت ئاگاداری مەسەلە ڕۆحیەکانیش بیت. بەیانی دەتانبینمەوە؟

–بەیانی؟ پێویستناکات ئێستە ببینم؟

–ویل ئەمڕۆکە لەبارودۆخێکی باشدا نییە. باشتر وایە دواتر دەستبەکارەکە بکەین.

هەستامەوە. دیاربوو کە خاتوو ترینەر چاوەڕوانی خوداحافیزییە. لەوکاتەدا کە سەرقاڵی لەبەرکردنی چاکەتەکەی دایکم بووم، گوتم:

–بەڵێ، زۆر سوپاس، بەیانی کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی دەتانبینمەوە.

***

کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، دایکم خەریکبوو پەتاتەی دەکردە ناو قاپەکەی باوکمەوە. دوو پارچەی تێکرد. باوکم خۆی دەستبەکار بوو پارچەی سێیەم و چوارەمی لەناو تاوەکەدا هەڵگرت. دایکم نەیهێشت و پەتاتەکانی کردەوە ناو تاوەکە. دواتر کاتێك باوکم ویستی هەڵیانبگرێتەوە، دایکم بە کەوچك کێشای بەسەر دەستیدا. باوکم و دایکم و خوشکەکەم و تۆماس و بابەگەورەم و پاتریك کە زۆرجار چوارشەممان لەگەڵ ئێمەدا نانی دەخوارد، لەسەر مێزەکە دانیشتبون.

دایکم بە بابەگەورەمی گوت:

—باوکە، گۆشتت بۆ بکەم بە تیکە؟ ترینا تۆ بۆی دەکەیت؟

ترینا بەرەو پێشەوە لاریویەوە و بە شارەزاییەوە هەموو گۆشتی ناو قاپەکەی بابەگەورەی کردە تیکە تیکە. هەمان کاری بۆ تۆماسیش کرد کە لەولایەوە دانیشتبوو.

—لوئیزا، بارودۆخی ئەم پیاوە چەندێك خراپە؟

باوکم گوتی:

—ئەگەر بهێڵن کچەکەمان کاری خۆی بکات، ئیتر ئەوەندە بارودۆخی خراپتر نابێت.

تەلەفیزیۆن لە دوای منەوە داگیرسابوو، باوکم و پاتریك سەیری یارییان دەکرد. هەزار جار کە سەیری تەلەفیزیۆنیان دەکرد ئەوەیان لەبیردەچویەوە یەك پارو هەڵبگرن و بیخەنە دەمیانەوە، یان سەیری پاس یاخود هەڵەیەکی گریمانی یاریزانەکانیان دەکرد.

—وابزانم هەلێکی زۆر باشە. کارکردن لە یەکێك لەو باڵەخانە گەورانە و بۆ خێزانێکی ئاست بەرز، ئازیزەکەم کەسانێکی باشن و پیاوی پیاوانەن؟

لە گەڕەکەکەی ئێمەدا بە کەسانێکیان دەگوت پیاوی پیاوانە، کە هیچ ئەندامێکی خێزانەکەیان بەپێچەوانەی پێوەرە کۆمەڵایەتیەکانەوە نەجولێتەوە.

—بەڵێ، وابزانم بەو شێوەیەن.

باوکم بە زەردەخەنەوە گوتی:

—کەوابوو تۆیش داب و نەریتەکانی تێکەڵیکردن و مامەڵەکردنی جوان لەگەڵ خەڵکیدا بەباشی فێر دەبیت!

ئەو شەربەتەی کە بەدەستی تۆماسەوە بوو خەریکبو دەڕژا، ترینا چەمایەوە بۆ ئەوەی لێی وەربگرێت گوتی:

—باشە تۆ ئەو کەسەت بینیوە؟ پیاوە ئیفلیجەکە. کەسێکی چۆن بوو؟

—بەیانی دەیبینم.

—چەند سەیرە! هەموو ڕۆژی خۆت لەگەڵیدا بەسەر دەبەیت، نۆ سەعات. لە پاتریك زیاتر دەیبینم.

گوتم:

—قورس نییە.

پاتریك كه لەوسەری مێزەكەوە دانیشتبوو، خۆی كەڕ كرد، باوكم گوتی:

—خەمی ئەوەت نییە كە ئازارت بدات؟

دایكم بە توندو تیژییەوە گوتی:

—بێرنارد!

—تەنها قسەیەكم كرد كە هەموان خەریكن بیری لێدەكەنەوە. پاتریك وابزانم باشترین خاوەنكارێكە كە دەتوانیت بۆ هاوڕێكەت بیدۆزیتەوە، ئەی وانییە؟

پاتریك لەوسەری مێزەكەوە زەردەخەنەیەكی كرد. سەرقاڵی نانخواردن بوو، بەڵام پەتاتەی نەدەخوارد، لەگەڵ ئەوەی كە خۆشترین خواردنی دایكم بوو. بەڵام ئەم مانگە نەدەبوو كە پاتریك كاربۆهیدرات بخوات. خەریكبوو خۆی بۆ پیشبڕكێی دووەمی خۆڕاگری مانگی مارس ئامادە دەكرد.

—لەبەر خۆمەوە بیرم دەكردەوە، بەدڵنیاییەوە دەبێت زمانی ئاماژەیش فێر ببیت؟ ئەگەر نەتوانێت قسە بكات، چۆن دەزانی كە چی دەوێت؟

—دایكە، دایكی نەیگوت ناتوانێت قسە بكات. ئەوەندە توشی شۆك بوبوم لەوەی كە كارم دەستكەوتبوو، قسەكانی خاتوو ترینەرم لەبیر نییە.

—لەوانەیە بە یەكێك لەو جیهازو كەرەستانە قسەی لەگەڵدا بكات. وەك زاناكان. وەك خێزانی سیمپسون[٣].

تۆماس گوتی:

—توخمە سەگ.

باوكم گوتی:

—نا، ئەوە چی دەڵێیت.

پاتریك گوتی:

—ستیڤن هاوكینگ[٤].

دایكم سەیرێكی لۆمەكارانەی تۆماس و باوكمی كرد و گوتی:

---

[٣] فیلمكارتۆنی پڕ بینەری سیمپسونەكان.

[٤] فیزیازانی گەردونناس و نوسەری بەریتانی لەدایكبوی ١٩٤٢ كە توشی نەخۆشی ئسكلروزی لاوەكی ئامیوتروفیك بووە و ناتوانێت دابنیشێت، هەستێت، بڕوات بە ڕێگادا، دەست و قاچەكانی بجوڵێنێت و تەنانەت قسەیش بكات.

—ئەوە تۆی کە قسەی خراپ فێری ئەم منداڵە دەکەیت.

تیژی نیگاکەی دایکم تەنانەت دەیتوانی پەرداخی دەستکداریش ببڕێت.

—وانییە، نازانم لە کوێوە ئەم قسانە فێر بووە.

تۆماسیش ڕێك سەیری نێوچاوانی باوکمی کرد و گوتی:

—توخمە سەگ.

ترینا مۆڕی کرد.

—ئەگەر من بومایە شێت دەبووم، کاتێك ئەو پیاوەم ببینیایە کە بە قوڕگێکی دەستکردەوە قسە دەکات. تۆ بیری لێبکەرەوە!

دواتر بە نازو مەکرەوە گوتی:

—ئادەی— پەرداخێك— ئاوم— پێبدە.

ترینا کەسێکی سەری حاڵ و بەکەیف بوو هەرگیز بۆ هیچ شتێك خۆی نارەحەت و بێتاقەت نەدەکرد. هەندێکجار باوکم لەم حاڵەتەی ترینا بێزار دەبوو. یەکەمین ئەندامی خێزانەکەمان بوو کە چووە زانکۆ، دواتر کاتێك توماس لەدایکبوو، ناچار بوو کە لە کۆتا ساڵدا نەچێتەوە بۆ زانکۆ. باوك و دایکم هێشتا هیواداربون کە ترینا ڕۆژێك لە ڕۆژان خێزانەکە بگەیەنێتە بەختەوەری.

من گوتم:

—بۆچی وابیردەکەنەوە کەسێك لەسەر کورسی تایەدار دادەنیشێت، دەبێت وەك مرۆڤی ئالی قسە بکات؟

—بەڵام تۆر دەبێت زۆر لێی نزیك ببیتەوەو کارە شەخسیەکانی بکەیت. لانیکەم ناچار دەبێت بە دەستماڵ دەمی بسڕیت و نان و ئاوی بکەیت بە دەمەوە.

—خۆ نامەوێت فیل هەڵبفڕێنم.

—کێ، تۆ! کە هەمیشە پۆشاکەکەی تۆماست هەڵاوگەڕاو لەبەر دەکرد.

—تەنها یەکجار بوو.

–دوو جار لەو سێجارەی کە پۆشاکەکەت لەبەر کرد هەڵاوگەڕاو بوو!

سەرقاڵبوم بە خواردنی لۆبیای سەوزەوە. هەوڵم دەدا خۆم بە خۆشبینتر لە هەستی ڕاستەقینەم نیشانبدەم.

بەڵام تەنانەت هەمان ئەو کاتەیش کە سواری پاسەکە بووم و بەرەو ماڵەوە دەگەڕامەوە، ئەم فیکرانە بیرو زەینیان سەرقاڵ کردبووم. قسەمان لەسەر چ شتانێك دەکرد؟ ئەگەر هەموو ڕۆژەکە بە سەری شۆڕبوەوەوە واقی بەمندا وڕ بمێنێت چۆنە؟ ئایا تامڵم دەکرد؟ ئەی ئەگەر لە مەبەستی تێنەگەیشتمایە چی دەبوو؟ هەموان دەیانگوت مرۆڤێك نیم کە بتوانم ئاگاداری شتێك بکەم. لەپاش کارەساتی هەمستەرو ماسیە سورەکە، هەرگیز لەناو ماڵەکەماندا گیانەوەری ماڵی و گوڵ و گیامان ڕانەدەگرت. ئەی ئەگەر سەروفەساڵی دایکی ووشك و جیدی ویل هەرچەند سات جارێك پەیدا ببێت چی؟ نەمدەتوانی بیریشی لێبکەمەوە کە ئەم هەموو ماوەیە لەژێرچاودێری کەسێکدا بم، بەڕواڵەت خاتوو ترینەر لەو ژنانە بوو کە مرۆڤە زیرەك و وریاکانیش لەبەردەستیدا دەحەپەسان.

–پاتریك تۆ چی دەڵێیت؟

پاتریك ئاوێکی باشی خواردەوە و شانەکانی بەرز کردەوە.

لەدەرەوە باران دەیدا لە چوارچێوەی پەنجەرەکە.

تەنها دەنگی تەقەتەقی قاپ و کەوچك و چنگاڵەکان دەهاتنە بەرگوێ.

–برنارد، پارەکەی باشە. هەرچی بێت، باشترە لەکارە شەوانەکەی تۆ لەناو کارگەی لە قوتونانی مریشکدا کار دەکەیت.

چپەچپی پشتیوانی لەهەموولایەکی مێزەکەوە بەرز بویەوە. من گوتم:

–زۆرباشە، باشترین قسەیەك کە سەبارەت بە کارە نوێیەکەم دەیکەن ئەوەیە کە باشترە لە هەڵگرتنی ئێسقانی مریشك بۆ شوێنی بارکردن.

–زۆر باشە، لەمکاتەدا تۆ دەتوانیت کار لەسەر لەشجوانی بکەیت و بڕۆیت بۆ لای پاتریك و وانەی تایبەت بڵێیتەوە.

—لەشجوانی! زۆر سوپاس باوکە.

ویستم دوبارە پەتاتە هەڵگرم، بەڵام پەشیمان بوومەوە، دایکم گوتی:

—باشە دەی بۆ نا؟

حاڵەتی دایکم بە جۆرێکبوو کە هەروەك بڵێی ئەیویست دابنیشێت. بۆ ساتێك هەموان بێدەنگ بوون، بەڵام نەخێر، دایکم دووبارە وەستایەوە و یارمەتی بابە گەورەمی دا کە ساس بکات بەسەر گۆشتەکەیدا.

—مرۆڤ دەبێت لەبیری داهاتودا بێت. خۆ تۆ زۆر باش دەزانی قسە بکەیت.

باوکیشم بە پێکەنینەوە گوتی:

—زۆر باش دەزانێت چەوری زیادەیش بهێنێت.

گوتم:

—کارم بۆ خۆم دۆزیوەتەوە. هەقدەستەکەیشی لە موچەی کارەکەی پێشووم زیاترە. ئەڵبەتە ئەگەر ئێوە وازم لێبهێنن.

پاتریك خۆی فرێدایە ناو قسەکانەوە:

—بەڵام کارێکی کاتی! بابە ڕاستدەکات. کاتێك دەستت بەکارکرد، کار لەسەر لەشجوانیش بکە. دەتوانیت ببیتە ڕاهێنەرێکی تایبەتی زۆر باش. تەنها ئەگەر کەمێك هەوڵ بدەیت.

لەژێر لێوەوە جنێوێکم دا بە پاتریك، کە دەمی تاوەکو بناگوێی کرابویەوە.

ترینا گوتی:

—لوئیزا، بەشوێن کارێکدا دەگەڕێت کە تەنها لەسەر کورسییەك دابنیشێت و قاچ بخاتە سەرقاچ. هەروەك بڵێی بە قامیش خواردن دەدات بە (ئایرونساید)[°]ی پیرو هەموو ڕۆژەکە سەیری تەلەفیزیۆن دەکات.

—بەڵێ، هەروەك بڵێی گوڵە ئەستێرەی ژاکاوی سیس بویان دووبارە خستەوە ناو ئاوو پێویستی بە هەوڵ و کۆششی زەینی و جەستەیی هەیە، ڕاستە ترینا؟

---

[°] کەسایەتیەکە لە زنجیرەی تەلەفیزۆنی ئایرونساید، کە ڕۆڵی پۆلیسێکی سەرسەخت و ڕاستگۆو دروستکار دەبینێت کە لە ڕووداوێکدا ئیفلیج بووە و لەسەر کورسی تایەدار دادەنیشێت.

باوکم پەرداخە سواڵەتە دەسکدارەکەی بەرز کردەوە.

–ئازیزەکەم، گاڵتەت لەگەڵدا دەکەین. زۆر باشبوو کە توانیت ئیشێك بدۆزیتەوە. مایەی سەربەرزیی ئێمەیت. هەرگیز نیگەرانیش نیم کە بۆ ماوەی شەش مانگە. گرەو دەکەم هەرکە قاچت خستە ناو ئەو ماڵەوە، ئەو توخمە سەگانە ئیتر ناهێڵن بەجێیان بهێڵیت.

توماس گوتی:

–توخمە سەگ.

باوکم پێش ئەوەی دایکم قسەیەك بکات گوتی:

–من نەمگوت..!

{٣}

ئەمە خانووە لاوەکییەکەیە. پێشتر بۆ شتێکیتر سودمان لێوەردەگرت. بەڵام دواتر زانیمان ئەم بەشەی خانووەکە زیاتر بەکەڵکی ویل دێت، لەبەر ئەوەی کە تەنها یەك قاتە. ئەمەش ژورێکی زیادەیە کە لەکاتی پێویستدا (نیتن) سودی لێوەردەگرێت. لەو سەرەتایەوە پێویستمان بە کەسێك هەبوو کە زۆرترینی کاتەکان لەم ژورەدا بمێنێتەوە.

خاتوو ترینەر بە چوست و چالاکییەوە لەناو ڕێڕەوەکەدا هەنگاوی هەڵدەگرت. بە دەست ئاماژەی بۆ ژورەکان دەکردو ئیتر سەیری دواوەی نەدەکرد. پێڵاوە پاژنە بەرزەکانی بەسەر سیرامیکەکەدا تەقەتەقیان دەکرد. هەندێکجار چاوەڕوانی ئەوە بوو کە هەموو قسەکانی لەبەر بکەم.

—سویچی سەیارەکە لێرەدایە. بیمەیشم بۆ کردویت. گریمانم لەسەر ئەوە داناوە کە ئەو چەند شتەی کە بەئیمەت گوت بەتەواوەتی ڕاست و دروستبن. لەڕاستیدا متمانەم پێکردویت. لەوانەیە نیتن بتوانێت فێرت بکات کە کار بەو بەشە بکەیت کەلەناو سەیارەکەدا لار دەبێتەوە. دەبێت ئەو بەشەی ئۆتۆمبیلەکە کە لار دەبێتەوە بخەیتەکار تاوەکو ویل سوار ببێت. ئیتر ئەویتری ئۆتۆمبیلەکە ئەنجامیدەدات. هەرچەندە ئەم چەند ڕۆژە حەزناکات بەهیچ شێوەیەك بچێتە دەرەوە.

گوتم:

—هەوای دەرەوە کەمێك ساردە.

خاتوو ترینەر گرنگی بە قسەکەم نەدا.

—دەتوانیت لەناو چێشتخانەکەدا چای و قاوە بۆ خۆت دروستبکەیت. هەموو شتومەکەکانی دەخەمە ناو کابینەکەوە، گەرماویش لێرەدایە.

دەرگاکەی کردەوە، منیش مەسعەدێکی ستیل و پلاستیکێکی سپیم بینی، کە لەسەر تەوالیتەکەوە کۆکرابویەوە. لەژێر دووشەکەوە کەشوەوایەکی شێدار هەبوو، کورسییەکی تایەداری کۆکراوەیش لە تەنیشتیەوە بوو. لەناوەوە قەفەسێکی شوشەیی کۆمەڵی زاوییەیی لە بەستە نایلۆن ڕاکشابوو کە لەوێوە نەمدەتوانی بزانم ئەوانە چین. بۆنی مادەی دژ بۆگەنکردن و بۆنبڕ لە هەموو لایەکەوە دەهات

خاتوو ترینەر دەرگای گەرماوەکەی داخست و بەرەولای من ئاوڕیدایەوە.

—دووبارەی دەکەمەوە کە ویل نابێت بەتەنیا بێت. پەرستارەکەی پێشوو جارێکیان چەند سەعاتێك دیارنەما، چوبو بۆ ئەوەی ئۆتۆمبیلەکەی ببات بۆ لای فیتەر، ویلیش بە دیار نەبوونی ئەو زیانی بە خۆی گەیاندبوو.

تفی خۆی قوتدایەوە، هەروەك بڵێی هێشتایش بە وەبیرهاتنەوەی ئەو یادەوەرییە تێکدەچوو.

—من ناچم بۆ هیچ شوێنێك.

—ئەڵبەتە پێویستت بە پشوودان هەیە. تەنها ئەمەوێت ئەوە ڕوونبکەمەوە کە نابێت لە دە بۆ پازدە خولەك زیاتر بە تەنیا بەجێبهێڵیت. ئەگەر کارێکی واجب و پێوسست هاتە پێشەوە، دەتوانی جەرەسی ئایفۆنەکە لێبدەیت، لەوانەیە (ستیڤن)ی هاوسەرم لەماڵەوە بێت، یان تەلەفۆن بۆ مۆبایلەکەم بکە. ئەگەر پێویستت بە مۆڵەت هەبوو، سوپاست دەکەم کە زوتر هەواڵم پێبدەیت، دۆزینەوەی جێگر هەموو کاتێك کارێکی ئاسان نییە.

—بەڵێ.

خاتوو ترینەر دەرگای ڕەفەی ناو هۆڵەکەی کردەوە. قسەکردنی وەك کەسێك بوو کە بەباشی ڕاهێنانی لەسەر دەقی ووتارەکەی کردووەو ئێستە خەریکە بەلەبەر دەیڵێتەوە.

حەزم دەکرد بزانم پێش من چەند پەرستار لێرەدا کارییان کردووە.

—ئەوکاتانەی کە ویل سەرقاڵ بووە، سوپاست دەکەم ئەگەر بتوانی بەکارەکانی ماڵەوە ڕابگەیت، شۆردنی چەرچەف، گسکی کارەبایی، لەمجۆرە کارانە. کەرەستەکانی شۆردن لەژێر سنگی حاجەتەکاندا هەیە. هەندێکجار ویل حەزدەکات بە تەنیا بێت. بەتێپەڕینی کات دەردەکەوێت کە پەیوەندیتان دەبێت چۆن بێت.

خاتوو ترینەر سەیری جلوبەرگەکەی کردم، بەجۆرێك هەروەك بڵێی یەکەمجارە کە دەمبینێت. پاڵتۆیەکی فەرودارم لەبەر کردبوو، کە باوکم دەیگوت لە نەعامەی ئوسترالیایی دەچێت. هەوڵمدا زەردەخەنە بکەم. بەڵام کارێکی زۆر قورس بوو.

–چاوەڕوانیم لێت هەیە کە بەیەکەوە ڕابێن. حەزدەکەم تۆ وەك هاوڕێی خۆی بزانێت، تاوەکو پەرستارێك کە موچە وەردەگریت. ئاوا باشترە.

–بەدڵنیاییەوە، حەزی لە چ کارانێکە؟

–سەیری فیلم دەکات. هەندێکجاریش گوێ بۆ ڕادیۆ یان موسیقا دەگرێت. جۆرێك لە دیجیتاڵیەکانی هەیە. ئەگەر خۆی نزیك بێت، دەتوانێت دایگیرسێنێت و بیکوژێنێتەوە. پەنجەکانی کەمێك جوڵەیان تێدایە. هەرچەندە ناتوانێت هیچ شتێك بەدەست بگرێت.

زۆر خۆشحاڵ بووم، بەڵام ئەگەر ئەو حەزی لە فیلم و مۆسیقایە، ئایا بەڕاستی دەتوانین لێکتێگەیشتنمان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت؟ کتوپڕ خۆم و ئەم پیاوەم هاتە پێشچاو کە سەرقاڵی سەیرکردنی فیلمی کۆمیدی هۆلیودین و پێدەکەنین، من گسکی کارەبایی دەدەم و ئەویش گوێ بۆ مۆسیقا دەگرێت. لەوانەیە هەروایش دەربچێت. لەوانەیە لە کۆتاییشدا ببینە هاوڕێی یەکتری.

–پرسیارێکت نییە؟

–نەخێر.

سەیری سەعاتەکەی کرد و گوتی:

–وەرە بابڕۆین و بتناسێنم. بەدڵنیاییەوە تاوەکو ئێستە جلوبەرگی لەبەر کردووە. لەپشتی دەرگای ژورەکەوە وەستاین و خاتوو ترینەر تەقەی دا لە دەرگاکە.

–ویل تۆ لەوێی؟ خاتوو کلارکم هێناوە تاوەکو تۆ ببینێت.

هیچ وەڵامێك نەبوو.

–ویل؟ نیتن؟

کەسێك بە شێوەزارێکی توندی نیوزلەندییەوە گوتی:

–خاتوو ترینەر جلوبەرگەکەی لەبەر کردووە.

خاتوو ترینەر دەرگاکەی کردەوە. ژوری نوستنی خانووە لاوەکیەکە زۆر گەورە بوو، دیوارێکی هەبوو کە دەرگاکەی هەموی شوشە بوو بەرەوڕوی کەشوهەوای سەوزی دەرەوە دەکرایەوە. زۆپایەکی دارین لە سوچی ژورەکەدا بوو. ڕێك لەبەرامبەر تەلەفیزیۆنێکی شاشە

تەختدا، قەنەفەیەکی گەورەی ڕەنگ کرێمی دەبینرا. بەرگێکی خوریش لە قەنەفەکە گیرابوو، ژورەکەیان بە سەلیقەیەکی زۆر جوانەوە ڕێکخستبوو. ژورێکی یەك نەفەری بە شێوازی ئیسکەندنافی.

کورسییەکی تایەداری ڕەشم لەناوەڕاستی ژورەکەدا بینی. گۆشەی ئەملاو ئەولاو پشتەوەی چەرمی بوون. جێگە قاچی کورسییە تایەدارەکە ڕێکدەخرا. هەرکە چوینە ناو ژورەکەوە، پیاوێك لەسەر کورسییە تایەدارەکە بە قژێکی کوڵکنی پژاوەوە سەیری دەکردین. چاومان بڕییە یەکتری، لەپاش ساتێك وەستان ناڵەیەکی ترسناك لە دەمییەوە هاتە دەرەوە. دواتر لێوەکانی سوڕان و دەنگێکی ترسناکیان لێوە هاتە دەرەوە. هەستمکرد کە دایکی لە شوێنی خۆیدا وشکبوو.

—ویل، وا مەکە!

پیاوەکە تەنانەت سەیری دایکیشی نەکرد، دووبارە دەنگێکی سەیرو سەمەرە لە جێگەیەکی قەفەسەی سینەیەوە هاتە دەرەوە. دەنگێکی ترسناك و سامناك بوو. هەوڵمدا حاڵەتی ئاسایی خۆم بپارێزم. پیاوەکە بە حاڵەتێکی زۆر شپرزەوە واقی بە مندا وڕمابوو. سەروفەسالێکی گرمۆڵکە و سەری چوبویەوە بەناو شانەکانیدا. زۆر بە نائاسایی دەهاتە پێشچاو، بە جۆرێك لە جۆرەکان توڕە بوو. وەها جانتاکەم بەتوندی گرتبوو کە جومگەی پەنجەکانم سپی بوبونەوە.

—ویل، تکایە وامەکە!

دەنگی دایکی کەمێك توڕە دیار بوو. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە، ئەی هاوار خودایا من دەرەقەتی ئەمە نایەم. بە توندی تفی خۆمم قوتدایەوە. پیاوەکە بەردەوام سەیری منی دەکرد، هەروەك بڵێی چاوەڕوان بوو من هەنگاوی یەکەم هەڵبگرم.

—من (لو)م.

ئیتر بێدەنگ بووم. دەنگم زۆر خراپ دەلەرزی. نەمدەزانی کە دەبێت تەوقەی لەگەڵدا بکەم یان نا؟ دواتر بیرم کەوتەوە کە ناتوانێت تەوقە بکات و دەستم بگرێت، لەبەرامبەردا دەستم بۆ ڕاوەشاند و گوتم:

—(لو) کورتکراوەی (لوئیزا)یە.

دواتر بەوپەڕی سەرسامییەوە بینیم کە حاڵەتی گۆڕدرا. سەری ڕێك بەسەرشانییەوە وەستا.

ویل ترینەر بە هێمنییەوە واقی بەمندا وڕمابوو کەمترین زەردەخەنەی دوونیا کەوتە سەر لێوەکانی. گوتی:

–بەیانیت باش خاتوو کلارك. وادیارە کە پەرستاری نوێی منیت.

نیتن شوێنپێی کورسییە تایەدارەکەی ڕێککردو لەوکاتەی کە خەریکبوو هەڵدەستایەوە سەری ڕوەشاندو گوتی:

–جەنابی ویل تۆ خراپیت، زۆر خراپ.

پیاوە پەرستارەکە زەردەخەنەیەکی کردو دەستە ئەستورو قایمەکەی بەرەولای من درێژکرد، منیش زۆر بە شل و ملییەوە تەوقەم لەگەڵدا کرد، نیتن خۆی بە کەسێکی هێمن و ئارام نیشاندەدا.

–بەداخەوە ئەو ڕۆژەهات کە ویل زۆر بە خراپی کەوتووەتە بارودۆخەکەی کریستی براونەوە[٦]. لەگەڵیدا ڕادێیت، خەمت نەبێت. تەنها کەمێك هات و هاوار دەکات.

خاتوو ترینەر خاچەکەی ملی بە پەنجە باریك و سپییەکانی خۆی گرتبوو، کۆتایی زنجیرە ئاڵتونەکەی گەردنی بەرەو پێش و دواوە دەسوڕاندەوە، حاڵەتێك کە نیشانیدەدا زۆر تورەیە. سەروفەسالی ووشك و زۆر جیدی بوو.

–بە تەنها بەجێتان دەهێڵم بۆ ئەوەی یەکتری بناسن. ئەگەر پێویستت بە یارمەتی هەبوو، بە ئایفۆنەکە ئاگادارم بکەرەوە، نیتن بەرنامەی ڕۆژانەی (ویل)ت پێدەڵێت و کەرەستە و پێداویستیەکانیت نیشاندەدات.

–دایکە، خۆم زیندوم و لێرەم، پێویستناکات لەبری من قسە بکەیت، خۆ هێشتا مێشکم لەکار نەکەوتووە.

–بەڵێ ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر بتەوێت بێتامی بکەیت، باشتر وایە کە خاتوو کلارك نیتن ئاگادار بکاتەوە.

ئاگام لێبوو کاتێك دایکی قسەی دەکرد، سەیری ئەوی نەدەکرد. بەڵکو سەیری زەوی دەکرد، نزیکەی سێ بۆ چوار مەتر دوورتر.

---

[٦] نوسەرو وێنەکێشێکی ئیرلەندییە کە توشی ئیفلیجی مێشك بووە کە تەنیا دەیتوانی قاچی چەپی بجوڵێنێت، بە پەنجەکانی ئەو قاچەی دەینوسی. (١٩٣٢ – ١٩٨١).

—خاتوو کلارك، ئەمڕۆ ناچم بۆ سەرکارو سەرقاڵی ئێش و کارەکانی ماڵەوە دەبم، هەربۆیە کاتی نانی نیوەڕۆ دێم.

—زۆر باشە.

دەنگەکەم لە قیژە دەچوو. خاتوو ترینەر ڕۆیشت. کەس قسەی نەکرد، لە بێدەنگیەکەدا گوێمان بۆ دەنگی پێیەکانی خاتوو ترینەر گرتبوو کاتێك هەنگاوی هەڵدەگرت و بەرەو بەشی سەرەکی خانووەکە دەچوو.

—ویل کێشە نییە من بڕۆم و دەرمانەکان نیشانی خاتوو کلارك بدەم؟ تەلەفیزیۆنەکە داگیرسێنم؟ یان دەتەوێت گوێ لە گۆرانی بگریت؟

—نیتن بێزەحمەت ڕادیۆکە بکەرەوە و بیخەرە سەر کەناڵی چوار.

—باشە هەر ئێستە.

بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشتین.

—خاتوو ترینەر دەڵێت، ئەزمونی کارکردنت لەگەڵ کەسانی ئیفلیجدا نییە، ڕاستە؟

—بەڵێ.

—زۆر باشە. ئەمڕۆکە زۆر قورسی ناکەین لەسەرت. تۆمارێك لێرەدایە هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە دەبێت سەبارەت بە بەرنامەی ڕۆژانەی ویل بیزانی، لەگەڵ ژمارە تەلەفۆنە کتوپڕو پێویستەکان. تکات لێدەکەم ئەگەر کاتت هەبوو بە وردییەوە بیانخوێنەرەوە، ئەڵبەتە پێموابێت بۆ ئەوە کاتت هەبێت.

نیتن کلیلێکی لە کەمەری دەرهێناو کابینەیەکی کردەوە. کە پڕ بوو لە سندوق و قوتوی بچوکی پلاستیکی دەرمان.

—لێپرسراوییەتی ئەمانە لە ئەستۆ منە، بەلام بۆ کاتە پێویست و ناچارییەکان باشتر وایە تۆیش شوێنەکەیان بزانیت. لەوێدا خشتەیەك بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە کە دەڵێت ڕۆژانە دەبێت چ شتانێکی پێبدرێت. هەرکاتێك شتێکی زیادەت پێدا، دەبێت هەر لەوشوێنەدا بینوسی.

بە دەست ئاماژەی کرد بۆ شوێنەکە.

—بەلام باشتر وایە بەلایەنی کەمەوە لەم قۆناغەدا هەموو شتێك لەگەڵ خاتوو ترینەردا ڕوونبکەیتەوە.

—نەمدەزانی بڕیار وایە دەرمانەکانیشی پێبدەم.

—کارێکی قورس نییه. خۆی تاوەکو ئاستێکی باش دەزانێت دەبێت چ شتانێك بخوات. بەڵام پێویستی بە کەمێك یارمەتی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت بیانخوات. ئێمە زیاتر سود لە پەرداخی تایبەت وەردەگرین، کە وەك پلور وایە، بەڵام دەتوانیت حەبەکان بە هاوەن و دەسکەوان ورد بکەیت و بیانکەیتە ناو پەرداخی ئاوەکەوە.

یەکێك لە دەرمانەکانی هەڵگرت. تەنها لەناو دەرمانخانەدا ئەم هەموو دەرمانەم بینیبوو.

—دوو حەپ دەخوات بۆ پەستانی خوێنەکەی. ئەمەیان لەکاتی خەوتندا پەستانی دادەبەزێنێت، ئەمەشیان کاتێك لە خەو هەستا فشارەکەی بەرز دەکاتەوە. ئەمانەیان بۆ ڕەقبونی ماسولکەکانە، کە هەندێکجار پێویستن. حەبێك پێشنیوەڕۆو حەبێکیش پاشنیوەڕۆ. ئەم حەبانە بچوکن و بەئاسانی قوتیان دەدات. ئەمانەیش بۆ گیرانی میزڵدان. ئەمەشیان بۆ گێڕانەوەی ئەسیدی گەدەیە. هەندێکجار کە لەپاش نانخواردن ناڕەحەت دەبێت، دەبێ ئەم حەبە بخوات، ئەمەشیان لەدژی حەساسییەتە کە دەبێت بەیانیان بیخوات. ئەمەشیان سپرای لوتە، بەڵام زیاتر پێش ئەوەی خۆم بڕۆم ڕێکیان دەخەم، کەواتە نیگەران مەبە. ئەگەر ئازاری هەبوو پاراسیتامۆڵی پێدەدەم. حەبی خەویشی هەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەدرێژایی ڕۆژ ڕەفتاری دەگۆڕێت، هەوڵدەدەین کەمتر ئەو حەبەی پێبدەین.

قوتویەکیتری هەڵگرت.

—ئەم ئانتی بیوتیکەش دوو هەفتەجارێك بۆ قەرەبوکردنەوەی حەزوئارەزوو دەیخوات. خۆم پێی دەدەم، مەگەر کاتێك لێرە نەبم. هەربۆیە بەوردی شێوازەکەیت بۆ دەنوسم. ئەمانە زۆر بەهێزن. سندوقی دەستکێشی لاستیکیش هەیە، بۆ هەندێکات کە پێویستبوو پاکی بکەیتەوە. قوتویەك کرێمیش هەیە بۆ ئەو کاتانەیە کە برینێك بە جەستەیەوە دروست ببێت. بەڵام لەوکاتەوەی کە دۆشەکی پزیشکی و تایبەتی بریندار نەبونما بۆ هێناوە بارودۆخی باشترە.

من هەروا وەستابوم، نیتن دەستیکرد بەناو گیرفانیدا و کلیلێکیتری دەرهێناو دایبەدەستمەوە.

—ئەمەش کلیلی یەدەکە. نابێت بە هیچ کەسێکی بدەیت، تەنانەت خودی ویلیش، تێگەیشتی؟ گیانی تۆو گیانی ئەم کلیلە وەك هەردو چاوت پارێزگاری لێبکە.

تفی دەمم قوتدایەوە و گوتم:

—دەبێت زۆر شتم لەبیر بێت.

—هەموو شتەکانم نوسی. ئەمڕۆ دەبێت ئەوەت لەبیر بێت کە دەرمانی دژە سپاسمی پێبدەیت. ژمارەی موبایلەکەیشم بۆ نوسیویت، کاتێك پێویستت هەبوو پەیوەندیم پێوەبکە. کاتێك لێرە نیم سەرقاڵی خوێندنم. هەربۆیە باشتروایە زۆر پەیوەندیم پێوە نەکرێت. بەڵام بێخەمبە تاوەکو ماوەیەکیتر لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕادێیت و زاڵدەبیت بەسەریاندا.

چاوم بڕییە ئیزبارەو لیستەکەی بەرامبەرم، هەستم دەکرد لەسەر ئیمتیحان دانیشتوم و ئامادەییشم تێدا نییە.

—ئەی ئەگەر پێویستی بە توالیت هەبوو چۆن؟

بیری ئەو مەسعەدە تایبەتانەی کەسانی ئیفلیجم کەوتەوە.

—دڵنیانیم بتوانم، خۆ دەزانی چی دەڵێم، واتە بۆ بەرزکردنەوەی.

هەوڵمدەدا ترسەکەم بشارمەوە.

نیتن سەری ڕاوەشاند.

—هەرگیز پێویست بەمکارە ناکات. دایبی هەیە. کاتی نیوەڕۆ خۆم دەیگۆڕم. تۆ بۆ کارە فیزیکیەکان نەهاتویت بۆ ئێرە.

—ئەی کەواتە من بۆ چ کارێك لێرەم؟

نیتن سەیرێکی زەوییەکەی کرد و دواتر سەیری منی کرد.

—تۆ دەبێت ڕۆحییەتی بگۆڕی. کەمێك هات و هاوار دەکات، بە سەرنجدان لە هەلومەرجەکانی مرۆڤ دەتوانێت دەرکی بکات، ناچاری کەمێك پێست قایم بیت. خۆ هەڵسوکەوتی گاڵتەجاڕانەی ئەم بەیانیەت بینی، بەمکارانەی مرۆڤ دەهری و کەللەیی دەکات.

—هەر لەبەر ئەمەیە کە موچەیەکی باش دەدەن؟

نیتن دەستێکی لەشانمدا و گوتی:

—بەڵێ. نەك بەو ئەندازەیەی کە خواردنی خۆڕایی بدەن، نا؟

جەستەم لەم قسەیە دەلەرزی.

—ویل کوڕێکی باشە. پێویستناکات کە هەمیشە کوتەکت لە ئاودا بێت بۆی.

کەمێك وەستا، دواتر گوتی:

—من خۆشم دەوێت.

بەجۆرێك ئەم قسەیەی بەزاری خۆیدا هێنا، هەروەك بڵێی تەنها هەر ئەوە خۆشی دەوێت.

بەدوایدا چوم بۆ ژوری دانیشتنەکە، کورسیە تایەدارەکەی ویل ترینەر ئێستە لە بەردەم پەنجەرەکەدایە، پشتی لە ئێمە بوو سەیری دەرەوەی دەکرد. گوێی بۆ ڕادیۆ گرتبوو.

—ویل، من کارم تەواو بوو، پێش ئەوەی بڕۆم پێویستت بە هیچ شتێك نییە؟

—نەخێر زۆر سوپاس نیتن.

—دەی دەتسپێرم بە خاتوو کلارکی نازەنین. هاوڕێ گیان نیوەڕۆ دەتبینمەوە.

چاوم بڕیبویە پەرستارە مامەڵە جوانەکەی کاتێك خەریکبوو چاکەتەکەی لەبەر دەکرد. سات لەدوای سات ترسم زیاتر و زیاتر دەبوو. نیتن چاوێکی لێداگرتم و گوتی:

—کوڕینەی دەی لای ئێوە خۆش.

دواتر لە ژورەکە چویە دەرەوە.

لەناوەڕاستی ژورەکەدا وەستابوم. دەستم لەناو گیرفانمدا بوو. نەمدەزانی چی بکەم. ویل ترینەر هەروا سەیری دەرەوەی دەکرد. هەروەك بڵێی من مرۆڤ نیم کە لەوێدا وەستاوم.

بێدەنگیەکە زۆر بە ئازار بوو. لە کۆتاییدا دەمم کردەوەو گوتم:

—کوپێك چایتان بۆ بهێنم؟

—ئەمەش کچێك کە لەڕێگەی چای دروستکردنەوە ئەیەوێت موچە وەربگرێت. نازانم چەندێکی پێدەچێت تاوەکو تۆ شارەزاییەکانت نیشاندەدەیت. نەخێر ناخۆم سوپاس.

—ئەی قاوە؟

—خاتوو کلارك ئێستە هەرگیز خواردنەوەی گەرم ناخۆم.

—دەتوانیت بە لو بانگم بکەیت.

—زۆر حەز دەکەیت؟

چاوێکم داگرت و کەمێك دەمم کرایەوە، دواتر دامخستەوە. باوکم هەمیشە دەیگوت ئەمکارەم زۆر زیاتر لەوەی کە هەم، گەمژەتر نیشانم دەدات.

—باشە، حەزت لە شتێکیتر هەیە؟

لامکردەوە بەولایەدا و سەیرم کرد. بە ڕیشەکەیدا دیاربوو چەند هەفتەیەکە نەیتاشیوە. نەدەکرا شتێك لە چاوەکانی بخوێنیتەوە. دووبارە ڕوی وەرگێڕایەوە.

بەڕێکەوتم.

—دەچم بزانم شتێك هەیە بیشۆم.

له ژوره‌كه هاتمه ده‌ره‌وه. دڵم ته‌په ته‌پی ده‌كرد. به‌ره‌و چێشتخانه‌كه چوم و به بێخه‌م مۆبایله‌كه‌م ده‌رهێناو نامه‌یه‌كم نارد بۆ خوشكه‌كه‌م.

(ترسناكه، ڕقی له‌من بووه‌ته‌وه).

چه‌ند ساتێك دواتر وه‌ڵامیدایه‌وه.

(ته‌نها یه‌ك سه‌عاته كه له‌وێیت ئه‌ی مرۆڤی كه‌م تامڵ! باوكم و دایكم خه‌مبارو نیگه‌رانی خه‌رجی ماڵه‌وه‌ن. بلكێ به كاره‌كه‌ته‌وه و بیر له هه‌قده‌سته‌كه‌ی بكه‌ره‌وه. ماچ).

مۆبایله‌كه‌م كوژانده‌وه‌و فومكرده گوپه‌كانم. چوم بۆ جلوبه‌رگه چڵكنه‌كانی ناو گه‌رماوه‌كه. یه‌ك له‌سه‌ر چواری جلشۆره‌كه‌م پڕكرد. چه‌ند خوله‌كێكیشم له خوێندنه‌وه‌ی ڕێنمایی جلشۆره‌كه‌دا سه‌رف كرد. نه‌مده‌ویست فه‌رمانی هه‌ڵه به جلشۆره‌كه بده‌م، یان كارێك بكه‌م ببێته هۆی ئه‌وه‌ی كه ویل یان خاتوو ترینه‌ر دووباره به جۆرێك سه‌یرم بكه‌نه‌وه، هه‌روه‌ك بڵێی كه‌سێكی بێئه‌قڵم. جلشۆره‌كه‌م داگیرساند و هه‌ر له‌وێدا وه‌ستام. هه‌وڵم ده‌دا بزانم ئیتر ده‌بێت چ كارێكیتر ئه‌نجامبده‌م. گسكه كاره‌باییه‌كه‌م له‌ناو كۆمه‌دی ناو هۆڵه‌كه ده‌رهێنا و ڕێڕه‌وو هه‌ردوو ژوری نوستنه‌كه‌م گسكدا. هه‌موو ئه‌و ماوه‌یه‌ش بیرم له‌وه ده‌كرده‌وه كه ئه‌گه‌ر باوك و دایكم منیان ده‌بینی به‌دڵنیاییه‌وه ئه‌یانویست وێنه‌ی یادگاریم له‌گه‌ڵدا بگرن. پێموابوو زۆربه‌ی كاته‌كان نیتن له‌وێدا ئاماده نابێت. له‌به‌ر خۆمه‌وه بیرم ده‌كرده‌وه كه هه‌رگیز نابێت ڕه‌خنه له‌و بگیرێت.

چه‌ند ساتێك به دڵه‌ڕاوكێوه له پشتی ده‌رگای ژوره‌كه‌ی ویل ترینه‌ره‌وه وه‌ستام. دواتر باوه‌ڕم به خۆم هێنا كه ئه‌وێیش هه‌روه‌ك شوێنه‌كانیتر پێویستی به گسكدان هه‌یه. له‌لایه‌كی ژوره‌كه‌وه ڕه‌فه‌یه‌ك به‌دیواره‌كه‌دا هه‌ڵواسرابوو، كه نزیكه‌ی بیست چوارچێوه‌ی وێنه‌ی تێدا بوو.

هه‌روا كه سه‌رقاڵی گسكدان بووم، ڕێگه‌م به خۆمدا و سه‌یرێكی وێنه‌كانم كرد، پیاوێك خه‌ریكبوو له تاشه‌به‌ردێك ده‌چوویه سه‌ره‌وه. ده‌سته‌كانی وه‌ك وێنه‌كه‌ی حه‌زره‌تی مه‌سیح كرابویه‌وه، له وێنه‌یه‌كیتردا پیاوێكم له شوێنێكی وه‌ك دارستاندا بینی، كه گومانم ده‌كرد ویل بێت. دووباره وێنه‌یه‌كیتری ئه‌و كه له‌ناوه‌ڕاستی گروپێك له هاوڕێیانی مه‌ستیدا دانیشتبوو. پیاوه‌كان هه‌موویان گوڵ په‌پوله‌یان له گه‌رندابوو جلوبه‌رگی فه‌رمیان پۆشیبوو. ده‌سته‌كانیشیان خستبویه سه‌رشانی یه‌كتربییه‌وه.

لە وێنەیەکیتردا خەریکی خلیسکێنەی سەر بەفر بوو لە لێژییەکەوە دەهاتە خوارەوە. لە تەنیشتیەوە کچێك هەبوو کە چاویلکەی ڕەشی لەچاودا بوو قژێکی زەردی ئاڵتونی درێژی هەبوو. چوارچێوەی وێنەکەم هەڵگرت بۆ ئەوەی باشتر بیبینم. لەبنەوە ڕیشی تاشیبوو. تەنانەت لەبەر ڕووناکی زۆریشدا دەموچاوی درەوشاوەییەکی تایبەتی پەیدا کردبوو، کە دەبویە هۆی ئەوەی پارەدارەکان ساڵی سێجار بچن بۆ گەشت و گەڕان. نیشانێکی پان و خاوەن ماسولکەی بەهێزی هەبوو، بەجۆرێك کە تەنانەت لەناو جلوبەرگەکانی خلیسکێنەی سەر بەفرەکەیشدا دیاربوو. بە ئەسپاییەوە چوارچێوەی وێنەکەم لەسەر ڕەفەکە و لە شوێنەکەی خۆی دانایەوەو پشتەوەی سێتی نوستنەکەیشم گسکدا. لە کۆتاییدا گسکە کارەباییەکەم کوژاندەوە، هەرکە ویستم وایەرەکەی لە پلاکەکە بکەمەوە و کۆی بکەمەوە، بەلاچاو ئاگاداری جوڵەیەك بوومەوە. لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم و قیژەیەکی زۆر هێمن لە دەمم دەرچوو. دەبینم ویل ترینەر لەناو دەرگاکەدا واقی بەمندا وڕماوە.

—کورشول، دوو ساڵ و نیو لەمەوبەر.

سوربومەوە و گوتم:

—ببورن تەنها دەمویست....

—تەنها دەتویست وێنەکانم ببینی. لەوانەیە لەبەر خۆتەوە بیر بکەیتەوە کە چەرخی زەمانە بسوڕێتەوە و کەسێك کە ژیانێکی بەمجۆرەی هەبووە ئێستە ئیفلیج ببێت.

دەموچاوم زۆر سور بوبویەوە.

—نەخێر.

—هەرکاتێك حەزی ملۆموش و پشکنینت گوڵیکردەوە وێنەکانیترم لەناو چەکمەجەکەی تردان، دەتوانیت سەیریان بکەیت.

دیسانەوە ورە وزێکی بچوك هاتەوە بەرگوێ، کورسییە تایەدارەکە سوڕایەوە و ویل دیار نەما.

بەرەبەیان درێژەی کێشاوو نەیدەویست تێپەڕێت، هەروەك بڵێی ئەیویست ساڵانێکی پێبچێت. هەرگیز لەبیرم نییە کە خولەك و کاتژمێرانێکی ئاوا خاوو ماندوکەرم لە ژیانمدا بینیبێت. زۆرم لە خۆم دەکرد کارێك بدۆزمەوەو خۆمی پێوە سەرقاڵ بکەم. ڕەفەکانم سڕی،

بەکورتی دەستمکردە ئەنجامدانی ئەمجۆرە کارانە. بەپێی توانا هەوڵمدا کەمتر بچم بۆ ژووری دانیشتنەکە. دەمزانی لە ترسانمەوەیە، بەڵام گرنگ نەبوو بۆم.

کاتژمێر دوازدە و نیو نیتن گەیشتە ئەوێ. هەوای ساردی دەرەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. بڕۆکانی بەرزکردەوە و گوتی:

—بارودۆخ باشە؟

بە درێژایی ژیانم زۆر بەکەمی بۆم وەپێشهاتبوو کە تاوەکو ئەم ئاستە بە بینینی کەسێك هێندە خۆشحاڵ بم.

—باشە، خراپ نییە.

—زۆر باشە. ئێستە نیوسەعات کاتی ئازادت هەیە. لەم نیوسەعاتەدا من و بەڕێز ویل ترینەر کۆمەڵێك کارمان هەیە کە دەبێت ئەنجامیان بدەین.

خێرا پاڵتۆکەمم هەڵگرت. پێشتر نەمدەویست بۆ نانی نیوەڕۆ بچمە دەرەوە. بەڵام ئێستە هەناسەیەکی ئیسراحەتم هەڵکێشا کە لەم ماڵە دەچومە دەرەوە. یەخەی پاڵتۆکەم بەرز کردەوە. جانتاکەم کردە شانم و بە پەلە بەناو ڕیزەوی ئۆتۆمبیلەکاندا هەنگاوم هەڵدەگرت. هەروەك بڵێی شوێنێکی مەبەستم هەیەو ئەمەوێت بچم بۆ جێگەیەك. نیوسەعات لە شەقامەکانی ئەو دەوروبەرەدا سوڕامەوە. هەناسە گەرمەکانم دەیاندا لەو ملپێچەی کە بەتوندی بەستبوم بە دەممەوە.

لەم بەشەی شاردا هیچ قاوەخانەیەکی لێنەبوو. قەلاَکەیش چۆڵ بوو. نزیکترین چێشتخانە ڕیستورانێك بوو کە بڕەی گرانی هەبوو، شوێنێك کە گومانم هەبوو پارەکەم بەش بکات بۆ ئەوەی خواردنەوەیەك بکڕم. ئەڵبەتە ئەگەر بهێڵن خۆم بەتەنیا و خێرا نانەکەم بخۆم. لەناو گەراجەکەدا کۆمەڵێك ئۆتۆمبیلی جوان و گرانبەها هەبوون کە تازە ژمارەیان بۆکرابوو.

لەناو گەراجی قەلاَکەدا وەستام. بیرم بەلای ئەوەوە هەبوو کە لەناو گۆڕەپانی گرنتاهاوسدا نەبم. تەلەفۆنم بۆ خوشکەکەم کرد.

—سلاَو...

—خۆ دەزانی کە لەسەر کارەکەم ناتوانم بە تەلەفۆن قسە بکەم. تۆ هێشتا لەوێیت، وایە؟

—نەخێر، تەنها ئەمویست دەنگێکی خۆش و دڵنشین ببیستم.

—واتە ئەوەندە خراپە؟

–تۆ بڵێ خراپترین، ڕقی لە من بووەتەوە. بەجۆرێك سەیرم دەكات هەروەك بڵێی زبڵی ناو كۆڵانم. تەنانەت چایش ناخوات، خۆمی لێ دەشارمەوە.

–باوەڕناكەم ئەم شتانە دەبیستم.

–چۆن یانی؟

–تەنها قسەی لەگەڵدا بكە، بە دەنگی بەرز. ئەڵبەتە جێگەی بەزەییە. دیلی ئەو كورسییە تایەدارە نەفرەتیەیە. وادیارە وردە وردە مانەوەت بێ سود دەبێت. تەنها قسەی لەگەڵدا بكە، بەباشی بیناسە. بەبڕوای تۆ خراپترین شتێك كە لەوانەیە بێتە پێشەوە چییە؟

–نازانم، تەنانەت دڵنیایش نیم كە بتوانم بەردەوامبم.

–بە ئێمە ناڵێن لەپاش تاقێك كە بڕیارتدا كارەكەت واز لێدەهێنی. لو ئەوانە ناتوانن پارە بەتۆ بدەن. ناتوانی واز لەكارەكەت بهێنی. ناتوانین خەرجی ماڵەوە بكێشین، تاوەكو تۆ بتوانی واز لە كارەكەت بهێنی.

ئەو ڕاستی دەكرد. هەستمكرد چەندە ڕقم لە خوشكەكەمە.

بێدەنگییەكی كورت بەرقەرار بوو. دەنگی ترینا بە شێوەیەكی زۆر نائاسایی و دۆستانە بوو، بەڕاستی ئەمەش نیگەرانی دەكردم. دیاربوو خۆیشی دەیزانی كە خراپترین كاری دونیام هەیە، گوتی:

–سەیركە تەنها شەش مانگ زیاتر نییە. بە هەرشێوەیەك هەیە ئەم شەش مانگە تاملێ بكەو بیبەرە سەر، بۆ ئەوەی پێشینەی كارێكی باشت هەبێت و ئەوكارەی كە حەزت لێیەتی بیدۆزیتەوە. هێی بەمشێوەیە سەیری بكە: خۆ هیچ نەبێت كاركردنی شەوانە نییە لە كارخانەی لە قوتونانی گۆشتی مریشك، ئەی وانییە؟

–كاری شەوانە لە كارگەی لە قوتونانی گۆشتی مریشك بەبەراورد بە بەمكارە وەك گەشت و سەفەركردن وایە.

–لو، من دەبێت دایبخەمەوە و بڕۆم، دوایی دەتبینمەوە.

***

–حەزدەكەیت پاشنیوەڕۆ بچیت بۆ شوێنێك؟ ئەگەر بتەوێت دەتوانین بە ئۆتۆمبیل بچینە دەرەوە.

نیو سەعاتێك دەبوو كە نیتن ڕۆیشتبوو. خۆم بە شۆردنی قاپ و دەفرەكانەوە سەرقاڵ كرد، بەجۆرێك كە لەوانەبوو بەتەواوەتی خاوەخاوی تێدا بكەم. لەبەرخۆمەوە بیرم لەوە دەكردەوە ئەگەر سەعاتێك زیاتر لەم ماڵە تاریك و نوتەكەدا بمێنمەوە شێت دەبم.

ئاوڕی دایەوە بەرەو لای من.

—خۆت شوێنێك پێدەزانیت؟

—نازانم، دەتەوێت گەشتێك بەچواردەوری شاردا بكەین؟

خۆم هەندێكجار ئەمكارەم دەكرد، ئەمویست وەك ترینا بم. ترینا لەوجۆرە كەسانەیە كە بێ هات و هاوارن و كەسانێكن كە خاوەنی كەسایەتی خۆیانن. كەسیش ناتوانێت قاچ بخاتە ناو پێڵاویانەوە.

گوتی:

—دەوروبەری شار.

هەروەك بڵێی هەڵسەنگاندنی دەكرد.

—چ شتانێك دەبینی؟ درەخت؟ ئاسمان؟

—نازانم زیاتر چ كارانێك دەكەن؟

دەنگی خۆم بە شێوەیەكی زۆر شاد و پیشەگەرانە دەهاتە بەرگوێم.

—خاتوو كلارك، هیچكارێك ناكەم. ئیتر ناتوانم هیچكارێك بكەم. هەروا دادەنیشم. من تەنها هەناسە دەدەم.

گوتم:

—زۆرباشە، بە منیان گوتوە كە تۆ ئۆتۆمبیلت هەیە كە دەكرێت كورسی تایەدار بخەیتە پشتەكەیەوە.

—نیگەرانی ئەوەی كە ئەگەر ڕۆژانە بەكارنەهێنرێت كارەكەت لەدەستبدەیت؟

—نەخێر، بەڵام....

—خەریكە بە من دەڵێیت كە دەبێت بچمە دەرەوە؟

—تەنیا بیرم كردەوە.

—بیرت كردەوە كە گەشتێكی خنجیلانە بەسە بۆ من؟ هەوای تازە؟

—تەنها هەوڵێكمدا....

–خاتوو کلارك ژیانی من بە گەڕان بەدەوری ستور تفلددا هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نایەت.

دواتر ڕوی خۆی وەرگێڕا.

سەری بەناو شانەکانیدا چویە خوارەوە. حەزم دەکرد بزانم ئایا بەڕاستی ئیسراحەت و بێخەمە. بەڕواڵەت کات و جێگەیەکی گونجاو نەبوو بۆ پرسیارکردن. بێدەنگ و خامۆش دانیشت.

–دەتانەوێت کۆمپیوتەرەکەتان بۆ بهێنم؟

–بۆچی؟ لەوانەیە بیرت لەوە کردبێتەوە کە ببمە ئەندامی ڕێکخراوی پارێزگاری لە ئیفلیجەکان.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا. زۆرم لە خۆم دەکرد بۆ ئەوەی ئاوازی دەنگ و قسەکانم متمانە بەخۆبونیان پێوەدیار بێت.

–ئێ باشە، بیرم کردەوە لەبەر ئەوەی کە دەبێت بەیەکەوە ڕۆژەکانمان بەسەر بەرین، لەوانەیە باشتر بێت کە زیاتر یەکتری بناسین.

شتێك لە دەموچاویدا هەبوو منی خستە گومانەوە. بەردەوام و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چاوی بڕیبویە دیوارەکەی بەرامبەری ز دەمارەکانی شەویلگەی دەرپەڕیبون.

لە قسەکانم بەردەوام بووم:

–بڕیار وایە بۆ ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە بین. یەك ڕۆژی تەواو. لەوانەیە ئەگەر بەمن بڵێیت کە حەزدەکەیت چی بکەین، حەزتان لە چ شتێکە، ئەوکات من دەتوانم دڵنیاببمەوە لەوەی کە ئێوە حەزتان لە چ شتێکە و بەچی ڕازی و دڵخۆش دەبن.

ئەمجارەیان بێدەنگییەکە زۆر ئازاربەخش بوو. هەستمدەکرد دەنگی خۆمم قوتداوەتەوە، بەتەواوەتی شپرزە بوبوم، تریناو ئامۆژگارییەکانیم لەبیر چوبونەوە.

سەرئەنجام کورسییە تایەدارەکە کەوتە جوڵەو بە هێمنییەوە لەبەرامبەرمەوە وەستا.

–خاتوو کلارك کۆمەڵێك زانیارییان سەبارەت بە ئێوە بە من ڕاگەیاندووە، دایکم دەڵێت هاوڕێیەتیت زۆر خۆشە و کەسێکی گفت شیرینی.

بەجۆرێك ئەم قسەیەی کرد هەورەك بڵێی ئەو سیفەتە بەلاًو موسیبەت بێت.

–دەکرێت بەیەکەوە ڕێککەوتنێك بکەین؟ کاتێك لەلای منیت بێدەنگ بیت؟

تفی دەمم قوتدایەوە، هەستمکرد دەموچاوم گڕی گرت.

دواتر کاتێك توانیم بێمەگۆ گوتم:

–زۆرباشە من لەناو چێشتخانەکەدام، ئەگەر کارێکت هەبوو بانگم بکە.

***

–ئێستە ناتوانی واز لەکارەکەت بهێنی.

لەسەر قەرەوێڵەکە لەسەر لا ڕاکشابوم، وەك سەردەمی مێردمنداڵی قاچەکانم ڕاکێشابوو لکاندبونم بە دیوارەکەوە. لەپاش نانی ئێوارە هاتم بۆ ژورەکەم و هەروا لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشام. ئەوکارەی کە ماوەیەکی زۆربوو ئەنجامم نەدابوو. لەپاش لەدایکبونی تۆماس ژورە گەورەکە بویە هی تریناو ئەو ژورەیش کە هێندەی پاکەتە شقارتەیەك بوو بۆ من. ژورەکەم هێندە بچوکبوو کاتێك مرۆڤ لە یەك سەعات زیاتر لەو شوێنەدا دەمایەوە لەو کەشوهەوا داخراوەدا تووشی هەراسانی دەبوو.

لەگەڵ ئەمەشدا حەزم نەدەکرد لە قاتی خوارەوە لەلای دایکم و بابەگەورەم بمێنمەوە، دایکم بە نیگەرانییەوە سەیرم بکات و ئەم قسانە بکات: (ئازیزەکەم باشتر دەبێت)، یان (هیچ کارێك لە یەکەم ڕۆژەوە خۆش نییە). دایکم بەجۆرێك قسەی دەکرد هەروەك بڵێی لەم بیست ساڵەی ڕابوردودا خۆی ئەزمونی ئەو بوارەی هەبووە. لەناخی مندا هەستکردن بە گوناحی دروستدەکرد، لەکاتێکدا کە هیچکارێکم نەکردبوو.

–ئەی هاوار خوایە، ترینا من نەمگوت واز لەکارەکەم دەهێنم. بارودۆخەکە زۆر لەم قسانەش خراپترە. زۆر بەدبەختیە.

–بەڵێ باشە، دەست و قاچەکانی جوڵەیان نییە، هەر دەبێت بەدبەخت و چارەڕەش بێت.

–نەخێر، لەبەر ئەمە ناڵێم. لەبەر ئەوە دەڵێم کە زمانێکی تیژو برینداركەری هەیە، هەموو کارە بێماناکانیشی بە ئەنقەست دەکات، هەرکاتێك قسەیەك دەکەم یان پێشنیارێك دەکەم، سەیرێکی عاقڵانەم دەکات، هەروەك بڵێی من بێئەقڵ و نەفام بم، یان قسەیەك دەکات کە هەست دەکەم تەمەنم دوو ساڵ زیاتر نییە.

–لەوانەیە قسەیەکی بێئەقڵانەت کردووە. تەنها دەبێت بەیەکەوە ڕابێن.

–نە بابە، چ قسەیەکی بێئەقڵانە! ئاگادارم. تەنها گوتم: (حەزدەکەیت بچینە دەرەوە و کەمێك بگەڕێین؟) یان (کوپێك چایت بۆ بهێنم؟).

—لەوانەیە لەو سەرەتایەوە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەمجۆرە هەڵسوکەوت بکات، بۆ ئەوەی دواتر دڵنیاببێتەوە کەبەدەوروبەریدا ناسورێیتەوە. گرەو دەکەم لەوانەیە سەد جۆر مرۆڤ هاتبنە ئەو خانووە و بەجێیان هێشتبێت و ڕۆیشتبن.

—تەنانەت حەزناکات لەناو ژورەکەدا لەلای بم. کاترینا پێموانیە بتوانم تاوەکو کۆتایی لەگەڵیدا بمێنەوە. ڕاستیەکەیت بوێت، هەربەڕاستی ناتوانم. ئەگەر دەهاتیت و خۆت دەتبینی ئەوکات تێدەگەیشتی چی دەڵێم.

ترینا وەڵامێکی نەدایەوە. تەنها چرکەیەك سەیری منی کرد. هەستایەوە و سەیرێکی دەرگاکەی کرد، هەروەك بڵێی ئەیویست لەوە دڵنیاببێتەوە کە کەس لەودیوی دەرگاکەوە نییە. دواتر گوتی:

—بیر لەوە دەکەمەوە و ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ زانکۆ.

چەند ساتێکی خایاند تاوەکو توانیم خۆم لەگەڵ گۆرینی بابەتی قسەکاندا بگونجێنم. گوتم:

—ئۆو خودایەگیان، بەلام....

—بڕیارم وایە کە بۆ کرێی مانگانەکەی قەرز وەر بگرم. خەرج و تێچویش بۆ تۆماس دەدەن، زانکۆیش کەمکردنەوە دەکات، لەبەر ئەوەی.....

شانەکانی بەرز کردەوە، کەمێك شپرزە دیار بوو.

—وادەزانن دەتوانم ببمە خوێندکارێکی نایاب. یەکێك لە خوێندکارانی خوێندنەوە بازرگانییەکان کەوتووە، هەربۆیە دەتوانم بۆ نیوەی کۆتایی ساڵ بڕۆم.

—ئەی تۆماس چی لێدێت؟

—لەناو زانکۆدا باخچەی ساوایانی تێدایە. بەدرێژایی هەفتەکە دەتوانین لەناو ئەو شوقەیەی کە یارمەتی دارایی دەدرێت بمێنینەوە. کۆتایی هەموو هەفتەیەکیش دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.

—ئۆو..!

هەستم بە قورسی نیگاکانی دەکرد لەسەر خۆم. نەمدەزانی چی لە دەموچاوی گرگرتوو داگیرساوم بکەم.

—زۆر خراپ پێویستم بەوە هەیە کە دووبارە مێشکم بخەمەوە کار. گوڵفرۆشی تەنها دەستەکانم بەکرێ دەگرێت. حەزدەکەم بخوێنم، حەزدەکەم خۆم بەرەو سەرەوە ببەم. ڕیشکم دەرهات هێندە بە ئاوم کارم کرد و دەست و قاچەکانم تەزین.

هەردوکمان واقمان بە دەستەکانیدا وڕمابوو، کە لەناو هەوای زۆر گەرمی ماڵەوەماندا پەمەیی بوبونەوە.

—بەڵام....

—لو، من ئیتر کار ناکەم. ئیتر ناتوانم یارمەتیدەری خەرجی ماڵەوە بم، من تەنانەت.... پێویستم بە یارمەتی ئەوانیش هەیە.

زۆر بێتاقەت دەهاتە پێشچاو کاتێك ئەم قسەیە دەکات. کاتێك سەری بەرزکردەوەو سەیری منی کرد، سەروفەساڵی داوای لێیبوردنی لێدەخوێنرایەوە.

دەنگی پێکەنینی دایکم لە قاتی خوارەوە دەبیسترا، سەرقاڵی سەیرکردنی تەلەفیزۆن بوو. دەنگیم دەبیست کاتێك ڕونکردنەوەی بۆ بابەگەورەم دەدا. زیاتر باسی فیلمی بۆ دەکرد. لەگەڵ ئەوەدا کە هەمیشە پێماندەگوت نابێت ئەمکارە بکات.

نەمدەزانی چی بڵێم. هێدی هێدی بە شێوەیەکی ناچار پەیم بە قوڵایی قسەکانی خوشکەکەم بردبوو. هەستی قوربانیانی مافیاکانم هەبوو، زۆر خراپ هەستم دەکرد دەست و قاچەکانم بەستراونەتەوە.

—لو، چارەیەکیترم نییە. حەزدەکەم تۆماس لە بارودۆخێکی باشتردا بژی، واتە هەردوکمان دەبێت لە هەلومەرجێکی باشتردا بژین. تەنها ڕێگەیەك کە دەتوانم خۆمی پێبەرز بکەمەوە چونەوەیە بۆ زانکۆ. من کەسێکی وەك پاتریکم نییە، باوەڕیش ناکەم کەسێکی لەوشێوەیە بدۆزمەوە. لەوکاتەوە تۆماس لەدایکبووە، کەس نەهاتووە بەلامدا. هەربۆیە خۆم دەبێت ئەوپەڕی هەوڵ و کۆشش بکەم.

منیش بە سەر ڕاوەشاندن بەڵێم بۆ کرد.

—لو، تکایە لێم تێبگە.

تاوەکو ئەو ڕۆژە خوشکەکەمم بەوشێوەیە نەبینیبو. سەرم بەرزکردەوە و بەزۆر زەردەخەنەیەکم کرد. کاتێك دەستمکرد بە قسەکردن دەنگم بەهیچ شێوەیەك لەهی خۆمی نەدەکرد.

–ئێ باشە، هەروا کە خۆت گوتت، بەڵام دەبێت لەگەڵیدا ڕابێم. ئەو چەند ڕۆژەی سەرەتا کەمێك قورسە، ئەی وانییە؟

{٤}

دوو هەفتە تێپەڕی و کارم لەوماڵەدا کەوتە سەر ڕێڕەوی تەختی خۆی. هەموو ڕۆژێك بەیانیان کاتژمێر هەشت دەچوم بۆ گرنتاهاوس و بە سڵاوێکی بەرز ئامادەبونی خۆمم ڕادەگەیاند. نیتن لەپاش گۆڕینی جلوبەرگەکانی ویل دەهات و سەبارەت بە دەرمانەکان و لەوەش گرنگتر سەبارەت بە ڕۆحییەتی ئەو ڕۆژەی ویل ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێویستی منی دەکرد، منیش زۆر بەوردییەوە گوێم بۆ دەگرت.

لەپاش ڕۆیشتنی نیتن، ڕادیۆ یان تەلەفیزۆنم بۆ ویل دادەگیرساند، دەرمانەکانیم ئامادە دەکرد، هەندێکجار حەبەکانیم لەناو هاوەن و دەستکەواندا بۆ دەهاڕی. لەپاش نزیکەی دە خولەك پێی دەگوتم کە تاقەتی منی نییە. منیش دەچوم و خۆم بە ئیش و کاری ماڵەکەوە سەرقاڵ دەکرد. دەستماڵەکانی دەفرسڕینەکان کە پاکبون دەمشۆردن، یەکێك لە کەرەستەکانی گسکە کارەباییەکەم هەڵدەبژارد و سوچ و کاشیەکانی بەردەم پەنجەرەکان کە پاکیش بوون دووبارە پاکمدەکردنەوە. بەپێی فەرمانی خاتوو ترینەر هەر پازدە خولەك جارێك سەرێکم لە ژورەکەی ویل دەدا. هەمووجارێك دەمبینی کە لەناو کورسییە تایەدارەکەدا دانیشتووەو سەیری حەوشەی بێ ڕۆح و خەمگینی ماڵەکە دەکات.

دواتر ئاو یان یەکێك لەو خواردنەوە پڕ لە کالۆریانەم پێدەدا کە وەك لەزگەی دیوار وابوو ئەیانویست ڕێگر بێت لە دابەزینی زیاتری کێشی جەستەی، لەپاشان خواردنیشم پێدەدا. لە مەچەکییەوە کەمێك جوڵەی هەبوو، بەڵام شانەکانی نەدەجوڵاند. هەربۆیە دەبوایە بە کەوچك و وردە وردە خواردنم بکردایە بە دەمییەوە. خراپترین کاتم ئەمە بوو کە کەوچکی چێشت بخەیتە ناودەمی پیاوێکی گەورەوە، هەر لە خۆیەوە بەشتێکی سەیرو سەمەرە دەهاتە پێشچاو. ئەو شڵەژانەی کە لە خۆمدا هەستمپێدەکرد، دەبویە هۆی ئەوەی بە شپرزە بنوێنم. ویل ئەوەندە

ڕقی لەمکارە بوو، کاتێك کەوچکی خواردنەکەم دەخستە ناو دەمییەوە، هەوڵیدەدا بەهیچ شێوەیەك چاوی بە نێوچاوانم نەکەوێت و نەمبینێت.

کاتژمێرێك پێشتر، نیتن دەهاتەوە و منیش خێرا پاڵتۆکەمم لەبەر دەکرد و دواتر دەڕۆیشتم بۆ ئەوەی کە لە شەقامەکەدا پیاسەیەك بکەم و لەناو وێستگەی سەرداپۆشراوی پاسەکانی نزیکی قەڵاکە نانی نیوەڕۆ بخۆم. لەوانەیە کاتێك لەوێدا دادەنیشتم و قەپم لە ساندەویچ دەگرت، زۆر جێگەی بەزەیی و بەدبەخت دەهاتمە پێشچاو. بەڵام گرنگ نەبوو بەلامەوە. چونکە نەمدەتوانی هەموو ڕۆژەکە لەوماڵەدا بەسەر بەرم.

پاشنیوەڕوان سەیری فیلمم دەکرد. ویل ئەندامی یانەی فیلم بوو، هەموو ڕۆژێکیش فیلمە نوێیەکان لەڕێگەی پۆستەوە دەگەیشتن. بەڵام هەرگیز بانگی نەدەکردم بۆ ئەوەی لەلای دابنیشم و سەیری فیلم بکەم. هەربۆیە زۆربەی کات دەچووم بۆ چێشتخانە یان ژووری میوانەکە. لەپاش ماوەیەك کتێب و گۆڤارم لەگەڵ خۆمدا دەهێنا، بەڵام هەستم بە تاوان دەکرد کە هیچکارێك ناکەم. تەرکیزی پێویستم لەسەر ڕستەکانم نەبوو. هەندێکجار خاتوو ترینەر سەرێکی دەدا، هەرچەندە زۆر قسەی نەدەکرد و تەنها دەیگوت (بارودۆخ باشە؟) وەڵامی جێگەی پەسەندیش (بەڵێ) بوو.

پرسیاری لە ویل دەکرد پێویستی بە شتێك هەیە یان نا، هەندێکجار پێشنیاری بۆ ڕۆژی دواتر هەبوو کە پێیوابوو ویل حەزی لێدەکات، بۆ نمونە چونە دەرەوە یان بینینی هاوڕێیەك کە هەواڵی پرسیوە. زۆربەی جاریش ویل گوێی بە پێشنیارەکەی دایکی نەدەدا، ئەڵبەتە نەك بەشێوەیەکی ڕوقایمانە. خاتوو ترینەر زنجیرە ئاڵتونەکەی ملی بە دەست بەرەو پێش و دواوە دەجوڵاند و بێتاقەت دەهاتە بەرچاو. دواتر دەڕۆیشت و ئەو ناوەی بەجێدەهێشت.

باوکی پیاوێکی قەڵەو بوو بە کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ دەهاتە پێشچاو. زۆربەی جار لەوکاتانەدا دەهاتەوە کە من ئامادەی ڕۆیشتن بووم. لەوجۆرە پیاوانە بوو کە کلاوی حەسیرییان لەسەر کردوە و یاری کراکت دەکەن. لەوکاتەوەی کە لەشاردا کاری دەکرد و موچەیەکی باڵای هەبوو، لە کارەکەی خانەنشین کرابوو، بەڕێوەبەرایەتی قەڵاکەی لە ئەستۆ گرتبوو. وابزانم ئەمکارەی تەنها لەبەر ئەوە دەکرد کە لە بەتاڵی خانەنشینی و نەبوونی عەریزە ڕزگاری ببێت. هەموو ڕۆژێك سەعات ٥ پاشنیوەڕۆ دەگەڕایەوە، دواتر دادەنیشت و لەگەڵ ویلدا

سەیری تەلەفیزیۆنیان دەکرد. هەندێکجاریش لەکاتی ڕۆشتندا دەنگیم دەبیست کە بیرو بۆچونی خۆی سەبارەت بە هەواڵەکانی ڕۆژ دەردەبڕێت.

دوو هەفتەی یەکەم هەموو کاتێك چاودێری ویل ترینەرم دەکرد. دەمبینی ئەیەوێت بەتەواوەتی جیاواز بێت لەسەردەمی پێش ڕووداوی هاتوچۆکە، قژە قاوەییەکانی دانابوو بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ناجۆر بەرز ببنەوە، ڕیش هەموو دەموچاوی گرتبویەوە. دەوری چاوە خۆڵەمێشییەکانی لەبەر ماندویەتی چرچ و لۆچ بوبون، لەوانەیشە بەهۆی ئێش و ئازارو ڕەنجی هەمیشەییەوە بوو، (نیتن دەیگوت زۆربەی کاتەکان ئێشی هەیە). چاوەکانی حاڵەتێکی ساردو سڕی کەسێکیان هەبوو کە لەدونیای دەوروبەری دواکەوتووە. هەندێکجار لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە لەوانەیە ئەمە میکانیزمی بەرگری بێت. یان لەوانەیە تاکە ڕێگە بۆ ڕاهاتن لەگەڵ هەلومەرجەکاندا ئەوە بوو کە واینیشانبدات گۆڕدراوە بۆ کەسێکیتر و ئیتر خۆی نییە. هەروەك بڵێی ئەم ڕووداوە بۆ کەسێکیتری بێجگە لە ویل ترینەری ئیفلیج ڕوویداوە.

بەڕاستی دڵم بۆی دەسوتاو بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. بەتایبەت کاتێك دەمبینی کە ماتی کردووە و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات، بە خەمبارترین کەسێك دەهاتە بەرچاوم کە لە ژیانمدا بینیبوم. بە تێپەڕینی کات زانیم کە هەلومەرجەکان تەنها پەیوەندییان بە دیلی و ئەسیرییەوە نییە لەسەر ئەو کورسییە تایەدارە. نەك لەبەر ئەوەی کە ئازادی جەستەیی لەدەستدابوو. بەڵکو پەیوەست بوو بە کۆمەڵێکی زۆرو زەوەندی کێشەی جەستەیی و ڕۆحییەوە کە دەتوانن پاشهاتێکی نالەبارو خراپیان بەدواوە بێت. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە ئەگەر من لە جێگەی ئەودا بومایە، ئەوا لەوانەبوو بەهەمان ئەندازە هەست بە داماوی بکەم.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، هەڵسوکەوتی لەگەڵ مندا زۆر بریندار کەر بوو. هەرچیم دەگوت وەڵامێکی توندو تیژی دەدامەوە. کاتێك دەمپرسی ئایا سەرمای نییە، هەڵدەشاخا بەڕومدا و دەیگوت ئەگەر سەرمای بێت خۆی دەتوانێت داوای بەتانیەکیتر بکات. ئەگەر پرسیارم لێبکردایە ئایا دەنگی گسکە کارەباییەکە ئازاری دەدات–چونکە نەمدەویست موزاحیمی سەیرکردنی فیلمەکانی ببم– وەڵامی دەدامەوە و دەیگوت بۆچی بۆ بیانویەك دەگەڕێیت کە گسکە کارەباییەکە بکوژێنیتەوە. کاتێك کەوچکی چێشتم دەخستە دەمییەوە، هەمیشە بۆڵەی دەهات کە خواردنەکە ساردە یان گەرمە، یاخود پێش ئەوەی کەوچکی پێشو قوتبدات

کەوچکێکیترم خستوەتە ناو دەمییەوە. هێزێکی سەیری هەبوو، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە دەمگوت یاخود ئەنجامم دەدا بەجۆرێك مامەڵەی دەکرد، کە لەناخی مندا هەستی بێئەقڵی بەدی بێت.

لەماوەی دوو هەفتەی سەرەتادا، بەباشی توانیم خۆم بەجۆرێك نیشانبدەم کە گوێ بەهیچ شتێك نادەم، ڕامدەکرد و دەچوم بۆ ژوری میوانەکە. هەتاوەکو دەمتوانی کەمتر قسەم لەگەڵدا دەکرد، وردە وردە ڕقم لێی دەبویەوە، دڵنیابوم کە خۆیشی زانیبوی.

هەرگیز بیرم لەوە نەکردبویەوە کە تاوەکو ئەو ڕادەیە دڵم بۆ کارە پێشووەکەم تەنگ ببێت. دڵم بۆ فرانك تەنگ بوبو، نیگا ڕەزامەندانەکانی کاتێك بەیانیان منی دەبینی کە دەگەیشتمە قاوەخانەکە. دڵم بۆ موشتەرییەکان تەنگ بوبو، بێتاقەتی قسەکردن و چەلەحانێ بووم لەگەڵیاندا، کە وەك دەریایەکی ئارام لەدەوروبەرمدا لە جۆش و خرۆشدا بوون. ئەم ماڵە بەو هەموو جوانی و گەورەیی و پڕشکۆییەوە، هەروەك گۆڕستان، بێدەنگ و ساردو سڕ بوو. کاتێك تامڵی ئەوەم نەدەما کە لەو ماڵەدا بمێنمەوە، لەژێر لێوەوە بۆڵەم دەهات و دەمگوت شەش مانگ تەنها شەش مانگە و ئیتر ڕزگارم دەبێت.

تاوەکو ئەوەبوو ڕۆژی پێنجشەممە کاتێك سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردنەوەی پڕ لە کالۆری پێشنیوەڕۆی ویلم بووم، دەنگی خاتوو ترینەرم لەناو هۆڵەکەدا بیست. ئەڵبەتە ئەوە رویدابوو کە هەندێکجار دەنگی ببیستم. چاوەڕێ بووم، کەوچکە بەدەستمەوە بوو. دەنگێکی ژنانەی تریش هاتەبەرگوێ، دەنگی ژنێکی گەنج کە دەنگێکی زۆر ناسك و خۆشی هەبوو. دەنگێکی پیاوانەیش دەهات.

خاتوو ترینەر لەناو دەرگای چێشتخانەکەدا دەرکەوت. خۆم بە سەرقاڵ نیشانداو بەخێراییەوە پێکهاتەکانی ناو پەرداخەکەم تێکەڵ دەکرد. خاتوو ترینەر سەیرێکی پەرداخەکەی کرد و گوتی:

—ئاوو شیرت بە لەسەدا شەست و لەسەدا چل دروستکردووە؟

—بەڵێ، بە تامی شلیك.

—هاورێکانی ویل هاتون بۆلای. چەندە باش دەبوو ئەگەر تۆ....

—بەڵێ، کاری زۆرم هەیە کە دەبێت ئەنجامیان بدەم.

بێخەم بوبوم کە یەك دوو سەعاتێك سەری قاڵ بووە و هەقی بەسەر منەوە نییە. سەری پەرداخەکەم نایەوە.

—میوانەکان چای یان قاوە دەخۆنەوە؟

حاڵەتی بەجۆرێکبوو هەروەك بڵێی حەپەساوە.

—بەڵێ، بێزەحمەت، پێموابێت قاوە...

لە هەمیشە تورەتر دەهاتە پێشچاو، سەیری ڕێڕەوەکەی دەکرد، ئەو شوێنەی کە دەنگی قسەکردن دەهات. دەمزانی زۆر بەکەمی کەسێك دێت بۆ سەردانی ویل.

—وابزانم....

سەیری ڕێڕەوەکەی دەکرد.

—وابزانم هەر ئەمە بەس بێت.

دیاربوو کە بیرو زەینی لە شوێنێکیتر بوو. لەپاشان کتوپڕ بەرەو لای من ئاوڕیدایەوە و گوتی:

—روپرتی هاوڕێی کۆنییەتی، کە بەیەکەوە کارییان دەکرد.

هەستم دەکرد بابەتێکی گرنگ لە ئارادایەو ئەیەوێت قسە لەگەڵ کەسێکدا بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەیش من بم.

—لەگەڵ ئالیسیا کە زۆر یەکترییان خۆشدەویست... خاتوو کلارك قاوە زۆر باشە، سوپاست دەکەم....

***

پێش ئەوەی دەرگاکە بکەمەوە، کەمێك وەستام. ڕانم نا بەدەرگاکەوە، بۆ ئەوەی بتوانم هاوسەنگی خۆم لەگەڵ ئەو سینیە قاوەیەدا کە بەدەستمەوە بوو ڕابگرم.

دواتر هەرکە چوومە ژوورەوە، گوتم:

—خاتوو ترینەر گوتیان قاوەتان بۆ بهێنم.

سینیەکەم لەسەر مێزەکە دانا. پەرداخەکەی ویلم لەسەر جێگەی تایبەتی پەرداخی کورسییە تایەدارەکەی دانا، قەسەبەکەیشم بەجۆرێك دانا کە بە سوڕانەوەی سەری بتوانێت پێکهاتەکانی ناو پەرداخەکە بخواتەوە. لەژێرچاوەوە سەیرێکی میوانەکانم کرد.

سەرەتا ژنەکە سەرنجی ڕاکێشام. قاچێکی درێژی هەبوو زۆر بالآ بەرز بوو، بە پێستێکی ڕەنگ قاوەییەوە. لەوجۆرە ژنانە بوو کە هەمیشە کاتێك دەمبینین لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە ئایا بەڕاستی مرۆڤەکان هەمویان یەك شێوەن. وەك ئەسپی پێشبڕکێ بەلأم لەجۆرە مرۆڤەکەی. هەندێکجار ئەم ژنانەم کاتێك دەبینی کە دەستی منداڵە شیك پۆشەکانیان گرتبوو بە تەپۆڵکەی قەلأکەدا دەچونە سەرەوە. ئەم ژنانە کاتێك دەهاتنە ناو قاوەخانەکەوە، بە دەنگێکی زۆر ڕوون و بەبێ ئەوەی کە ئاگایان لە خۆیان بێت دەیانگوت: (هری ئازیزەکەم قاوە دەخۆیتەوە؟ بپرسم قاوەی ماکیاتویان هەیە یان نا؟) زۆر بەکەمی ژنێکم دەبینی کە حەزی لە قاوەی ماکیاتو بێت. بۆنی پارە، بۆنی متمانە، بۆنی ژیانێك کە لە ناو گۆڤارە لوکسەکاندا دەبینرا، لە هەموو بون و وجودی ئەو ژنەوە دەهاتە لوتی مرۆڤەوە.

دواتر بە شێوەیەکی وردتر سەیرم کرد، دوو شتم زانی، یەکەمیان ئەوەی کە بیرم کەوتەوە، ناوبراوم لەتەنیشت ویلەوە لەو وێنەیەی کە لەحاڵی خلیسکێنەی سەر بەفردا بوون بینیوە. دووەمیش ئەوەی کە زۆر بێزارو بێتاقەت دەهاتە پێشچاو.

کوڵمی ویلی ماچکرد. هەنگاوێك هاتە پێشەوە و بەشێوەیەکی ناشیانە زەردەخەنەیەکی کرد. چاکەتێکی پێستەی بێ قۆڵی قاوەیی لەبەر کردبوو، شتێك کە ئەگەر من لەبەرم بکردایە وەك دێوم لێدەهات. شاڵێکی خۆڵەمێشی ڕۆشنی کشمیریشی دابوو بەسەر شان و ملیدا، کە بەردەوام دەستی پێیەوە بوو، هەروەك بڵێی نەیدەزانی لاییبات یان نا.

ژنەکە بە ویلی گوت:

—باش دێیتە بەرچاو. هەر بەڕاستمە. قژەکانت بەرز کردوەتەوە. ویل هیچی نەگوت. تەنها سەیری ئەوی دەکرد. وەك هەمیشە نەدەکرا بە سەروسیمایدا شتێك بزانیت. ئەوە هاتە بیرو زەینمەوە ئەوە تەنها من نیم کە بەوجۆرە سەیرم دەکات.

پیاوەکە کێشای بە پشتی کورسییە تایەدارەکەی ویلدا، بەجۆرێك سەری وەك نیشانەی پشتیوانی ڕادەوەشاند، هەروەك بڵێی خەریکە باسی ئۆتۆمبیلێکی پێشبڕکێی دەرەجە یەك دەکات.

—ئۆو، کورسی تایەداری نوێ. چەندە جوانە! تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتوی هەیە!

نەمدەزانی چی بکەم. چەند سانێك لەوێدا وەستام و لەم پێیەمەوە خۆم دەخست بەسەر پێیەکەی تردا، دواتر دەنگی ویل بێدەنگییەکەی شکاند.

—لو، ئەگەر گرفتێك نییە دار بخەرە ناو زۆپاكەوە. وابزانم داری پێویستە.
یەكەمینجار بوو كە كورتكراوەی ناوەكەمی بەسەرزاردا بێت، منیش گوتم:
—بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.
سەرقاڵ بووم. ناو سەبەتەی دارەكان گەڕام بۆ ئەوەی داری گونجاو بدۆزمەوەو بیخەمە ناو زۆپاكەوە. ژنەكە گوتی:
—دەرەوە زۆر ساردە، لەم كەشوهەوایەدا ئاگر چێژو خۆشی تایبەت بە خۆی هەیە.
دەرگای شومینەكەم كردەوە. بە یارمەتی مەقاشەكە سكڵی ناو زۆپاكەم ئەمدیوو ئەودیوكرد.
—هەوای ئێرە چەند پلەیەك لە هەوای لەندەن ساردترە.
پیاوەكەیش پشتڕاستی كردەوە.
—بەڵێ، هەروایە.
—بیر لەوە دەكەمەوە كە شومینە بۆ ماڵەوە بكڕم. وادیارە زۆر لە زۆپای تر باشترە.
ئالیسیا چەمایەوە و بە وردی سەیری زۆپای دارەكەی كرد. بەجۆرێك سەیری دەكرد هەردەتگوت تاوەكو ئێستە شومینەی نەبینیوە. پیاوەكە گوتی:
—بەڵێ، منیش بیستم.
—دەبێت بەباشی سەیری ناوەكەی بكەم. یەكێك لەوكارانەیە كە دەتەوێت ئەنجامیانبدەیت و دواتر...
چركەیەك بێدەنگبوو لەپاشان گوتی:
—چ قاوەیەكی خۆشە!
—ئێ، ویل ئێستە چی دەكەیت؟
—هیچكارێكی تایبەت ناكەم، سەیرە، نا؟
—عیلاج تەبیعی و ئەمجۆرە شتانە دەكەیت، هیچ كاریگەرییەكەی هەبووە؟
ویل گوتی:
—ڕوپرت باوەڕناكەم بەمزوانە بچمەوە بۆ یاری خلیسكێنەی سەر بەفر.
لە ئاوازی دەنگەكەیدا كینایەو ناڕاستەوخۆی تێدا بوو.

لەبەر خۆمەوە زەردەخەیەکم کرد. هەمان ئەو ویلە بوو کە من دەمناسی. خوڵەمێشەکەم لەناو ئاگردانەکەدا کۆکردەوە. هەستمدەکرد هەموویان سەیرم دەکەن. بێدەنگییەکی قورس باڵیکێشابوو بەسەر شوێنەکەدا. لەبەر خۆمەوە گوتم لەوانەیە مارکەی بلوزەکەم دەرکەوتبێت و سەرنجی ڕاکێشابن.

لە کۆتاییدا ویل بێدەنگییەکەی شکاند.

—ئەم شانازیەم قەرزداری چیم؟ بووەتە هەشت مانگ.

—ئۆو، بەڵێ ئەوە دەزانم. زۆر سەرم قاڵبوو. کارێکی نوێم لە چێڵسی دۆزیەوە. بەڕێوەبەرایەتی بوتیکی ساشا گولدستاین،. ساشات لەبیرە؟ کۆتایی هەفتەکانیش لەسەرکار بووم. شەممان زۆر قەرەباڵغ دەبوو. کاتێکی بێکارم بۆ نەدەمایەوە.

دەنگی ئالیسیا زبر و ووشك بوبو.

—یەك دووجار تەلەفۆنم کرد، دایکت پێی گوتیت؟

—ویل، بارودۆخی لوینز خراپە، خۆت دەزانی چۆن. شەریکێکی نوێمان پەیدا کردووە. کابرا خەڵکی نیۆیۆرکە و ناوی (دن بینز)ە. هیچکاتێك بینیبوت؟

—نەخێر.

—کابرای نەگبەت لە ڕۆژێکدا بیست و چوارسەعات کار دەکات، ئەیەوێت هەموانیش وەك خۆی کار بکەن.

زۆر ڕوون و ئاشکرابوو کاتێك کابرا بینی بابەتێکی بۆ قسەکردن دەستکەوتووەو بەدڵییەتی. هەناسەیەکی ئیسراحەتی هەڵکێشا.

—تۆ هەڵسوکەوت و تەبیعەتی کۆنی نیۆیۆرکیەکان دەناسیت. کەمێك کات بۆ نانخواردن، کەس بۆی نییە نوکتەی قۆڕ بگێڕێتەوە. ویل، دەبێت بڵێم جەوو کەشوهەوای ئەوێ بەتەواوەتی گۆڕدراوە.

—بەڕاست؟

—بەڵێ، کاتێك نەخۆشیشە هەردێتەوە بۆ سەرکار. هەندێکجاریش هەستدەکەم کە بوێری ئەوەم نییە لە سەر مێزەکەم هەستمەوە.

کەشوهەوای ژورەکە بەیەکجاری گۆڕدرابوو. دەنگی کۆکە هات.

هەستامەوە، دەستم بە قانتۆڵەکەمدا سڕی. ئاوڕمدایەوە بەلای ویلدا و بە چپەوە گوتم:

—من... من دەچم کەمێك دار بهێنم.

سەبەتەی تایبەتی دارەکانم هەڵگرت و ڕامکرد. هەوای دەرەوە زۆر سارد بوو. بەڵام من زورم پێچوو. دارەکانم ئەمدیوو ئەودیو دەکرد بۆ ئەوەی هەڵیانبژێرم، ئەمویست کات بکوژم. لەبەر خۆمەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕەقبونەوە لەم سەرمایەدا زۆر باشترە لە گەڕانەوە بۆ ناو ئەو ژورە. بەڵام هەواکەی زۆر سارد بوو، پەنجەی دۆشاومژەم پێش هەموو پەنجەکانیترم شین و مۆر بویەوە و لەکۆتاییدا قبوڵم کرد کە شکستم هێنا لەوەی کە لەدەرەوە بمێنمەوە. هەرکە نزیکی ژوری میوان و دانیشتنەکە بوومەوە، دەنگی ژنەکەم بیست. دەرگای ژورەکە کەمێك کرابویەوە. هەر بۆیە دەنگ دەهاتە دەرەوە. ژنەکە دەیگوت:

—ویل، هۆکارێکیتریش هەیە بۆ هاتنمان بۆ ئێرە. دەنگوباسانێك هەیە. لەودیوی دەرگاکەوە وەستام. سەبەتەی دارەکانم بەتوندی گرتبوو بە دەستمەوە.

—بیرم کردەوە... واتە بیرمان کردەوە کە تۆ پێویستە دەنگوباسەکان بزانیت... بەڵام بە هەرحاڵ دەبێت بڵێین من و ڕوپرت ئەمانەوێت هاوسەرگیری بکەین.

هەر لەوێدا بەبێدەنگییەوە وەستام. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەتوانم بەبێدەنگی بگەڕێمەوە بەبێ ئەوەی هیچکەسێك پێمبزانێت.

ژنەکە بە ئاوازێکی گوماناوییەوە لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—دەزانم لەوانەیە کەمێك توشی شۆك بوبێت. لەڕاستیدا خۆیشم توشی شۆك بووم. ئێمە ماوەیەکی زۆرە کە پێشتر و لەپاش...

دەستم ئازاری هەبوو. سەیرێکی سەبەتەکەم کرد. بەخۆمم گوت ئێستە چی بکەم.

—تۆ خۆت باش دەزانی کە من و تۆ...ئێمە...

دووبارە بێدەنگییەکی قورس باڵیکێشایەوە بەسەر شوێنەکەدا.

—ویل، تکایە شتێك بڵێ.

لە کۆتاییدا ویل هاتە گۆ.

—پیرۆز بێت.

—من دەزانم کە بیر لە چی دەکەیتەوە. خۆ هیچکام لە ئێمە نەماندەویست ئەم ڕووداوە ڕویدات. ڕاستیەکەی ئەوەیە ماوەیەکی دوورودرێژە کە تەنها هاوڕێی یەکتری بوین. هاوڕێیانیش

خەمی حاڵی تۆیان بوو. لەپاش ئەوەی تۆ توشی ئەم ڕووداوە بویت. ڕوپرت لە هەمویان زیاتر پارێزگاری و پشتیوانی لێکردم.

—زۆر بەڕێزە.

—تکایە بەمجۆرە مامەڵە مەکە. زۆر خراپە. بەڕاستی لە باسکردنی ئەم بابەتە بۆ تۆ زۆر دەترسام. واتە هەردوکمان دەترساین.

ویل زۆر بە بڕشتانەوە گوتی:

—دیارە.

دەنگی ڕوپرت هاتە بەرگوێ.

—تەنها لەبەر ئەوە بەتۆی دەڵێین چونکە بەلامانەوە زۆر گرنگیت. حەزمان نەکرد لە کەسانێکیترەوە گوێت لێبێت. تۆ خۆت دەزانی کە ژیان بەردەوامە و ناوەستێت. بەدڵنیاییەوە خۆت زۆر باش ئەمە دەزانی. بەهەرحاڵ دوو ساڵ تێپەڕیوە.

دووبارە بێدەنگی باڵیکێشایەوە بەسەر شوێنەکەدا. حەزم نەدەکرد لەمە زیاتر ببیستم. بە هێمنیەوە گەڕامەوە و هەوڵمدا هیچ دەنگێك دروست نەبێت. بەلام دەنگی ڕوپرت کە دووبارە دەستیکردبویەوە بەقسەکردن هێندە بەرز بوو بەئاسانی دەهاتە بەرگوێم.

—واز بهێنە کابرا، دەزانم زۆر سەختە... هەرهەموی. ئەگەر ئالیسیا بەلاتەوە گرنگە، خۆشبەختی و بەختەوەری ئەوت دەوێت.

—ویل، تکایە شتێك بڵێ، تکات لێدەکەم.

دەمتوانی سەروفەساڵی ویل بهێنمە پێشچاوی خۆم. لەهەمانکاتدا کە نەدەکرا شتێکی لێ بخوێنرێتەوە، گرنگیپێنەدانێکی ئاوێتە بەنەفرەتی لەناخیدا هەڵگرتبوو.

ویل دووبارە گوتی:

—پیرۆزە. دڵنیام کە هەردوکتان دەگەنە ژیانێکی بەختەوەر.

ئالیسیا دەمی کردەوە بۆ ئەوەی قسەیەك بکات. —شتێکی شاراوە و نەزانراو— بەلام ڕوپرت خۆی فرێدایە ناو قسەکەیەوە و گوتی:

—ئالیسیا واز بێنە. پێموایە ئیتر دەبێت بڕۆین. ویل، چاوەڕێت لێناکەین کە دووعای بەخێرمان بۆ بکەیت! بۆ ئەمە نەهاتوین بۆ ئێرە. تەنها لەبەر ڕێزو ئیحتیرام بوو. ئالیسیا بیری کردەوە، باشە، لەڕاستیدا هەردوکمان بیرمان کردەوە تۆ دەبێت بزانیت. داوای لێبوردن دەکەم

هاوڕێی دێرینم، من.... من هیوادارم که بارودۆخت باشتر ببێت و هیواداریشم هەرکاتێك هەلومەرجی ژیانت بەرەو باشتر چوو پەیوەندیمان پێوەبکەیت.

دەنگی پێم بیست. بەسەر سەبەتەی دارەکاندا چەمامەوە. وام نیشاندا کە تازە گەیشتومەتە بەردەرگاکە. لەناو ڕێڕەوەکەوە دەنگیانم دەبیست. دواتر ئالیسیا لەبەرامبەرمەوە دەرکەوت. چاوەکانی سوربوبونەوە و شتێکی وای نەمابوو کە دەستبکات بە گریان، گوتی:

–دەتوانم بچم بۆ توالیت؟

دەنگی قایم و گڕ بوو. بە هێمنیەوە دەستم بەرزکردەوە بەبێ ئەوەی کە قسەیەك بکەم ڕێگەکەم نیشاندا. لەو نیگا سارد و سڕەوە کە سەیری منی کرد، زانیم دەموچاوم هەستم ئاشکرا دەکات. لەپاش ساتێك وەستان گوتی:

–دەزانم چۆن بیر لەمن دەکەیتەوە. بەڵام من هەوڵی خۆمدا، بەڕاستی هەوڵی خۆمدا. چەندین مانگ، بەڵام ئەو بەردەوام منی لە خۆی دوردەخستەوە.

حاڵەتی زۆر ووشك و جیدی بوو. بە شێوەیەکی زۆر سەیرو نامۆ سەروفەساڵی تورە دەهاتە پێشچاو.

–بەڵام ئەو بەڕاستی خۆی نەیویست لێرەدا لەلای بم و لەگەڵیدا بژیم. زۆر ڕوون و بێ پەردە ئەمەی بەمن گوت.

ژنەکە چاوەڕوانبوو شتێك بڵێم.

لە کۆتاییدا توانیم قسەیەك بکەم.

–ئەم بابەتە پەیوەندی بەمنەوە نییە.

چاومان بڕیبویە نێوچاوی یەکتری. گوتی:

–خۆت دەزانی مرۆڤ تەنها دەتوانێت یارمەتی کەسێك بدات کە خۆی بیەوێت.

ئەمەی گوت و ڕۆیشت.

چەند خولەکێك وەستام و چاوەڕێم کرد. دەنگی ئۆتۆمبیلەکەیانم بیست کە دەچویە دەرەوە. دواتر گەڕامەوە بۆ چێشتخانەکە. هەر لەوێدا مامەوە، لەگەڵ ئەوەی کە حەزم لە چای نەبوو، بەڵام کترییە کارەباییەکەم داگیرساند. سەرقاڵی سەیرکردن و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤارێك بووم کە پێشتر خوێندبومەوە. دواتر گەڕامەوە بۆناو ڕێڕەوەکە. سەبەتە دارەکەم

هەڵگرت و چوم بۆ ژوری دانیشتنەکە. پێش ئەوەی بچمە ژورەوە، بە هێمنییەوە سەبەتەکەم کێشا بە دەرگاکەدا بۆ ئەوەی ویل لە هاتنە ژورەوەم ئاگادار ببێتەوە.

-گوتی: لەوانەیە بتانەوێت....

بەلاّم کەس لە ژورەکەدا نەبوو.

ژورەکە چۆڵ بوو.

لەو ساتەدا دەنگێکم بیست. دیسانەوە هەمان دەنگ هاتەوە بەرگوێم، بەرەو ڕێڕەوەکە ڕامکرد. دەنگی شکانی شوشە بوو. بەشوێن دەنگەکەدا ڕۆیشتم. لە ژوری نوستنەکەی ویلەوە دەهات. ئەی خوایە، شتێکی لە خۆی نەکردبێت! زۆر ترسابووم. هۆشدارییەکانی خاتوو ترینەر وەك پێك دەکوتران بەسەرمدا. تەنها پازدە خولەك زیاتر بەتەنها بەجێم هێشتبوو.

گەیشتمە کۆتایی ڕێڕەوەکە، لەناو چوارچێوەی دەرگاکەدا وەستام. هەردوو دەستم گرتبوو بە چوارچێوەی دەرگاکەوە. ویلم لە ناوەڕاستی ژورەکەدا بینی، ڕێکوپێك لەسەر کورسییە تایەدارەکەدا دانیشتبوو. دارعاساکەی لەسەر دەسکی کورسییەکە بوو. نزیکەی چل و پێنج سانتیمەتر لەلای چەپییەوە هاتبویە دەرەوە. -کۆچانێك کە لەڕاستیدا نەیزەی شەڕ بوو بە دەستییەوە- تەنانەت یەك چوارچێوەی وێنەیش لەسەر ڕەفە دورودرێژەکانی بۆفەکە نەمابویەوە، چوارچێوە ووێنە گرانبەهاکان، وردو خاش بوبون و بەسەر زەوییەکەدا بلاّو ببوبونەوە. فەرشەکە پڕی بوو لە وردە شوشەو بریقەیان دەهات. پارچە شوشە ڕژابون بەسەر پێیەکانیدا. بارودۆخ زۆر شێوابوو. کاتێك بینیم زیانێکی بەخۆی نەگەیاندووە، لێدانەکانی دڵم هێمن بوونەوە.

ویل زۆر خراپ هەناسەی دەدا، وادیاربوو هەرچی کردبوو هەوڵ و کۆششێکی زۆری دابوو.

کورسییەکەی سوڕایەوە. ووردە شوشەکان لەژێرتایەی کورسییەکەیەوە دەستیانکردە جیڕەجیڕکردن. چاوی بەمن کەوت. زۆر ماندوو دیار بوو، ئەوەندە ماندوبوو کە ڕێگەی بە من دەدا بوێری ئەوەم هەبێت دڵدانەوەی بکەم.

سەیری قاچەکانیم کرد، دواتر سەیرێکی سەرزەوییەکەی دەوروبەریم کرد. لەناو ئەو هەموو تێکەڵی و شێواوییەدا، وێنەی ئەوو ئالیسیام بینی کە زۆر بەسەختی دەناسرایەوە. دەموچاوی ئالیسیا لەناو چوارچێوەی وێنەکەدا چرچ و لۆچ و شێوابوو نەدەناسرایەوە.

تفی خۆمم قوتدایەوە و واقم بە وێنەکەدا وڕمابوو. هێدی هێدی سەرم بەرز کردەوەو سەیرم کرد. درێژترین چرکەساتەکانی تەمەنم بوون.

لەپاشان کاتێك توانیم شتێك بڵێم، گوتم:

–تایەکانی کورسییەکەت پەنچەر دەبن؟ چونکە لەبیرم نییە کە جەکەکەم خستوەتە چ شوێنێکەوە.

چاوەکانی خڕ بوونەوە. چرکەیەك بیرم کردەوە تۆ بڵێی قسەیەکی خراپم کردبێت. بەڵام دواتر هەستپێنەکراوترین زەردەخەنەکانی دوونیام لەسەر لێوەکانی بینی!

گوتم:

–بێزەحمەت مەجولێ، هەر ئێستە گسکە کارەباییەکە دەهێنم.

دەنگی گۆچانەکەم بیست کە کەوتە سەر زەوییەکە. کاتێك خەریکبوم لە ژورەکە دەهاتمە دەرەوە، پێموابوو دەنگیم بیست کە گوتی داوای لێبوردن دەکەم!

کینگز هد، شەوانی پێنج شەممان زۆر قەرەباڵغ بوو، تەنانەت بارەکەیش کە لە کەنارەوە بوو تەنانەت زۆر قەرەباڵغتر بوو. هەر بەزۆر جێگای خۆم لەنێوان پاتریك و پیاوێکدا کە بەڕواڵەت ناوی راتر بوو کردەوە. جاروبارێك سەیری ئەو ئامێرو کەرەستە تایبەتانەی ئەسپم دەکرد کە بە تیرۆکی دارین(کۆڵەکە داری کورتە بالا) بەسەر سەرمەوە هەڵواسرابون و سەیری وێنەکانی قەڵاکەم دەکرد کە تیرۆکەکەیان دادەپۆشی. هەوڵم دەدا زۆر گوێ بەو قسەو باسانە نەدەم کە لەدەوروبەرمدا دەکرێن. زیاتر قسەکانیش سەبارەت بە چەوری جەستە و کاربۆهیدرایت و ئەمجۆرە شتانە بوو.

هەمیشە پێموابوو دانیشتنەکانی گروپی وەرزشی پاتریك کە دوو هەفتە جارێك لەو یانە شەوانەیەدا ئەنجامدەدرا خراپترین کابوس بوو بۆ خاوەنانی ئەو یانە شەوانەیە. من تەنها کەسێك بووم کە مەشروبم دەخواردەوە. تەنها پاکەتێکی جبس هی من بوو کە خاڵی و بەتاڵی و بە چرچ و لۆچکراوی لەسەر مێزەکە کەوتبوو. ئەوانیتر قوم قوم سەرقاڵی خواردنەوەی ئاوی کانزایی بوون، یان حیسابی کالۆری ئەو ساردیانەیان دەکرد کە دەیانخواردەوە. لە کۆتاییدا داوای خواردنمان کرد، بەڵام زەڵاتەیان نەهێنا، بۆ ئەوەی بتوانم بە ساسی پڕ لە چەورییەوە بیخۆین. یان پارچەیەك گۆشتی مریشك کە هێشتا پێستەکەی پێوە بێت. من زیاتر داوای

پەتاتەی سورەو کراوم دەکرد، سەیری ئەوانیشم دەکرد کە خۆیان بەوجۆرە دەنوێنن حەزییان لێی نییە و نایخۆن.

ناتوانم بڵێم لەناو کۆڕی هاوڕێکانی پاتریکدا چێژم وەردەگرت. بەڵام بە سەرنجدان لە کاتژمێرەکانی کارکردنم و بەرنامەی هەفتانەی فێرکاری وەرزشی پاتریك، یەکێك لەو چەند کات و ساتانە بوو کە دەمتوانی ناوبراو ببینم. پاتریك لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو لەگەڵ ئەوەی کە هەوای درەوە زۆر سارد بوو، بەڵام پاتریك پانتۆڵی سێچارەکی لەپێکردبوو. ئەندامانی یانەکە کاتێك بەمجۆرە جلوبەرگی کەمیان لەبەر دەکرد، بەزۆری مەبەستیان پۆزلێدان بوو بەسەر یەکتریدا. پیاوەکان لەڕو لاواز و بەهێز بوون، بە وەرزشە سەخت و ئاڵۆزو گرنگەکان کە دەبویە هۆی دروستکردنی شانازی و خۆهەڵکێشانێکی زۆر لەواندا خۆیان دەنواند. هەندێکیش لە پەڕی مریش سوکتر بوون و هەوڵیاندەدا ماسولکە پەیدا بکەن و جەستەیەکی وەرزشیان هەبێت.

کچەکانی ماکیاجیان نەدەکرد و لەو جۆرە کەسانە بوون کە لە کەشوهەوای ساردا دەیان کیلۆمەتر ڕادەکەن و هەوای سارد کاریان تێناکات. بە نەفرەتەوە سەیری منیان دەکرد. تەنانەت لەوانە بوو کە دەرکم نەکەم. بێگومان ڕێژەی گۆڕانی چەوری بە ماسولکەی جەستەیان هەڵسەنگاندم و ڕەخنەیەکی زۆریان لە جەستە و لەش و لارم هەبوو.

نەمدەزانی ئایا دەتوانم بەبێ ئەوەی کە کەسێك بەلاچاو سەیرم بکات داوای کێکی پەنیر بکەم. بە پاتریکم گوت:

—بەڕاستی ترسناك بوو. کچە هاوڕێکەی و باشترین هاوڕێی!

پاتریك گوتی:

—ناکرێت ڕەخنە لەو کچە بگیرێت. هەر بەڕاست ئەگەر من لە ملمەوە بەرەوخوار ئیفلیج ببم، دیسانەوە هەر لەلام دەمایتەوە؟

—سەد ئەڵبەتە کە دەمامەوە.

—نەخێر، نامێنیتەوە. هەرچەندە خۆیشم چاوەڕوانییەکی لەمشێوەیەم لە تۆ نییە.

—ئێ باشە، بەڵام من هەروا وازت لێناهێنم.

—بەڵام من نامەوێت بمێنیتەوە، حەزناکەم هیچ کەسێك لەبەر ئەوەی کە بەزەیی پێمدا دێتەوە لەلام بمێنێتەوە.

—کێ گوتویەتی لەبەر بەزەیی پێداهاتنەوە؟ خۆ لەبنەڕەتدا هەر ئەو کەسەی پێشویت.

—نەخێر، ئەو کەسەی پێشوو نیم، ئیتر هەرگیز هەمان ئەو کەسەی پێشوو نیم.

چرچی خستە لوتی و گوتی:

—ئەگەر ئیفلیج ببم ئیتر هەرگیز نامەوێت بە زیندویی بمێنمەوە. چونکە بۆ هەر کارێك دەبێت پشت بە خەڵکی ببەستیت. ئەی هاوار خەڵکی بێن و دەمولێوت پاکبکەنەوە و لیکەکانت بۆ بسڕن و خۆیشت ناتوانیت هیچکارێك بکەیت.

سەری ڕاوەشاند.

—ئیتر ناتوانی ڕابکەیت و سواری پاسکیل ببیت.!

دواتر سەیری منی کرد، هەروەك بڵێی تازە بیری کەوتبویەوە.

—ئیتر ناتوانیت لەگەڵ هیچ ژنێکدا بخەویت.

پاتریك قومێك ئاوی هەڵقوڕاند.

—سەیرکە، تۆ گوتت مرۆڤێکی ترسناکە، لەوانەیە پێش ڕووداوەکەیش هەر ترسناك بوبێت. لەوانەیە هۆکاری بنەڕەتی هەر ئەوەیە کە وازی لێهێناوە و ڕۆیشتووە. هەرگیز بیرت لێکردبویەوە؟

—نازانم.

بیری ئەو وێنەیەم کەوتەوە کە لەماڵی ویلدا بینیبوم.

—وادیارە کە بەیەکەوە زۆر خۆشحاڵ و شادومان بوون.

بەڵام ئایا بەڕاستی وێنە دەیتوانی شتێك بسەلمێنێت؟ خۆم وێنەیەکم لەماڵەوە هەبوو کە تێیدا بەجۆرێك زەردەخەنەم بۆ پاتریك کردووە هەروەك بڵێی لە ڕووداوێکی ئاگرکەوتنەوە ڕزگاری بووە. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە لەوکاتەدا لەبەر ئەوە پێکەنیبوم کە بە (گوێرەکەی تەواو عەیار) بانگم کردبوو ئەویش بە (لێرە بڕۆ بابە)یەکی هاوڕێیانە وەڵامی دابومەوە!

پاتریك ئیتر حەزی لە بابەتەکە نەما.

—هێی جیم.... جیم، سەیرێکی ئەو پاسکیلە نوێ سوکەت کردووە؟ پاسکیلێکی چۆنە؟

من ئیتر لەمبارەیەوە هیچ قسەیەکم نەکرد و بوارمدا کە بابەتی قسەکان بگۆڕدرێت. بیرم لە قسەکەی ئالیسیا دەکردەوە. دەمتوانی بەباشی ویل بهێنمە بەرچاوی خۆم کە پاڵ بەوەوە دەنێت و دەری دەکات. بەڵام ئەگەر بەڕاستی عاشقی کەسێکیت، ئایا ئەرکی سەرشانتە

هەمیشە لەلای بمێنیتەوە؟ لەبەر ئەوەی بێزارو بێتاقەتە هاوکاری بکەیت؟ لە نەخۆشی، لە تەندروستی، لە هەر هەلومەرجێکدا؟

لەوەی کە خاوەنکارەکەم خستوەتە ژێر زەرەبینەوە، کەمێك هەستم بە گوناح کرد. بەتایبەت کاتێك بیرم هاتەوە کە بەدەست چ کێشە و گرفتانێکەوە دەناڵێنێت و ژیان بەسەر دەبات. بەڵام ئایا دەکرێت مرۆڤ بیری بەلای لایەنە تایبەتەکانی کەسێکی وەکو ئەودا نەڕوات، پاتریك بە ئانیشك کێشای بە کەلەکەمدا.

—خەریکم بیر دەکەمەوە کارێکی گەورە ئەنجامبدەم.

—کاری گەورە!

—پێشبڕێکێ سێ لایەنە[٧]. ئکستریم ڤایکینگ. سەد کیلۆمەتری بە پاسکیل، پەنجا کیلۆمەتر بە ڕاکردن، مەلەوانییەکی نایاب و زرۆ باش لە دەریای ژێر سفری باکوری ئەوروپادا.

بەڕێزێکی زۆرەوە باسی ڤایکینگیان دەکرد. ئەم گروپە لەگەڵ ئەوەی کە زیانی توندیان پێگەیشتبوو بەڵام پێشبڕکێیان کردبوو، هەروەك سەربازانی کۆنەکارو بە ئەزمونی جەنگەکان، بەتایبەت جەنگ و شەڕە وەحشیانەکان. بە باسکردنی ئەو شتانە دەمی پاتریك ئاوی دەکرد.

سەیری هاوڕێکەمم کرد و لە خۆمم پرسی ئایا بەڕاستی کەسێکی غەریب و نامۆ نییە. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کاتێك لەگەڵ ئەودا بوومە هاوڕێ کە لەکاری بازاڕدۆزی بەتەلەفۆن کاری دەکرد، نەدەکرا کە لە وێستگەیەکی بەنزین تێپەڕێت و چوکلێت لە فرۆشگاکەی نەکڕێت و تێری سکی خۆی نان نەخوات.

—بڕیارتداوە بەشداری بکەیت؟

—بۆچی؟ چونکە تاوەکو ئێستە هیچکات هەلومەرجی ئەوەم نەبووە.

بیرم لە ڕاهێنانە زیادەکان دەکردەوە—قسەوباسە بێکۆتاییەکان سەبارەت بە ماوەکە، ئامادەگی جەستەیی و خۆڕاگری— ئەم ڕۆژانە تەنانەت لە باشترین هەلومەرجیشدا زۆر بەسەختی دەکرا سەرنجی پاتریکیش بەلای خۆتدا ڕابکێشی.

گوتی:

—تۆیش دەتوانیت لەگەڵ مندا بێیت.

---

[٧] واتە ڕاکردن، مەلەوانی و پاسکیلسواری.

بەلآم هەردوکمان دەمانزانی کە خودی خۆیشی باوەڕی بەو قسەیە نییە کە دەیکات.

گوتم:

—پێشکەشی خۆت بێت، هەرخۆت برۆ.

دواتر داوی کێکی پەنیرم کرد.

***

ئەگەر پێموابوبێت کە ڕووداوەکانی ڕۆژی پێشووی گرنتا هاوس دەبنە هۆی دروستبونی دۆستایەتی و خۆشەویستی، ئەوا زۆر لە هەڵەدا بووم.

بە زەردەخەنەوە سلآوێکی گەرمم لە ویل کرد، بەلآم ئەو تەنانەت ئەزیەتی خۆیشی نەدا کە ئاوڕم لێبداتەوە و ڕوی لەپەنجەرەکەوە وەربگێرێت بەرەو لای من. نیتن لەوکاتەی کە چاکەتەکەی لەبەر دەکرد، لەژێر لێوەوە گوتی:

—ئەمرۆ بارودۆخ باش نییە.

هەورەکان زۆر نزم بوون و بەیانییەکی زۆر خراپ بوو، نم نم باران دەیدا لە پەنجەرەکەو هەرگیز نەتدەتوانی بیر لەوە بکەیتەوە کە دووبارە ئاسمان سامال ببێتەوە و خۆر دەربکەوێت. لەوەها ڕۆژێکدا مرۆڤ خۆ بەخۆ هەست بە بێتاقەتی دەکات. هەرگیز جێگەی سەرسوڕمان نەبوو کە ویل لە جاران مامەڵەی خراپ و ڕەقتر بێت. دەستمکردە کارە ڕۆژانەکانی بەیانیان و سەرقاڵ بووم پێیانەوە، هەموو ئەو ماوەیەش بە خۆمم دەگوت بێزار مەبە. هیچ ناچار نیت خاوەنکارەکەت خۆش بوێت. زۆرێك هەن کە خاوەنکارەکانی خۆیان خۆشناوێت. ڕۆژی پێشوو بە وردییەوە وێنەکانم خستبویە ناو چەکمەجێکی ترەوە. ئێستە وەستابوم و وێنەکانم دەردەهێنا. ئەمویست ئەو چوارچێوانە کە دەکرێت چاکبکرێنەوە جیایان بکەمەوە. من شارەزاییەکی زۆرم لە چاککردنەوەی شتومەکە خراپ و شکاوەکاندا هەبوو. سەرەڕای ئەوەش، پێموابوو ڕێگەیەکی زۆر باشە بۆ کات کوشتن و بەسەربردنی کاتەکانم.

لەپاش نزیکەی دە خولەك کە سەرقاڵی کارەکەم بووم. دەنگی هێمنی کورسییە تایەدارە پاتریدارەکەم بیست کە نیشانەی هاتنەژورەوە ویل بوو. هەر لەوێدا و لەناو دەرگاکەدا وەستاو واقی بە مندا وڕمابوو. سێبەرانێکی ڕەش لە ژێرچاوەکانیەوە دەبینرا. هەندێکجار نیتن بە منی دەگوت شەوی ڕابوردو ویل چاوەکانی لێکنەناوە. ناتوانم تەسەوری ئەوە بکەم کە مرۆڤ بە درێژایی شەو لەسەر قەرەوێڵەکەی تەخت کەوتبێت و نەتوانێت بێتە خوارەوەو خەویشی

لێنەکەوێت و تەنها بیرو فیکری خەمبارانە و نائومێدانەی هەبێت. یەکێك لە چوارچێوەی وێنەکانم بەرز کردەوە و گوتم:

—بیرم لەوە کردەوە کە لەوانەیە بتوانم هەندێکیان چاکبکەمەوە.

وێنەیەکی خۆی بوو کە بەپەتێك لەبەرزاییەکەوە خۆی هەڵدەدایە خوارەوە. هەوڵمدا بە دڵخۆش و شادومان بێمە پێشچاو. (پێویستی بە کەسێکە کە خۆشبین و ڕوخۆش بێت).

—بۆچی؟

چاوێکم داگرت.

ئێ باشە، پێموابوو دەکرێت هەندێکیان بهێڵینەوە. سیکۆتینی دارم لەگەڵ خۆمدا هێناوە، ئەڵبەتە ئەگەر تۆ پێت باشبێت. ئەگەریش چوارچێوەی نوێتان بوێت، دەتوانم کاتی نانی نیوەڕۆ کە دەچمە دەرەوە بیانکرم. ئەگەریش حەزبکەیت هەوایەك بگۆڕیت ئەوا دەتوانین بەیەکەوە بچینە دەرەوە....

—کێ پێی گوتیت ئەمکارە بکەیت؟

سەیرکردنەکەی بەبڕشت و نەلەخشاو بوو.

—ئۆو، زۆر باشە، پێموابوو. من تەنها دەمویست هاوکارییەکم کردبێت.

—تۆ دەتویست خراپەکاری و پشێوییەکانی دوێنێم کۆ بکەیتەوە؟

—من....

—لو... تۆ دەزانی مەسەلەکە چییە؟ تەنها بۆ یەکجاریش بووە چەندە باش دەبوو کە گرنگی بە خواستەکانی من بدرایە. شکاندنی ئەم چوارچێوەی وێنانە شتێکی ڕێککەوت نەبوو. وامەزانە لە کەللەمی دابێت یان تێکەڵم کردبێت، من بەڕاستی حەزناکەم چاوم بەم وێنانە بکەوێت.

هەستامەوە....

—ببورن پێموانەبوو....

—پێتوابوو خەریکی کارێکی باش ئەنجامدەدەیت. هەمووان پێیانوایە کە دەزانن خواستەکانی من چین. (ئەم وێنە نەفرەتیانە بخەرەوە جێگەی خۆیان بۆ ئەوەی ئەم بەدبەخت و چارە ڕەشە ئیفلیجە شتێکی هەبێت بۆ ئەوەی سەیری بکات). حەزناکەم ئەم وێنە نەفرەتیانە

بەو شێوەیە بەملارکردنەوە سەیرم بکەن. منێك کە دیلی سەر جێگەکەمم و چاوەڕێم تاوەکو کەسێك بێت و بەرزم بکاتەوە. تێگەیشتی، لە قسەکەم حاڵی بویت؟

تفی خۆمم قوتدایەوە.

—مەبەستم وێنەکەی ئالیسیا نەبوو. ئەوەندەش نەزان نیم... تەنها وامزانی تۆ هەستدەکەیت کە...

—ئەی خودایا!

ڕوی خۆی وەرگێڕا و ئاوازی قسەکەی ڕەخنەئامێز بوو.

—پێویستناکات دەروونناسیم بۆ بکەیت، تۆ بڕۆو تەنها ئەو گۆڤارانەی پورە زەنکی بخوێنەرەوە. هەرکاتێکیش زانیت ئیشت نییە و نابێت چای لێبنێیت. بڕۆ هەرکارێکت پێخۆشە بیکە.

کوڵمەکانم سور بوبونەوەو گڕیانگرتبوو. وەستام و سەیرم کرد کە خەریکبوو لە ڕێڕەوە تەسکەکە تێدەپەڕی. پێش ئەوەی بزانم کە چی دەڵێم، ئەم قسەیەم لەدەم دەرچوو:

—تۆ نابێت بەمجۆرە و وەك مرۆڤە خوێڕییەکان هەڵسوکەوت بکەیت.

کورسییە تایەدارەکە وەستا. هەڵوەستەیەکی دوورودرێژ، دواتر گەڕایەوە و بەهێمنییەوە بەرەو لای من هات. لەبەرامبەر یەکترییەوە وەستاین. دەستی لەسەر سوکانی کورسییەکە بوو.

—چیت گوت؟

واقم بە چاوەکانیدا وڕمابوو، دڵم ترپە ترپی دەکرد.

—لەگەڵ هاوڕێکانتدا زۆر توند بویت. باشە، لەوانەیە ڕاستبکەن. بەڵام خۆ من هەمو ڕۆژێك دێم بۆ ئێرە و هەوڵدەم بەباشترین شێوە کە بۆم بکرێت کارەکانم ئەنجامبدەم. سوپاست دەکەم ئەگەر بێت و چارەڕەشم نەکەیت. هەمان ئەوکارەی کە لەبەرامبەر خەڵکیدا دەیکەیت.

چاوەکانی ویل لە سەرسوڕماندا خڕ بوونەوە. هەروەك بڵێی چاوەڕوانی ئەو قسانە لەمنەوە نەبوو. دواتر وەلامیدایەوە و گوتی:

—ئەی باشە ئەگەر من بەتۆ بڵێم کە حەزناکەم لێرە بیت چی دەکەیت؟

—من تۆ دات نەمەزراندوم. بەڵکو دایکت دایمەزراندوم. تاوەکو ئەو کاتەی کە ئەو پێم نەڵێت پێویستم پێت نییە هەرگیز واز لەکارەکەم ناهێنم. نەك لەبەر ئەوەی کە تۆ بەلامەوە گرنگ نیت،

یان حەزم لەمکارە بێمانایە بێت، یان مەبەستم دروستکردنی گۆڕانکاری بێت لە ژیانی ئێوەدا، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەیە کە پێویستم بەپارە هەیە. تێدەگەیت؟ بەڕاستی من پارەم پێویستە.

بە ڕواڵەت سەروفەسالّی ویل زۆر نەگۆڕدرا. بەلآم من سەرسوڕمانم لەودا بینی. هەروەك بڵێی لەسەر ئەوە ڕانەهاتبوو کە هیچکەسێك دژی بێت و وەلآمی بداتەوە.

کاتێك لەو قسەیە تێگەیشتم کە کردم، لەبەر خۆمەوە گوتم (ئۆو نەفرەتی ئەمجارە ئیتر تێکتدا).

بەلآم ویل تەنها چەند چرکەیەك واقی بەمندا وڕما، دواتر کاتێك بینی کە منیش چاوم بڕیوەتە ئەو. هەناسەیەکی هەڵکێشا، بەجۆرێك هەروەك بڵێی ئەیویست شتێکی ناخۆش بڵێت، گوتی:

–کێشە نییە! ئەو وێنانە بخەرە ناو چەکمەجێکیترەوە، هەر هەمویان. تێگەیشتی؟

دواتر هوویەکی کورتی کردو ڕۆیشت.

## {٥}

کاتێك بە دەر لە ویستی خۆت بەرەو ژیانێکی نویێ پەلکێش دەکرێیت – یان باشتر وایە بڵێم بەزۆر دەدرێیت بەسەر ژیانی کەسێکیتردا و دەبیتە تەماشاچی چرکەساتەکانی ژیانی ئەو کەسە– کارت دەگاتە جێگەیەك کە لەبەر خۆتەوە بیردەکەیتەوە کە بەڕاستی تۆ چ کەسێکیت. یان لەبەرچاوی خەڵکانیتر چ جۆرە مرۆڤێکیت.

لەبەرچاوی دایکوباوکم، نەمتوانیبوو بە تێپەڕینی چوار هەفتە بلکێم بەکارەکەمەوە. ئێستە کەوتبومە ناو دوونیایەکی زۆر جیاوازەوە. بەتایبەت کە دایکم ڕۆژانە شتانێکی سەبارەت بە گرنتاهاوس و بارودۆخە ناوخۆییەکەی دەپرسی، ئەوەش بە حاڵەتێکەوە هەروەك بڵێی سەبارەت بە بوونەوەرێکی سەیروسەمەرە و نەریتەکانی لێکۆڵینەوەی دەکرد. دەیپرسی: (خاتو ترینەر هەمیشە دەستماڵی قوماش بەکار دەهێنێت؟) (تۆ پێتوایە ئەوان ڕۆژانە وەك ئێمە گسکی کارەبایی بەکار دەهێنن)، یان (ئایا پەتاتە چۆن لێدەنێن و دەیخۆن؟).

بەیانیان بە کۆمەڵێك داواکاریەوە بەڕێی دەکردم. بۆ نمونە بزانم سود لە چ مارکەیەك وەردەگرن بۆ دەسڕو کلێنسی توالیت، یان ئایا چەرچەفەکانیان تێکەڵەی پەموو نایلۆنن؟ هەرکات لە زۆربەی کاتەکاندا دەمزانی بیرم نایەتەوە، زۆر بێزار دەبوو. لەوکاتەوە و لەتەمەنی شەش ساڵییەوە کاتێك بەدایکمم گوت کە دایکی یەکێك لە منداڵە دەوڵەمەندەکان ناهێڵێت لەناو ژوری دانیشتن و میوانی ماڵەکەیاندا یاری بکەین (لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی بەرز بونەوەی تەپوتۆز)، دایکم پڕ بەدڵ پێیوابوو کە کەسانی دەوڵەمەند لەناو تەپوتۆزدا دەژین.

کاتێك دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە و ئەوەم بۆ دەگێڕایەوە کە بەڵێ ئەوان ڕێگە دەدەن سەگ لەناو چێشتخانەکەیاندا یاری بکات، یان خێزانی ترینەر قادرمەکانی ڕێڕەوەکە پاك ناکەنەوە. ئەو کارەی کە دایکم ئەنجامیدەدا، ئەوە بوو کە لێوەکانی دەهێنایەوە یەك و سەیرێکی باوکمی دەکرد، بەوپەڕی ڕەزامەندی و بێخەمییەوە سەرێکی ڕادەوەشاند. هەروەك بڵێی بەو هەواڵانەی

کە ڕۆژانە بۆی دەهێنم گومان و گریمانەکانی سەبارەت بە ژیانی دەوڵەمەند و پارەدارەکان دەگۆڕدرا بۆ یەقین و دڵنیایی.

ئەو هیوایەی کە بە داهات هەیانبوو، یان لەوانەیە ئەو ڕاستیەی کە دەیانزانی بەڕاستی کارەکەمم خۆشناوێت بوبویە هۆی ئەوەی کە لەلایەن خێزانەکەمەوە کەمێك زیاتر ڕێزم لێبگیرێت، ئەویش نەك هێندە زۆر. بۆ نمونە باوکم بە زۆر خۆر بانگی نەدەکردم. لەلایەن دایکیشمەوە ڕێزەکەم ئەوەبوو کە دەمبینی بە کوپێك چاییەوە چاوەڕوانم دەکات.

بەڵام بۆ پاتریك و خوشکەکەم هیچ نەگۆڕدرابوو، هێشتا هۆکاری گاڵتەو پێکەنین بووم، ماچیان دەکردم و باوەشیان پێدا دەکردم، یاخود بە ڕەقی لەگەڵمدا دەجوڵانەوە. گۆڕانکارییەکم لە خۆمدا نەدەبینی، ڕواڵەتم نەگۆڕدرابوو هێشتایش وەك پێشوو جلوبەرگم لەبەر دەکرد. هەروەك ترینا دەیگوت هەروەك ئەوە بوو کە دەمەوێت بڕۆم و بەشداری لە زۆرانبازی خێرخوازیدا دەکەم.

هەرگیز نەمدەزانی دانیشتوانی گرنتاهاوس سەبارەت بە من چۆن بیردەکەنەوە. خۆ نەمدەتوانی هیچ شتێك لە ویلەوە حاڵی ببم. گومانم دەبرد بەلای نیتنەوە تەنها بریتی بووم لە کۆتا کەسی لیستی دوورودرێژی ئەو پەرستارانەی کە دامەزراون. لەگەڵ ئەوەی کە هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی هاوڕێیانەی هەبوو، بەڵام کەمێك گوێپێنەدەر بوو. هەستم دەکرد کە باوەڕناکات بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێدا بەردەوام بم و بمێنمەوە. بەڕێز کاك ترینەریش کاتێك لەبەردەم دەرگاکەدا بەتەنیشت یەکتریدا تێپەڕ دەبوین. بە ڕێزەوە سەری بۆ ڕادەوەشاندم، هەندێکجاریش دەیپرسی ترافیك چۆنە، یان ئایا بارودۆخ باشە یان نا.

بەڵام بەلای خاتوو ترینەرەوە —ئەی هاوار خودایە— بێئەقڵترین و نا بەرپرس ترین کەسی سەرزەوی بووم.

دەستپێکردنی بە مەسەلەو بابەتی وێنەکان بوو. لەو ماڵەدا هیچ شتێك لەبەرچاوی خاتوو ترینەر شاراوە نەبوو. ئەوە تێگەیشتم کە ڕووداوی شکانی چوارچێوەی وێنەکان شتێکی کەمتر لە بومەلەرزە نییە. تاقیکردنەوەیەك بوو کە لەڕێگەیەوە خاتوو ترینەر بەتەواوەتی تێگەیشت کە من بۆ ماوەی چەندێك ویل بەجێدەهێڵم و بە چ خێراییەکیشەوە شێواوی ژورەکە لا دەبەم. هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاردانەوەی نیشان نەدا، —خۆی دەبوارد لەوەی کە دەنگی بەرز بکاتەوە— بەڵام هەمیشە لەوەڵامی مندا کاتێك شتێکم دەگوت، بە هێمنییەوە

چاوێکی لێکدەنا یان هۆوێکی کورتی دەکرد. ئەوەی کە دەبوو بیزانم لە شێوازی مامەڵەکردنییەوە تێیدەگەیشتم. کاتێك نیتن بە منی گوت کە خاتوو ترینەر دادوەری دادگای ئەم بەش و ناوچەیە، شتێکی نەمابوو لە سەرسوڕماندا شاخم لێبڕوێت.

خاتوو ترینەر دەیگوت تەنانەت کاتێك ویلیش زۆر بێتامی دەکات نابێت بەتەنیا بەجێی بهێڵم. تێگەیشتیت؟، دەیگوت بۆ جارێکیتر کە سەرقاڵی لابردنی لەك و پەڵەکانم و ماڵەکە پاکدەکەمەوە، دەبێت وریا بم و کەرەستەکانی نەخەمە لێواری پەنجەرەو مێزەکانەوە، نەوەك بکەونە خوارەوە. تێگەیشتیت؟، (وادیاربوو پێیباشترە کە وابزانرێت جاری پێشوو چوارچێوەی وێنەکان خۆیان کەوتونەتەخوارەوە)، بەجۆرێك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم هەروەك بڵێی بێنەقڵێکی تەواو عەیارم، هەربۆیە لەلای ئەو دەگۆڕدرام بۆ مرۆڤێکی بێنەقڵی تەواو عەیار. ڕێك کاتێك دەهات کە شتێك بەدەستمەوە کەوتبێتە سەر زەوییەکە، یان خەریکبو نەزانم تەباخی غازەکە دابگیرسێنم، هەندێکجار لەناو ڕێڕەوەکەدا دەوەستا، بە بێتاقەتییەوە کاتێك ڕۆیشتبوم دار بهێنم و ئێستە کە خەریکم دەگەڕێمەوە دەوەستاو سەیری دەکردم، هەروەك بڵێی زیاتر لە چاوەڕوانی ئەوم پێچوبوو.

بەشێوەیەکی نامۆ هەڵسوکەوتی ئەو زیاتر لە ڕوقایمیەکەی ویل بێتاقەتی دەکردم. یەك دوو جارێك ئەوە هات بە دڵمدا کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە خۆی بڵێم ئایا کێشەیەك هەیە یان نا. ئەمویست بڵێم: (تۆ بە منت گوت زیاتر لەبەر هەڵسوکەوتەکانم داتان مەزراندوم، تاوەکو لەبەر شارەزایی و پیشەییەکەم. ئێ باشە من ئەم هەموو ڕۆژە نەفرەتیانە بە شەوق و زەوقەوە لێرە بووم، بەوپەڕی بە بڕشتیەوە، هەربەوجۆرەی کە دەتانویست، ئەی باشە ئیتر کێشە چییە؟).

بەڵام کامیلا ترینەر ژنێکبوو کە بکرێت ئەم قسانەی لەگەڵدا بکرێت. سەرەڕای ئەمەش، هەستم دەکرد لەو ماڵەدا کەسێك بە شێوەیەکی ڕاستەو خۆ هیچ شتێکی بەویتر ناڵێت، (لی لی، پەرستاری پێشوو، ئەو عادەتە باشەی هەبوو کە بۆ لێنانی دوو جۆر لە سەوزەواتەکان تەنها سودی لەو مەنجەڵە وەردەگرت و بەکاری دەهێنا). ئەمەش بەم مانایە بوو کە تۆ زۆر زیاتر قاپ و دەفرەکان پیس دەکەیت و ماڵەکە شپرزە دەکەیت. یان دەیگوت (ویل لەوانەیە حەزت لە قاوە بێت)، یاخود (کۆمەڵێك کاری نوسینگەم هەیە کە دەبێت ئەنجامیان بدەم)، ئەمەش مانای ئەوە بوو کە تۆ ڕوقایمیت کردووە و ناچارم کە ژوورەکە بەجێبهێڵم.

هەموو ئەم ڕستانەی بە حاڵەتێکی خەمبارانەوە دەگوت، لە هەمانکاتیشدا بە پەنجە باریکەکانی خاچی ملیوانەکەی بەرەو پێش و دواوە دەجولاند، ژنێك بوو کە هەرگیز هەستەکانی ئاشکرا نەدەکرد، زۆر خۆویست و هێمن بوو. منیش زۆر بە ڕێزەوە زەردەخەنەم دەکرد و وام نیشاندەدا کە ئاگاداری هیچ شتێك نیم، بەردوامبوم لەوکارەی کە لەبەرامبەریدا موچەم وەردەگرت.

یان بەلایەنی کەمەوە هەوڵی خۆمم دەدا.

—ئەی هاوار! بۆچی بەزۆر و بە هێواشی بە چنگاڵ گێزەرم پێدەدەیت؟

سەیرێکی قاپەکەم کرد. خەریکبوم سەیری بێژەرە ژنەکەی ناو تەلەفیزیۆنەکەم دەکردو لە خۆمم دەپرسی ئەگەر من قژەکانم وەك ئەو بۆیاخ بکەم، دەبێت چ سەروفەسالێك پەیدا بکەم.

—ها.. نەخێر نایکەم.

—بۆچی گێزەرەکەت بە چنگاڵ ورد کردووە و لەژێر ساسەکەدا حەشارتداوە. خۆم بینیم. لە تەریقیدا سور بوومەوە. ئەو ڕاستی دەکرد. دانیشتبوم و خەریکبوم خواردنم پێدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرقاڵی سەیرکردنی هەواڵەکانی نیوڕۆژ بووین، خواردنی ئەو ڕۆژە گۆشتی گوێرەکەی سورەو کراو بوو. دایکی گوتبوی هەمیشە دەبێت سێ جۆر سەوزە بکەمە ناو قاپەکەیەوە. بەڵام ئەو ڕۆژە خۆی بەشێوەیەکی بەبڕشتانە گوتبوی کە سەوزەوات ناخوات. پێموانیە کە خواردنێك لە دوونیادا هەبێت و بۆ ئەو سودی هەبێت و بە منیان نەگوتبێت کە بۆ ویلی ئامادە بکەم.

—بۆچی دەتەوێت بەزۆر گێزەر بدەیتە دەرخواردم؟

—نەخێر وانییە.

—کەواتە گێزە لەناو قاپەکەدا نییە؟

سەیرێکی پارچە وردەکانی گێزەرەکەم کرد.

—باشە... زرۆ باشە...

چاوەڕوانی وەڵامی من بوو، برۆکانیشی بەرزکردبویەوە.

—باشە، وامزانی سەوزەوات بۆ ئێوە بەسودە.

بەشێکی بە فەرمانی خاتو ترینەر بوو، هەندێکیشی لەسەری سەعاتدا بوو. زۆرکات خواردنم بە تۆماس دابوو. دەبوایە سەوزەواتەکانی بەجوانی بهاڕدرانایە و وەك هەویرییان لێبهاتایە، یان

لەژێر قاژێکی گەورەی پەتاتەدا بشاردرایەتەوە. هەندێکجاریش بە پاستا پێماندەدا. هەرکاتێك کە سەرکەوتو بوینایە و سەوزەواتەکانمام بە تێکەڵی ببردایە بۆ دەمی، هەستمان بە سەرکەوتن دەکرد.

—مۆڵەت بدە شتێکت بۆ ڕونبکەمەوە. واتزانی بە خواردنی دوو پارچە گێزەر، حاڵ و بارودۆخم باشدەبێت؟

ئەم شێوازە لە قسەکردنی ویل بەلای منەوە زۆر بە بێئەقلانە دەهاتە پێشچاو، بەلاّم فێر بوبوم نیشانی نەدەم کە لەبەر قسەکانی دەترسم، بە هێمنیەوە وەلاّممدایەوە:

—بەڵێ، لە مەبەستەکەتان تێدەگەم.

لەپاش یەك خولەك ویل ترینەر دەستیکردە پێکەنین. هێندە هەناسەی سوار بوو کە هەردەتگوت خۆیشی باوەڕی نەبوو پێبکەنێت، سەری ڕاوەشاند.

—بۆ خاتری خودا.

منیش واقم بەناوبراودا وڕمابوو.

—باشە بۆچی دەتویست بە نهێنی گێزەرت بدەیتە دەرخواردم؟ لەوانەیە دواتریش بتویستایە بڵێیت تونێلەکە بکەمەوە بۆ ئەوەی جەنابی شەمەندەفەر بتوانێت کەلەرمی برۆکسلی وردبوو بگات بە وێستگەکە.

بۆ ساتێك بیرم لە قسەکەی کردەوە، بە سەروفەسالێکی ووشك و جیدیەوە گوتم:

—نەخێر، من تەنها لەگەڵ جەنابی چنگاڵدا کار دەکەم. جەنابی چنگاڵ وەك جەنانی شەمەندەفەر نییە.

تۆماس چەند مانگێك لەمەوبەر ئەم قسەیەی بۆمن کردبوو.

—دایکم فێری کردویت؟

—نەخێر ببورن.... من تەنها....من تەنها ئاگام لە خۆم نەبوو.

—لە تۆ بەدورە.

—زۆر باشە، زۆر باشە... ئەگەر بەڕاستی ئەم گێزەرە نەفرەتیانە بێزارت دەکەن، کۆیان دەکەمەوە.

—ئەم گێزەرە نەفرەتیانە نین کە بێتاقەت و بێزارم دەکەن. لەوە بێزارم چونکە بەردەستێك کە بە چەقۆو چنگاڵ دەڵێت کاك و خاتوون، گێزەرەکانی تێکەڵی خواردنەکانیتر کردووە و دەیداتە دەرخواردم.

—گاڵتەم کرد. ئێستە بهێڵن گێزەرەکان هەڵبگرم.

ڕوی خۆی وەرگێڕا.

—تێر بووم، تەنها چایم دەوێت.

کاتێك خەریکبوم لە ژورەکە دەچومە دەرەوە، بە دەنگی بەرز گوتی:

—هەوڵ مەدە ئەو کەلەرمە نەفرەتیەشی تێکەڵ بکەیت.

سەرقاڵی شۆردنی دەفرەکان بووم، نیتن گەیشتە ماڵەوە. پەرداخە دەسکدارەکەم دابەدەستیەوە و گوتم:

—ئەمرۆ زۆر دڵخۆشە.

—بەڕاست؟

هەمبەرگرەکەم لەناو چێشتخانەکەدا خوارد. هەوای دەرەوە زۆر سارد بوو.

ئێستە ئیتر ماڵەکە وەك ڕابوردو نادۆستانە نەبوو.

—گوتی ویستوتە ژەهراوی بکەیت. بەڵام گاڵتەی دەکرد، خۆ تێدەگەیت. لەوەی کە بە شێوەیەکی زۆر نامۆ قسەیەکی خۆشم بیست زۆر خۆشحاڵ بووم. بەڵام هەوڵمدا کە نیتن بەوە نەزانێت.

—بەڵێ.... تەنها کاتم پێبدە.

—ئێستە زیاتر قسە دەکات. پێشتر چەند هەفتەیەك تێدەپەڕی و تەنانەت یەك قسەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد. بەڵام لەم چەند ڕۆژەی ڕابوردوەدا دەبینم چەند ووشەیەکی گوتووە.

بیرم هاتەوە کە ویل پێیگوتبوم ئەگەر واز لە زۆر بلێی نەهێنم، ئەوکات ناچار دەبم بەم کورسییە تایەدارە بتکەم بە ژێرەوە، بە نیتنم گوت:

— وابزانم پێناسەی من و تۆ سەبارەت بە قسەکردن کەمێك لەیەکتری جیاوازن.

—ئێمە سەبارەت بە کریکت قسەمان کرد، دەبێت بڵێم کە...

دەنگی خۆی نزم کردەوە.

—خاتوو ترینەر یەك دوو هەفتە لەمەوبەر پرسیاری لەمن کرد کە بەباشی کاردەکەیت یان نا. منیش گوتم کارەکەت بەباشی دەزانیت و شارەزایت، بەڵام خۆ دەمزانی کە مەبەستی ئەمە نییە. دواتر دوێنی هات بۆلام و گوتی کە دەنگی پێکەنینی ئێوەی بیستووە.

بیرم لە ڕۆژی پێشوو کردەوە.

—خەریکبوو بە من پێدەکەنی.

بە لای ویلەوە پێکەنیناوی بوو کە دەمزانی پستو[^] چییە. بەوم گوتبو کە بۆ نانی ئێوارە پاستامان هەیە بە ساسی سەوزەوە.

—ئەها... هۆکاری پێکەنینەکە بۆ خاتوو ترینەر گرنگ نییە. ماوەیەکی زۆر بوو کە هیچ شتێك نەیتوانیبوو ناوبراو بخاتە پێکەنین.

ئەوە ڕاست بوو. چونکە بە ڕواڵەت من و ویل ڕێگەیەکی ئاسانترمان بۆ هەڵکردن بەیەکەوە دۆزیبویەوە. ئەو زۆر بەتوندی لەگەڵ مندا دەجولایەوە، منیش هەندێکجار وەك خۆی مامەڵەم لەگەڵدا دەکرد. کاتێك بەمنی دەگوت کە کارێکم بەدروستی ئەنجامنەداوە، منیش وەلامدەدایەوە کە ئەگەر بەڕاستی بەلایەوە گرنگە دەبێت بە زمانی خۆش داوام لێبکات. بەلام ویل بەپێچەوانەوە دەجولایەوەو قسەی بێمانای بەرامبەر دەکردم، یان بە بۆگەن بانگی دەکردم. منیش وەلامدەدایەوە و دەمگوت کە ئەم ووشەی بۆگەنە لە بیرو مێشکی خۆی بباتە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانێت چەندێك کاریگەری لە ژیانیدا دەبێت. ئەم جۆرە مامەلانە تاوەکو ئاستێکی نەخوازراو وەپێش دەهاتن، بەلام وادیاربوو بۆ هەردوکمان سودی هەبوو. تەنانەت بەوجۆرە دەهاتە پێشچاو کە مایەی هێمنی و ئارامییە، کاتێك دەبینێت کەسێك هەیە و ئامادەیە وەلامیبداتەوە، یان دژایەتی دەکات و پێی دەڵێت مرۆڤێکی ترسناکە. هەربۆیە گەیشتبویە ئەو دەرئەنجامەی کە لەوکاتەوە توشی ئەو ڕووداوە بووە و هەموو کەسێك بە ڕێك و ڕاستی لەدەوروبەریدا ڕۆیشتون و داریان بەدەستەوە بووە، —ئەڵبەتە بێجگە لە نیتن کە وادیاربوو بە شێوەیەکی ناخودئاگا ڕەفتارێکی بەڕێزی لەگەڵ ناوبراودا هەبوو، چونکە وادیاربوو لەبەرامبەر قسەکانیەوە زۆر بەتوندی وەلامیدابویەوە— هەربۆیە لە بنەڕەتدا نیتن لەسەر ڕێگەی نەشتەرەکانی ویلدا نەمابوو.

[^]: جۆرێکە لە ساسی ئیتالی کە ڕەنگەکەی سەوزە.

—تەنها ئاگادار بە کە لەمە زیاتر نەبێتە کەرەستەی پێکەنینی ئەو.

پەرداخەکەم خستە ناو لەگانی قاپشۆردنەکەوە.

—باوەڕناکەم ئەوە مەسەلەیەکی گرنگ بێت.

بێجگە لە کەشوهەوای ناوخۆی ماڵەوە، گۆڕانکارییەکی تری گەورە ڕوویدابوو. ئێستە ئیتر ویل وەك ڕابوردوو داوای لەمن نەدەکرد کە بەتەنها بەجێی بهێڵم. تەنانەت یەك دوو جار بەمنی گوت ئەگەر حەز بکەم دەتوانم لەژوورەکەدا بمێنمەوە و بەیەکەوە سەیری فیلم بکەین. ئەگەر فیلمەکە ترمیناتور بوو، لەگەڵ ئەوەی کە هەموو فیلمەکانیم بینیبوو، بەڵام ئامادە بووم دووبارە بیانبینمەوە. بەڵام کاتێك فیلمێکی فەرەنسی بە ژێرنوسەوە نیشاندام، بەگشتی سەیرێکی بەرگەکەیم کرد و گوتم لەوانەیە حەزم لە بینینی نەبێت.

—بۆچی؟

شانەکانم بەرز کردەوە.

—حەزم لە فیلمی ژێرنوس نییە.

—هەروەك ئەوە وایە کە بڵێیت فیلمت بە هونەرمەندەکەوە خۆشناوێت. گاڵتە مەکە. حەزت لە چی نییە؟ لەوەی کە بەو ئەندازەیەی کە دەبێت سەیر بکەیت، دەبێت بخوێنیتەوە؟

—حەزم لە فیلمە بێگانەکان نییە.

—بێجگە لە فیلمی (قارەمانی ناوچەیی) نەبێت، هەموو فیلمەکان بێگانەن. ئەی پێتوایە چییە! لەوانەیە واتزانیبێت کە هۆلیود لەناو (بیرمنگم)دایە.

—پێکەنیناوییە.

کاتێك دانم بەوەدا نا کە هیچکاتێك حەزم لە فیلمی ژێرنوس نەبووە، نەیدەتوانی باوەڕ بە قسەکەم بکات. کاتم نەبو بۆ سەیرکردنی فیلم. باوکودایکم شەوانە کۆنترۆڵەکەیان بە هی خۆیان دەزانی. بینینی فیلمی بێگانە بۆ پاتریك وەك ئەوە وابوو کە پێشنیاری بەشداریکردنی لە خولە شەوانەکانی قاڵی چنیندا بۆ بکەیت.

سینەمای چەند هۆڵ لە نزیکترین شاری ئێمەدا تەنها کۆتا فیلمەکانی (تەقەیان لێبکە) یان کۆمیدییە عاشقانەکانی نمایش دەکرد. ئەو نەوجەوانانەی کە هۆویان دەکرد و قەمسەڵەی کلاّودارییان لەبەر دەکرد، بەجۆرێك هەڵمەتیان دەبرد بۆ بینینی ئەم فیلمانە، ئیتر زۆر بەکەمی گەورەکان خۆیان توشی ئەو قەرەباڵغییە دەکرد.

—لو دەبێت سەیری ئەم فیلمە بکەیت، واتە فەرمانت پێدەکەم کە هەر دەبێت تەماشای بکەیت.

ویل کورسییە تایەدارەکی سوڕاندەوەو ئاماژەی بۆ قەنەفەیەکی ئیسراحەت کرد:

—لەوێدا دانیشە، هەتاوەکو فیلمەکە تەواو نەبێت هەڵنەستیتەوە. هیچکاتێك سەیری فیلمی بێگانە ناکات، زۆر سەیرە!

فیلمێکی فەرەنسی بوو سەبارەت بە (پیاوێکی کۆپارە لەپشت) کە خانویەکی لە دەوروبەری ناوچە گوندنشینەکانی فەرەنسادا بە میرات بردبوو. ویل گوتی لەسەر بنەمای کتێبێکی بەناو بانگ دروستکراوە، بەلاَم من هیچم لەبارەیەوە نەبیستبوو. بیست خولەکی یەکەمم بە نارەحەتییەوە تێپەڕاند.

ژێرنوسەکان تورەیان دەکردم. نازانم ئەگەر بمگوتبایە بچم بۆ تەوالیت ویل تورە دەبوو یان نا.

دواتر ڕووداوێك ڕویدا. لەبیرم چویەوە کە چەندە قورسە مرۆڤ لەیەککاتدا هەم ببیستێت و هەم بخوێنێتەوە. لەبیرم چوو دەرمانەکە بدەم بە ویل. ئاگام لێنەبوو کە لەوانەیە خاتوو ترینەر وابزانێت تەمبەڵی دەکەم. وردە وردە نیگەرانی پیرەپیاوە هەژارەکە و خێزانەکەی بوبوم، کە دراوسیٚ نالەبارەکانی دەیانخەڵەتاند. کاتێك پیاوە کۆپارە لەپشتەکە مرد، بەبێدەنگییەوە گریام. ئاوی لوتم بە قۆڵی کراسەکەم پاکدەکردەوە. ویل هاتە پاڵم.

—باشە..

لەژێر چاوەوە سەیرێکی کردم.

—وادیارە هەر حەزت لێی نەبوو!

سەرم بەرزکردەوە، بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دەبینم دوونیا تاریکیکردووە، دەستمبرد بۆ کلێنسەکان.

—لەوانەیە ئێستە دڵت ئاوی خواردبێتەوە ئەریٚ؟

—بەڵیٚ کەمێك. بەلاَم تەنیا سەرم لەوە سوڕماوە کە تۆ تەمەنت چەندە؟

—بیست و شەش سالٚ.

—تەمەنت گەیشتبێتە بیست و شەش سالٚ و هەرگیز فیلمت بە ژێرنوسەوە نەبینیبێت!

لەوکاتەی کە خەریکبووم چاوەکانم دەسڕی بەردەوام سەیری دەکردم.

سەیری کلێنسەی دەستمکرد و دەبینم ڕیپۆقی چاوەکانم پاکبونەتەوە. بە لوشکەیەکەوە گوتم:

—هەرگیز ئاگام لەخۆم نەبوو بە زۆر داتنیشاندوم.

—زۆر باشە، لوئیزا کلارك، ئەی ئەگەر سەیری فیلم ناکەیت چی دەکەیت.

کلێنسەکەم لە ناو دەستمدا گرمۆڵە کرد.

—حەزدەکەیت بزانی کاتێك لێرە نیم چی دەکەم؟

—ئەوە تۆ بویت کە دەتویست یەکتری بناسین. دەی وەرە سەبارەت بە خۆت قسەم بۆ بکە.

ئەمە شێوازی قسەکردنی بوو، بەڵام مرۆڤ نەیدەتوانی بەتەواوەتی دڵنیاببێتەوە کە مەبەستی گاڵتەپێکردن نەبێت. من چاوەڕوانی باجم دەکرد لەلایەن ئەوەوە. هەر بۆیە گوتم:

—چۆن. چی بووە کە کتوپڕ دەتەوێت بزانی؟

—ئای لەدەستتۆ. خۆ تێکەڵییەکانت نهێنی دەوڵەتی نییە؟

بێتاقەت دەهاتە پێشچاو، گوتم:

—نازانم.... هەندێکجار دەچم بۆ مەیخانە و لێوێك تەڕ دەکەمەوە. سەیری تەلەفیزیۆن دەکەم. دەچم و سەیری هاوڕێ کوڕەکەم دەکەم کە سەرقاڵی ڕاهێنانی ڕاکردنە. هەر ئەوەندە، کارێکی تایبەت ناکەم.

—سەیری هاوڕ کوڕەکەت دەکەیت کە وەرزش دەکات؟

—بەڵێ..

—خۆ خۆت ڕاناکەیت؟

—نەخێر بەهیچ شێوەیەك.

سەرم داخست و ئاماژەم بۆ خۆم کرد.

—ڕاهێنانی لەشجوانی دەکەم.

قسەکەم زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوەکانی.

—ئێ باشە، ئیتر چ کارانێکیتر دەکەیت؟

—مەبەستت چییە؟

—خۆت بە چییەوە سەرقاڵ کردووە؟ بۆ گەشت و گەڕان بۆ کوێ دەچیت؟

وەك مامۆستاكانی قوتابخانە دەستیکرد بە پرسیارکردن. هەوڵمدا بەبیری خۆمی بهێنمەوە.

–سەرقاڵییەکی تایبەتم نییە. هەندێکجار کتێب دەخوێنمەوە. زۆر حەزم لە جلوبەرگە.

–چەندە باشە..!

– من زۆر ئەهلی سەرقاڵی و گەشت و گەڕان نیم.

ئاوازی دەنگم بە شێوەیەکی سەیر ئاڵۆز بوبو.

–لە کوێ دەژیت؟

–لەوبەری قەڵاکەوەو لە شەقامی رن فرو.

سەرسام دەهاتە پێشچاو، ئەڵبەتە هەر بەڕاستیش جێگەی سەرسوڕمان بوو. مرۆڤەکانی ئەمبەری قەڵاکە زۆر لەگەڵ ئەوبەری قەڵاکەدا نەیاندەکرا.

ماڵەکەمان نزیکی شەقامی سەرەکییە، لە تەنیشت ماکدوناڵدز.

سەرێکی ڕاوەشاند، هەرچەندە دڵنیا نەبووم کە بەتەواوەتی تێگەیشتبێت مەبەستم چ شوێنێکە.

–ئەی لەکاتی پشووەکاندا چی دەکەیت؟

–لەگەڵ پاتریکی هاوڕێمدا چوبوم بۆ ئیسپانیا.

لەسەر قسەکانم بەردوامبوم:

–لە منداڵیشمدا تەنها چوبوم بۆ (دوربست( و (تنبی). پورم لە تنبی دەژی.

–چیت دەوێت؟

–یانی چی؟

–چیت لە ژیانت دەوێت؟

موشەیەکم کرد.

–چ پرسیارێکی قورسە، چوزانم!

–بەگشتی پرسیم. نامەوێت خۆت بپشکنی. تەنها پرسیم کە چ بەرنامەیەکت بۆ ژیانت هەیە؟ هاوسەرگیری ناکەیت؟ بۆ ئەوەی منداڵت ببێت؟

خەونت هەیە؟ دەتەوێت گەشتی دوونیا بکەیت؟

هەڵوەستەیەکی دوورودرێژی کرد.

وابزانم تەنانەت پێش ئەوەی قسەکەیشم بکەم، دەمزانی کە وەڵامەکەم ئەو بێ هیوا دەکات.

—نازانم. هیچکات به جیدییەتەوە بیرم لەم شتانە نەکردووەتەوە.

***

ڕۆژی هەینی چووم بۆ نەخۆشخانە. خۆشحاڵم کە ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی پێشتر نەمزانیبوو کە ویل نەخۆشخانەی هەیە، چونکە هەموو شەوەکە لەسەر جێگەکەم بە بێداری دەمامەوە و نیگەرانی بردنی بووم. بەڵێ ئەوە ڕاستە کە شۆفێریم دەکرد، بەڵام بە هەمان ئەندازە کە دەتوانم بڵێم توانای قسەکردنم بە فەرەنسی هەیە. ئەوە ڕاستە کە تراییم دابوو دەرچووبوم، بەڵام لەساڵێکدا لەجارێك زیاتر شۆفێریم نەکردووە. بەهۆی بیرکردنەوە لەوەی کە ویل و کورسییە تایەدارەکەی سواری مینی ڤینەکە بکەم کە بۆ ئەمکارە گونجاو بوو بە سەلامەتی بیبەم بۆ شارەکەی نزیکمان و دواتر بیهێنمەوە. ترس و تۆقین کەوتبویە گیانمەوە.

تاوەکو چەندین هەفتە ئارەزوم دەکرد کە خۆزگایە کاری ڕۆژانەم لەو ماڵەدا بەشێوەیەك بوایە کە هەندێکجار دەبوایە لە ماڵەوە بچمە دەرەوە. بەڵام بەپێچەوانەوە دەبوو لەناو ئەو ماڵەدا بمێنمەوە. پێشتر کارتی نەخۆشخانەکەم لەسەر فایلی بارودۆخی جەستەیی ویل دانابوو، فایلەکە کە دابەشکرابوو بە گواستنەوە و بیمە. تواناویستی و کاتی دکتۆر. کارتەکەم لەسەر فایلەکە هەڵگرت و سەیرم کرد. لە خودام دەویست کە ویل لە گوتنی کات و وادەی سەردانی نەخۆشخانەکەیدا هەڵەی کردبێت، بەڵام ڕاست بوو، ویل هەر ئەو ڕۆژە کاتی سەردانی پزیشکی هەبوو.

—دایکیشت دێت؟

—نەخێر نایەت لەگەڵمدا بۆلای پزیشك.

نەمدەتوانی سەرسامی خۆم بشارمەوە. چونکە وامزانی ئەیەوێت چاودێری تەواوی دەرمان و چارەسەرەکانی کوڕەکەی بکات.

ویل گوتی:

—پێشتر دەهات. بەڵام ئێستە بەیەکەوە بڕیارمانداوە کە نەیەت.

—ئەی نیتن دێت؟

لەبەرامبەریەوە چۆکم دادابوو خواردنم پێدەدا. هێندە تووڕە بووم کە خواردنەکە ڕژا بەسەر پێیەکانیدا، ئێستەیش بە بێهۆشییەوە هەوڵمدەدا کە پاکی بکەمەوە. هەربۆیە پانتۆڵەکەی زۆر

تەڕ بوبو. ویل شتێکی نەگوت، تەنها ئەوەی گوت کە هێندە داوای لێبوردن نەکەم. بەڵام ئەو قسەیە هیچی لە دڵەخورپەکەم کەم نەکردەوە.

—بۆچی؟

—هەروا.

حەزم نەدەکرد بزانێت چەندە نیگەرانم. هەموو بەیانیم بەسەر برد و دەفتەرچەکانی تایبەت بە ڕێنمایی سوارکردنی ویل بۆ سەر کورسی تایەدارەکەم دووجار خوێندەوە، لە کاتێکدا کە دەبوایە ئەمکاتەم لە پاککردنەوەدا سەرف بکردایە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نیگەرانی ئەو ساتە بووم کە دەبوایە بەتەنیایی ویلم نزیکەی حەفتا سانتیمەتر بەرز بکردایەوە.

—کلارك بجوڵێ. کێشەیەك هەیە؟

—زۆر باشە، تەنها... تەنها بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە باشتر بێت جاری یەکەم کەسێکمان لەگەڵدا بێت کە کونج و کەلەبەرەکانی کارەکە بزانێت.

گوتی:

بۆ دژایەتی لەگەڵ مندا.

—نەخێر، بەو شێوەیە نییە.

—کەوابوو لەبەر ئەوەیە کە نابێت کۆمەڵێك شت لەبارەی تەندروستیمەوە بزانیت؟

ڕێکو ڕاست و بێ پەردە گوتم:

—تۆ دەزانیت ئیش بە بەشی ڕەمپای ناو ئۆتۆمبیلەکە بکەیت؟ دەتوانیت بە ڕێکی پێمبڵێیت دەبێت چی بکەم؟

چاوی بڕییە من. تێڕوانینی سارد و سڕو بێ هەست بوو. ئەگەر بەشوێن ئاژاوەدا بگەڕایە، بەڕواڵەت بیروباوەڕی گۆڕی، چونکە گوتی:

—ئاوا...! بەڵێ، نیتن دێت. یارمەتییەکی باشە. وابزانم ئەگەر لێرە بیت کەمتر توڕە دەبیت.

—من توڕە نیم.

—دیارە..!

سەیرێکی پانتۆڵەکەی کرد، منیش بەردەوام بە پارچە پەڕۆیەك سەرقاڵی پاککردنەوەی بووم. ساسی پاستاکەم بەپانتۆڵەکەیەوە پاککردبویەوە. بەڵام پانتۆڵەکەی تەڕ تەڕ بوبو.

—لەوانەیە ئیتر میز ڕانەگرم، ئەرێ.

هێشتا کارم تەواو نەبووە.

موجەفیفەکەم دا لە کارەباکە و گەرماکەیم ڕووکردە پانتۆڵەکانی. کاتێك هەوای گەرم چویە ناو پانتۆڵەکەیەوە، برۆکانی بەرز کردەوە. منیش گوتم:

—بەڵێ، هەرچەندە بیرم نەدەکردەوە کە پاشنیوەڕۆی هەینیم بەمشێوەیە بەسەر بەرم.

—تۆ بەڕاستی توڕەیت ئەی وانییە؟

ڕێك دیاربوو کە ئەیەوێت سەر بخاتە سەرم.

—تۆو کلارك چرچەکانی نێوچاوانت بکەرەوە! ئەوە منم کە هەوای موجەفیفەکە دەدات لە پێیەکانم.

وەڵامم نەدایەوە. لەبەر دەنگی موجەفیفەکە بە سەختی گوێم لەدەنگی دەبوو.

—وازبێنە بابە، بۆ من کە کارم گەیشتوتە کورسی تایەدار، ئایا شتێکی لەمەش خراپتر هەیە؟

قسەکەی زۆر بێئەقڵانە بوو. بەڵام نەمتوانی ڕێگە لە پێکەنینی خۆم بگرم. خاوەن ناخترین مرۆڤی دوونیا ئەیویست من بهێنێتە سەرخۆم و دڵخۆشم بکات.

***

ئۆتۆمبیلەکەم بینی کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوانیتردا نەبوو. بەڵام کاتێك لە دواوە کرایەوە، ڕەمپایەك لە تەنیشتی ئۆتۆمبیلەکەوە هاتەخوارەوەو نوسا بە زەوییەك وە. من کورسی تایەداری تایبەتی دەرەوەی ویلم ڕاستەوخۆ بەرەو نزیکی ڕەمپاکە برد، نیتن دانیشتبوو سەیری دەکرد، ویل کورسییەکی تایەداری جیاوازی بۆ ئەو کاتانە هەبوو کە دەچویە دەرەوە. سەیرێکی ئیستۆپە کارەباییەکەم کردو بەوشێوەیە ڕێکمخست کە ناوبراو بە هێمنییەوە بەرزبکاتەوەو بیخاتە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە. نیتن سواری ئۆتۆمبیلەکە بوو، قایشی کورسییەکەی ویلی بەست و تایەکانی قوفڵکرد. منیش سواربوم، هەوڵمدەدا نەهێڵم دەستەکانم بلەرزن. برێکەکەم دایە خوارەوە و سەیارەکەم بە هێمنییەوە خستە ئیش و بەرەو نەخۆشخانە بەڕێکەوتین.

ویل لەبەر ئەوەی کە ئێستە لەماڵەوە دووربوو، کەمێك خۆی کۆکردبویەوە. هەوا زۆر سارد بوو. من و نیتن پاڵتۆیەکی ئەستورمان کردبویە بەری ویل و ملپێچێکی ئەستورمان بەستبوو بە گەردنییەوە، ویل لە هەموو کاتێك بێدەنگتر بوو، بێدەنگی هەڵبژاردبوو تاوەکو ئاستێك

کەوتبویە ژێرکاریگەری تیشکی جیهانی دەوروبەری خۆیەوە. هەرجارێك کە لە ئاوێنەی دواوە سەیرم دەکرد، دەبینم واقی بەدەرەوەی جامەکەدا وڕماوە. نەدەکرا لە سەروفەساڵییەوە شتێك تێبگەیت. بەردەوام لە ئاوێنەکەی پشتەوە سەیرم دەکرد، هەرچەندە نیتن لەوێ بوو، بەڵام دیسانەوە هەر نیگەران بووم، نەوەك ئیستۆپی کورسییە تایەدارە بەر ببێت، تەنانەت کاتێك بە توندی قاچم خستەسەر ئیستۆپەکە یان دەمکوژاندەوە. کە چەندینجاریش ئەوە ڕویدا، تەنها تەکانێکیداو چاوەڕێ بوو کە خۆم کۆبکەمەوە.

سەرئەنجام کاتێك گەیشتینە نەخۆشخانەکە، من لەتاو هەوڵ و کۆششی زۆردا لە ئارەقدا تەڕ بوبوم. سێجار دەوری گەراجی نەخۆشخانەکەم دایەوە، هێندە ترسابوم کە دەمویست شوێنێکی گەورە بدۆزمەوە بۆ ئەوەی بتوانم بەبەگ بچمە ناوییەوە و ئۆتۆمبیلەکە بوەستێنم. هەستم دەکرد کە خەریکە حەوسەڵەی هەردوکیان بەسەر دەچێت. سەرئەنجام شوێنێکم دۆزییەوە و وەستام. ڕەمپاکەم دایە خوارەوە و نیتن یارمەتیدام بۆ ئەوەی کورسییە تایەدارەکەی ویل لەسەر زەوییەکە جێگیر ببێت.

کاتێك نیتن دادەبەزی، دەستێکی کێشا بە پشتمدا و گوتی:

—ئافەرین شۆفێرییەکی زۆر باشت بۆ کردین.

بەڵام من گومانی هەبو کە بەوشێوەیە بوبێت.

تاوەکو مرۆڤ خۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکدا نەکات کە لەسەر کورسی تایەدار دانیشتووە، هەرگیز زۆرێك لە شتەکان نازانێت. یەکێکیان ئەوەی کە پیادەڕەوەکان چەندە خۆڵ و خاشاك و چاڵ و چۆڵیان تێدایە و هەندێکجاریش تەنها ناهەموارن. بە هێمنییەوە لە تەنیشت ویلەوە کە کورسیە تایەدارەکەی لێدەخۆڕی دەڕۆیشتم و دەمزانی کە چاڵ و چۆڵەکان ناوبراو بەشێوەیەکی خراپ تەکان پێدەدەن و بەرزو نزمی پێدەکەن. من بینیم کە چۆن ناچارە لەبەرامبەر هەندێك لە بەربەستەکانەوە بە خۆپارێزی تەواوەوە کورسییە تایەدارەکەی لێبخورێت. نیتن خۆی بە جۆرێك نیشاندەدا کە هیچ نابینێت، بەڵام من بەباشی دەمبینی کە ئاگای لێیەتی. ویل بە ڕوگرژ و زۆر جیدی دەهاتەپێشچاو.

خاڵێکیتر ئەوەبوو کە شۆفێرەکان زۆر بێئاگان و گوێ بە هیچ شتێك نادەن، ئۆتۆمبیل لە تەنیشت شەقامەوە بە لاری پارك دەکەن، یان بە شێوەیەك لەپاڵ یەکتریدا دەیانوەستێنن کە ڕێگەی کورسی تایەدار نییە بڕوات و تێپەڕێت. من توشی شۆك بوبوم، یەك دووجاریش بیرم

لەوە کردەوە کە یاداشتێکی توند بنوسم و بیدەم لە فلچەی سەیارەکان. بەلام وادیاربوو ئەم شتانە بۆ ویل و نیتن زۆر ئاسایی بوون. لە کۆتاییدا نیتن ڕێگەیەکی پەڕینەوەی دۆزییەوە و هەروا کە خۆم و خۆی لەملاو ئەولای ویلەوە دەڕۆیشتین، سەرکەوتوبوین کە پانتایی شەقامەکە ببڕین.

لەوکاتەوەی کە ماڵەوەمان بەجیهێشتبوو، ویل یەك ووشەیش قسەی نەکردبوو.

بینای نەخۆشخانەکە دوو سێ قات بوو لەبەر ڕووناکی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوە. بەشی ڕازاوەی پێشوازی زیاتر وەك هی ئوتێلە لوکس و پێشکەوتووەکان بوو، لەوانە بوو بڕیارنامەی لەگەڵ بیمە تایبەتەکاندا هەبوو.

من لەدواوە وەستام و ویلیش چویە پێشەوە و ناوەکەی بە کارمەندی پرسگەی نەخرشخانەکە گوت. دواتر چوم بەدوای ئەوو نیتنداو چوینە ناو ڕێڕەوێکی دوورودرێژەوە. نیتن کۆڵەپشتێکی گەورەی پێبوو، کە هەموو پێداویستیەکانی ویلی تێدا بوو. هەر لە پەرداخەوە بیگرە تاوەکو جلوبەرگە زیادەکان. نیتن بەیانی ئەو ڕۆژە بە ئامادە بوونی من کەرەستە و شتومەکەکانی خستبویە ناو جانتاکەوەو بە دوورودرێژی ڕووداوە گریمانییەکانی ڕونکردبویەوە. دواتر کاتێك سەروفەسالی تۆقیوی منی بینی گوتی:

—چەندە باشە کە هەمیشەیی نییە و هەندێکجار ناچارین ئەمکارانە ئەنجامبدەین!

من لەگەڵ ویلدا نەچومە ژورەوە بۆلای دکتۆر. لەگەڵ نیتندا و لەسەر کورسییەکانی دەرەوەی ژورەکەدا دانیشتم. کەشوهەوای ئەو شوێنە بۆنی نەخۆشخانەی نەدەدا. لەسەر لێواری پەنجەرەکان کۆمەڵێك گوڵدانی پڕ لە گوڵی تازەیان دانابوو کە تەنانەت یەك لقیشیان نەژاکابوو. زۆربەیان گوڵی کێوی بوون کە من ناوەکەیانم نەدەزانی، دیمەنێکی زۆر جوانیشیان هەبوو. لەپاش نیوکاتژمێر کە بەوشێوەیە دانیشتین گوتم:

—لێرەدا چی لەو دەکەن؟

نیتن سەری لەسەر کتێبەکە بەرزکردەوە.

—هەر شەش مانگ جارێك دەبێت پشکنینی بۆ بکرێت.

—بۆ ئەوەی بزانن باشتر بووە؟

نیتن کتێبەکەی خستە لاوە.

—باشتر نابێت مۆخی زیانی پێگەیشتووە.

–بەلأم خۆ تۆ عیلاج تەبیعی و ئەمشتانەی بۆ دەکەیت.

–تەنها هەوڵدەدەین بارودۆخی جەستەیی بەمشێوەیەو لەم ئاستەدا ڕابگرین. بۆ ئەوەی ڕێگری لە شیبونەوە و نەمانی خوێی ئێسکەکان و شلی پێیەکان و ئەمجۆرە شتانە بکەین.

کاتێك دووبارە دەستیکردەوە بە قسەکردن، ئاوازی قسەکانی هێمن و ئارام بوو، هەروەك بڵێی لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە کە دەبێت بێئومێدم بکات.

–لو، ویل هیچکات ناتوانێت بڕوات بە ڕێگادا. تەنها لە فیلمەکانی هۆلیوددا لەوانەیە شتی وا ڕووبدات. ئێمە تەنها هەوڵدەدەین کە ئێش و ئازارەکانی کەم بکەینەوەو ئەم ئەندازە جوڵەیەش کە هەیەتی بیپارێزین بۆ ئەوەی لەدەستی نەدات.

–عیلاجی تەبیعی لەبەر خاتری تۆ قبوڵ کردووە؟ چونکە پێشنیاری هەرکارێکی بۆ دەکەم قبوڵی ناکات و ڕەتی دەکاتەوە.

نیتن چرکێکی خستە لوتیەوە.

–ئەنجامی دەدات، بەلأم باوەڕناکەم زۆر دڵ بدات بە کارەکە. لەو سەرەتایەوە کە هاتبوم، زۆر بەجیدیەتەوە دەیکرد، بەلأم دواتر کە بینی باشتر نەبوو، ئیتر پێموابێت پشتگوێی خست، هەرچەندە وازی لێنەهێنا.

–بەبڕوای تۆ دەبێت بەردەوام بێت لەسەری؟

نیتن سەیری زەوییەکەی کرد.

–ڕاستیەکەیت پێبڵێم؟ ئیفلیجی چوارپەلە لە فەقەرەی ٥ و ٦ .

دەستی خستە سەر بەشی سەرەوەی قەفەسەی سینەیەوەو گوتی:

–واتە لێرەوە بەرەو خوار جوڵەی نییە. هێشتا چارەسەریان بۆ نەدۆزیوەتەوە.

سەیرێکی دەرەوەم کرد، دەموچاوی ویل کاتێك لەبەردەم تیشکی خۆری زستانەدا سواری ئۆتۆمبیلەکە بوین، هاتە بەرچاوم. ئەم پیاوە خامۆش و بێدەنگە هەمان ئەو پیاوە دەمبەخەندەیە بوو کە لەکاتی پشوەکاندا دەچوو بۆ خلیسکێنەی سەر بەفر.

–هەمیشە زانستی پزیشکی لە حاڵی پێشکەوتندایە. بۆ شتێکی لەمجۆرە بەدڵنیاییەوە هەوڵی خۆیان دەدەن.

نیتن بە ئاوازێکی گونجاوەوە گوتی:

–ئێرە نەخۆشخانەیەکی زۆر باشە.

–ئەو شوێنەی کە هێشتا هیوایان بە ژیان هەیە، نا؟
نیتن سەیری منی کرد، دواتر کتێبەکەی کردەوە و گوتی:
–نەخێر هەرگیز.

***

لەسەر پێشنیاری نیتن نزیکەی چارەك بۆ سێ ڕۆیشتم بۆ ئەوەی قاوە بکڕم. دەیگوت هەمیشە کاری ویل درێژە دەکێشێت. گوتوبوی تاوەکو بگەڕێمەوە ئاگاداری بارودۆخەکەیە. لەبەشی پێشوازیدا دەورێکم دایەوە. سەیرێکی لاپەڕەی گۆڤارەکانی ڕۆژنامە فرۆشییەکەم کرد، لە بەردەمی چوکلێت فرۆشییەکدا هەندێك کاتم کوشت.

لەوانەیە هەروەك چاوەڕوان دەکرا، کاتێك ویستم بگەڕێمەوە بۆناو ڕێڕەوەکە، ڕێگەکەم وونکرد و ناچار بووم پرسیار لە چەند پەرستارێك بکەم کە لەکامە لاوە دەبێت بڕۆم، دوو کەسیان نەیاندەزانی. کاتێك گەیشتم قاوەکە سارد بوبویەوەو ڕێڕەوەکەیش چۆڵ بوبو. کاتێك چومە پێشترەوە دەبینم دەرگای ژوری پزیشکەکە نیوەکراوەیە. چەند ساتێك لەدەرەوەی ژورەکەدا وەستام، ئێستە ئیتر دەنگی خاتوو ترینەر لە گوێمدا دەزرنگایەوە، خەریکبوو سەرزەنشتی دەکردم کە بۆچی ویلم بەتەنهایی بەجێهێشتووە. ئەوەتا ئێستە دیسانەوە ئەمکارەم ئەنجامداوەتەوە.

دەنگێك هاتە بەرگوێم کە دەیگوت:

–کەوابوو جەنابی کاك ترینەر سێ مانگیتر دەتانبینمەوە. ڕێژەی دەرمانە ئیسپاسمەکانم دیاریکردووە. بەدڵنیاییەوە بۆ ئەنجامی پشکنینەکان پەیوەندیتان پێوە دەکەنەوە. بەگریمانی زۆر بەهێز ڕۆژی دووشەممە.

دەنگی ویلم بیست.

–دەتوانم ئەمانە لە دەرمانخانەکەی قاتی خوارەوە وەربگرم؟

–بەڵێ، تەنانەت لەوانەیە بتوانن زیاترتان پێبدەن.

دەنگێکی ژنانە هاتەبەرگوێ.

–فایلەکە هەڵبگرم؟

–گومانم برد کە کارەکەیان تەواو بووە. بە هێمنیەوە تەقەمدا لەدەرگاکە. دەنگێك گوتی: وەرە ژورەوە. بە هەردووچاو بەرەولای من ئاوڕی دایەوە.

پزیشکەکە لەسەر کورسییەکەی هەستایەوە و گوتی:

–ببورن وامزانی پەرستاری عیلاج تەبیعین.

هەروا کە دەستم بە کیلۆنی دەرگاکەوە بوو گوتم:

–من پەرستاری جەنابی کاك ویلم.

ویلیش لەناو کورسییە تایەدارەکەیدا بەرەو پێشەوە چەمایەوە و نیتنیش بلوزەکەی کێشایە خوارەوە.

–ببورن وامزانی جلەکانتان لەبەرکردەوە.

دەنگی ویل لەناو ژورەکەدا دەنگیدایەوە.

–لو، یەك خولەك بوەستە ئێستە دێین.

لەژێر لێوەوە داوای لێبوردنم کرد و لەژورەکە چومە دەرەوە. دەموچاوم گڕی گرتبوو. جەستەی ڕووت و لەڕو لاوازو پڕ لە برینی ویل نەبوو کە توشی شۆکی کردم، هەروەها سەروفەسالّی بێتاقەتی پزیشکەکەیش نەبوو، هەمان ئەو قیافەو سەروفەسالّەش نەبوو کە ڕۆژانە لە خاتوو ترینەردا دەمبینی، کاتێك خاتوو ترینەر ئەم قیافەیەی دەگرتەخۆی، دەمزانی سەرەڕای ئەو موچە زۆرەی کە وەرم دەگرت، هەروا هەمان بێئەقڵی شپرزەم لەبەرچاوی ناوبراو.

بەڵکو ئەو هێڵە سورە کوتراوانە توشی شۆکیان کردم کە خەتیان خستبویە مەچەکی ویلەوە. شوێنی برین بوو، لەسەر شێوەی هێڵی درێژ کە دەمیاندابویەوە و تیمارو چارەسەر نەدەکران. هەرچەندە نیتن بەخێراییەوە قۆڵی بلوزەکە ویلی ڕاکێشایە خوارەوە، بەلاّم بەداخەوە من هەر ئەو برینە قولّەم بینی.

{٦}

کاتێك لە ماڵەوە هاتمە دەرەوە، ئاسمان شینێکی درەوشاوە بوو. بەڵام دواتر بەجۆرێك کتوپڕ دەستیکردە بەفربارین کە لەماوەی نیوسەعاتدا هەموو شوێنێك سپی بوو. کاتێك لە تەنیشت قەڵاکەوە تێدەپەڕیم، دەبینم قەڵاکە هەر دەڵێی کێکی ڕازاوەیە و قەراغێکی سپی و قایم لە کرێم چواردەوری داپۆشیوە.

بە زۆر لەناو ڕێڕەوی ئۆتۆمبیلەکاندا ڕێگەی خۆمم کردەوە. دەنگی پێیەکانم نەدەهات و پەنجەکانم بێ هەست بوبون. پاڵتۆیەکی ئاوریشمی ناسکی چینیم لەبەردا بوو لەسەرماندا دەلەرزیم. لە گرنتاهاوسی داپۆشراو بەبەفر هەڵمی باریك بەرز دەبویەوە. هیچ دەنگێك نەدەهاتەبەرگوێ و بەشێوەیەکی زۆر نامۆ دەنگ و سەدای دونیا هێمن بوبویەوە. لەولای پەرژێنە چاککراوەکەوە، لەناو شەقامەکەدا ئۆتۆمبیلەکان بە هێمنی و خۆپارێزییەکی زیاترەوە تێدەپەڕین، ڕێبوارانی پیادە دەسوڕانەوەو هاواریان دەکرد. ملپێچەکەم دابەدەموچاومدا و لەبەرخۆمەوە دەمگوت خۆزگایە پێڵاوێکی گونجاوتر لە پێڵاوی کەتان و جلوبەرگێکی گەرمترم لە مەخمەڵ بپۆشیایە.

لەوپەڕی سەر سوڕمانی مندا، نیتن نەبوو کە دەرگاکەی بۆ کردمەوە، بەڵکو باوکی ویل بوو. لەناو دەرگاکەدا وەستا و لەوێوە سەیرێکی ئاسمانی کرد.

—لەناو جێگەکەیدا نەهاتوەتە دەرەوە، حاڵی هیچ باش نییە. نازانم تەلەفۆن بۆ پزیشك بکەم یان نا.

—نیتن لە کوێیە؟

—بەیانی مۆڵەتی وەرگرت، ئەڵبەتە تەنها ئەمڕۆ. پەرستاری نەفرەتی ئاژانسەکە بەخێراییەوە هات و ڕۆیشت. ئەگەر بەمشێوەیە بەفربارین بەردەوام بێت، نازانم دەبێت چی بکەین.

شانەکانی بەرز کردەوە. هەروەك بڵێی هیچکارێك ناکرێت. دواتر گەڕایەوە و لەناو ڕیزەوەکەدا بەرێکەوتەوە. دیاربوو کە ئێستە بێخەم بووە، بە هاتنی من ئەرکی سەرشانی ئەو هەڵگیرابوو. لە پاشملەوە گوتی:

–تۆ دەزانیت پێویستی بە چ شتانێك هەیە. ڕاستە؟

پاڵتۆو پێڵاوەکەم داکەند. دەمزانی خاتوو ترینەر چووە بۆ سەر ئیش. (لەناو ڕۆژمێری چێشتخانەکەی ویلدا ڕۆژەکانی کاری خۆی نیشانە دەکرد)، گۆرەوییە تەڕەکانم خستە سەر ڕادیاتۆرەکە بۆ ئەوەی ووشك ببنەوە. جوتێك گۆرەوی ویل لەناو سەبەتەی جلوبەرگە شۆردراوەکاندا هەبوون، منیش لەپێمکردن. بەشێوەیەکی پێکەنیناوی بۆ پێیەکانم گەورە بوون، بەڵام زۆر باش بوون بۆ ئەوەی قاچەکانم ووشك و گەرم ببنەوە. بانگی ویلم کرد، بەڵام وەڵامینەدایەوە. دواتر خواردنەوەم بۆ ئامادە کرد، تەقەم لە دەرگاکە دا و سەرێکم کێشایە ناو ژورەکەوە. لەژێر ڕووناکی لاوازی خۆری بەیانیدا تەنها توانیم جەستەی لەژێر لێفەکەوە ببینم. خەوێکی قوڵی لێکەوتبوو، هەنگاوێك گەڕامە دواوە، دەرگاکەم داخستەوە. چوم و سەرقاڵی ئیش و کار بووم.

بەرواڵەت ماڵێکی ڕێکوپێك هەستێکی ڕەزامەندانەی بە دایکم دەبەخشی، بەڵام من لەگەڵ ئەوەی کە یەك مانگ دەبوو ڕۆژانە کاری پاککردنەوە و گسکدانم کردبوو، هێشتا سەرنجراکێشییەکم تێدا نەدەبینی. تەسەورم وابوو کاتێك ژیانم مانا پەیدا دەکات کە هەرگیز ئەمجۆرە کارانە ئەنجام نەدەم.

بەڵام لەڕۆژێکی وەك ئەو ڕۆژەی کە ویل لەسەر جێگەکەی بوو دیاربوو کە دوونیای دەرەوە لە جموجۆڵ وەستابوو، کاتێك کونج و کەلەبەرەکانی ئەم خانووەم پاکدەکردەوە تاوەکو ئاستێکی باش دڵخۆشدەبم. هەروا کە سەرقاڵی پاکردنەوەو سڕین بوم، ڕادیۆکەم لەگەڵ خۆمدا لەم ژورەوە دەبرد بۆ ئەو ژورەکەیتر. دەنگیم کز کردبوو بۆ ئەوەی ویل بێزار نەکەم. هەزارجار سەرم لە ژورەکەی دەدا، بۆ ئەوەی دڵنیاببمەوە کە بارودۆخی باشەو ویل هەناسە دەدات. بەڵام کاتێك سەعات یەك تێپەڕی و ئەو خەبەری نەبویەوە، وردە وردە نیگەران بووم.

سەبەتەی دارەکانم پڕ کرد. چەند سانتیمەترێك لەبەرزایی ئەو بەفرەی کە نیشتبویە سەر زەوییەکە، کەم بوبویەوە. پەرداخێکی خواردنەوەم بۆ ویل دروستکرد و تەقەم دا لە دەرگای ژورەکەی، جاری دووەم بەهێزتر لێمدا.

–بەڵێ؟.

دەنگی دوو ئاواز بوو، وادیاربوو خەبەرم کردبویەوە.

–منم.

کاتێك وەڵامینەدامەوە، گوتم:

–لو،م دەتوانم بێمە ژورەوە؟

–وەرە ئێرە خۆ سەرقاڵی سەماکردن نیم!

ژورەکە تاریکبوو پەردەکان دادرابونەوە. چومە ژورەوە. وردە وردە چاوەکانم لەگەڵ تاریکیەکەدا ڕاهاتن. ویل لەسەرلا خەوتبوو. دەستێکی لەپێشەوە لار بوبویەوە، هەروەك بڵێی بە پاڵدان بەدەستیەوە ئەیەوێت دابنیشێت. پێشتریش بینیبوم، هەربەوشێوەیە بوو. هەندێکجاریش هەروەك بڵێی لەبیرم دەچوو، کە خۆی ناتوانێت تەپاوتل بدات. قژەکانی بەدەوری لێفەکەدا پێچرابوون. ژورەکە بۆنی پیاوی دەدا، جەستەیەکی گەرم و نەشۆردراوەی هەبوو بەڵام بێئازاربوو. تەنها بۆ یەك ڕۆژ کارێکی سەیر بوو.

–کارێك هەیە ئەنجامی بدەم؟ خواردنەوەت دەوێت؟

–ئەمەوێت بەسەرلاکەیترد بکەوم.

پەرداخەکەم لەسەر مێزی ڕەفەکان داناو بەرەو لای جێگەکەی ڕۆیشتم.

–ئەمەوێت چی بکەم؟

بەهێمنییەوە تفی خۆی قوتدایەوە، هەروەك بڵێی بە ئازارە بۆی.

–بەرزم بکەرەوە بۆ ئەوەی بکەوم بەسەرلاکەیتردا، دواتر پشتی کورسییەکە بەرز بکەرەوە، لێرەدا...

ئاماژەی کرد کە بچمە پێشترەوە.

–هەردوو دەستت بە پشتمەوە گرێبدەو دواتر بمبەرە دواوە. سمتت بخەرە سەر قەرەوێڵەکە، بەمشێوەیە فشار ناکەوێتە سەر پشتت.

نەمتوانمی سەرسوڕمانم بشارمەوە. لوتم پڕ بوو لە بۆنی ئەودا. پێستی گەرمی نزیکی پێستم بوویەوە. لەمە زیاتر نەمدەتوانی نزیك ببمەوە. وەگەرنا دەمم دەلکا بە گوێیەوە. ئەم بیرکردنەوەیە کەمێك تورەی کردم، هەوڵمدا زاڵبم بەسەر خۆمدا.

–چی بووە؟

—هیچ.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، هەردوو دەستم لەیەکتری گرێداو جێگۆڕکێم بە خۆم کرد، تاوەکو بەتەواوەتی هەستمکرد کە دەستم توند لە پشتی گیر بووە. پشتی زۆر پانتر بوو لەوەی کە چاوەڕوانم دەکرد. تەنانەت قورستریش بوو لەوەی کە بیرم لێکردبویەوە. دواتر بە ژماردنی یەك تاوەکو سێ ناوبراوم ڕاکێشایە دواوە.

هاواری کرد:

—یا عیسای مەسیح!

خەریکبوو لەدەستم بکەوێتە خوارەوە، گوتم:

—چی بووە؟

—بۆچی دەستەکانت ئەوەندە ساردن؟

—ئێ باشە، ئەگەر کەمێك ئەزیەتت بدایەتە بەرخۆت و لەسەر جێگەکەت بهاتبایتە دەرەوە، دەتبینی کە لەدەروە بەفر دەبارێت.

گاڵتەم کردبوو، بەڵام ئێستە دەبینم هەر بەڕاستی جەستەی لەناو بلوزەکەدا گەرمە، گەرمایەکی توند کە بەڕاستی لەناخی جەستەیەوە هاتبویە دەرەوە. کاتێك خەریکبوم پاڵیبدەم بە پاڵپشتەکەوە، ناڵەییەکی کرد. هەوڵمدا تاوەکو بۆم دەکرێت بە هێمنی و نەرم و نیانیەوە بیجوڵێنم. ئاماژەی بە کۆنترۆڵی قەرەوێڵەکە کرد بۆ ئەوەی بەهۆیەوە لای سەری قەرەوێڵەکە بەرز بکەمەوە.

لەژێر لێوەوە گوتی:

—زۆر نا، کەمێك سەرم گێژ دەخوات.

چراکەی سەر مێزەکەم داگیرساند، قرخەیەکی کرد، بەڵام من وا خۆم نیشاندا کە هیچم نەبیستووە. ئێستە ئیتر دەمتوانی دەموچاوی ببینم.

—ویل حاڵت باشە؟

دووجار پرسیارەکەم دووبارەکردەوە تاوەکو وەڵامیدامەوە.

—زۆر باش نیم.

—حەپی ئازارشکێنت دەوێت؟

—بەڵێ، بەڵام با بەهێز بێت.

-پاراسیتامۆڵ باشە.

ئاهێکی هەڵکێشاو پاڵیدا بە پاڵپشتەکەوە. پەرداخە ئاوەکەم بردە پێشەوە، سەیرم کرد و دەبینم هەڵیدەقوڕێنێت. دواتر گوتی:

-مەمنونم.

کتوپڕ هەستمکرد کە زۆر بە ئازارم. تاوەکو ئێستە هیچکاتێك سوپاسی نەکردبووم. چاوەکانی داخست. چەند ساتێك لە ناو دەرگاکەدا وەستام و سەیرم کرد. قەفەسەی سینەی لەژێر بلوزەکەوە بەرزو نزمی دەکرد، کەمێك دەمی کرابویەوە. تاوەکو ئاستێك هەناسەدانی روکەش بوو، لەوانەیە بەبەراورد بە رۆژانی رابوردوو کەمێك سەختتر. بەڵام من هەرگیز ناوبراوم لەدەرەوەی کورسییە تایەدارەکەدا نەبینیبوو. هەربۆیە لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە کە لەوانەیە پەیوەندی بە ڕاکشان و پاڵکەوتنەوە هەبێت، بە چپەوە گوتی:

-برۆ.

منیش رۆیشتم.

کاتژمێر١٢:٣٠ بوو، دایکم پەیامی نارد و گوتی کە باوکم نەیتوانی ئۆتۆمبیلەکە ببات بۆ ناو شەقامەکە. گوتی پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆماڵەوە تەلەفۆن بکەم. نەمدەزانی چ بەرنامەیەکی هەیە. لەوانەیە ویستبێتی باوکم بە سورتمە و سن برنارد[١] بنێرێتە دەرەوە.

گوێم بۆ هەواڵە ناوچەییەکانی ڕادیۆ گرت. بەفرو بارانی چاوەڕواننەکراو کۆمەڵێك کێشە و گرفتی زۆری دروستکردبوو. ڕێگەکان گیرابوون. شەمەندەفەرەکان لە جوڵە وەستابون. قوتابخانەکان بە شێوەیەکی کاتی داخرابوون. گەڕامەوە بۆ ژورەکەی ویل بۆ ئەوەی سەیرێکی بکەم. لە ڕەنگی دەموچاوی زۆر بێتاقەت بووم. هەرجارێك کە سەردانم کردبوو دەبینم ڕەنگ بەڕوییەوە نەماوە و کوڵمەکانی بریقەیان دەهات. بە هێمنیەوە گوتم:

-ویل؟

هیچ جوڵەیەکی نەکرد.

-ویل؟

---

[١] ڕەگەزێکە لە سەگە کویستانییەکان کە لە ئیتالیا دەژی و توانایەکی تایبەتی لە پێشبینی بەفرو زریاندا هەیە.

ورده ورده خەریكبوو نیگەران دەبووم. دووجاریتر بانگم كرد. بەلاّم هیچ وەلاّمێكم وەرنەگرت. تاوەكو چەمامەوە بەسەریداو سەیرم كرد، دەموچاوی هیچ جوڵەیەكی نەبوو، هیچ جوڵەیەكیشم لەناو قەفەسەی سینەیدا نەدەبینی، دەبوایە هەستم بە هەناسەی بكردایە. كاتێك نەمتوانی هەست بە هەناسەی بكەم، هەوڵمدا هەناسەدانەوەكەی هەستپێبكەم. كاتێك نەمتوانی دەستم بردە پێشەوە و بە هێمنییەوە دەستێكم بە دەموچاویدا هێنا. جوڵەیەكی كرد، دەمی بە دەنگەوە كرایەوە. تەنها چەند سانتیمەترێك لە دەمی منەوە مەودای هەبوو. خێرا خۆم كێشایە دواوەو گوتم:

—ببورە.

چاوێكی داخست و كردیەوە. سەیرێكی ژورەكەی كرد، هەروەك بڵێی دەوروبەرەكە بەلایەوە نەناسراو بوو.

كاتێك هەستمكرد لەوانەیە منی نەناسیبێتەوە، گوتم:

—من لوئیزام.

كەمێك تورە و دەموچاوگرژ دەهاتەپێشچاو.

—دەزانم.

—حەزت لە سوپ هەیە؟

—نەخێر، سوپاس.

چاوەكانی داخستەوە.

—هێوركەرەوەیەكیتر بهێنم.

دڵۆپە ئارەقی وورد و درەوشاوە لەسەر گۆناكانییەوە دەدرەوشانەوە. لێفەكەیشی گەرمبوو بە ئارەق شێدار ببوو، خەمبار بووم.

—كارێك هەیە كە دەبێت بیكەم؟ مەبەستم ئەوەیە ئەگەر نیتن نایەت.

—بە چیەوە گوتی:

—نەخێر، من باشم.

دووبارە چاوەكانی داخستەوە.

سەیرێكی فایلەكەم كرد، گوتم لەوانەیە شتێكیان لەبیركردبێت كە پێبدەن. سندوقی دەرمانەكانم كردەوە چاوم بە دەستكێشی لاستیك و كەرەستەكانی تەداویكردن كەوت. هەر

نەشمدەزانی بەکەڵکی چی دێن. هەوڵمدا بە ئایفۆن قسە لەگەڵ باوکی ویلدا بکەم، بەڵام وادیاربوو کەس لەماڵەوە نەبوو. دەنگی جەرەسەکە تەنانەت لەبەشی فەرعیشدا دەنگیدەدایەوە.

ئەمویست تەلەفۆن بۆ خاتوو ترینەر بکەم، کە دەرگای پشتەوەی ماڵەکە دەنگی لێوەهات. نیتن هاتە ژورەوە. جلوبەرگی باشی لەبەر کردبوو، ملپێچێکی خوری و کڵاوێك کە سەری دادەپۆشی. لەگەڵ خۆیدا شنەیەك لە هەوای سارد و بەفراوی هێنابویە ژورەوە. هەروەك بڵێی کتوپڕ ماڵەکە لە خەوو خەیاڵ خەبەری بوویەوە، گوتم:

—ئەی هاوار سوپاس بۆ خودا کە هاتیت.

حاڵی باش نییە. زۆربەی بەیانی هەر خەوتووە. شتێکی ئەوتۆیشی نەخواردووە. نازانم چی بکەم.

نیتن پاڵتۆکەی داکەند.

—ناچار بووم هەموو ڕێگەکە بە پیادە بێم. پاسەکان کار ناکەن.

نیتن چوو سەرێك لە ویل بدات. منیش چوم چای بۆ بهێنم. هێشتا کترییەکە نەکولابوو، کە نیتن گەیشتە ماڵەوە.

—جەستەی زۆر زۆر گەرمە، لەکەیەوە وایلێهاتووە؟

—هەر لە سەرەتای بەیانییەوە. خۆیشم بینیم کە چەندە گەرمە. بەڵام خۆی گوتی ئەیەوێت بخەوێت.

—ئەی هاوار لەبەیانییەوە بەوشێوەیە؟ ئەی نەتدەزانی کە جەستەی ناتوانێت گەرمای جەستەی ڕێکبخاتەوە.

بە دەست منی بردە کەنارەوەو دەستیکردە گەڕان بەناو سندوقی دەرمانەکاندا.

—ئەنتیبایۆتیك، بەهێزترینی.

یەکێك لە قوتوەکانی هەڵگرت و حەبێکە کردە ناو هاوانە دەستیەکەوە و بە توڕەییەوە دەستیکردە هاڕینی.

منیش لە دوایەوە وەستابوم، گوتم:

—پاراسیتامۆڵم پێداوە.

—دەبوایە لەگەڵیدا ئەمەیشت پێبدایە.

–نەمدەزانی. کەس پێی نەگوتبوم. هەموو بیرو خەیاڵم لەلای ئەو بوو.

–لەناو ئەم فایلە نەفرەتیەدا نوسراوە. گوێ بگرە. ویل وەك ئێمە ئارەق ناكات. لەڕاستیدا لەوكاتەوە كە زیانی پێگەیشتووە هەرگیز ئارەق ناكات. واتە ئەگەر كەمێك سەرمای ببێت پلەی گەرمای جەستەی تێك دەچێت. بڕۆو پانكەیەكم بۆ بهێنە، دەبێت دایبگیرسێنین تاوەكو پلەی گەرمای جەستەی دادەبەزێت، خاولییەكی تەڕیش بهێنە بۆ ئەوەی بیپێچین لە گەردنی. تاوەكو بەفرەكە نەوەستێتەوە ناتوانین بیبەین بۆلای پزیشك. نەفرەت لەو پەرستارەی كە ئاژانسەكەی نارد، دەبوایە بەیانی بیانزانیایە.

تاوەكو ئەو ڕۆژە نیتم ئەوەندە بە توڕەیی نەبینیبوو. ئیتر قسەی لەگەڵ مندا نەكرد. ڕۆشتم بۆ ئەوەی پانكە بهێنم.

نزیكەی چل خولەكی خایاند تاوەكو پلەی گەرمای جەستەی ویل كەمێك باشتر بوو. هەروەك چاوەڕێبووین كە تا لابەرو ئازارشكێنەكە كاریگەری بكات، بەپێی فەرمانی نیتن خاولییەكی تەڕ لەسەر دەموچاوو دانەیەكیشم پێچا بە گەردنییەوە. جلوبەرگەكانمان لابرد و بە چەرچەفێكی خام بەباشی هەموو جەستەیمان داپۆشی. پانكەكەمان ڕوتێكرد، ئێستە ئیتر دەستی ڕوت بوو. شوێنی برینەكە بەتەواوەتی دیاربوو. منیش واخۆمم نیشاندەدا كە نەمبینیوە، نیتنیش هیچ قسەیەكی نەكرد.

ویل بە بێدەنگییەوە ڕاكشاو مۆڵەتیدابن كە چاودێری بكەین. وەڵامی پرسیارەكانی نیتنی تەنها بە بەڵێ و نەخێر دەدایەوە. هەندێكجاریش وەڵامەكەی هێندە نەزانراو بوو كە دڵنیانەبووم كە ئاگای لە خۆی بێت كە چی دەڵێت، ئێستە بەڕۆژی ڕووناك دەبینم بەڕاستی نەخۆشە. بێتاقەتی ئەوە بووم كە بۆچی پێشتر بەو حاڵ و بارودۆخە خراپەیم نەزانیبوو. داوای لێبوردنم كرد، نیتنیش پێی گوتم كە وردە وردە حاڵی خراپ بووە.

–بەوردییەوە سەیربكە و بزانە چی دەكەم بۆ ئەوەی بەباشی فێرببیت. لەوانەیە دواتر ناچار ببیت كە خۆت بە تەنیا ئەمكارانە بكەیت.

دەمزانی جێگەی هیچ جۆرە ملەجەڕێیەك نییە، دواتر نیتنم بینی كە پانتۆڵەكەی ویلی داكەند و بە هێمنیەوە گازی تەداوییەكەی لەدەوروبەری بۆرییەكی بچوكی ناو سكیدا هەڵگرت و پاكیكردەوە و گازێكیتری لە جێگەیدا دانا، بەڕاستی ئەمكارانەم بەلاوە زۆر قورس بوون. نیتن ئەوەی فێركردم كە چۆن كیسەی میزەكەی بگۆڕم. ئەوەی بۆ ڕونكردمەوە كە بۆچی دەبێت

هەمیشە کیسەکە لە خوار جەستەی ویلەوە بێت. بەڵام کاتێك بینیم کە چەند ئاسایی کیسەی پڕ لە شلەی گەرمم لە ژوورەکەوە بردە دەرەوە، زۆر سەرم سوڕما. زۆر خۆشحاڵ بووم کە ویل ئاگاداری ئەمکارەم نەبویەوە. نەك لەبەر ئەوەی کە لەوانەیە قسەیەکی توندم بەرامبەر بکات، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو هەستمدەکرد تەریق دەبێتەوە ئەگەر ببینێت من کەوتومەتە ناو تایبەترین کارەکانییەوە.

نیتن گوتی:

—هەر ئەمە.

سەرئەنجام یەك سەعات دواتر، ویل لەناو چەرچەفە تازەکاندا ڕاکشابوو خەریکبوو وەنەوزو پشوی دەدا، ئیتر وەك پێشتر بەبێ حاڵ نەدەهاتە پێشچاو. بهێڵە بخەوێت، بەڵام لەپاش یەك دوو کاتژمێر خەبەری بکەرەوە، لەبیرت نەچێت کە شلەمەنی باشی پێبدەیت. کاتژمێر پێنجیش دووبارە تاو ئازارشکێنی پێبدە، تێگەیشتیت؟ بە گریمانی بەهێز پلەی گەرمای جەستەی تاوەکو سەعاتێکیتر بەتەواوەتی دادەبەزێت و ئاسایی دەبێتەوە. بەڵام تاوەکو پێش کاتژمێر پێنج حەبی پێمەدە.

هەموو قسەکانیم یاداشت کرد، بۆ ئەوەی لەبیرم نەچنەوە. لەوە دەترسام کە مەبادا هەڵەیەك بکەم.

—دەبێت عەسر هەموو ئەمکارانە دووبارە بکەیتەوە، خۆ دەزانیت؟

نیتن خۆی وەك ئیسکیموەکان داپۆشیوو ملی شەقامە بەفرینەکانی گرتە بەر.

—تەنها لەبیرت بێت یاداشتەکان بخوێنەرەوە، هیچ مەترسە، هەر کێشەیەکت بۆ دروستبوو تەلەفۆنم بۆ بکە. ئەوکات پێت دەڵێم کە چی بکەیت، تەنانەت ئەگەر پێویستیکرد خۆیشم دێم.

***

لەپاش ڕۆشتنی نیتن، لەناو ژوورەکەی ویلدا مامەوە، هێندە ترسابوم کە هەرگیز نەمدەتوانی بەجێی بهێڵم. لە سوچێکی ژوورەکەدا قەنەفەیەکی ئیسراحەتی چەرمی لێبوو، لە تەنیشتیەوە گڵۆپێکی خوێندنەوەش هەبوو. لەوانەیە هی ئەو کاتە بێت کە هێشتا ویل ئەو ڕووداوەی بەسەر نەهاتبوو. لەناو کتێبخانەکەدا کتێبێکم هەڵگرت و لەسەر قەنەفەکە پاڵمدایەوە و قاچم خستە سەرقاچ و دەستمکردە خوێندنەوەی داستانە کورتەکانی ناو کتێبەکە.

ژورەکە بەشێوازێکی زۆر سەیرو نامۆ هێمن و ئارام بوو. لەقەراغ پەردەکانەوە دوونیای دەرەوەم دەبینی، سەرانسەر سپی و جوان و پڕ لە هێمنی و ئارامی بوو. ماڵەکە گەرم بوو بەناو بێدەنگیدا ڕۆچوبوو. بێجگە لە چرکە چرکی ناخۆشی کاتژمێرەکە و دەنگی دەزگای گەرماکەی ویل کە زنجیرەی فیکرەکانمی دەپچڕاند، هیچ دەنگێکیتر نەدەهاتە بەرگوێ. سەرقاڵی خوێندنەوە بووم، هەندێکجاریش سەرم بەرزکردەوەو سەیری ویلم دەکرد، ئارام و بێدەنگ خەوتبوو. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە تاوەکو ئەمڕۆ لە تەمەنمدا ئەوەم بەسەر نەهاتبو کە لە شوێنێکدا بە بێدەنگی دابنیشم و هیچکارێك نەکەم. لە ماڵێکی وەك ماڵی ئێمەدا کە هەمیشە گسکی کارەبایی و دەنگی بەرزی تەلەفیزیۆن و ڤیزۆقاو هەیە، نەگونجاوە کە مرۆڤ بە ڕاهاتن لەسەر بێدەنگی گەورە ببێت. لە هەندێککاتدا کە تەلەفیزیۆن گوژابویەوە، باوکم گۆرانییەکانی ئالویس پریسلی بە دەنگی بەرز پەخش دەکرد، هەروەك قاوەخانە کە هەمیشە پڕ لە هات و هاوارو جۆش و خرۆشە.

بەڵام لەم ماڵەدا دەنگی بیرو زەینی خۆمم دەبیست و دەمتوانی گوێ بۆ لێدانەکانی دڵم بگرم. لەوپەڕی سەرسوڕماندا خۆمم دەبینی کە چەندە ئەم کەشوهەوایەم پێخۆشە.

کاتژمێر پێنج، مۆبایلەکە ئاماژەی دەدا کە نامەی بۆ هاتووە. ویل تەکانێکیدا. منیش لەسەر قەنەفەکە هەستامەوە. ویستم پێش ئەوەی دەنگی تەلەفۆنەکە بێزاری بکات، بێدەنگی بکەم.

(شەمەندەفەرەکان کار ناکەن. دەتوانیت شەو بمێنیتەوە؟ نیتن ناتوانێت بێت. کامیلا ترینەر).

یەکسەرو بەبێ ئەوەی کە بیرم کردبێتەوە وەڵامەکەم بۆ نوسی:

(کێشە نییە).

تەلەفۆنم بۆ ماڵەوەمان کرد و ئاگادارم کردنەوە کە شەو دەمێنمەوە. بەڕواڵەت دایکم بێخەمبوو. کاتێکیش گوتم کە بۆ کاری زیادەی شەو هەقدەست دەدەن، زۆری پێخۆش بوو.

دەستی نیوەو نیوەچڵ لەسەر تەلەفۆنەکە بوو گوتی:

—بیرنارد، تێگەیشتی؟ ئەگەر شەو بمێنێتەوە هەقدەستی پێدەدەن.

دەنگی حەپەساوی باکم بیست کە گوتی:

—ئەی شوکر بۆ خودا، ئیشی خۆی دۆزییەوە.

نامەیەکیشم بۆ پاتریك نارد. هەواڵمپێدا کە دەبێت شەو لەسەر کار بم و دواتر تەلەفۆنی بۆ دەکەمەوە. ئەویش یەکسەر وەڵامیدایەوە:

(ئەمشەو دەچم بۆ پێشبڕکێی ڕاکردنی سەر بەفر لە دەشتاییدا، ڕاهێنانێکی زۆر باش بۆ نەرویج!)

سەرم سوڕدەما کە چۆن دەکرێت مرۆڤ بە بیرکردنەوە لەوە کە بە جلوبەرگی وەرزشییەوە لە پلەی گەرمای ژێر سفردا ڕاهێنانی ڕاکردن بکات و تاوەکو ئەم ئاستە خۆشحاڵ بێت.

ویل هەر خەوتبوو. خواردنم بۆ خۆم ئامادە کرد. هەندێك سوپیشم لە بەفرگرەکە دەرهێنا بۆ ئەوەی ئەگەر حەزی لێی بوو بۆی گەرم بکەمەوە و بیخوات. شومینەکەی ژووری دانیشتنەکەم داگیرساند. لەوانەیە حاڵی ویل ئەوەندە باش ببێتەوە کە بتوانێت بێت بۆ ئەوێ. کورتە چیرۆکێکیترم خوێندەوە. ماوەیەکی زۆر بوو کتێبم بۆ خۆم نەکڕی بوو. لە منداڵیدا عاشقی کتێب خوێندنەوە بووم، بەڵام بەبیرم نەدەهاتەوە کە بێجگە لە گۆڤار بەم دواییانە شتێکیترم خوێندبێتەوە. ترینا هێشتا ئەهلی خوێندنەوە بوو. بە جۆرێك لە جۆرەکان هەستم دەکرد ئەگەر کتێبێك هەڵگرم و بیخوێنمەوە، ئەوا دەستدرێژیم کردووەتە سەر حەریم و دەسەڵاتی ئەو. بیرم لە تریناو تۆماس دەکردەوە کە بڕیاروابوو لەماڵی ئێمە بڕۆن و بچنە ناو شوقەکانی زانکۆ. هێشتا نەمدەزانی لەم بابەتە خۆشحاڵم یان بێتاقەت. لەوانەیە هەندێك لەم قسانە ئاڵۆزتر بوون هەستێکی بەین بەینم هەبوو.

نیتن سەعات حەوت تەلەفۆنی کرد. وادیاربوو بێخەم بوبو کە من شەو لەلای ویل دەمامەوە. گوتی:

—نەمتوانی پەیوەندی بە بەرێز ترینەرەوە بکەم. تەنانەت تەلەفۆنم بۆ تەلەفۆنی ژورەکەیشی کرد. بەڵام یەکسەر پەیوەستبوو بە پەیامگیرەوە.

—ئەها... لەوانەیە ڕۆیشتبێت.

—ڕۆیشتبێت؟

لەگەڵ ئەوەی کە بڕیار وابوو هەموو شەوەکە لەگەڵ ویلدا بە تەنیا بم، ناخودئاگا ترس هەموو گیان و جەستەی داگرتم. دەترسام دووبارە هەڵەیەکی گەورە بکەمەوەو تەندروستی ویل بکەوێتە مەترسییەوە.

—دووبارە تەلەفۆنم بۆ بەرێز ترینەر بکەمەوە؟

چرکەیەك بێدەنگی باڵیکێشا بەسەر خۆم و دەورووبەرەکەمدا.

—نەخێر. باشتر وایە تەلەفۆن نەکەیت.

—بەڵام....

— سەیرکە لو، هەرکاتێك خاتوو ترینەر شەو لەشار بمایەوە، بەڕێز ترینەریش نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە.

یەك دوو خولەکی ویست تاوەکو لە مەبەستەکەی تێبگەم.

—ئۆو..!

—هەر ئەوەی کە تۆ لەوێیت بەسە. ئەگەر دڵنیای کە حاڵی ویل باشە، کەوابوو منیش بەیانی زوو دێم بۆ ئەوێ.

***

هەندێکات بە شێوەیەکی سروشتی تێدەپەڕن، هەندێکاتیش بە شێوەیەکی ناسروشتی. هەندێکات هەردەڵێی کات درێژبووەتەوە و هەندێکاتیش هەست دەکەیت ژیان درێژ بووەتەوە، ژیانی ڕاستەقینە هەروەك بروسکەو هەوا تێدەپەڕێت. ئەو شەوە هەوڵمدا خۆم سەرقاڵ بکەم، سەیری تەلەفیزیۆنم کرد، نانم خوارد و چێشتخانەکەم پاککردەوە. بەناو ماڵە تاریك و بێدەنگەکەدا سوڕێکم خوارد. لە کۆتاییشدا گەڕامەوە بۆ ژورەکەی ویل. کاتێك دەرگاکەم داخست تەکانێکیدا. کەمێك سەری بەرزکردەوە و گوتی:

—کلارك کاتژمێر چەندە؟

دەنگی لەو پاڵپشتەوەی کە لەبەردەم دەمیدا بوو کەمێك بە کزی دەهاتە بەرگوێ.

—هەشت و چارەك.

دووبارە سەری دانەواندەوە.

—خواردنەوەم بۆ دەهێنیت؟

زمانی هیچ زبر نەبوو تانەو تەشەری نەدەدا. هەروەك بڵێی ئێستە کە نەخۆش کەوتبوو، بێ بەرگری و بێ زیان بوبو. پەرداخێك خواردنەوەم پێداو گڵۆپی پاڵ قەرەوێڵکەیم داگیرساند. لەقەراخ قەرەوێڵەکەیدا دانیشتم و دەستم خستە سەر دەمووچاوی، ئەوکارەی کە دایکم لە منداڵیمدا دەیکرد. هێشتا کەمێك گەرم بوو. بەڵام هەرگیز وەك پێشتر نەبوو.

—دەستەکانت چەندە ساردن.

—پیشتریش ئەم سکالآیەت کردبوو.

—بەڕاست؟

—حەزت لە سوپ هەیە؟

—نەخێر.

—ئیسراحەتی.

هەرگیز نەمزانی کە بەڕاستی چەندە ئازار دەچێژێت.

—ئەمەوێت بکەوم بەسەر لاکەیترداو بسوڕێمەوە بەرەو ئەولا. پێویستناکات دابنیشم. خۆمم لەسەر قەرەوێڵەکە جێگۆڕکێ پێکرد و بە خۆپارێزییەکی تەواوەوە خستمە سەرلاکەی تری. جەستەی زۆر گەرم نەبوو. تەنها گەرمای سروشتی جەستەیەکی هەبوو کە بۆ ماوەیەك لەژێر لێفەدا مابێتەوە.

—کارێکیتر هەیە کە ئەنجامیبدەم؟

—نەدەبوو بگەڕێیتە ماڵەوە؟

—نەخێر کێشە نییە، شەو لێرە دەمێنمەوە.

دەمێك بوو دوونیا تاریکی کردبوو. بەردەوام بەفر دەباری، لە پەنجەرەکەوە هەیوانەکەم دەبینی کە لەناو تۆپەڵێك لە ڕووناکی زەردی کەمڕەنگ و ماتەمدا ڕۆچوبوو. هەر لەوێدا بە بێدەنگی و هێمنییەوە دانیشتین و دەستمانکردە سەیرکردنی ڕووناکی سیحراوی بەرهەیوانەکە.

سەرئەنجام بێدەنگییەکەم شکاند و گوتم:

—دەتوانم شتێکت لێبپرسم؟

دەستی بەسەر لێفەکەوە بوو، زۆر ئاسایی سروشتی دەهاتەپێشچاو، بەهێزو تەندروست، بەلآم ئەم دەستانە نەیاندەتوانی هیچکارێك بکەن، بەڕاستی زۆر سەیر بوو! گوتی:

—دەزانم دەتەوێت چ پرسیارێك بکەیت.

هێشتا جێگەی برینی سەر مەچەکی بەلای منەوە جێگەی پرسیار بوو. بەلآم شتێك نەبوو کە بتوانم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لێی بپرسم.

—چی ڕوویدا؟

چاوێکی کردەوە.

—چۆن بوو کە بەمجۆرەم لێهات؟

کاتێك گوتم بەڵێ، دووبارە چاوی داخستەوە.

—لەگەڵ ماتۆڕ سکێلدا دەعمم کرد، نەك بە ماتۆڕی خۆم. من تەنها ڕێبوارێکی پیادەی بێ خەتا بووم.

—وامزانی لەکاتی خلیسکێنەی سەر بەفرو لەکاتی بەرزبونەوەدا لە شتێکمداوە.

—هەموان وابیر دەکەنەوە. ئەمەش گاڵتەیەکی بچکۆلانەی خودایە، لە ماڵەوە هاتبومە دەرەوەو خەریکبوم دەچومە ئەوبەری شەقامەکەوە، لەم ماڵەدا نا، ماڵەکەم لە شاری لەندەن.

سەیری کتێبەکانی ناو کتێبخانەکەیم کرد. لەتەنیشت ڕۆمان و کتێبەکاندا بەرگی دڕاوی پنگوین کۆمەڵێك کتێبی ناونیشانی کارو بازرگانی بوونیان هەبوو: یاسای کۆمپانیاکان، کڕینی پشکی کۆمپانیا، دەفتەرچەکانی ڕێنمایی ناوونیشانەکان کە من هیچکامیانم نەدەناسی و نەمبینیبون.

—ئەی ئێستە بە هیچ ڕێگەیەك ناتوانی لەکارەکەت بەردەوام بیت؟

—نەخێر، ئیتر ناتوانم لەناو ئاپارتمانەکەی خۆمدا بم و بڕۆم بۆ گەشت و سەفەر، ئیتر من ژیانم نییە....لەوانەیە کچە هاوڕێ پێشوەکەمت بینیبێت.

—ئەو خاوقسەکردنەی کە لە ئاوازی دەنگیدا هەبوو تاڵی لەناو قسەکانیدا دوور نەدەخستەوە.

—سەردەمێك بوو کە هەرگیز بیرم نەدەکردەوە بە زیندویی بمێنمەوە.

—پێتناخۆشە؟ مەبەستم لە ژیانە لەم شوێنەدا.

—بەڵێ.

—ئایا هیچ ڕێگەیەك بوونی هەیە کە دووبارە بگەڕێیتەوە لەندن و لەوێدا بژیت؟

—نەخێر. بەمجۆرە نا.

—بەڵام دڵنیابە تۆ باشتر دەبیت. مەبەستم ئەوەیە کە زانستی پزیشکی لەبارەی ئەمجۆرە زیانانەوە پێشکەتنێکی زۆری بە خۆیەوە بینیوە.

ویل دووبارە چاوەکانی داخستەوە.

چاوەڕوانم کرد. دواتر پاڵپشتەکەم لە پشتی سەرییەوە ڕێککردو چەرچەفەکەم لەسەر سنگی ساف و ڕێککرد. ڕێك و ڕاست دانیشتم و گوتم:

—ببورە ئەگەر لە پرسیارەکانمدا زیادەڕەویم کرد، حەزدەکەیت بڕۆم؟

—نەخێر، کەمێکیتر بمێنەرەوە و قسە بکە.

تفی دەمی قوتدایەوە. چاوەکانی کردەوە و سەیری منی کرد، زۆر ماندو دیاربوو.

—قسەی باشم بۆ بکە.

چرکەیەك وەستام، دواتر پاڵمدا بە گۆشەکانی تەنیشتیەوە، لەناو ژورە نیوەتاریکەکەدا دانیشتبوین و سەیری کلوە بەفرەکانمان دەکرد کە لەناو تاریکی و ڕەشایی شەودا ووندەبون. لە کۆتاییدا دەستمکردە قسەکردن.

—دەزانی منیش هەمیشە بە باوکمم دەگوت قسەی خۆش و باشم بۆ بکە. بەڵام ئەگەر بڵێم کە زیاتر چ وەڵامێکی دەدامەوە، پێتوایە من چ گەمژەیەك بووم!

—زیاتر لەمن؟

—کاتێك کابوسم دەبینی، یان دڵتەنگ دەبوم، یاخود لە شتێك ترسابوم. گۆرانی بۆ دەگوتم....

پێکەنیم.

—ئۆو، ناتوانم.

—دەی گۆرانیم بۆ بڵێ.

—هەمیشە گۆرانی مولاهونکی بۆ دەگوتم.

—چ گۆرانییەك؟

—گۆرانی مولا هونکی. وایدەزانی هەموان دەیزانن.

بە چپەوە گوتی:

—کلارك ئێستە تۆ ئەو گۆرانییە بۆمن بڵێ.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو چاوەکانم داخست. دەستمکردە گۆرانی گوتن.

ئەی خۆزگایە لە سەرزەویی مولاهونکیدا دەژیام....

—ئەی هاوار خودایا!

هەناسەیەکم هەڵکێشاو بەردەوامبوم.

بێدەنگییەکی کورت باڵیکێشا بەسەر شوێنەکەدا.

—گێژ بویت، هەموتان گێژن.

—بەڵام کاریگەر بوو.

—دەنگێکی زۆر ناخۆشت هەیە! هیوادارم دەنگی باوکت کەمێك خۆشتر بێت.

—دەزانم بەم قسەیەت دەتەوێت چی بڵێیت. دەتەوێت بڵێی: (خاتو کلارك سوپاست دەکەم کە هەوڵتدا سەرقاڵم بکەیت).

—باشە کلارك، وابزانم هێندەی ئەوکارانەی کە دەروونناسەکان بۆیان کردوم، کاریگەر بوو. دەی قسەم بۆ بکە، هەرچییەکت پێخۆشە، هەرچییەك کە پەیوەندی بە گۆرانییەوە نەبێت.

کەمێك بیرم کردەوە.

—ئەها، تێگەیشتم. پێریێ سەیری پێڵاوەکانمت دەکرد.

—ئاگام لە خۆم نەبوو.

—باشە، دایکم دەیگوت چیرۆك و بەسەرهاتی لەپێکردنی پێڵاوە نائاساییەکان دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی سێ ساڵیم. جوتێك جزمەی شینی بریقەداری بۆ کڕیبوم. ئەوکاتە شتێکی زۆر سەیرو سەمەرە بوو —منداڵان زیاتر حەزیان لە ڕەنگە سەزەکەی بوو— یان ئەگەر زۆر شانسیان هەبوایە سورەکەی. دایکم دەڵێت ئەو ڕۆژەی کە ئەو پێڵاوانەی بۆ کڕیم، ئیتر ئامادە نەبووم دایانبکەنم. لەسەر جێگە، لە گەرماو، لە ڕەوزە، تەنانەت بە درێژایی هاوینیش لە پێمدا بوون. زۆر حەزم لەو پێڵاوە بریقەدارانە و پانتۆڵێك بوو کە وەك زەردەواڵە خەت خەت بوون.

—بە نەخشی زەردەواڵە؟

—بەڵێ، خەتێکی زەرد و خەتێکی ڕەش، هەروەك زەردەواڵە.

—چەندە سەیرە!

—بەڵام کەمێك تەسك و تروسك بوو.

—بەڵێ چاو دەبات.

—لەوانەیە چاوی تۆ ببات، بەڵام ویل ترینەر دەبێت بڵێم هەموو کچەکان بۆ ئەوە جلوبەرگ لەبەرناکەن کە کوڕان و پیاوان پێیانخۆش بێت.

—قسەی بێمانایە!

—نەخێر، قسەی بێمانا نییە.

ژنەکان هەرچییەك دەکەن، پیاوانیان لەبیرو مێشکدایە. هەرکارێك مرۆڤەکان ئەنجامیدەدەن دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی ژن و پیاو. شازنی سورت نەخوێندوەتەوە؟

–نازانم باسی چی دەکەیت. بەڵام دەتوانم لەوە دڵنیات بکەمەوە کە لێرەدا لەسەر قەرەوێڵەکەت دانیشتوم و گۆرانی دەڵێم لەبەر ئەوە نییە کە بەدوای ئەمشتانەوەم. کاتێك تەمەنم سێ ساڵان بوو پڕ بەدڵ حەزم دەکرد قاچەکانم ڕاڕابن.

هەستم دەکرد ئەو شڵەژان و دڵەخورپەیەی کە هەموو ڕۆژەکەی منی خستبویە ناو چنگی خۆیەوە، بە هەر ڕستەیەك کە ویل دەیگوت کەمتر دەبویەوە. ئێستە ئیتر پەرستاری کەسێکی نەخۆشی فەلەج نەبووم، بەڵکو لەتەنیشت کەسێکی تانەدەری قەهاردا دانیشتوم و قسەم دەکرد.

–ئێ، دواتر، جزمە بریقەدارە جوانەکانت چییان لێهات؟

–دایکم ناچار بوو فرێیانبدات. پەنجەکانم بۆگەنی کەڕوداربیان کردبوو.

–چەندە باش!

–گۆرەوییە پانتۆڵییەکەیشی فرێدام.

–بۆچی؟

–هیچکاتێك نەمزانی بۆچی. بەڵام ئەمکارەی دڵی شکاندم. ئیتر پاش ئەوە هەرگیز نەمتوانی گۆرەوییەکی پانتۆڵیم دەستبکەوێت کە هێندە حەزم لێی بێت. ئیتر لەو مۆدێلەیان نەبوو، یان ئەگەریش هەیانبوایە منداڵانەکەی بوو.

–چەندە سەیرە!

ئۆو، تۆیش گاڵتەم پێبکە. هیچکاتێك نەبووە کە تاوەکو ئەم ئاستە عاشقی شتێك ببیت؟

ئێستە ئیتر ژورەکە بەتەواوەتی تاریك بوبو بە ئاستەم ویلم دەبینی. دەمتوانی گڵۆپی سەقفەکە دابگیرسێنم. بەڵام شتێك ڕێگرم بوو.

–بەڵێ، بووم، بەڵێ عاشق بووم.

زۆر لەوە پەشیمان بووم کە وەها پرسیارێکم کردبوو.

کەمێك زیاتر قسەمان کرد، دواتر ویل خەوی لێکەوت. هەر لەوێدا ڕاکشام و سەیری هەناسەدانەکەیم دەکرد. هەندێکجار بیرم دەکردەوە ئەگەر خەبەری ببێتەوە و بزانێت ئاوا سەیری دەکەم، چی بە قژە درێژو چاوە ماندووەکانی خۆی دەڵێت. بەڵام هەرگیز نەدەکرا کە لابکەم بەولادا. چرکەساتانێکی سەرسوڕهێنەرو تەسەور نەکراو بوون. هەروەك بڵێی کات وەستا بوو. تەنها من لەماڵەوە بووم دەترسام لەوەی کە بە تەنها بەجێی بهێڵم.

کەمێك پاش کاتژمێر یازدە، هەستمکرد کە دووبارە ئارەقی کردووەتەوە، هەناسەی سوار بوبو. خەبەرم کردەوە و ئازارشکێن و حەبی تام پێدا. هیچ نەگوت و تەنها لەبەرخۆیەوە سوپاسی کرد. چەرچەف و پەڕۆی سەر پشتیەکەم گۆڕی، دیسانەوە خەوی لێکەوتەوە. کەمێك لەولاترەوە ڕاکشام و ماوەیەکی زۆری پێچو تاوەکو خەوم لێکەوت.

***

کەسێك بانگیکردم و لە خەو ڕاپەڕیم. خەریکبوم خەوم دەبینی. لەناو پۆلدا بووم، لەسەر مێزەکە خەوم لێکەوتبوو مامۆستا خەریکبوو تەقەی لە تەختە ڕەشەکە دەدا. چەندینجار بەناوەکەی خۆمەوە بانگیکردم. دەمزانی دەبێت وەڵام بدەمەوە، دەمزانی بەلای مامۆستاوە خەوتن لەناو پۆلدا کارێکی زۆر ناشیرینە. بەڵام نەمدەتوانی سەرم لەسەر مێزەکە بەرز بکەمەوە.

—لوئیزا.

—هوووم.

—لوئیزا.

بەڕاستی مێزەکە نەرم بوو. چاوەکانم کردەوە. دەنگەکە لەسەر سەرمەوە دەهات، هێمن بەڵام بەهێز بوو.

—لوئیزا.

خێرا لە شوێنی خۆم هەستامەوە. دەبینم لە تەنیشتمەوە ویل لەژێر لێفەکەدا خەوتووە. دەمی کەمێك کرابویەوە، ئانیشکی لە گۆشەی لای ڕاستیەوە چەمابویەوە. ڕووناکی لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژورەوە و هەواڵی بەیانیەکی ڕووناك و ساردی پێبوو.

—هوم.

—چی دەکەیت؟

هەستم دەکرد لەکاتی ئەنجامدانی کارێکی خراپدا دەستیان دەستگیربیان کردوم. دەستێکم هێنا بە دەموچاومدا، هەوڵمدا بیرو زەینم کۆ بکەمەوە. بۆچی لێرەم؟ چ وەڵامێکم بۆی هەبوو؟

—لەناو جێگەکەی ویلدا چی دەکەیت؟

بە هێمنیەوە گوتم:

—ویل... ویل حاڵی باش نەبوو. هەربۆیە بە خۆمم گوت دەبێت بە ووردی چاودێری بکەم و ئاگام لێی بێت.

تۆ چی دەڵێیت؟ حاڵی باش نەبوو؟ سەیرکە، وەرە بۆ هۆڵەکە.

لە ژوورەکە چویەدەرەوە. دیاربوو کە چاوەڕوانە.

بەشوێنیدا ڕۆیشتم. هەروا کە خەریکبوو دەڕۆیشتم، دەستێکم هێنا بە جلوبەرگەکانمدا و ڕێکم کردنەوە. زۆر خراپ هەستم دەکر کە ماکیاجەکەم لکاوە بە هەموو جەموچاومداو تێکچووە. هاتمە دەرەوە و دەرگای ژوورەکەی ویلم داخست.

لەبەرامبەرییەوە وەستام. هەوڵمدەدا بیرو زەینم کۆ بکەمەوە. دەستێکم هێنا بەسەروقژمدا.

—ویل تای هەبوو. کاتێك نیتن هات تاکەی دابەزاند، بەڵام من شتێکم لەبارەی تاوە نەدەزانی. هەربۆیە دەمویست هەموو هەستەکانم لەلای ئەو بن... نیتن گوتی بۆ یەك ساتیش بەتەنها بەجێی نەهێڵم.

دەنگم گیراوو گڕ بوو. ئاگام لە خۆم نەبوو کە چی دەڵێم.

—بۆچی تەلەفۆنت بۆ من نەکرد؟ ئەگەر حاڵی خراپ بوو دەبوایە خێرا پەیوەندیت بەمن یاخود بە جەنابی ترینەرەوە بکردایە.

کتوپڕ هاتمەوە سەرخۆم، کاك ترینەر، ئای خودایە گیان! سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد.

چارەکی دەویست بۆ هەشت.

—من تەلەفۆن... وادیارە نیتن.....

—لوئیزا، سەیرکە، خۆ موشەکت نەدەهاویشت بەرەو ئاسمان. ئەگەر ویل ئەوەندە نەخۆش بوو کە پێویستبوو لەناو جێگەکەیدا بخەویت، دەبوایە پەیوەندیت بە منەوە بکردایە.

—بەڵێ.

چاوم تروکاند و سەرم داخست.

—تێناگەم بۆچی تەلەفۆنت بۆ من نەکرد؟ تەلەفۆنت بۆ کاك ترینەر کرد؟

نیتن گوتبوی کە هیچ نەڵێم.

—من....

لەوکاتەدا دەرگای ماڵەکە کرایەوە و کاك ترینەر دەرکەوت.

ڕۆژنامەیەك لە بندەستیدا بوو.

–توانیت بگەڕێیتەوە؟

کلوە بەفرەکانی لەسەرشانی دەتەکاند.

–بە هەزار فەلاکەت چومە ئەوبەری شەقامەکە و ڕۆژنامە و شیرم کڕی. شەقامەکان زۆر خراپ خلیسك و مەترسیدار بوون، هەربۆیە ناچار بووم کە لەسەر ڕێگاکە لابدەم بۆ ئەوەی نەچم بەسەر سەهۆڵبەندانەکەدا.

خاتوو ترینەر سەیری کرد، بۆ ساتێك دۆش دامام. ئایا بەڕاستی نەیدەزانی کە هاوسەرەکەی هەمان جلوبەرگی دوێنێی لەبەردایە.

–زانیوتە دوێنی شەو حاڵی ویل باش نەبووە؟

کاك ترینەر سەیری منی کرد. سەرم داخستبوو سەیری خوارەوەم دەکرد، هیچکات هێندە بێتاقەت و بە ئازار نەبووم.

–لوئیزا، تەلەفۆنت بۆ من کرد؟ بەداخەوە نەمبیستووە. لەوانەیە ئایفۆنەکە ئیشی نەکردبێت. لەم دواییانەدا چەندینجار ئەوە ڕویداوە کە ئاگام لە جەرەسی ئایفۆنەکە نەبووە. خۆیشم دوێنی شەو زۆر حالم باش نەبوو. بێهۆش کەوتبوم.

هێشتا گۆرەوییەکانی ویلم لە پێدا بوو، سەیری ئەوانم کرد. لەوانەبوو خاتوو ترینەر لەسەر ئەو گۆرەویانە لێم توڕە بووە.

بەڵام دیاربوو کە ئاگای لەو مەسەلەیە نەبوو. خاتو ترینەر گوتی:

–دەردەسەرییەکی زۆرم توش بوو تاوەکو توانیم خۆم بگەیەنمە ماڵەوە، زۆر ماندوم. ئێستەیش ویل دەدەمە دەستی خۆت. بەڵام ئەگەر دیسانەوە شتێك ڕویدا خێرا تەلەفۆنم بۆ بکە، تێگەیشتی؟

نەمدەویست سەیری کاك ترینەر بکەم. تەنها گوتم:

–بەڵێ.

دواتر بەخێراییەوە چوم بۆناو چێشتخانەکە.

## {٧}

زۆر خێرا بەهار هات، زستانیش هەروەك میوانێکی ناوەخت، بەبێ ئەوەی کەماڵئاوایی بکات، کتوپڕ ملی ڕێگەی خۆی گرتەبەرو ڕۆیشت. هەموو شوێنێك بەرگی سەوزی پۆشی. شەقامەکان لێوانلێوبوون لە تیشکی خۆر، هەوایش گونجاوو دڵڕفێن بوو. کەشوهەوایش پڕ بوو لە بۆن و بەرامەی خۆش و دڵنشینی بەهاری. ئاوازو دەنگی باڵندەکانیش بەجۆش و خرۆشەوە لەپاش هاتنی بەرەبەیان دەهاتە بەرگوێ.

بەڵام من سەرنجم نەدەدایە هیچکام لەمشتانە. لەبەر چڕوپڕی بەرنامە ڕاهێنانیەکانی پاتریك، لەپاش یەك هەفتە شەوی ڕابوردو توانیبوم ناوبراو ببینم.

من و پاتریك بۆ یەکەمینجار یەکتریمان لە شوێنی کارەکەمدا بینی. پێش ئەوەی لە قاوەخانەکەی فرانکدا کار بکەم، لە ئارایشتگای ژنانە و پیاوانەدا سەرقاڵی کارکردن بووم. کاتێك پاتریك هاتەناو ئارایشتگاکەوە داوای کرد کە بە مەکینەی چوار قژەکانی بتاشم، سامانتای خاوەنی ئاراشتگاکە دەستی گیرابوو. هەربۆیە من کارەکەی پاتریکم بەپێی خواستی خۆی ئەنجامدا، بەڵام خراپتر لەمە ڕووینەدەدا کە لە درێژایی مێژوی مرۆڤایەتیدا قژی هیچ کەسێك بەمشێوە خراپە کورت نەکرابویەوە. سێ مانگ دواتر بەم دەرئەنجامە گەیشتم ئەگەر حەزدەکەم قژەکانی خۆم کورت بینەوە. ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەتوانم قژی خەڵکیش کورت بکەمەوە. هەربۆیە کاری ئارایشتگاکەم وازلێهێنا و ڕۆیشتم و لە قاوەخانەکەی فرانکدا بەیەکەوە سەرقاڵی کارکردن بووین.

کاتێك من و پاتریك بوینە هاوڕێ و هاتوچۆمان پەیدا کرد، ئەوکات سەرقاڵی کاری فرۆشتن بوو، فەهرستی ئەو شتانەی کە حەزی لێدەکردن بریتی بوون لە بیرە، نوقڵ، ژن و قسەو باس لەسەر وەرزش. بەبڕوای ئەو شەوێکی باش دەبوایە هەرچوار شتەکەی تێدا بێت. پاتریك سەروفەساڵێکی ئاسایی هەبوو، نەدەکرا بڵێیت کەسێکی جوان و پێکەوتەیە. هەیکەلی لەمن

گەورەتر بوو، بەلأم من بەلامەوە جوان بوو. حەزم لە مەتینی و نەلەخشاوییەکەی بوو. باوکی مردبوو ئەم دایکی بەخێو دەکرد و ئاگاداری بوو، هەڵسوکەوتی لەگەڵ دایکیدا بەلای منەوە زۆر جوان و پەسەند بوو. چوار براو خوشکەکەی (خێزانی ڤاڵتون)یان دەهێنایەوە یادی من، وادیاربوو کە زۆر یەکترییان خۆشدەویێت. یەکەمینجار کە مەوعیدم لەگەڵ پاتریکدا دانا و چومە دەرەوە، هەمیشە دەنگێك دەهاتە بەرگوێم کە( ئەم پیاوە هەرگیز زیان بە تۆ ناگەیەنێت)، لەماوەی حەوت ساڵی هاوڕێیەتیماندا، پاتریك هەرگیز کارێکی نەکر کە گومان و دوودڵیم سەبارەت بەناوبراو لەلا دروست ببێت.

دەموچاوی جوان بوو، زیاتر لە دەرەوە کاتەکانی بەسەر دەبرد، خۆر سوتاندبوی و ڕان و قاچێکی ماسولکەیی هەبوو.

هەرچەندە لەشجوانییەکی زیاتری پەیدا دەکرد، زیاتر بەرامبەر بە ئەندامەکانی جەستەی هەستیارتر دەبوو سەرنجی لەسەر جەستەی من کەمتر دەبویەوە. یەك دووجار بە پاتریکم گوت وادیارە ئیتر بەلایەوە گرنگ نیم، بە بزشتەوە وەلأمیدایەوە (تۆ جوانیت، منیش جەستەم قوپاوە بەسەر یەکدا. حەزناکەم تۆیش لەڕو لاواز ببیت).

بەڕاستی حەزم دەکرد وەك ئەو حەز لە وەرزش بکەم، هەر بەڕاستیش هەوڵی خۆمم دەدا. بەلأم زۆر زوو تێگەیشتم کە لەخەڵکیتر جیاوازم و هیچ کەسێك وەك من نییە. کوڕەکانی باشگاکە یان تەنها بوون یان لەگەڵ کەسێکدا هاوڕێ بوون کە لەڕواڵەتدا وەك خۆیان بن. جوتی هاندەریش لە وەرزشدا هەبوون، هەموو کۆتایی هەفتەیەك بەرنامەی وەرزشیان ڕێکدەخست، وێنەی یەکترییان دەخستە ناو کیفی پارەکانیانەوەو دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکتری و لەپاش پێشبڕکێ دەگەڕانەوە، یان بە لەخۆباییبونەوە مەدالیاکانیان نیشاندەدا و دەریان دەخستن.

پاتریك هیچکات گرنگی بەوە نەدەدا کە من هەروەك خۆی دەڵێت (من هەلأوگەڕاو) جلوبەرگ لەبەردەکەم. ئەی باشە ئەگەر قسەی دڵی خۆی نەکردبایە چی دەبوو؟ کاری پاتریك، تێکەڵییەکانی، هەر هەموو شتەکانی، بەدەوری لەشجوانیدا دەسوڕانەوە. هەموو قسەکانی سەبارەت بە کۆنترۆڵی کێش، دابەزاندنی کێش و لەشجوانی بوو. پاتریکێك کە لەگەڵ کچە وەرزشکارە لەشجوانەکاندا حەشرو نەشری هەبوو، ئەی باشە ئەگەر یەکجار منی بە ناحەز

بهاتبایەتە پێشچاو چی دەبوو؟ ئەگەر چرچەکانی جەستەم کە هەمیشە بەلای خۆمەوە جوان بوون، وەك هەویر بهاتنایەتە بەرچاوە تیژەکانی ئەو چی دەبوو؟

خەریکبوم بیرم لەمشتانە دەکردەوە، بیرو خەیاڵ زۆر خراپ بە مێشکمدا دەهات کە خاتوو ترینەر هاتە ژورەوە و فەرمانیدا کە من و ویل بچینە دەرەوە.

—داوام لە پاککەرەوەکانم کردوە کە بێن و پاککردنەوەی بەهارەمان بۆ بکەن، هەر لەبەر ئەمەیە کە پێموابوو لەوانەیە حەزبکەن تاوەکو ئەوکاتەی ئەوان لێرەن بچنە دەرەوەو چێژ لەو هەوا خۆشە وەربگرن.

من و ویل سەیری یەکتریمان کرد، یەکێك لە برۆکانی کەمێك بەرز بویەوە.

—دایکە، خۆ بەزۆر نییە، وایە؟

—تەنها پێموابوو کە خراپ نییە برۆنە دەرەوەو هەوایەکی پاك هەڵمژن. ڕەمپای ناوسەیارەکە لەشوێنی خۆیەتی. لوئیزا، چای لێدەنێیت بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆتاندا بیبەن؟

پێشنیارەکە نالۆژیکی نەبوو. حەوشەکە زۆر جوان بوبو. هەروەك بڵێی بە زۆربونی پلەی هەوا شتەکان هەموویان بەیەکەوە بڕیاریاندابوو سەوز بێن و بڕوێن. گوڵە نێرگزەکان یەکسەر سەریان لە خاك دەرهێنابوو، چەکەری زەردی پیازەکان هەواڵی پشکوتنی گوڵەکانیان دەدا. لقە قاوەییەکان چرۆیان لێدا، گژو گیا سەدساڵەکان بە خۆپارێزی و هێمنییەوە لەژێر خۆڵ و خاکی ڕەقدا ڕێگەی خۆیان کردەوە و سەریان دەرهێنا. دەرگاکەم کردەوە و چوینە دەرەوە. ویل کە کورسییە تایەدارەکەی لەسەر ڕێڕەوی زەوییە بەبەرد فەرشڕێژکراوەکەدا لێدەخوڕی، ئاماژەی بە کورسییەك کرد کە دۆشەکەیەکی لەسەر دانرابوو. بۆ ماوەیەك لەوێدا دانیشتین. دەموچاومان ڕووکردە خۆرە کزو بێ ڕونەقەکەو گوێمان بۆ دەنگ و سەداو ئاوازی چولەکەی قەراغ پەرژینەکان شل کردبوو.

—تۆ چیت لێقەوماوە؟

—مەبەستت چییە؟

—خۆت گوتت کە حەزدەکەیت قسە نەکەم.

—نەك بەوشێوەیەش. ئەم بێدەنگییەی تۆ توشی شڵەژانم دەکات. شتێك بووە؟

گوتم:

—نەخێر.

دواتر لە قسەکانم بەردەوامبوم و گوتم:

—ئەگەر بەڕاستی حەزدەکەیت بزانی، پەیوەندی بە هاوڕێ کوڕەکەمەوە هەیە.

گوتی:

—ئەها، هەمان ئەو پیاوەی کە یاری ڕاکردن دەکات.

چاوەکانم کردەوە، تەنها ئەمویست بزانم ئایا خەریکە گاڵتەم پێدەکات.

گوتی:

—باشە، پێمبڵێ بزانم مەسەلەکە چییە؟ بە مامە ویلی خۆت بڵێ.

—نەخێر.

—دایکم بەلایەنی کەمەوە ئەم پاککەرەوانە نزیکەی یەك سەعاتیتر وەك شێتەکان ڕادەگرێت.
خۆیشت دەبێت لەگەڵ کەسێکدا دەردە دڵ بکەیت.

ڕێك و ڕاست دانیشتم و بەرەو لای ویل ئاوڕمدایەوە. کورسییە تایەدارەکەی تایبەت بە ماڵەوە یەك دوگمەی کۆنترۆڵی هەبوو کە شوێنی دانیشتنەکەی بەرز دەکردەوە، بۆ ئەوەی ئەو بتوانێت خۆی لەگەڵ قەد و باڵای کەسەکاندا هاوئاهەنگ بکات و هەڵزنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەبویە هۆی سەرگێژخواردنی، زۆر بەکەمی کەڵکی لێوەردەگرت. بەڵام ئێستە شوێنی دانیشتنی کورسییەکە بەرز بوو. هەربۆیە ناچار بووم کە سەرم بەرز بکەمەوە و سەیری بکەم.

چاکەتەکەم بەست بەکەمەرمەوە و لەژێرچاوەوە سەیرم کرد.

—تۆ پێمبڵێ دەتەوێت چ شتانێك بزانیت؟

گوتی:

—ماوەی چەندێکە کە بوونەتە هاوڕێی یەکتری؟

—شەش ساڵ و شتێکە.

سەری سوڕما.

—ئەمە ماوەیەکی دوورودرێژە.

—بەڵێ زۆر دوورودرێژە.

پاڵمدا بە قەرەوێڵەی دانیشتنەکەوە، بەتانییەکی بچوکم خستە سەر قاچەکانی. خۆرەکە گومڕاکەر بوو، بەڕواڵەت زۆر لەوە زیاتر بوو کە بەڕاستی دەبوو وابێت.

—هاوڕێ کوڕەکەت چکارەیە؟

-ڕاهێنەری وەرزش.

-دەبێت وەرزشی ڕاکردن بێت.

-بەڵێ ڕاکردن.

-چ جۆرە مرۆڤێکە. ئەگەر ناڕەحەت نابیت تەنها لە سێ ووشەدا وەسفی بکە.

کەمێك بیرم کردەوە.

-خۆشبین، ڕاستگۆ، زۆر هەستیاریش بەرامبەر بە لەشجوانی.

-خۆ ئەمە بوویە حەوت ووشە.

-کەوابوو چوار ووشەی خۆڕایت دەستکەوت. ئێستە بڵێ چۆن بوو؟

-کێ؟

-ئالیسیا!

ڕێك وەك خۆی منیش سەیری چاوەکانیم کرد. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو واقی بەدرەختی پیرە چنارەکەدا وڕما. قژەکانی بەرچاویان گرتبوو. ڕێگریم لە خۆم کرد بۆ ئەوەی قژەکانی بۆ لانەدەم.

-جوان و دڵڕفێن. بەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو نیگەران.

-نیگەرانی چی بوو؟

پێش ئەوەی کە خۆم ئاگاداربم ، ووشەکان لە دەمم دەرچوون.

دەموچاوێکی ڕەزامەندانەی لەخۆی گرتبوو گوتی:

-تۆ سەرت سوڕ دەمێنێت. کچانێکی وەك لیسا سود لە شێوەو لەش و لاریان وەردەگرن، چونکە وادەزانن شتێکیتریان نییە. ئەڵبەتە کەمێك بێ ویژدانیش دەکەم. لیسا سەلیقەیەکی باشی هەبوو، کەرەستەکان، دیکۆرات، دەیتوانی هەموو شتێك جوان بکات و بیڕازێنێتەوە.

ڕێگریم لە خۆم کرد بۆ ئەوەی نەڵێم هەرکەسێکیتریش جانتایەکی پارەی بە قولاَیی کانزای ئەڵماس هەبێت، دەتوانێت هەموو شتێك جوان و ڕازاوە بکات.

-کەرەستە و شتومەکەکانی ژورەکەی جێگۆڕکێ پێدەکردو ژورەکە باشتر و جوانتر دەهاتە پێچاو، هیچکات سەرم لەکارەکانی دەرنەکرد.

سەری بەرو لایماڵەکە ڕاوەشاند.

-ئەمە خانوی ناسەرەکی کارەکەی ئەوە، ئەوکاتە تازە هاتبومە ئێرە.

وامزانی مەبەستی ژوری دانیشتنەکەیە، کە دیکۆراتێکی جوان و باشی هەبوو. چاوم لەسەر ژورەکە لابرد. ئێستە زانیبوم کە دیکورات و ڕێکخستنی ئەو ژورە کاری ئەو بووە، دەبینم کە لەبەرچاوم کەوتووە.

—ماوەی چەندێك هاوڕێی یەکتری بوون؟

—هەشت نۆ مانگێك.

—زۆر نییە.

—بۆ من زۆرە.

—لە کوێ یەکتریتان ناسی؟

—میوانداری نانی ئێوارە. میوانداریيەکی بێمانای نانی ئێوارە. ئەی خۆت لە کوێدا پاتریکت ناسی؟

—لەناو سالۆنی ئارایشتدا. لەوێدا کارم دەکرد، موشتەریمان بوو.

—ئەها، تۆ کاتی بەتاڵی کۆتایی هەفتەکانت بۆ پڕدەکردەوە.

وادیاربوو کە سەروفەسالّم مات و بێدەنگ بوبو، لەبەر ئەوەی کە سەری ڕاوەشاند و گوتی:

—گرنگ نییە.

لەناو ماڵەکەوە هاژەی گسکی کارەبایی دەهات. چوار ژن هاتبون بۆ پاککردنەوەو هەمویان جلوبەرگی کارکردنی هاوشێوەیان پۆشیبوو. منیش دۆشدامابوم کە شوێنێکی بچوکی وەك ئەو جێگایە بۆچی پاکردنەوەکەی ئەم هەموو کاتە درێژەی کێشا.

—دڵت تەنگبوە بۆی و بیری دەکەیت؟

ویل واقی بەشتێکی دوردا وڕمابوو.

—لەوانەیە....

لایکردەوە بەلای مندا. بە ئاوازێکی بەبڕشتەوە گوتی:

—من بیرم لێکردەوە، دواتر گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئەوو ڕۆپرت زۆر لەیەکتری دەوەشێنەوە.

—بە سەر ڕاوەشاندن پشتگیریم کرد و گوتم:

—ئاهەنگێکی بێمانا ڕێکدەخەن، سەرپێیەك دەچن بۆ شوێنێك. هەروەك تۆ كە ڕۆیشتیت، خانوێکی لەقەراغ شاردا دەکڕن، بەڵام پێنج ساڵ پڕناکاتەوە دەبینی کاکم لەگەڵ سکرتێرەکەیدا تێکەڵیکردووە.

—لەوانەیە تۆ ڕاست بکەیت.

—دواتر درێژەم بە بابەتەکە داو بەردەوامبوین لە قسەکردن لەوبارەیەوە.

—ئالیسیایش لەبەرامبەریدا دەوەستێت و بەبێ ئەوەی کە بەڕاستی خۆی بزانێت بۆچی، لە میوانییە بێماناکانی نانی ئێوارەدا یەکسەر لەلای هاوڕێکانی خراپەی دەڵێت. ڕۆپرتیش تەلاقی نادات، چونکە خەمی ئەو مارەیی و مافانەیەتی کە دەبێت بیدات بەو.

— ویل ئاوڕیدایەوە بۆلای من.

—-هەر شەش هەفتە جارێکیش بەیەکەوە دەخەون. ڕۆپرت منداڵەکانی زۆر خۆشدەوێت، بەڵام هیچکارێکی تایبەت بۆ پەروەردەکردنیان ئەنجامنادات. لەوانەیە هێشتا قژەکانی ئالیسیا باش و جوان بن، بەڵام دەموچاوی زەرد بووە و تەپیوە.

لێوم باریك کردەوە و لە قسەکانم بەردەوامبوم و گوتم:

—هیچکاتێك ناڵێت بەڕاستی چ مەبەستێکی هەیە. وەك شێتەکان بەشداری لە خولەکانی (پیلاتس)دا دەکات. لەوانەیشە سەگ یان ئەسپێك بکڕێت، دواتریش حەزی لە ڕاهێنەری ئەسپسوارییەکەی دەبێت. ڕۆپرت کاتێك لە تەمەنی چل ساڵی تێدەپەڕێت، ڕودەکاتە ڕاکردنی لەسەر خۆ، لەوانەیشە هارلی—دیڤیدسن بکڕێت کە ئالیسیا زۆری پێناخۆشە. ڕۆژانە کە دەچێتە سەرکار، سەیری پیاوە گەنجەکانی هاوکاری خۆی دەکات و لەناو قاوەخانەدا دڵی بەلای کەسانێکەوەیە کە کۆتایی هەفتەکان تۆڕ دادەنێن بۆ ژنان. یاخود باوەڕ بە قسەکانیان دەکات کە گوایە بەبەلەم بۆ کوێ و کوێ ڕۆیشتون. دواتریش لەبەر خۆیەوە بیردەکاتەوە کە بەجۆرێك لە جۆرەکان خەڵەتاوە. بەڵام خۆیشی نازانێت بە چ شێوەیەك.

لامکردەوە.

دەبینم ویل واقی بەمندا وڕماوە. گوتم:

—شەرمەزارم.

—ساتێك وەستام و دواتر گوتم:

—بەڕاستی نازانم ئەم قسانە لە کوێوە دەهێنم.

-هەستدەکەم کەمێك بەداخەوەم بۆ ئەم پیاوە وەرزشکارە.

-گوتم:

-ئۆو نەخێر. لەبەر ئەو نییە. ئەو ساڵانەی کە خۆم لەناو قاوەخانەکەدا کارم دەکرد، بینیومە. شتانێکی زۆرم بینیوە و بیستووە. هەموویان وەك یەکن. کردارو ڕەفتارییان وەك یەکە. لەو شتانەی کە دەتبینی بەڕاستی سەرت سوڕ دەما.

-هە لەبەر ئەمەیە کە هیچکات هاوسەرگیریت نەکردووە؟

چاوم داخست و کردمەوە.

-بەڵێ، وابزانم لەبەر ئەوە بووە.

-نەمدەویست بڵێم هەرگیز داواکارم نەهاتووە.

***

لەوانەیە بە ڕواڵەت کارێکی زۆرمان ئەنجامنەدەدا. بەڵام لە ڕاستیدا خودی ویل هۆکارێکبوو کە ڕۆژەکان بە شێوازێکی هەستپێنەکراو لەیەکتری جیاواز بن، ئەمەش پەیوەندی بە ڕۆحیەتی ویلەوی هەبوو، لەوەش گرنتر پەیوەندی بە ئەندازەی ئەو ئێشەوە بوو کە هەستی پێدەکرد. هەندێکجار کاتێك دەگەیشتمە جێ، بە سەروسیمایدا دەمزانی کە ئەمڕۆ من و ئەوانیتریش ناگرێتەخۆی. منیش خۆم سەرقاڵ دەکرد بە کاریماڵەوە، هەمو هەوڵم ئەوەبوو کە پیشبینی داخوازییەکانی بکەم، بۆ ئەوەی ناچار نەبم بە پرسیارکردن بێزاری بکەم.

هۆکارگەلێك هەبوون کە دەبونە هۆی دروستبونی ئێش و ئازار لە ویلدا. گرنگترینیان شیبونەوەی ماسولکەکان بوو کە جەستەیان ڕاگرتبوو. لەگەڵ ئەوەی کە نیتن لەکاتی عیلاجی تەبیعیدا ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا، بەڵام نەیدەتوانی لە شیبونەوەی ماسولکەکان ڕزگاری ببێت. کێشەکانی هەرس و گەدە دەبونە هۆی ئیش و ئازاری دڵ و هەندێکجاریش ئێشی شانەکانی هەبوو. لەگەڵ ئەوەی کە لە هەموو لایەکەوە چاوەڕوانی بوون هەندێکجار ئێش و ئازاری بۆگەنکردنی میزڵدان یەخەی ویلی دەگرت، ئەوەندە لەسەردەمی خۆپارێزیدا وەك نوقڵ و نەبات حەبی ئازارشکێنی خواردبوو، توشی برینی گەدە بوبو.

هەندێکجار لەبەر ئەوەی لەسەر یەك شێواز دانیشتبوو، سمتی بوبویە برین. یەك دووجارێك لەسەر جێگەکەی خەواندمان، بۆ ئەوەی برینەکانی باش ببنەوە، بەڵام ئەو زۆر ڕقی لە بەدەما خەوتن بوو. لەمجۆرە کاتانەدا ڕادەکشاو گوێی لە ڕادیۆ دەگرت، ڕق و توڕەیی لەچاوەکانی

دەباری. سەرئێشەیشی دەگرت. یەکێك لە کێشە جەستەییەکانی بوو کە بەبڕوای من و بەگریمان هۆکارەکەی نائومێدی و تورەیی بوو. لە ڕوی زەینیەوە ووزەیەکی زۆری هەبوو، بەلام شوێنێك نەبوو کە خاڵیبکاتەوە، ئەمە لەکاتێکدابوو کە دەبوایە ئەم ووزەیە لە شوێنێکدا سەرف بکرێت.

بەلام ئەوەی کە لە هەموو شتەکان زیاتر ناوبراویان لاواز دەکرد، بریتی بوو لە سوتانەوەی دەست و قاچەکانی بەشێوەیەك کە توشی ئازارێکی پەیتا پەیتا دەبوون و نەیدەتوانی تاملی ئازارەکەیان بکات. بەجۆرێك ئازاری پێدەگەیشت کە نەدەکرا بەشتێکەوە سەرقاڵی بکەیت. جامۆڵکەیەك ئاوی ساردم دەهێنا و دەست و قاچەکانیم تەڕ دەکرد، هەندێکجاریش خاولی تەڕم پێوەدەپێچان. بەوهیوایەی کە بەڵکو ئازارەکەی کەم بکەمەوە. ماسولکەی چەناکە و شەویلگەی دەجولاو هەندێکجار وەها دەهاتە پێشچاو کە دیارنەماوە. هەروەك بڵێی تەنها ڕێگە بۆ نەهێشتنی ئەو سوتانەوەیەی دەست و قاچەکانی، ئەوەبوو کە خۆی لە قالبەکەی بهێنێتە دەرەوە و دیارنەمێنێت. بەڕاستی بەلامەوە سەیر بوو کە دەمبینی چەندە ئاسان لەگەڵ پێویستیە جەستەییەکانی ویلدا ڕاهاتوم، بەراستی نادادپەروەرانە بوو سەرەڕای ئەو ڕاستیەی کە نەیدەتوانی سودو کەڵك لە دەست و قاچەکانی وەربگرێت یان تەنانەت هەستیان پێبکات، بەلام ناچاربوو کە ئازارەکەیان بکێشێت.

لەگەڵ بوونی ئەم هەموو ناڕەحەتیانەدا، ویل لەسەر ناڕەحەتی دەربڕین ڕانەهاتبوو. هەربۆیە چەندین هەفتەی دەخایاند تاوەکو تێدەگەیشتم کەئازاری هەیە. ئێستە ئیتر بە ڕەشایی قەراغ چاوەکانیدا و بە بێدەنگییەکەیدا و بەوجۆرەی کە دەچویەوە بەناو خۆیدا دەمتوانی ئاگاداری ناخ و دەرونی ببمەوەو بزانم چییەتی. تەنها دەیگوت لو دەتوانیت کەمێك ئاوم بۆ بهێنیت؟ یان دەیگوت (وابزانم ئێستە کاتی حەبی ئازارشکێنە). هەندێکجار ئەوەندە ئازاری هەبوو، کە ڕەنگ بەڕوییەوە نەدەماو وەك گەچ سپی دەبویەوە. لەم ڕۆژانەدا لە جاران خراپتر بوو.

کاتەکانیتر بەباشی بەیەکەوە هەڵماندەکرد و دەگونجاین. کاتێك قسەم بۆ دەکرد، بەوشێوەیە نەدەهاتەپێشچاو کە وەك ڕۆژانی ڕابوردوو ناڕەحەت ببێت.

بەڕواڵەت ئەو ڕۆژە ئازاری نەبوو. کاتێك بەڕێز جەنابی ترینەر هات و گوتی کاری پاککەرەوەکان بیست خولەکیتر تەواو دەبێت، خواردنەوەم بۆ خۆم و ویل تێکرد و هێواش

هێواش بەناو حەوشەکەدا سوڕاینەوە. ویل لە ڕێڕەوێکی باریکدا دەڕۆیشت و منیش سەیری پێڵاوە کەتانییەکەم دەکرد کە بە ڕۆیشتن بەناو گژوگیاو چیمەنەکەدا تەڕو پیس بوبون.

ویل گوتی:

–پێڵاوێکی سەیرو سەمەرەت هەڵبژاردوە!

ڕەنگی پێڵاوەکەم سەوزێکی زمڕوتی بوو. لە فرۆشگای خێرخوازی کڕیبوم. پاتریك دەیگوت کاتێك ئەم پێڵاوانە لەپێ دەکەم لە کچە شاپەرییەکان دەچم.

–تۆ وەك مرۆڤەکانی ئەم دەوروبەرە جلوبەرگ لەبەر ناکەیت. هەمیشە چاوەڕوانم بزانم جاری داهاتوو چ شتانێك بەیەکەوە ڕێکدەخەیت و لەبەریان دەکەیت.

–باشە، مرۆڤەکانی ئەم دەوروبەرە دەبێت چۆن جلوبەرگ بپۆشن؟

لقەدارێك لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، هەربۆیە ویل ناچار بوو کورسییە تایەدارەکەی کەمێك بەرەو لای چەپ لاریکاتەوە.

–قوماشی خوری، یان ئەگەر لە گروپەکەی دایکم بیت، جلوبەرگێکی وەك ئەوەی ئەو.

دواتر سەیری کردم.

–ئەم سەلیقە سەیرو سەمەرەیەت لەکوێ هێناوە؟ پێشتر لە کوێ دەژیایت؟

–لە هیچ شوێنێکیتر نەژیاوم و هەر لێرە بووم.

–کەوابوو هەمیشە ماڵتان لێرە بووە؟

–بەڵێ.

ئاوڕمدایەوەو سەیرێکم کرد. پەنجەکانی هەردوو دەستم وەك حاڵەتی پاڵپێوەنان لەسەر سنگم لێك ئاڵاند.

–باشە، ئەوە کێشەی چییە؟

–ئێرە شارێکی بچوکە. زۆریش سنورداره. هەمویشی لەبەر ئەم قەڵایە.

وەستاین و چاومان بڕییە قەڵاکە، لە دورەوە دەمانبینی کە لەسەر تەپۆڵکە سەیروسەمەرەو گومەزی ئاساکەوە شار دەرکەوتووە، ئەوەندەی جوانی وێنەی منداڵێك بوو.

–هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە قەڵا شوێنێکە کە خەڵکی زیاتری بۆ دێن. ئەو کاتانەی کە لە شتەکانیتر ماندوبون یاخود نازانن بۆ کوێ بچن.

–سوپاس.

—ئەڵبەتە خۆی لەخۆیدا هیچ کێشەیەکی نییە، بەڵام.... هێندەیش پڕ هات و هاوار نییە. جموجۆڵی تێدا نییە نا؟ هەمیشە یەك جۆرە. شتە نوێکان، خەڵکانی سەرنجڕاکێش، یان پێگەیەکی تایبەتی نییە. خەڵکی ئێرە وا بیردەکەنەوە ئەگەر فرۆشگا گەشتیارییەکانی شار ژێردەفرێك بە وێنەی سکەی شەمەندەفەر بفرۆشن، کۆتایی بەدبەختییە.

نەمتوانی ڕێگری لە پێکەنینەکەم بکەم. هەفتەی پێشوو یەکێك لە ڕۆژنامە ناوچەییەکان بابەتێکی لەمبارەیەوە بڵاو کردەوە.

—کلارك، تۆ تەمەنت بیست و شەش ساڵە. ئیتر کاتیەتی کە لێرە بڕۆیت و دوونیا بخەیتە ژێر پێیەکانتەوە. کۆمەدی جلوبەرگە سەیروسەمەرەکانت بۆ پیاوە فێڵبازەکانی ناو قاوەخانەکە نمایش بکەیت و خۆت توشی گێرەو کێشە بکەیت.

—من لە ژیان لێرەدا زۆر ڕازیم.

—بەڵام نابێت ڕازی بیت.

—تۆ چەندە حەزت لەوەیە کە بەخەڵکی بڵێیت دەبێت چی بکەن!

گوتی:

—تەنها کاتێك حەزدەکەم کە لەسەر حەق بم، بێزەحمەت قەسەبەکە بگوازرەوە ناتوانم بخۆمەوە.

منیش قەسەبی ناو خواردنەوەکەم سوڕاند بۆ ئەوەی بە ئیسراحەتتر بخواتەوە. وەستام تاوەکو هەموی خواردەوە. کەمێك هەوا سارد بوو نوکی گوێی کەمێك پەمەیی بوبویەوە.

دەموچاوی هێنایەوە یەك و گوتی:

—یا عیسا مەسیح، بۆ کچێکی وەك تۆ کە لەرێگەی چای لێنانەوە ژیان بەسەر دەبات، ئەمە چ شوێنێکی بێمانایە کە دروستتکردوە.

—تۆ تەنها لەسەر خواردنەوەی چاییە هەواو ئارەزو وروژێنە چینیەکان ڕاهاتویت.

—ئارەزو وروژێنەر!

لە سەرسوڕماندا دەمی بوبو بە تەڵەی تەقیو. دواتر گوتی:

—هەرچی هەیە خۆ لەم ڕۆنە خەستە باشترە. ئەی هاوار یەك کەوچك بخەر دەستت دەوەستێت و نارێژێتە خوارەوە.

—باشە، لەوانەیە چاییەکەی من ناخۆش بێت...

لەسەر قەرەوێڵەکە لەبەرامبەرییەوە دانیشتم.

—بەڵام بۆچی بۆ تۆ کێشە نییە سەبارەت بە هەر قسەیەك کە دەیکەم و هەر کارێك کە ئەنجامیدەدەم ڕاوبۆچونی خۆت بڵێیت؟

—باشە لوئیزا کلارك بەردەوامبە. بۆچونی خۆت بە من بڵێ.

—سەبارەت بە تۆ؟

ئامێکی لە خۆبایانەی هەڵکێشاو گوتی:

—پێمبڵێ من دەبێت چی بکەم؟

—دەتوانیت قژەکانت کورت بکەیتەوە. وەك مرۆڤە شەقاوەو بەرەڵاگانت لێهاتووە.

—زۆر ناشیرینیان کردویت. بەلایەنی کەمەوە دەتوانیت کورتیان بکەیتەوە. موەکانی دەموچاوت زۆر درێژ بوون؟

لەژێرچاوەوە سەیرێکی کردم.

—بەڵێ، خۆیشم دەزانم. باشە، ئەمڕۆ پاشنیوەڕۆ دەیانتاشم.

—ئۆو نەخێر...

—بەڵێ، تۆ پرسیت ڕیشم زۆر بووە، منیش وەڵامەدایەوە. لەلایەکیتریشەوە خۆ بڕیارنییە تۆ دەموچاوم بۆ چاکبکەیت.

—ئەی ئەگەر پێت بڵێم مەیکە چی دەکەیت؟

—نەخێر هەر دەبێت بیانتاشم. ئەگەر درێژتر بن ئەوکات ناچارم وردەی خواردنیان پێوە لێبکەمەوە. ڕاستگۆیانە پێت بڵێم ئەوکات ناچار دەبم لەسەر مەسەلەی دروستکردنی مەترسی بۆ سەر تەندروستیم سکاڵا لە تۆ بکەم.

دواتر زەردەخەنەیەکیکرد. هەروەك بڵێی قسەیەکی پێکەنیناویم کردووە. جێگەی داخ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ویل زۆر بەکەمی زەردەخەنەی دەکرد، بویە هۆی ئەوەی زۆر گوێ بە بابەتەکە نەدەم و منیش پێبکەنم.

—کلارك چاکەیەکم لەگەڵ دەکەیت؟

—چی؟

—گوێم بۆ بخورێنە. شێتی کردوم.

–ئەگەر ئەمکارە بکەم، ڕێگەم پێدەدەیت سەرت بۆ چاکبکەم؟ تەنها کەمێك ڕێکوپێکی دەکەم.

–باشە ئێستە ئەوەندەش ڕوودار مەبە!

–هۆش! تکایە شپرزەم مەکە. خۆم دەزانم کە کورت کردنەوەی سەرو ڕیشم باش نییە.

***

لەناو لۆکەری گەرماوەکەدا گوێزان و مەڵحەمی ڕیشتاشینم دۆزییەوە. لۆکەی تەندروستیان لکاندبوو بەپشتی دەستماڵە تەڕەکانەوە، بەجۆرێك کە هەر دەتگوت ماوەیەکی زۆرە کەڵکیان لێوەرنەگیراوە. ویلم ڕازیکرد بێتە ناو گەرماوەکەوە. لەگانەکەم پڕکرد لەئاوو پشتەوەی کورسییە تایەدارەکەم کەمێك لارکردەوە. دواتر خاولییەکی گەرمم بەست بە گەردن و سنگییەوە.

–ئەمە چییە؟ دوکانی ئارایشتگات کردوەتەوە؟ ئەم خاولییە بۆ چییە؟

منیش دانمنا بە مەسەلەکەدا.

–نازانم ئەمە کارێکە کە لەناو فیلمەکاندا بینیومە. لەکاتی منداڵبونیشدا خاولی و ئاوی گەرم بۆ ژنان دەبەن.

نەمدەتوانی دەمی ببینم، بەڵام لە خۆشیدا چواردەوری چاوەکانی چرچ بوبون، حەزم دەکرد هەمیشە بەمجۆرە بێت، حەزم دەکرد هەمیشە شادو دڵخۆش بێت. زۆر بڵێییم دەکرد، نوکتەم بۆ دەگێڕایەوە، کۆمەڵێك گۆرانیم بۆ دەگوت بۆ ئەوەی ئەو سەروفەساڵە نیگەران و پڕ لەئازارە لە خۆی نەگرێت. بەکورتی، هەموو کارێکم دەکرد بۆ ئەوەی دووبارە ڕوگرژ و خەمبار نەبێت و زیاتر شاد و دەمبەخەندە بێت.

قۆڵی کراسەکەم هەڵکرد و مەڵحەمی ڕیشتاشینەکەم هێنا بە دەموچاویدا. گوتم:

–ئێستە دەبێ بڵێم تاوەکو ئەمڕۆکە تەنها قاچەکانم بەمشێوەیە بە مەڵحەم چەور کردبوو.

چاوەکانی داخست و پاڵیدا بە پشتی کورسییەکەوە. منیش سەرقاڵ بووم و بە هێمنی و خۆپارێزییەوە بە گوێزان ڕیشیم بۆ تاشی، کاتێك گوێزانەکەم دەچەقاند بەناو لەگانی ئاوەکەدا تەنها دەنگی شڵپە شڵپەکەی بێدەنگییەکەی دەشکاند. هەروا کە بەبێدەنگی سەرقاڵی کارەکەم بووم، چوم بەناو دەریای دەموچاوی ویل ترینەردا، ئەو هێڵانەی کە دەگەیشتنەوە بە قەراخەکانی دەمی، ئەو شتانەی کە سەبارەت بە تەمەنی زۆر قوڵ بوون، موەکانم لەقەراغ

دەموچاوی لابرد. شوێنەواری ئاشکرای ڕووداوەکە بەسەر دەموچاوییەوە دەرکەوت. سێبەری ئەرخەوانی کە باسی بێخەوی شەوانەی دەکرد لەنێوان برۆکانیدا دەرکەوت کە ئاوێنەنوێنی ئازارێکی خامۆش و بێدەنگبوو. بۆنێکی شیرین و گەرم لە پێستیەوە بەرز دەبویەوە، تێکەڵەیەك لە بۆنی مەڵحەم و بۆنێکی خۆش و گران لە بون و وجودی خودی ویلەوە سەرچاوەی دەگرت. وردە وردە دەموچاوی دەرکەوت، منیش بەباشی دەمبینی کە چەندە ئاسان دەتوانێت ژنێکی وەك ئالیسیا کەمەندکێش و شەیدای خۆی بکات.

لەسەرخۆو زۆر بە خۆپارێزییەوە کارم دەکرد. کاتێك دەمبینی کە چۆن لە ئارامشدایە، بوێرییەکی زیاترم پەیدا دەکرد. ئەوەم بەبیردا هات کە تەنها بۆ کارە دەرمانی و پزیشکیەکانە کەسێك دەتوانێت دەست لە جەستەی بدات. لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیەدا پەنجەکانم بە هێمنی و نەرمونیانی دەهێنا بەسەر پێستیدا و هەوڵمدا بەپێی توانا جوڵەکانی دەستم جیاوازترین لە بەریەککەوتنی مەکینەی ریشتاشینەکەی دەستی نیتن و دکتۆر، کاتێك کە سەرو ریشیان بۆ چاککردوە.

ریش تاشینی ویل کارێکی تەواو شەخسی بوو، هەروا کە سەرقاڵی کار بووم، بیرم کردەوە کە کورسییە تایەدارەکەی رێگرە، ئیفلیجی و نەخۆشییەکە رێگرە لە هەر حەزێکی چێژو خۆشی ویستانە لە ناوبراودا. بەڵاَمە نەخێر نەیدەتوانی بەمشێوەیە بێت. نەگونجاوبوو کە بەوجۆرە لەکەسێکەوە نزیك بیت و هاتنەوەیەکی پێستی لەژێر پەنجەکانتدا هەستپێبکەیت. لە هەوایەکدا کە ئەو هەناسە دەدات تۆیش هەناسە بدەیت، دەموچاوی تەنها چەند سانتیمەترێك لە دەموچاوتەوە مەودای هەبێت، بەڵام پەرێشانیش نەبیت. کاتێك گەیشتمە ئەولاکەی دەموچاوی، وردە وردە هەستم بە دەستەپاچەیی دەکرد، هەروەك بڵێی زیاتر لە بەرەی خۆم پێمراکێشاوە.

لەوانەیە خووی گرتبێت بە حاڵەتەکانی خەڵکانی دەوروبەرییەوە، بەڵام بەرواڵەت هەستی بەگۆڕانکاری هەستپێنەکراوی فشاری دەستم دەکرد، چونکە چاوەکانی کردەوە و چاوی بڕییە نێوچاوانم.

ساتێك وەستاو دواتر بە ئاوازێکی جیدییەوە گوتی:

—-تکایە پێم مەڵی کە برۆکانیشت تاشیوم.

—تەنها یەك برۆت.

گوێزانەکەم خستە ناو ئاوە گەرمەکەوە و شۆردم. خواخوام بوو کاتێك لادەکەمەوە سورایی گۆناکانم نەمابێت.

لە کۆتاییدا گوتم:

—یەك برۆیان بەسە. نیتن سەردانمان ناکات؟

گوتی:

—ئەی سەرم چاك ناکەیت؟

—بەڕاست! دەتەوێت چاکی بکەم؟

—بەڵێ، دەبێت قژەکانم کورت بکەیتەوە.

—وامزانی حەزناکەیت و ڕازیت نییە.

تاوەکو ئاستێك کە دەیتوانی شانەکانی بەرزکردەوە، شانەکانی کەمێك جوڵەیان هەبوو. گوتی:

—یەك دوو هەفتەیەکیش واز لە بۆڵە بۆڵ بهێنیت، کەمترین تیچویەکە کە لەبەرامبەرییەوە دەیدەم.

هەروا کە خەریکبوم گەردیلەی کەفی مەڵحەمی ڕیشتاشینەکەم بەسەر دەموچاوییەوە پاکدەکردەوە، گوتم:

—ئەی هاوار خودایە گیان! دایکت چەندە خۆشحاڵ دەبێت!

—بەڵێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو خۆشحاڵ دەبێت واز ناهێنین و پەشیمان نابینەوە.

***

لەناو ژوری دانیشتنەکەیشدا سەریم بۆ چاککرد. شومینەکەم داگیرساند و فیلمێکی پۆلیسی ئەمریکاییشم خستە ناو سیدیەکەوە. خاولیم پێچا بەشان و ملییەوە. پێشتر بە ویلم گوت کە کەمێك ناشیم، بەڵام لەوە خراپتر نابێت کە ئێستە هەیە.

گوتی:

—سوپاست دەکەم مەمنونم.

دەستبەکار بووم، قژەکانیم خستە نێوان پەنجەکانی دەستمەوە و هەوڵمدەدا یاساو بنەماکانی سەرچاککردنم بەبیر بکەوێتەوە. ویل کە سەرقاڵی سەیرکردنی فیلم بوو، ئاسودەی و خۆشحاڵ دەهاتەپێشچاو.

هەندێکجار بۆچونی خۆی سەبارەت بە فیلمەکە دەردەبڕی، -هونەرمەندی ڕۆڵی سەرەکی لە چ فیلمانێکدا ڕۆڵی بینیوە و یەکەمینجار لە چ فیلمێکدا ئەوی بینیوە- هات و هاوارێکی ناڕونیشی وەرێخستبووکە نیشانیدەدا چێژ لە بینینی فیلمەکە وەردەگرێت، (ڕێك وەك من کاتێك کە یاریم لەگەڵ تۆماسدا دەکرد). لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، هەموو هەست و هۆشم بەلایەوە بوو نەوەك قژەکانی سەقەت بکەم. لە کۆتاییدا تەواو بووم. ڕۆیشتم و لەبەرامبەرییەوە وەستام بۆ ئەوەی بزانم چ کەتنێکم کردووە.

ویل فیلمەکەی وەستاند و گوتی:

-چۆنە؟

ڕێك وەستام.

-باوەڕناکەم تاوەکو ئێستە دەموچاوتم بینیبێت. بەڕاستی حەیف بوو!

گوتی:

-سەرمامە.

-سەری لەلای چەپەوە بەرەو لای ڕاست جوڵاند، هەروەك بڵێی خەریکبوو سەرمای پشتەملی خۆی دەچەشت،

گوتم:

-بوەستە، ئێستە دوو ئاوێنە دەهێنم، بۆ ئەوەی بەباشی خۆت ببینی. تەنها مەجوڵێ. چونکە هێشتا تەواو نەبووە، دەبێت کەمێك ڕێکوپێکتری بکەم. بەگریمان دەبێت یەکێك لە گوێکانت ببڕم... دەنگی دەرکاکەم بیست. دەنگی هەنگاوی بەپەلەی دوو کەس دەهاتە بەرگوێ. دەنگی خاتوو ترینەر هات کە پەشۆکاو بوو.

-جورجینا، تکایە نەخێر.

دەرگای ژوری دانیشتنەکە کرایەوە. بەپەلە ئاوێنەکەم هەڵگرت و لە ژورەکە چومە دەرەوە. هەرگیز حەزم نەدەکرد کە بزانێت دووبارە ویلم بەتەنیا بەجێهێشتووە. خاتوو ترینەر لەناو دەرگای ژوری دانیشتنەکەدا وەستابوو. هەردوو دەستی خستبویە سەر دەمی خۆی. دیاربوو کە ڕوبەڕوی شتێکی پێشبینی نەکراو بووەتەوە.

-تۆ خۆویسترین پیاوێکی کە لە تەمەنمدا بینیومە.

دەنگی ژنێکی گەنج بوو کە هاواری دەکرد.

–ویل باوەڕناکەم. هەر لە سەرەتاوە تۆ خۆویست بویت، ئێستەیش خراپتر بویت. خاتو ترینەر منی بینی کە خەریکم نزیکدەبمەوە.

–جورجینا بێزەحمەت تەواوی بکە، ئیتر بەسە.

لە دوایەوە هاتمە ناو ژورەکەوە. ژنێکی گەنج لەبەرامبەر ویلەوە وەستابوو، بەسەر شانەکانی ویلەوە خاولی و پارچە قژی قاوەیی ڕەنگ، لەتەنیشت تایەکانی کورسیەکەوەو بەسەر زەوییەکەیشدا مووەکان بڵاوبوبونەوە. ژنەکە قژە ڕەشە درێژەکانی لە دواوە بەستبو، پانتۆڵێکی سپی و لەبەن چنراوی گران و پوتێکی جیری لەپێدا بوو. پێستێکی برۆنزی و لەش و لارێکی جوانی هەروەك ئالیسیای هەبوو. ددانەکانی هەروەك ڕیکلامی مەعجونی دەمودان لە سپییەتیدا دەدرەوشانەوە. هەروا خەریکبوو هات و هاواری دەکرد، هەر لەبەر ئەمەبوو کە ددانە سپیەکانی دەرکەوتبون. لە تورەییدا دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕابوو.

–باوەڕ ناکرێت. ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە تەنانەت بیریشت لێکردبێتەوە. لەناو ئەم هات و هاوارەدا دەنگی خاتوو ترینەر زۆر بەبڕشتەوە دەهاتە بەرگوێ کە دەیگوت:

–جورجینا تکایە، ئێستە کاتی ئەوە نییە.

ویل بە قیافەیەکی گرنگیپێنەدەرەوە ڕاستەوخۆ لەبەرامبەرییەوە وەستابوو سەیری جێگەیەکی نادیاری دەکرد.

بە هێمنییەوە گوتم:

–ویل پێویستت بەیارمەتی نییە؟ ژنە گەنجەکە کتوپڕ سوڕایەوە.

–تۆ کێیت؟

–منیش چاوەکانیم بینی کە پڕبون لە فرمێسك. ویل گوتی:

–جورجینا، خاتوو کلارك بناسە. پەرستارو ئارایشتگەری زۆر داهێنەرم. تۆیش بەجۆرجینای خوشکم دەناسێنم. وادیارە لە ئوسترالیاوە بە فڕۆکە هاتووە بۆ ئەوەی هات و هاواریکات بەسەرمدا.

جورجینا گوتی:

–ئەوەندە بێخەم مەبە. دایە، تکایە پێمبڵێ، خۆم هەمووی دەزانم.

هیچکەسێك کاردانەوەی نیشاننەدا.

گوتم:

—دەتانەوێت من بڕۆم.

—بەڵێ، بیرۆکەیەکی باشە.

دەستی خاتوترینەر لەسەر قەنەفەکە بوو سپییەتی پەنجەکانی بەتەواوەتی دەرکەوتبوو.

لەژوورەکە چومە دەرەوە.

—لوئیزا، لەوانەیە ئێستە هەلێکی باش بێت بۆ کاتی نانی نیوەڕۆ.

بەڕواڵەت لەو ڕۆژانە بوو کە دەبوایە لەژێر سێبەری وێستگەی پاسەکەدا دابنیشم. لە چێشتخانەکە ساندەویچەکەم هەڵگرت و چاکەتەکەمە لەبەرکرد و بەڕێکەوتم.

کاتێك لەماڵەوە دەهاتمە دەرەوە، دەنگی جورجینا ترینەرم لەناو ماڵەکەدا دەبیست.

—ویل، هەرگیز هات بە مێشکدا، یان باوەڕت بەوە هەیە کە ئەمە تەنها پەیوەست نییە بەتۆوە؟

***

کاتێك ڕێك نیوسەعات دواتر گەڕامەوە، ماڵەکە بێدەنگبوو. نیتن لەناو چێشتخانەکەدا سەرقاڵی شۆردنی پەرداخ بوو. کاتێك زانی هاتومەتەوە، ئاوڕی دایەوە و گوتی:

—دەنگوباس چییە؟

—ڕۆیشت؟

—کێ؟

—خوشکەکەی؟

نیتن سەیرێکی دواوەی خۆی کرد.

—ئەها، بەڵێ ڕۆیشت. کاتێك گەیشتم، پێی بە بەنزینی ئۆتۆمبیلەکەیدا نابوو خەریکبوو دەرۆیشت. کێشەی خێزانی، بەڵێ؟

—نازانم. لەناوەڕاستی سەرچاککردنەکەی ویلدا بووم ئەم ژنە هات و دەستیکردە هاتوهاوار. سەرەتا وامزانی ئەمەش کچە هاوڕێیەکی ویلە.

نیتن شانەکانی بەرز کردەوە. هەستمکرد زۆر خۆی تێکەڵی وردەکارییەکانی ژیانی ویل ناکات. هەرچەندە لەوانەیە زانیاریشی لەبارەیانەوە هەبێت.

—کەمێك چوەتەوە بەناو خۆیدا. بەباشی سەرت چاککردوە. چەندە باشبوو کە لەناو ئەو دارستانەدا هێناتە دەرەوە.

چوم بۆ ژوری دانیشتنەکە. ویل دانیشتبوو چاوی بڕیبویە تەلەفیزیۆنەکە. تەلەفیزیۆنەکە لەسەر هەمان ئەو دیمەنە وەستابوو کە من لەژورەکە چوبومە دەرەوە. گوتم:

—دەتەوێت هەڵیبکەم.

خولەکێك هەروەك بڵێی دەنگیم نەبیست. سەری کردبویەوە بەناو شانەکانیدا. کاتژمێرێك لەمەوبەر دەموچاوێکی ئارام، بەلاّم ئێستە تۆپەڵەیەکبوو لە خەم و نیگەرانی. دووبارە ویل چوبویەوە بەناو خۆیدا، قوفڵێکی لە بوون و وجودی خۆی دابوو، من نەمدەتوانی بیکەمەوە.

برۆی بەرزکردەوە هەروەك بڵێی تازە زانیبوی گەڕاومەتەوە بۆلای، گوتی:

—بەڵێ.

***

سەبەتەی جلوبەرگە شۆردراوەکانم بەدەستەوە بوو بەناو هۆڵەکەدا تێدەپەڕیم، کە دەنگیانم بیست. دەرگای ماڵە ناسەرەکییەکە بەهێواشی کرایەوە و دەنگی خاتوترینەرو کچەکەی بەناو ڕێڕەوە دورودرێژەکەدا خولی خوارد. کپ و نادیار بوو. خوشکەکەی ویل بە هێمنیەوە دەگریا، ئێستە ئیتر دەنگی توڕە نەبوو، بەڵکو زۆر جێگەی بەزەیی بوو.

—بەدڵنیاییەوە کارێك هەیە کە بتوانن بیکەن. زانستی پزیشکی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. ناتوانن بیبەن بۆ ئەمریکا؟ ئەمریکا هەمیشە لە هەموو ڕوانگەکانەوە پێشکەوتوترە.

—باوکت ئاگای لە دوایین پێشکەوتنەکانە. بەلاّم نەخێر ئازیزەکەم، هێشتا نا... دڵنیابە.

—لەگەڵ جاراندا زۆر فەرقی کردووە. وادیارە بڕیاریداوە ئیتر بە هیچ شتێك خۆشبین نەبێت. هیواو ئومێدی لەدەستداوە.

—جورجینا، هەر لەو سەرەتایەشەوە هەروابووە. وابزانم لەبەر ئەوەی کە کەمتر بینیوتە وادەڵێیت. تەنها ئەو کاتانە دەتبینی کە دەهاتیتەوە بۆ ماڵەوە. بەبڕوای من هەمیشە بەمشێوەیە ڕەشبین بووە. هەمیشە وایدەزانی کە شتێك ڕوودەدات.

هەستم بە ئازار دەکرد کە قسەوباسە تایبەتەکەیان دەبیستم. بەڵام ئەو کەشوهەوا نائاساییەی کە هەبوو ناخودئاگا ملوموشکاری دەکردم بۆ ئەوەی شتەکان بزانم. هێدی هێدی بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشتم. گۆرەویم لە پێدا بوو دەنگی ترپەی پێیەکانم نەدەهات.

—سەیرکە، من و باوکت پێمان نەگوتیت، لەبەر ئەوەبوو کە بێتاقەت نەبیت. بەڵام ئەیویست.... هەروەك بڵێی کێشەی لەگەڵ ووشەکاندا هەبوو.

—ویل ئەیویست خۆی.... خۆی بکوژێت.

—چی؟

—باوکم بینی. ئەوە مانگی دیسەمبەری ڕابوردوو بوو. ترسناك بوو. تۆ نازانیت چەندە ترسناك و تۆقێنەر بوو!

لەگەڵ ئەوەی کە خۆم گومانم بردبوو ئەم قسەیەش تەنها پشتگیری دەکرد، هەستمکرد گیان لە لەشمدا نەما. دەنگی گریانێکی بێدەنگ دەهات و دەنگێکی نزمیش کە دڵیدەدایەوە. دووبارە بێدەنگییەکی درورودرێژ باڵیکێشایەوە بەسەر کەشوهەوای ماڵەکەدا. دواتر دەنگی جورجینا کە لە خەم و پەژارەدا کفت بوبو هاتە بەرگوێ.

—ئەم کچە کێیە؟

—لوئیزام دامەزراندووە بۆ ئەوەی ئاگاداری بێت کە ڕووداوی لەو شێوەیە دووبارە نەبێتەوە.

ئیتر گوێم بۆ پاشماوەی قسەکانیان نەگرت، لەناو توالیتەکەی کۆتایی ڕێڕەوەکەدا دەنگی نیتن و ویلم دەبیست کە بەچپە بەیەکەوە قسەیان دەکرد. بێئاگا لەو قسانەی کە تەنها چەند مەترێك لەدوری ئەوانەوە ئەنجامدەدرا. یەك هەنگاو زیاتر نزیکی دەرگاکە بوومەوە. وابزانم لەوکاتەوە کە شوێنی برینەکەم لەسەر مەچەکی بینی، خۆم زانیبوم کە هەوڵی خۆکوشتنی داوە. هەموشتێك ڕێك بەیەکەوە دەگونجا، خەم ونیگەرانی خاتوو ترینەر کە بۆ ماوەیەکی زۆر ویل بەتەنیا بەجێنەهێڵم، دژایەتی ویل لەبەرامبەر ئامادەبوونی من لەوێدا، ئەو ڕاستیەی کە بۆ ماوەیەك بیرم لێدەکردەوە کە بۆچی دایانمەزراندوم، لەکاتێکدا هیچکارێکی تایبەتم نییە.

هەروەك بڵێی هاتبوم بۆ ئەوەی چاودێری منداڵێك بکەم. من ڕۆحیشم ئاگادار نەبوو، بەڵام خودی ویل دەیزانی، هەر لەبەر ئەمەبوو کە ڕقی لێم بوو.

کیلۆنی دەرگاکەم گرت. ئەمویست بەهێواشییەوە دایبخەم. نەمدەزانی نیتن دەزانێت یان نا، حەزم دەکرد بزانم ئێستە ویل ئامادەبونی منی قبوڵکردوە یان نا. ئێستە کە زانیبوم کێشەی ویل من نیم، هەناسەیەکی ئیسراحەتم هەڵکێشا، ئەمەش لە خۆویستیمەوە بوو. کەوابوو ویل لەو بارودۆخەی کە بۆیان دروستکردبوو بێتاقەت و بێزار بوو.

—دایکە تۆ نابێتە ڕێگەی بدەیت ئەمکارە بکات، دەبێت ڕێگری لێبکەیت.

—ئازیزەکەم هەڵبژاردن بەدەستی ئێمە نییە.

—بەڵێ، بەدەستی ئێوەیە، ئەگەر داوات لێبکات یارمەتی بدەیت.

هێشتا دەستم لەسەر کێلۆنی دەرگاکە بوو.

هەرگیز باوەڕناکەم کە تۆ ڕازی بیت. ئەی بیروباوەڕە ئاینیەکەت چی لێدێت؟ ئەی ئەوکارانەی کە کردوتە چیان لێدێت؟ ئەی باشە بۆ ئەمجارەی دوایی ڕزگارت کرد؟

ئاوازی قسەکانی خاتوو ترینەر بە ئەنقەست هێمن و ئارام بوو.

—ئاخر ویژدان نەبوو ڕزگاری نەکەم.

—بەڵام خۆتۆ گوتت کە دەیبری، ئەی چۆن بوو....

—ساتێك بیربکەرەوە. ئەگەر قبوڵم نەکردایە، ئایا داوای یارمەتی لە خەڵکانیتر نەدەکرد؟

—چون بۆ دیگنیتاس[10] هەڵەیەکی زەقە، دەزانم ژیان بۆی زۆر سەختە، بەڵام دڵنیام تۆو باوکیشم بەخۆیەوە دەفەوتێنێت.

بیر لە هەستتان بکەنەوە! بیر لە قسەی خەڵکی بکەنەوە! بیر لەکارەکەتان بکەنەوە! هەردوکتان ڕیسوای ناو خەڵکی دەبن. خۆی دەبێت ئەم شتانە بزانێت. تەنانەت داواکردنیشی

---

[10] ڕێکخراوی یارمەتیدانی خۆ کوشتنەکانە، ئەم ڕێکخراوە لە وڵاتی سویسرادا هەیە، یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە نەخۆشی چارەسەر نەکراویان هەیە و بەڵگەی پزیشکی و یاساییان هەیە، بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان بکوژن و ئەوەندە ئازار نەچێژن.

خۆویستیە. چۆن دەتوانێت؟ چۆن دەتوانێت ئەمکارە بکات؟ ئەی ئێوە چۆن دەتوانن ئەمکارە بکەن؟

دووبارە دەستیکردەوە بەگریان.

—جورجینا...

—بەوشێوەیە سەیری من مەکە. دایکە، ویل بەلای منەوە زۆر گرنگە. زۆر زۆر، ئەو برامە، من زۆرم خۆشدەوێت. من توانای تاملّکردنی ئەو مەسەلەیەم نییە. تەنانەت ناتوانم بیریشی لێبکەمەوە. ئەو هەڵەی کردووە کە ئەو داوایەی کردووە. تۆیش هەڵەت کرد کە قبوڵت کردووە. ئەگەر گوێ بۆ قسەکانی بگریت، ئەوە تەنها ژیانی خۆی نییە کە نابود دەبێت و لەناو دەچێت.

یەك هەنگاو لە پەنجەرەکە دوورکەوتمەوە. گوێم بەجۆرێك دەزرنگایەوە کە بەئاستەم وەڵامەکەی خاتوو ترینەرم بیست.

—جورجینا، شەشە مانگ، وادەی شەش مانگی بەمنداوە. ئێستەیش نامەوێت لەمبارەیەوە قسەیەکیتر بکەیت. بەتایبەت لەبەردەم خەڵکانیتردا. ئێمە دەبێت...

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا...

—تەنها دەبێت شەوو رۆژ نزابکەین کە شتێك روبدات بۆ ئەوەی ئەو بیروبۆچونەکەی خۆی بگۆرێت.

{٨}

**کامیلاترینەر**[11]

من هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبووە کە یارمەتی کوڕەکەم بدەم بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت.

تەنانەت خوێندنەوەی ڕستەیەکی لەوشێوەیەش سەیرو سەمەرەیە، هەروەک ئەو ڕستانە وایە کە مرۆڤ تەنها لەناو چاپەمەنییە جەنجاڵەکاندا دەیخوێنێتەوە.

من کەسێك نەبووم کە دەستبدەمە کارێکی لەوشێوەیە. یان بەلایەنی کەمەوە بیرم بکردایەتەوە کە بوونم نییە. ژیانی من سیستەمێکی سروشتی هەبوو، ژیانێکی ئاسایی بە کۆمەڵێك پێوەری نوێوە. نزیکەی سی و حەوت ساڵ لەمەوبەر هاوسەرگیریم کرد. دوو منداڵم هەبوو. چومە سەرکار، یارمەتی دارایم پێشکەشی قوتابخانە دەکرد، هاوکاری و هەماهەنگیم لەگەڵ ئەنجومەنی ماڵ و قوتابخانەدا هەبوو، هەرکە منداڵەکانم گەیشتنە ئەو تەمەنەی کە پێویستیەکی ئەوتۆیان بە من نەبوو. بوومە ئەندامی ئەنجومەنی دادوەران.

نزیکەی یازدە ساڵ دادوەر بووم. گرنگیم بە ژیانی ئەوکەسانە دەدا کە دەهاتن بۆلام: ئەو مرۆڤە نائومێدانەی کە تەنانەت نەیاندەتوانی ئەوەندە خۆیان کۆنترۆڵ بکەن کە سەری سەعات بگەنە دادگاو لە بڕیارەکانیدا ئامادە بن، تاوانبارانی هەمیشەیی، پیاوانی گەنج و ڕوگرژو توڕە و بێتوانا. دایکانی قەرزدار. کاتێك دەموچاوە هەمیشەییەکانم دەبینی لەگەڵ ئەو هەڵانەی کە چەندینجار دووبارە دەبونەوە، پاراستنی ئارامش و هادودەردی لەگەڵیاندا بۆ من کارێکی ئاسان نەبوو. خۆپاراستنی مرۆڤ لە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان و قبوڵکردنی لێپرسراوییەتیەکان، بەڕاستی دڵساردکەرەوەیە.

---

[11] لێرەوە قسەی کامیلا ترینەری دایکی ڤیلە.

هەروەها شارە بچوکەکەی ئێمەدا بەپێچەوانەی جوانی قەلاگەوە، باڵەخانە تایبەتەکان و ڕێگە بێوێنەکانی دەرەوەی شار، لەم کێشمەکێشمانەدا بێوەی نەبوون. گۆڕەپانە ڕیجنسییەکان[12] لەژێر دەسەلاتی نەوجەوانە مەستەکاندا بوون. دەنگی ئەو ژن و مێردانەی کە لە منداڵەکانیان دەداو بەناو ئەو کوخە کۆنانەدا خولی دەخوارد کە بە ساق و قاڕامی برنج سەرگیرابون. هەندێکجار هەستی پاشا کانیوتم هەبوو کە لەبەرامبەر شەپۆلێك لە ئاشوب و وێرانیدا قۆناغ بە قۆناغدا ڕاگەیاندن و ئاگادارییەکی بێوێنە دەردەکات.

لەگەڵ ئەم هەموو شتەدا، کارەکەی خۆمم خۆشدەویست. لەبەر ئەوە ئەمکارەم هەڵبژاردبوو چونکە باوەڕم بە ڕێکوپێکی و یاساو ڕێسا ئەخلاقیەکان هەبوو. باوەڕم وابوو ڕاستی و هەڵە بوونی هەیە، هەرچەندە لەوانەیە ئەمڕۆکە دیدگایەکی لەوجۆرەیان قبوڵ نەبێت.

کارکردن لەناو باخچەی حەوشەی ماڵەکەمدا ژیانمی برتر کردبوو لە هەوڵ و کۆشش. کاتێك منداڵەکان گەورە بوون، باخچەی ماڵەکە کاتەکانمی پڕ دەکردەوە. دەمتوانی ناوی لاتینی هەموو ئەو گیایانەتان پێبلێم کە پەروەردەتان دەکرد. سەیر لەوەدایە کە من لە قوتابخانەدا بەهیچ شێوەیەك وانەی لاتینیم نەخوێندبوو، قوتابخانەیەکی دەوڵەتی کچانە کە پشتی بە چێشتلێنان و دروستکردنی گوڵ بەستبوو، واتە ئەوکارانەی کە یارمەتیان دەداین ببینە ژن و دایکێکی باش، بەلام ناوی ئەو گولانە بەجۆرێك بوون کە لەبیرو زەینی ئێمەدا دەمانەوە. هەر ئەوەندە بەس بوو کە یەکجار ناوەکانیان ببیستم بۆ ئەوەی بەهەموو تەمەنم لەبیرم نەچنەوە. خربق، نیجر، گوڵ سرێش، سورمادە. هێندە بەئاسانی فێری ئەم ناوانە دەبوم کە هەرگیز بەوشێوەیە فێری وانەکانی قوتابخانە نەبووم.

دەڵێن کاتێك مرۆڤ تەمەن دەکات، زۆر حەز لە گوڵ گیا دەکات، منیش پێموایە ئەوە قسەیەکی ڕاستە. بە گریمانی بەهێز شتێکە کە پەیوەندی بە سوڕی ژیانەوە هەیە. ڕوانەوەی موعجیزە ئاسای گوڵ و گیاکان لەپاش زستان و لە بەهاردا هیچی لە موعجیزە کەمتر نییە. جۆرێکە لە خۆشی و شادی کە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە. شێوازێکە کە سروشت دەیگرێتەبەر بۆ ئەوەی بەوپەڕی هێزەوە هێزی دیمەن و دەرکەوتنە جیاوازەکانی باخچەکە نیشانبدات.

---

[12] لە شێوازەکانی بیناسازی و وێنەکێشان و...هتد لە بەریتانیا (١٨٢٠ – ١٨٢١)دا.

هەندێکجار –کاتێك ژیانی هاوسەرییەتیم زیاتر لە چاوەڕوانیم گۆڕدرا بە هاوژینی، باخچەی ماڵەکە بوویە پەناگەی من، کاتانێك کە پڕبوون لە شادی و خۆشی.

ڕاستیەکەیتان بوێت، تەنانەت کاتانێکیش هەبوون کە باخچەکەیش دەبویە هۆی ناڕەحەتی و بێتاقەتیم. هیچ شتێك دڵساردکەرەوەتر لەوە نییە کە ڕوەکێك بچێنیت و دواتر ببینیت کە گوڵ و گەڵا نەکات، یان ڕیزێك لە گوڵە سەوسەن ببینیت کە نیوەشەو لەلایەن ڕێبوارانی فێڵبازو دەغەڵەوە پێشێلکراوە. لەگەڵ ئەوەی کە باخچەکە کاتی دەگرتم و لەم بابەتە بێتاقەت بووم، بەڵام ووزەیەکی زۆرم لە چاودێریکردنیدا سەرف دەکرد. پاشنیوەڕوان کە بژارم دەکرد، جومگەکانم دەهاتنە ئێش و نینۆکەکانم هیچکاتێك پاك نەبوون، بەڵام دیسانەوە هەر عاشقی باخچەکە بووم. عاشقی ئەو خۆشی و چێژە بووم کە لە کەشوهەوای ئازاد و کراوەدا دەبویە بەشم. عاشقی بۆن و بەرامەکەی بووم. عاشقی ئەوەبووم کە هەستم بە زەوی دەکرد لەژێر پێیەکانمدا، بە بینینی ئەو دیاردانەی کە زیندوبوون، گەشەیان دەکرد و شەیدای جوانی کاتیی خۆیان بوون، چێژم وەردەگرت.

لەپاش دەعمەکەی ویل، نزیکەی یەك ساڵ دەستم لە باخچەکە نەدا. هۆکارەکەی تەنها کەمی کات نەبوو، هەرچەندە کاتژمێرانێکی بێ پایان لە نەخۆشخانەدا تێدەپەڕین، هاتوچۆکان کاتێکی زۆریان دەگرت و کاتیشم لەناو ئۆتۆمبیلدا دەبردە سەر، هەروەها چاوپێکەوتن و سەردانەکانی ویل هەموو کاتەکانی دەگرتم، شەش مانگ مۆڵەتی ناچاریم وەرگرت، بەڵام دیسانەوە هەر بەس نەبوو.

دواتر کتوپڕ بینیم ئەمە هیچ سودێکی نییە. هەربۆیە باخەوانێکم دامەزراند بۆ ئەوەی ئاگاداری باخچەکە بێت. بەڵام باوەڕناکەم توانیبێتم باخچەکە بگەیەنمە ئاستێك کە خاوەنی ڕەونەق و گەشاوەیی جارانی بێت، چونکە تەنها لە باشترین وەرزی ساڵدا جوان دەبوو، ئەوەش کاتیی بوو.

ئەمەش کاتێك بوو کە دووبارە ویلم هێنایەوە بۆ ماڵەوە. خانوە لاوەکییەکە پێشتر نۆژەن کرابویەوە و ئامادەکرابوو. لێرەدا بوو کە هەستمکرد دەبێت باخچەکە دووبارە جوان ببێتەوە. دەبوایە شتێکم پێشکەشی کوڕەکەم بکردایە بۆ ئەوەی سەیری بکات. دەبوایە بێدەنگ و بەبێ قسە بەوم بگوتایە کە بەڵکو بارودۆخەکان بگۆڕدرێن، باشتر بێت یان خراپتر، بەڵام ژیان بەردەوامە. دەبوایە ئەوەی تێبگەیەنم کە ئێمە بەشێکین لە سوڕێکی گەورە، تەقدیرێك کە تەنها

خودا ئاگادارییەتی. ئەڵبەتە نەمدەتوانی شتێکی لەمجۆرەی پێبڵێم، -چونکە من و ویل زۆر بەیەکەوە قسەمان نەدەکرد- هەر لەبەر ئەمە بوو کە دەبوایە نیشانی بدەم. قسەیەی بێدەنگ، ئەگەر خۆی بیەوێت وێنەیەکی گەورەتر کە دەکاتە هەمان ئایندەی ڕوون و ئاشکرا.

***

ستیڤن سەرقاڵ بوو ئاگری شومینەکەی خۆشە دەکرد، دارە نیوەسوتاوەکانی بە شارەزاییەکی تەواوەوە و بە یارمەتی مەقاشەکە جێگۆڕکێ پێدەکرد. بریسکەی کڵپەدار بەرەو لای دوکەڵکێشکە بەرز دەبونەوە. ستیڤن قۆتەرەیەکی تازەی خستە ناو دارەکانەوە. دواتر هەستایەوە و لە دواوە وەستا، ئەوکارەی کە هەمیشە ئەنجامیدەدا، بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە سەیری ئەو تیشکانەی کە دەکرد کە کڵپەیان دەهات. دەستی هێنا بە پانتۆڵە مەخمەڵییەکەیدا و پاکیکردەوە. هەرکە چومە ناو ژورەکەوە، ڕوی وەرگێڕا. پەرداخەکەم بەرەولای ئەو برد.

-سوپاس. جورجینا دێتە خوارەوە؟

-وادیارە نەخێر.

-چی دەکات؟

-سەیری تەلەفیزیۆن دەکات. پێمگوت بێتە خوارەوە بەڵام حەوسەڵەی کەسی نییە، ئەیەوێت بەتەنیا بێت.

-دواتر دێت، ماندویەتی گەشتەکە هێشتا لە جەستەیدا ماوە.

-هیوادارم. ئێستە کەمێك لە ئێمە بێتاقەتە.

لە بێدەنگییەکەدا وەستاین و سەیری ئاگرەکەمان دەکرد. ژورەکە تاریك و بێدەنگبوو، شوشەی پەنجەرەکەیش بەهۆی باوبارانەوە تەق و تۆقی دەهات.

-چ شەوێکی بێتامە!

-بەڵێ.

سەگەکە بە هەنگاوە ورد و نەرمەکانییەوە هاتە ناو ژورەکەوە. نوزەیەکی کرد و لەبەرامبەر ئاگرەکەوە دانیشت. بەدەما لەسەر زەوییە پاڵکەوتبوو بەوپەڕی عەشقەوە سەیری ئێمەی دەکرد.

ستیڤن گوتی:

-بیر لەچی دەگەیتەوە؟ ئەوەی کە سەرو ڕیشی کورت کردوەتەوە.

—نازانم بەڵام حەزدەکەم بەیەك نیشانەی ئەرێنیەوە ببینم.

—ئەم لوئیزایە مرۆڤێکی سەیرە، بەبڕوای تۆیش هەروایە؟

سەیری هاوسەرەکەمم کرد کە چۆن لەبەر خۆیەوە زەردەخەنەی دەکرد. بەبیرمدا هات بەڵام (نەك زۆر)، دواتر ئەم بیرکردنەوەیەم لە بیرو مێشکی خۆم دوور خستەوە.

—بەڵێ، بەڵێ، وابزانم.

—بەلای تۆوە کەسێکی گونجاوە؟

پێش ئەوەی وەڵامبدەمەوە قومێکم لە پەرداخەکە هەڵقوڕاندەوە و گوتم:

—خودا دەزانێت. بەڕاستی ئیتر نەمدەزانی ڕاست و هەڵە چییە؟

—ویل خۆشی دەوێت و لەگەڵیدا گونجاوە. دڵنیام پێی خۆشە کە لەلای بێت. پێرێ شەو کە سەرقاڵی سەیرکردنی هەواڵەکان بوین و قسەمان دەکرد، دووبارە ناوی ئەو کچەی هێنایەوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە پێشتر ئەمکارانەی نەدەکرد.

—بەڵێ، بەڵام من وەك تۆ هیوادار نیم.

—بۆچی؟

ستیڤن دەموچاوی لە ئاگرەکە وەرگێڕا. دەمبینی کە بەوردییەوە سەیری من دەکات، تۆ بڵێی تازە بەتازە بە چ شتانێکی نوێی دەوروبەری چاوەکانم و دەمی زانیبم کە لەو ڕۆژانەدا لە شڵەژان و شپرزەییدا وەك هێڵێکی باریکیان لێهاتبوو.

سەیرێکی خاچە ئاڵتونەکەی ملی کردم، شتێك کە ئێستە هەمیشە لە ملمدا بوو. هەرگیز حەزم نەدەکرد بەوشێوەیە سەیرم بکات. هەموو کات وام هەست دەکرد کە خەریکە لەگەڵ کەسێکدا بەراوردم دەکات.

—من تەنها کەسێکی واقیع بینم.

—وادیارە تۆ چاوەڕوانی ئەمە بویت.

—من کوڕەکەم دەناسم.

—کوڕەکەمان.

—بەڵێ، کوڕەکەمان.

بەلأم لەدلّمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە زیاتر کوڕی منە. تۆ هیچکاتیك لە پشتی نەبویت. بەتایبەت لەڕوی سۆزدارییەوە. تۆ تەنها کەسێکی نادیاربویت کە ئەو هەمیشە لە هەولّدا بوو بۆ ئەوەی نزیکت ببێتەوە.

ستیڤن گوتی:

—بیرو بۆچونی دەگۆڕدرێت. تاوەکو ئەوکاتە هێشتا زۆری ماوە.

هەر لەوێدا وەستاین، دووبارە پەرداخەکەم نابەسەرمەوە، سەهۆلّبەندان دژبەری ئەو گەرمایەدا بوو کە لە ئاگرەکەوە دەهات.

ستیڤن سەیری ئاگرەکەی دەکرد.

—بەردەوام بیر لەوە دەکەمەوە کە خەریکە شتێك لەدەستدەدەم.

مێردەکەم(ستیڤن) سەیری منی دەکرد. هەستم بە قورسایی نیگاکانی دەکرد. بەلأم نەمدەتوانی سەیری چاوەکانی بکەم. لەوانەیە ئەیویست پەیوەندیم لەگەلّدا ببەستێت. بەلأم وابزانم ئێستە ئیتر زۆر درەنگ بوو بۆ ئەوکارە.

—ئازیزەکەم ئێمە تاوەکو ئاستێك دەتوانین کارێك بکەین، ئەویتری لەدەستی ئێمەدا نییە.

—خۆیشم ئەوە باش دەزانم، بەلأم بەڕاستی ئەمە بەس نییە، ئەی بەسە؟

بەرەو لای ئاگرەکە ڕۆیشت. قۆتەرە دارێکی لە خۆیەوە تێکدا. منیش پشتم هەلّکرد و بەبێدەنگی لە ژورەکە چوومە دەرەوە.

خۆیشی تێگەیشتبوو کە دەڕۆم.

***

کاتێك ویل بۆ یەکەمینجار حەزو خواستی خۆی بەمن گوت، ناچار بوو دووبارەی بکاتەوە، چونکە جاری یەکەم لەوە دلّنیانەبوو کە لە قسەکەی تێگەیشتبم. کاتێك زانیم چی دەوێت، بێدەنگ بووم. دواتر گوتم قسەی بێمانا دەکات، خێرا لەژورەکە چوومە دەرەوە. بەڕاستی کارێکی ناجوامێرانەیە کە مرۆڤ هەنگاو هەلّبگرێت و پیاوێکی بەجێبهێلّێت کە دیل و ئەسیری کورسییەکی تایەدارە. لەنێوان خانوی سەرەکی و مالّەوە و خانوی لاوەکی و ناسەرەکیدا دوو قادرمە مەودا هەبوو، ویلیش بەبێ یارمەتی نیتن نەیدەتوانی ئەو مەودایە تەیبکات و ببیڕێت. من دەرگای خانووە لاوەکییەکەم داخست و لەناو ڕێڕەوی مالّەکەدا وەستام. قسەکانی کوڕەکە بەردەوام لە گوێمدا دەزرنگانەوە.

لەوانەیە بەڕاستی نزیکەی نیوسەعات بەوشێوەیە وەستابم.

ویل وازی نەدەهێنا. هەمیشە ویل بوو کە قسەی کۆتایی دەکرد و دەبوایە قسە هەر قسەی ئەو بێت. هەرکاتێك دەچوم بۆ بینینی، داواکارییەکەی دووبارە دەکردەوە، تا ئەوە بوو بەزۆر خۆم ڕازی کرد کە ئیتر هەموو ڕۆژێك نەچم بۆ بینینی. (**دایکە، نامەوێت بەمشێوەیە درێژە بەژیان بدەم. ئەم ژیانە هەڵبژاردەی من نییە. هیچ هیوایەك بە چاکبونەوەم نییە. ئیتر چ کێشەیەکی تێدایە کە بمەوێت بەشێوەیەکی گونجاو کۆتایی پێبهێنم**). دەنگیم دەبیست و دەمتوانی لەدانیشتنەکانی ئیش و کارەکەیدا بیهێنمە پێشچاوی خۆوم بەرجەستەی بکەم، کارێك کە ژیانی پڕ بەرەکەت دەکرد و مایەی شانازی بوو بۆی. ویل پیاوێکبوو کە نەریتی وابوو دەنگی ببیسترێت. مرۆڤێك نەبوو کە قبوڵی بکات من بەشێوەیەك ئەم هێزە پەیدا بکەم کە بۆ داهاتوی بڕیار بدەم. بەجۆرێك کە دووبارە ببمەوە دایکی، هەروەك سەردەمی منداڵی.

زۆر هەوڵیدا تاوەکو ڕەزامەندیم بەدەستبهێنێت. ئەوە ئاین و مەزهەب نەبوو کە بوونە ڕێگری من، هەرچەندە ئەم بیرکردنەوەیەی کە بەهۆی نائومێدی خۆیەوە بەرەو دۆزەخ و جەهەنەمی دەنێرم، زۆر ترسناك بوو بەتوندی ئازاری دەدام. (گەیشتبومە ئەو باوەڕەی کە خودای گەورە، خودای میهرەبان، هەست بە ئێش و ئازارو ڕەنجی ئێمە دەکات و لە گوناحەکەمان خۆشدەبێت).

ئەمە خاڵێکە کە هەرگیز ناتوانن لەبارەی دایکبونەوە هەستی پێبکەن و لێی تێبگەن. مەگەر ئەوەی کە خۆتا دایك بن: ئێوە پیاوێکی پێگەیشتو لەبەرامبەر خۆتانەوە نابینن بەبەڵگەیەکی تاوان و پێڵاوی سبوخ نەکراوو ژیانێکی عاشقانەی بێزارو بێتاقەت، بەڵکو منداڵێك دەبینن کە ڕیشی نەتاشیوە، نارێك کە تەنها بۆچونی خۆی پەسەند دەکات کە دەوروبەرەکانی و هەموو ژیانی لە یەك کەسدا کورت بووەتەوە و قەتیس ماوە.

کاتێك سەیری ویلم دەکرد منداڵێکم دەبینی کە توند دەیگوشم بەباوەشمەوە، دڵسۆزانە عاشقی بووم و باوەڕم نەدەکرد من هێناومەتە دوونیاوە. منداڵێکی تازەپێگرتوم دەبینی کە دەستی بەرەو لای من ڕاکێشاوە، منداڵێکی قوتابخانە لەبەر ئەوەی کە بە شەقاوەیی ڕەفتارییان لەگەڵدا کردووە، خەریکە دەگری. بێتاوانی و بەرائەت و ڕابوردویەکی هاوبەش. ئەمانە ئەو شتانە بوون کە ئەو داوای لەمن دەکرد لەناویان بەرم. —پیاوێك و منداڵێك— ئەیوست هەموو ئەو عەشق و هەموو ئەو ڕابوردووە لەناوبەرم.

دواترو لە ڕۆژی ٢٢ ی ژانویەدا، ئەوڕۆژەی کە من لە دادگادا و بە لیستێکی دوورودرێژەوە لە چەتە بەرەلاو شۆفێرە بێ بیمەکان و هاوسەرە پێشوە تورەو گریاوەکانەوە سەرقاڵبوم، ستیڤن دەچێت بۆ خانوی ناسەرەکی و کوڕەکەمان دەبینێت کە بێهۆش بووە. سەری کەوتوە بەسەرشانیدا و دەریایەکی ڕەش و لینج لە خوێن دەوری کورسییە تایەدارەکەی گرتووە. ویل بزمارێکی ژەنگاوی کە نیوەی بەدەرەوە بوو لە دارتاشە پەلەپەلکەرەمانەوە بەجێمابوو دۆزیبویەوە. مەچەکی دەستی خستبویە سەر ئەو بزمارە و دواتر کورسییە تایەدارەکەی بەرەو پێشەوە و بەرەو دواوە بردبوو، تاوەکو توانیبوی دەستی خۆی ببڕێت. هەرگیز نەمدەتوانی تەسەوری بکەم کە ئەو ڕۆژە بە چ ئیرادەیەکەوە توانیویەتی ئەمکارە بکات، تەنانەت کاتێکیش کە بیر دەکەمەوە، لەبەر خۆمەوە دەڵێم لەوانەیە لەبەر ئازاری زۆر شێت بوبێت. دکتۆرەکان دەیانگوت ئەگەر بیست خولەك درەنگتر بماندۆزیایەوە ئەوا گیانی لەدەستدابوو.

دکتۆرەکان بە زمانی حاڵ گوتیان (ئەمکارەی بۆ سەرنجڕاکێشانی دەوروبەرەکانی بەلای خۆیدا نەکردووە).

کاتێك لە نەخۆشخانەوە هەواڵیان پێدابن کە ویل بەزیندویی دەمێنێت، بەپەرێشانی و شپرزەییەوە چوم بۆ ناو حەوشەکە. زۆر لە خودا تورە بووم، لە سروشت و لەو تەقدیرە تورەبوم کە ئەم بەدبەختیەی بۆ ئێمە بڕیاردابوو. ئێستە کە سەیری ڕابوردو دەکەم، دەبینم لەوانەیە لەوکاتەدا ئەقڵم لەدەستدابێت. لەو شەوە ساردەدا لەناو حەوشەکەدا وەستام و هەر لەوێدا پەرداخەکەی دەستم پڕکرد و لەناوەڕاستی باخچەکە و لەناو گوڵەکاندا. یەك بین هاوارم دەکرد و دەمقیژاند و دەنگم بەناو هەوادا خولی دەخوارد، دەیدا لە دیواری قەلاکە و دەگەڕایایەوە و لە دورەوە دەنگیدەدایەوە. زۆر تورە بووم، دەمبینی هەموو شتەکانی دەوروبەرم دەتوانن بجولێن، لاریبنەوە، گەشەبکەن، زاوزێ بکەن، بەلام کوڕەکەی من، هەناسەی من، کوڕی جوان و پێکەوتەی من، ناتوانێت. لکاوە بە زەوییدا، ژاکاو، شکستخواردوو ڕەنج و ئازار دیدەیە. جوانییەکانی دەوروبەرم ناشیرین و پەست و شەرمهێنەر بوون. قیژاندم، هاوارم کرد، جنێوم بە زەمین و زەمان دەدا. جنێوانێك کە خۆیشم نەمزانیبوو دەیانزانم. تا ئەوەبوو ستیڤن هات و لە تەنیشتمەوە وەستاو دەستی خستە سەرشانم، ئەوەندە مایەوە تاوەکو من بێدەنگ ببم بێخەم بێت.

هەستی نەدەکرد. هێشتا هەستی بەوە نەکردبوو کە لەوانەیە ویل دووبارە کارێکی لەوشێوەیە ئەنجامبداتەوە، لەوانەیە سات بەساتی ژیانمان دەبێت گوێ بۆ جەرەسی تەلەفۆنەکە بگرین و چاوەڕوانی جاری دواتر بین. چاوەڕوان بین تاوەکو بزانین ئەمجارەیان چ بەڵایەك بەسەرخۆیدا دەهێنێت. ئێمە دەبوایە لە دەریچەی چاوی ئەوەوە دوونیا ببینین، خۆمان بخستایەتە جێگەی ئەوو دەرکمان بەو ئەنگێزە بەهێزو زەینیەتە داهێنەرانەی ئەو بکردایە کە ئەوی ناچار دەکرد کۆتایی بەو بەڵاو موسیبەتە بهێنێت کە ماتۆڕسوارە نەفرەتیەکە بەسەریدا هێنابوی. دەبوایە ژیانی ئێمە بەو گریمانەوە تێپەڕیایە کە جارێکیتر شتێکی لەمشێوەیە ڕوبداتەوە. ئەویش لەمکارەدا دەستێکی باڵای هەبوو، چونکە بێجگە لەوە شتێکیتری نەبوو کە بیری لێبکاتەوە.

دوو هەفتە دواتر وەڵامی ئەرێنیم بە ویل دایەوە.

هەریەڕاستی وەڵامدایەوە.

چارەیکیترم هەبوو؟

{٩}

ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم. لەناو ئەو ژورەدا ڕاکشام کە وەك شقارتە وابوو، چاوم بڕییە سەقفەکە و هەوڵمدا بە وردییەکی تەواوەوە دوو مانگی ڕابوردوو لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئێستە دەمزانی نۆژەنی بکەمەوە. هەروەك بڵێی هەموو شتێك گۆڕدرابوو، پارچە پارچە بوبو لە شوێنێکیتردا ئارامی گرتبوو، گۆڕدرابو بۆ قالبێك کە من هیچ شارەزاییەکم لەبارەیەوە نەبوو.

هەستم دەکرد خەڵەتاوم، بومەتە شەریکی تاوانی بێئەقڵێك کە ئاگای لە هیچ شتێك نییە. لەوانەیە لە دڵەوە بەمن پێکەنیبن کە هەوڵدەدەم سەوزەوات بە ویل بدەم و قژەکانی کورت بکەمەوە. ئەوکارە بچوکانەی کە کەمێك حاڵیان باشتر دەکرد. باشە سودیان چی بوو؟

چەندینجار کۆمەڵێك قسەم بیستبوو بیرم لێدەکردنەوە، ئەمویست بە جۆرێکیتر تەفسیرو ڕاڤەیان بکەم. هەوڵم دەدا باوەڕ بە خۆم بهێنم کە لەقسەکانیان خراپ تێگەیشتوم. بەلام دیگنیتاس شوێنێك نەبوو کە مرۆڤ هەروا لەخۆیەوە بچێت بۆ ئەو جێگەیە. نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم کە کامیلا ترینەر کارێکی لەو شێوەیە لەگەڵ کوڕەکەیدا بکات. بەڵێ، لەوە تێگەیشتبوم کاتێك دێت کەمێك بێتاقەتە و سەری قورسە. تەنانەت نەمدەتوانی تەسەووریشی بکەم کە وەك دایك نازی ویل بکێشێت، بەوجۆرەی کە دایکی ئێمە دەیکرد-بە هەموو وجود و جۆش و خرۆشی فراوانەوە- بەجۆرێك جاری وابوو ئەوەندە نازی دەکێشاین و ماچی دەکردین و باوەشی پێدا دەکردین کە لەدەستی هەڵدەهاتین و ڕاماندەکرد. ڕاستگۆیانە بڵێم، هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە پارەدارو دەوڵەمەندەکانیش لەگەڵ منداڵەکانیاندا بەوشێوەیەن. تازەگی ڕۆمانی (عەشق لە فەزای سارد)م لەناو کتێبخانەکەی ویلدا هەڵگرتبوو خوێندبومەوە. بەلام چۆن دەکرا دایکێك چالاکانە و بە ئیرادەی خۆی، ڕۆڵی لە مردنی کوڕەکەیدا هەبێت...!

ئێستە دیسانەوە چاوم بەبەسەرهاتەکەدا دەخشاندەوە، هەربۆیە دەمبینی کە ڕەفتاری تەنانەت زۆر لەوەش ساردوسڕتر دەهاتە پێشچاو. کارەکانی نیەت و مەبەستی باشیان لەدواوە نەبوو. زۆر لە ویل و لەویش تورە بووم. لەوە تورە بووم کە منیان توشی ڕواڵەتبازی خۆیان کردبوو. لەوە تورە بووم کە بۆچی ئەم هەموو ماوەیە هەوڵمداوە ئارامش و هێمنی بۆ فەراهەم بکەم و خۆشحاڵی بکەم. دواتر کاتێك تورەییەکەم وەستایەوە، هەستم بە خەمباری کرد. لەرزۆکی دەنگی کامیلا ترینەرم هاتەوە یاد کاتێك خەریکبوو جۆرجینای ئارام دەکردەوە. بەڕاستی دڵم بۆی دەسوتاو بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. دەمزانی کەوتوەتە چ پێگەیەکی دژوارو سەختەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ترس سەراپای بوونمی دەگرتەوە. ئەو شتانەی کە زانیبوم بوبونە هۆی نیگەرانیم. چۆن دەکرا بزانیت بەوەی کە خەریکە لە ڕۆژی مردنت نزیك دەبیتەوە، ڕۆژەکانی یەك لەدوای یەك بگوزەرێنی؟ چۆن دەکرا ئەو پیاوەی کە ئەو بەیانییە دەستم بەر پێستی کەوت و گەرم و نەرم بوو، بڕیاربدات خۆی لەناوبەرێت؟ چۆن دەکرا ئەم پێستە، بە ڕەزامەندی هەموان، چوارمانگیتر لەژێر خاکدا دەستبکات بە ڕزین؟

شتێك نەبوو کە بۆ هیچکەسێکی باسبکەم. کارێکی دروست نەبوو. ئێستە ئیتر من لە ڕازو نهێنی خێزانی ترینەردا شەریك و هاوبەش بووم.

نەمتوانی نانی ئێوارە بخۆم. لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشام، بەجۆرێك بیرو خەیاڵم لە مێشکمدا خولیان دەخوارد و هەموو بیرو زەینیان پڕ کردبوم کە توانای ئەوەم نەمابوو تامڵی ئەو بارودۆخەی خۆم بکەم. کاتژمێر هەشت و نیو گەرامەوە بۆ قاتی خوارەوە، بەبێدەنگییەوە لەلای بابەگەورە کە دڵنیابووم تەنها ئەندامی خێزانەکەمە کە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەم لێناکات، دانیشتم و سەیری تەلەفیزیۆنم کرد. لەسەر قەنەفە خۆشەویستەکەی خۆی دانیشتبوو لەسەر چاویلکەکانییەوە سەیری شاشەی تەلەفیزیۆنەکەی دەکرد. دیار نەبوو کە ئاگای لە تەلەفیزۆنەکە هەیە یان نا. لەوانەیە بیرو خەیاڵی لە شوێنێکیتر بوو.

دایکم بە پەرداخێك چاییەوە لەتەنیشتمەوە دانیشت.

—ئازیزەکەم، دڵنیایت شتێك ناخۆیت؟

خێزانی ئێمە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بە خواردنەوەی یەك کوپ چایی، مرۆڤ دەتوانێت هەموو شتێك چارەسەرو حەل و فەسڵ بکات.

—نەخێر، مەمنونم، برسیم نییە.

ئاگاداربوم کە سەیری باوکمی کرد. دەمزانی دواتر دەنگی چپەو بۆڵەی مەحرەمانە بەرز دەبێتەوە سەبارەت بەوەی کە خێزانی ترینەر کاری زۆرم لێ دەکێشنەوە و پەرستاریکردن لە کەسێکی ئیفلیج بارێکی زۆر قورس دەخاتە سەرشانی مرۆڤ. دڵنیابوم لەوەی سەرزەنشتی خۆیان دەکەن کە هانیانداوم بچم و ئەوکارە بگرمە ئەستۆ.

لە کۆتاییشدا کارەکە دەگەیشتە جێگەیەك کە دڵنیادەبونەوە بیرکردنەوەکەیان دروست و باش بووە.

***

بۆ ڕۆژی دواتر لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم کە ویل لەناو لاکی خۆیدا هاتووەتە دەرەوە. بەشێوەیەکی زۆر سەیر یەك تایم و زۆر بڵێ بوبو بەدوای شەڕو ئاژاوەدا دەگەڕا. زۆر قسەی دەکرد، زۆر لەبیرم نایەت هێندەی ئەو ڕۆژە زۆر بڵێیی کردبێت. بەردەوام دەیویست دەمەقاڵێ و کێشە دروستبکات. کاتێك دەیزانی ملی بۆ کەچ ناکەم، لێم دەڕەنجا.

—ئەمکارە نەفرەتیانەی ماڵەوە کەی تەواو دەبن؟

سەرقاڵی پاککردنەوەی ژوری دانیشتنەکە بووم. سەرم بەرزکردەوە و لەسەر قەراخی قەنەفەکانەوە سەیرم کرد.

—چی؟

—سەیری سەرم بکە. بەنیوەکاری ماوەتەوە. وەك یەکێك لە هەتیوەکانی سەردەمی ڤیکتۆریام لێهاتووە.

سەری سوڕاندەوە بۆ ئەوەی هونەرەکەی خۆم بەباشتر ببینم، گوتی:

—نەکا ئەمە یەکێك لەو مۆدیلی قژانە بێت کە بەلاتەوە جوانن!

—دەتەوێت زیاتر بۆت کورت بکەمەوە؟

—بەڵێ، خراپ نیە بەلامەوە. چەندە باشە ئیتر کەس وابیرناکاتەوە لەتیمارستان ڕامکردووە.

بەبێ ئەوەی کە قسە بکەم خاولی و مەقەستم هێنا. گوتی:

—لەوانەیە ئێستە نیتن بە کلکی گوێز دەشکێنێت کە قیافەم وەك ئادەمیزادەکانی لێهاتووە.

ئەڵبەتە لەپاش سەرچاکردنەکە خۆی پێی گوتم زۆر باشە، ئێستە دەبێت هەموو ڕۆژێك بیتاشم.

گوتم:

- ئێ..!

-خۆ کێشەیەکی نییە ها؟ کۆتایی هەفتەکانیش ناچارم لەگەڵ بنی ڕیشدا ڕابێم.

نەمدەتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم. تەنانەت نەمدەتوانی سەیری چاوەکانی بکەم. بەڕاستی زۆر قوس بوو. زۆر خراپ هەستم دەکرد کە ناپاکی لەگەڵدا کردووم.

-کلارك؟

-ها...؟

-ئەمڕۆ زۆر بێدەنگیت. زمانی خۆت قوتداوەتەوە؟

-ببورە...

-پەیوەندی بە پیاوە ڕاکەرەکەوە هەیە؟ چی دەکات؟ خۆ نەچووەکە؟ نا؟

-نەخێر.

بەشێك لە قژەنەرمەکانیم خستە نێوان پەنجەی ئامازەو ناوەڕاستەوە و دەمی مەقەستەکەم بردە پێشەوە بۆ ئەوەی زیادەکانی ببڕم. بەشە قژەکە هەروا لەنێوان پەنجەکانمدا بوون. باشە چۆن ئەمکارەیان دەکرد؟ بە دەرزی؟ بە دەرمان؟ یان ئەوەی کە بەتەنیایی دەیانخستە ناو ژورێکی پڕ لەموسەوە و بەجێیاندەهێشت؟!

-زۆر ماندو دیاری. سەرەتا کە هاتیت تاقەتی قسەکردنم نەبوو، بەڵام ئێستە دەبینم زۆر خراپ وێران و تێکشکاویت.

-ئێ...!

چۆن دەیانتوانی یارمەتی کەسێك بدەن کە نەیدەتوانی دەست و قاچەکانی بجولێنێت بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت؟ دەبینم خەریکم سەیری مەچەکی دەستی دەکەم، کە زیاتر بەسەرقۆڵی درێژ دادەپۆشرا. تاوەکو چەند هەفتەیەك پێموابوو لەوانەیە لە ئێمە زیاتر سەرمای ببێت بۆیە ئەوەندە قۆڵەکانی درێژن، بەڵام ئەوەش خەڵەتاندنێکیتری من بوو لەلایەن ئەوانەوە.

-کلارك؟

-بەڵێ؟

خۆشحاڵ بووم کە لەپشتیەوە وەستابوم. حەزم نەدەکرد دەموچاوی ببینم.

کەمێك وەستا. پێستی پشتەملی کە موی پێوە نەبوو، بەبەراورد بە شوێنەکانیتری جەستەی بێڕەنگتر بوو. نەرم و سپی و بەشێوەیەکی زۆر سەیر هەستیار بوو.

–گوێ بگره. لەبەر خوشکەکەم داوای لێبووردن دەکەم... ئەوە ڕاستە کە زۆر زۆر ئاگرین و تووڕەبوو، بەڵام مافی ئەوەی نەبوو کە بێ ئەدەبی بکات. هەندێکجار زۆر زیاد ڕکن دەبێت، خۆی نازانێت کە بەبێ مەبەست چەندە خەڵکی دەڕەنجێنێت.

کەمێك وەستا، دواتر لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

–وابزانم لەبەر ئەمەیە کە حەزی لە ژیانی ئوستورالیایە.

–مەبەستت ئەوەیە کە لەوێدا هەموان لەگەڵ یەکتریدا ڕاستگۆن و ڕاستیەکان بەیەکتری دەڵێن؟

–چی؟

–هیچ. تکایە سەرت بەرز بکەرەوە.

مەقەستم بکارهێناو شانەم کرد بەناو قژەکانیدا، بەپێی ڕێساو بنەماکانی سەرتاشین بەردەوامبوم، تاوەکو توانیم هەموو سەری بۆ چاکبکەم. زەوییەکەیش پڕ بوو لە موو.

***

لە کۆتاییدا، ئیتر بڕیارمدابوو.

کاتێك ویل لە تەنیشت باوکییەوە سەرقاڵی سەیرکردنی تەلەفیزیۆن بوو، وەرەقەیەك کاغەزم لە پرێنتەرەکە هەڵگرت. لەناو گۆزەی بەردەم پەنجەرەی چێشتخانەکەدا پێنوسێکم هێناو ئەوەی کە لەبیرو زەینمدا هەبوو نوسیم. کاغەزەکەم قەدکرد، زەرفێکی نامەم دۆزییەوە و کاغەزەکەم خستە ناوییەوە. ناوی دایکی ویلم لەسەر پاکەتی نامەکە نوسی و دواتر لەسەر مێزی چێشتخانەکە دامنا.

کاتێك ئێوارە خەریکبوو لەماڵەکە دەچومە دەرەوە، ویل و باوکی بەیەکەوە قسەیان دەکرد. ویل بەڕاستی پێدەکەنی. لەناو ڕێڕەوەکەدا وەستام و گوێم گرت. جانتاکەم لەشانمدا بوو. باشە بەچی پێدەکەنی؟ بەسەرنجدان بەوەی کە تەنها چەند مانگێتر کۆتایی بە ژیانی خۆی دەهێنا، باشە دەبێت چ شتێك بوبێتە هۆی شادومانی ناوبراو؟ لەناو چوارچێوەی دەرگاکەدا وەستام و گوتم:

–من ئەمەوێت بڕۆم.

دواتر بەڕێکەوتم.

–کلارك؟

بەلاّم من هاتبومە دەرەوەو دەرگاکەم داخستبوو.

هەموو ئەو مەودا کورتە تاوەکو ماڵەوە کە سواری پاس بوبوم لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە ئاخۆ چی بە خێزانەکەم بڵێم. بەدڵنیاییەوە تورە دەبن کاتێك بزانن وازم لە کارە نان و ئاودارەکەم هێناوە. لەیەکەم شۆکی سەرەتادا دڵی دایکم دەهێتە ئێش و بەرگری لەمن دەکرد. دەیگوت ئەزیەتەکەی زۆر بووە. بە گریمان باوکم دەیپرسی بۆ ناتوانم وەك خوشکەکەم بم. قسەیەك کە لەزۆربەی کاتەکاندا دەیکرد، ئەمە لەکاتێکدا خوشکەکەم تەنها کەسێکبوو کە ژیانی خۆی بە سکپڕییەکەیەوە تێکداو پشتی بە پارێزگاری دارایی ماڵەوە دەبەست و پەرستاری منداڵەکەی خستبویە سەرشانی ماڵەوەمان. لەناو ماڵی ئێمەدا کەس نەبوو بوێری ئەوەی هەبێت ئاماژە بەم بابەتە بکات، چونکە لەسەر بنەمای بیروباوەڕی دایکم بێتاقەتی لە بوونی تۆماس بە ناشوکری دەژمێردرا. بە بڕوای ئەو منداڵان هەمویان بەرەکەتی خوداوەندن، تەنانەت ئەوانەی کە نەخوازراون و ئامادەبونیان لە ماڵەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانێك کە دەتوانن بچنە درەوە و کار بکەن، لەماڵەوە بەوانەوە ببەسترێنەوە و پەرستاری لەوان بکەن.

شتێکی نەگونجاو بوو کە بتوانم واقیعیەتەکە بەوان بڵێم. هەرچەندە هیچ پابەندییەکم بە ویل و خانەوادەکەیەوە نەبوو. بەلاّم حەزم نەدەکرد بابەتەکە بکەوێتە سەر زاران و پێمخۆش نەبوو پەنجەی بۆ ڕابکێشرێت و دراوسێ فزولەکانیان بە جۆرێك سەیری بکەن.

بەم فیکرو خەیالاّنەوە لە پاسەکە دابەزیم و بە نشێوێکدا چومە خوارەوە. کاتێك گەیشتمە سەری شەقامەکە، دەنگی هات و هاوارم بیست کە بەهەوادا خولی خوارد. تازە دەنگی هاوارەکە لە مێشکمدا نەمابوو کە کۆمەڵێکی کەم لە خەڵکیم لەبەردەم ماڵەکەماندا بینی. لەوە ترسابوم کە نەوەك شتێك ڕویدابێت، باوك و دایکم لە دالاّنی ماڵەکەماندا بینی کە سەیری سەرەوەیان دەکرد. تێگەیشتم کە هاوارەکە لەماڵەکەی ئێمەوە نییە، بێخەم بووم. کۆتا جەنگی ژن و مێردی ماڵە دراوسێکەمان بوو.

هەرچەندە ڕیچارد گریشم هاوسەرێکی هێندە وەفادار نەبوو، بەلاّم زۆریش ئازاری بۆ خەڵکی گەڕەك نەبوو. ئێستەیش ئەمە ژنەکەی بوو کە خەریکبوو داوەری دەکرد و لەناو باخچەکەی بەردەم ماڵەوەیاندا نمایشی دەکرد.

—بە بێ ئەقڵم دەزانی. بلوزەکەی تۆی لەبەردا بوو، هەر ئەوەی کە بۆ یادی لەدایکبونت وەك دیاری پێشکەشم کردیت!

–دیمپانا، بەوشێوەیە نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.

–چوم هێلکە نەفرەتیەکانی ئیسکاچیت بۆ بکڕم. ئەو لەوێ بوو لەوپەڕی بێشەرمیدا بلوزەکەی تۆی لەبەردا بوو، ئیتر ڕقیشم لە هێلکەی ئیسکاچەکانیش هەستا!

هەنگاوەکانم هێمن کردەوە. بە ئاستەم بەناو خەڵکەکەدا ڕێگەی خۆمم کردەوە تاوەکو خۆم گەیاندە ماڵەوە. چاوم لەسەر ریچارد بوو کە خۆی حەشاردابوو تاوەکو ئەو دەزگا دیڤیدییەی کە بەرەو ئەو نیشانەی گیرابوو نەکێشرێت بەسەریدا. دواتریش پێڵاوەکەیان بۆ هاویشت.

–لەکەیەوە شەڕ دەکەن؟

دایکم کە پەڕۆکەی دەموچاوی بەتوندی بەستبوو بە کەمەرییەوە، دەستی گرتبوو بە سنگییەوە و وەستابوو. دەستی بەرز کردەوە و سەیری کاتژمێرەکەی دەستی خۆی کرد.

–ئێستە بەدڵنیاییەوە سێ و چارەك بووە. برنارت بە بڕوای تۆ سێ و چارەك بووە؟

–پەیوەندی بەوەوە هەیە کە لە کەیەوە حیسابی دەکەیت. لەوکاتەوە جلوبەرگەکانی فڕێدا، یان لەوکاتەوە کە ریچارد هاتوو ئەمانەی بینی.

–لەوکاتەوە کە هات.

باوکم گوتی:

–کەوابوو نیوسەعات زیاتر نییە. بەڵام تەنها پازدە خولەکی یەکەم، شتانێکی باشی لە پەنجەرەکەوە فڕێدایە دەرەوە.

–باوکت دەڵێت ئەگەر دیسانەوە شتی بۆ بهاوێژێت پێشنیار دەکات کە ئیستریۆکەی ریچارد فڕێبدات!

قەرەباڵغی دراوسێکان زیاتر بوبو. دیمپانا گریشم نەیدەویست کۆتایی پێبهێنێت، ئەگەر شتێك ناوبراوی بۆ بەردەوامبون لەوکارەی هانبدایە، تەنها بریتی بوو لەو قەرەباڵغیەی کە خەڵکی دروستیان کردبوو.

دەسترێژێك لە گۆڤارەکان لە پەنجەرەکەوە فڕێدرانە دەرەوە.

–دەتوانیت گۆڤارە بێماناکانیشت بدەیت بەو.

خەڵکەکەیش هۆویان کرد، ژنەکەیش بەردەوامبوو:

–سەیرکە حەزدەکات بزانێت کە نیوەی پاشنیوەڕۆی یەکشەممە لەناو توالیتدا دانیشتویت و ئەمانە دەخوێنیتەوە؟

چویەوە بۆ ناو ماڵەکە. دیسانەوە هاتەوە بەر پەنجەرەکە. سەبەتەی جلوبەرگە چڵکنەکانی فڕێدایە خوارەوە. هەموو چیمەنەکە پڕ بوو لە گۆڤارو جلوبەرگ.

—ئەمەش جلوبەرگە پیسەکانت. سەیرکە کاتێك ئەیەوێت ڕۆژانە ئەمانەت بۆ بشوات، بیر دەکاتەوە چەندە مرۆڤێکی بێئەقڵیت!

کاتێك سەبەتەکە کەوتە سەر چیمەنەکە، ڕیچارد دەستیکردە کۆکردنەوە. بەرەو پەنجەرەکە هاواریکرد، بەڵام لەناو ئەو هەموو هات و هاوارو فیکە لێدان و هۆوکردنەدا نەتدەزانی چی دەڵێت.

بەپێچەوانەی سیدی و یارییە ڤیدیۆییەکانییەوە کە لایەنگرییان زۆر بوو هەموان پەلاماریاندان و هەریەکەو سیدییەکی بۆ خۆی هەڵدەگرت، بەڵام کەس بۆ جلوبەرگەکان جوڵەی نەکرد.

گرومب! کاتێك ئستریۆکەی کەوتە سەرزەوی، هەندێك هۆشیان گووت.

ڕیچارد سەری بەرزکردەوە.

—ئەی سەڵیتە!

— تۆ ئەو لوچە خوێڕییە سەرا پا نەخۆشەت لەناو دوکانی فیتەرییەکەدا بینیوە، بەڵام من بومەتە سەڵیتە؟!

دایکم ئاوڕیدایەوە بەرەو لای باوکم.

—برنارد، چایت بۆ بهێنم؟ ئەڵبەتە لەوانەیە ئێستە کەمێك ساردیش بوبێتەوە.

باوکم بۆ ساتێکیش چاوی لەسەر ماڵە دراوسێکەمان هەڵنەدەگرت.

—مەمنونم ئازیزەکەم. زۆریش خۆشەو چێژێکی تایبەتی دەبێت.

هەرکە دایکم چویە ماڵەوە، من ئۆتۆمبیلەکەم بینی. بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لەیەکەم سەیرکردندا ناسیمەوە، مارسیدسە سورمەییەکەی خاتوو ترینەر بوو. ئۆتۆمبیلەکە وەستاو خاتوو ترینەر سەیری دیمەنی پیادەڕەوەکەی دەکرد. پێش ئەوەی کە پیادە ببێت، ساتێك دۆش داما. وەستاو سەیری ماڵەکەی کرد. لەوانەیە سەیری ژمارەی خانووەکانی دەکرد. دواتر چاوی بە من کەوت.

لە دالآنی ماڵەکەوە هاتمە دەرەوە، پێش ئەوەی کە باوکم بپرسێت بۆ کوێ دەچم، چومە ناو شەقامەکەوە. خاتوو ترینەر لەولای خەڵکەکەوە وەستابوو. بەجۆرێك سەیری هات و

هاوارەکەی دەکرد هەروەك بڵێی شاژنە ماری ئانتوانتە و خەریکە سەیری کۆمەڵێك دێهاتی ئاژاوەچی دەکات.

گوتم:

–شەڕی خێزانییە.

سەیرێکی دووری کرد. هەروەك بڵێی بە جۆرێك لە جۆرەکان شڵەژابوو، کە من دەبینم سەیری سکاڵاکە دەکات.

–بەڵێ، دەبینم.

–لەگەڵ پێوەرەکانی دەروونناساندا ناگونجێت. دەبێت بڕۆن بۆلای ڕاوێژکاری خێزانی.

چاکەت و تەنورەیەکی خوری شیك، ملیوانی مرواری و قژەکانی کە بوبونە تێچویەکی زۆر بۆی، ئەوەندە بوون کە ناوبراو لە خەڵکی گەڕەکەکەی ئێمە لەگەڵ ئەو پانتۆڵە تراکسودیانە و جلوبەرگە قوماشە هەرزان و بریقەدارانەی زنجیرە فرۆشگاکان جیا بکاتەوە، زۆر ووشك و جیدی دەهاتە پێشچاو، تەنانەت خراپتر لەو بەیانییەی کە هاتەوە بۆ ماڵەوە و منی بینی کە لەژورەکەی ویلدا خەوتبوم. لەدڵەوە دەمزانی کە لەدەستی کامیلا ترینەر ڕزگارم نابێت.

–نازانم دەتوانین بەیەکەوە قسە بکەین یان نا.

بەهۆی هات و هاوارو دەنگەدەنگی زۆرەوە ناچار بوو کە دەنگی بەرز بکاتەوە.

سەیرێکی خەڵکەکەم کرد، دواتر سەیرێکی دوای خۆمم کرد و لەپاشانیش سەیرێکی ماڵی خۆمانم کرد. هەرگیز نەمدەتوانی تەسەوری بکەم کە خاتوو ترینەر ببەمە ماڵەوە، یارییەکانی تۆماس لە هەموو شوێنێکی ماڵەکەدا بڵاوبوبونەوە، باوکیشم بە پرخەپرخ سەیری تەلەفیزیۆنی دەکرد. دایکم لەبەر بۆنی ناخۆشی گۆرەوییەکانی باوکم بۆنی خۆشی وەشاندبوو. تۆماسیش ئێستە کە کەسێکی غەریبەی دەبینی یەکسەر دەیویست لەژێر لێوەوە جنێوبدات و بڵێت سەلیتە.

–کاتێکی باش نییە.

–لەوانەیە بکرێت لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا قسە بکەین. سەیرکە، تەنها پێنج خولەك. لوئیزا بەدڵنیاییەوە حەق و مافم بەسەرتەوە هەیە.

کاتێك سواری سەیارەکەی بووم، یەك دوو دراوسێمان سەیرییان کردم. خۆشبەختانە خانەوادەی گریشم هەواڵی گەرمی ئەو شەوە بوون، وەگەرنا من دەبومە بابەتی قسەو

باسەکانیان. لە گەڕەکی ئێمەدا سواربونی سەیارەیەکی مۆدێل بەرزی گران بەو مانایە بوو کە یاریزانێکت کردوە بە دۆستی خۆت یان پۆلیسەکان بە جلوبەرگی مەدەنییەوە دەستگیرت دەکەن.

دەرگای ئۆتۆمبیلەکە بە هێواشییەوە داخرا. ئێستە ئیتر هیچ دەنگێك نەدەهاتەبەر گوێ. ئۆتۆمبیلەکە بۆنی تازەیی چەرمی کوشنەکانی دەدا، بێجگە لە من و خاتوو ترینەر هیچکەسێکیتری تێدا نەبوو. نە بەرگە چوکلێتی تێدا بوو نە خۆڵ و خاشاك و نە لەعابەی بەجێماوی منداڵ.

دەستیکردە قسەکردن، بەرەو پێشەوە دەیڕوانی، هەروەك بڵێی قسە لەگەڵ کەسێکی بەرامبەریدا دەکات.

—وابزانم تۆو ویل زۆر باش لەگەڵ یەکتریدا ڕاهاتون.

من هیچم نەگوت، لە قسەکانی بەردەوامبوو:

—موچەکەت کەمە؟

—نەخێر. پێویستت بەکاتی زیاترە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ؟ خۆم دەزانم زۆر کورتە. دەتوانم لە نیتن بپرسم بەڵکو.....

—نە کێشەکە پارەیە و نە کاتژمێرەکانی کارکردن.

—ئەی کەواتە چییە؟

—بەڕاستی من نامەوێت....

—سەیرکە، خۆ ناکرێت بەبێئاگا یاداشتێك بۆ من بنوسیت و چاوەڕوان نەکەیت تەنانەت هۆکارەکەی بپرسم.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.

—من دوێنێ شەو قسەکانی ئێوەم بیست. قسەکانی تۆو کچەکەتان. نامەوێت.... نامەوێت لەوکارەدا هیچ ڕۆڵێکم هەبێت.

—ئەها.....

بێدەنگ و خامۆش دانیشت. ئێستە کاك گریشم ئەیویست بەناو خەڵکەکەدا ڕێگەی خۆی بکاتەوە و لە دەرگاکەوە بڕواتە ماڵەوە. ژنەکەیشی سەرقاڵ بوو، هەرچییەك دەهات

بەدەستیەوە، لە پەنجەرەکەوە فرێی دەدایە خوارەوە. شتانێك کە هەروەك موشەك دەهاوێژران. کلێنسی توالیت، سابونی توالیت، شامپۆ، دیاربوو ئێستە لە حەمامدایە.

خاتوو ترینەر بە ئاوزێکی گونجاوەوە گوتی:

—بێزەحمەت مەڕۆو بەجێمان مەهێڵە. ویل لەگەڵ تۆدا زۆر دڵخۆشە. ماوەیەکی زۆرە ئارامشێکی لەو شێوەیەی نییە. من... بەڕاستی بەلامانەوە سەختە کە کەسێکیتر بهێنین بۆ شوێنەکەت.

—بەڵام ئێوە، خۆ ئێوە دەتانەوێت ببەن بۆ ئەو شوێنە ترسناکە. ئەو شوێنەی کە مرۆڤەکان دەچن بۆئەوەی خۆیانی تێدا بکوژن (دیگنیتاس).

—نەخێر، مەبەستم ئەوەیە کە هەرکارێکم لەدەستبێت بیکەم بۆ ئەوەی لەمکارە پەشیمانی بکەمەوە.

—بۆ نمونە چ کارێك؟ نزاکردن؟

خاتوو ترینەر سەرێکی کردم، دایکم بەوجۆرە سەیرکردنانە دەڵێت (سەیرکردن بەمۆڕەوە).

— بەدڵنیاییەوە تاوەکو ئێستە تێگەیشتویت کە ئەگەر ویل بڕیاربدات کارێك ئەنجامبدات، هیچکەسێك ناتوانێت ببێتە ڕێگرو بەربەست لەبەردەمیدا.

گوتم:

—دەزانم. من بۆ ئەوە لەماڵی ئێوەدام بۆ ئەوەی ئاگاداربم کە دووبارە کارێکی لەوشێوەیە نەکات. ئەوکارەی کە شەش مانگ لەمەوبەر ئەنجامیدا، ڕاستە؟

—نەخێر، ئەوە ڕاست نییە.

—هەر لەبەر ئەمەبوو کە تازەکاربونم و ناشارەزاییم بەلاتانەوە گرنگ نەبوو.

—من گوتم تۆ کەسێکی زیتەڵ و شادو گەشیت. لەگەڵ ئەوانیتردا جیاوازیت هەیە. لە پەرستارەکان نەدەچوی. ڕەفتارت... وەك ئەوانیتر نەبوو. بیرم کردەوە... بیرم کردەوە کە تۆ دەتوانی ئەو بهێنیتەوە سەرخۆی و دڵخۆشی بکەیتەوە. دوێنی کاتێك بینیم ئەو ڕیشە نەفرەتیەی تاشی... لەوە دڵنیابومەوە تۆ یەکێك لەو مرۆڤە زۆر دەگمەنانەی کە دەتوانیت هێمنی بکەیتەوە.

—بیرت کردەوە کە نابێت ئەوە بە من بڵێن کە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە داتانمەزراندوم ئاگام لێی بێت بۆ ئەوەی خۆی نەکوژێت، ئایا بەدەر لەمەیە؟

ئەو هەناسە قوڵەی کە کامیلا ترینەر هەڵیکێشا، لەکەسێکەوە دەهاتە دەرەوە کە بەناچاری نەیەوێت بە ئەدەبەوە شتێك بۆ منداڵێك ڕوونبکاتەوە. بەلامەوە سەیر بوو ئایا دەیزانی قسەکانی لەلّی بەرامبەرەکەیدا هەستێکی بێئەقلانە بەدی دەهێنێت؟ ئایا بە ئەنقەست ئەوەی دەکرد؟ باوەڕم نەدەکرد ئەوەم لێبوەشێتەوە کە لەگەڵ بەرامبەرەکانمدا بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکەم هەستبکەن کە بێئەقڵن.

—لەوانەیە یەکەمجار کە تۆمان بینی. وابوبێت. بەلّام ئێستە دڵنیام کە ویل پابەندی بەڵێنەکەی خۆی دەبێت و ئەم شەش مانگە دەوەستێت و ئارام دەگرێت. بەڵێنی شەش مانگی بەمنداوە. لوئیزا ئێمە پێویستمان بەمکاتە هەیە. هەلێك هەیە کە دەتوانین ئەم بیرو فیکرە لەمێشکی بکەینە دەرەوەو ئەوەی بۆ ئاشکرابکەین کە ڕێگەگەلیتر بوونیان هەیە. هیواداربوم ئەم فیکرە بێت بە مێشکیدا کە کۆمەڵێك ڕێگە هەن مرۆڤ دەتوانێت بۆ ژیانی خۆی چێژیان لێوەربگرێت. تەنانەت کاتێکیش کە ئەم شێوازە سەختەی ژیان بەسەریدا سەپێنرابێت.

—هەموو ئەم قسانە درۆیە. ئێوە درۆتان لەگەڵ مندا کرد، هەموتان درۆ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن.

وادیارنەبوو کە گوێی بۆ قسەکەم گرتبێت یان نا. ئاوڕیدایە بەلای مندا، دەستە چەکێکی پارەی لە جانتاکەی هێنایە دەرەوە و پێنوسەکەی دەستی ئامادە بوو:

—گوێبگرە، چەندت دەوێت؟ موچەکەت دەکەمە دوو هێندە. تەنها بڵێ چەندێکت دەوێت؟

—من پارەکەی ئێوەم ناوێت.

—ئۆتۆمبیل؟ بڕیاردەری؟ پاداشت؟

—نەخێر.

—ئەی چیت دەوێت؟ دەتوانم چ کارێکت بۆ بکەم کە بیروبۆچونت بگۆڕیت؟

—داوای لێبوردن دەکەم. من تەنها....

چاوم بڕییە دەرەوە. دەستیهێنایە پێشەوە و خستییە سەر دەستم. سەیر بوو، هەروەك بڵێی شەپۆلگەلێکی لێوە دەردەچوو. هەردوکمان سەیری ئەو شتەی دەرەوەمان کرد.

—خاتوو کلارك تۆ بڕیارنامەت واژۆکردووە. پابەند کراون کە شەش مانگ کاربکەن. ئەمە لەکاتێکدایە بەپێی حیسابی من تەنها دوو مانگە کاردەکەیت. بە زمانی خۆش داواتان لێدەکەم پابەندی پەیمان و بەڵێننامەکەی خۆتان بن.

ئاوازی دەنگی سارد و ووشك بوبو. سەرم داخست و سەیری دەستیم کرد، دەبینم کە دەلەرزێت. تفی دەمی قوتدایەوە.

—تکا دەکەم.

باوك و دایکم لەناو دالآنەکەدا وەستابوون و سەیرییان دەکرد. هەردوکیانم دەبینی. کوپی دەسکداری قاوەیان بەدەستەوە بوو. تەنها ئەم دوو کەسە بوون کە سەیری نمایشی ماڵە دراوسێکەی تەنیشتمانیان نەدەکرد. کاتێك زانیان من ئەوانم بینیوە، بەشپرزەییەوە ڕوی خۆیان وەرگێڕا. باوکم بینی کە نەعلی پەنجەداری خاڵداری ڕەنگاوڕەنگی لەپێ کردبوو.

کیلۆنی دەرگاکەم گرت.

—خاتوو ترینەر، بەڕاستی نازانم تەنها دابنیشم و تەماشا بکەم.... زۆر نائاساییە. نامەوێت هیچ ڕۆڵێکم لەوکارەدا هەبێت.

—بەباشی بیری لێبکەرەوە، بەیانی هەینی پیرۆزە[١٢]. ئەگەر پێویستت بە کات هەیە، ئەوا دەتوانم بە ویل بڵێم سەرقاڵی خێزانیت هەیە. پشوی فەرمی کۆتایی هەفتە هەل و بوار بە خۆت بدە، بەلآم تکایە بگەڕێرەوەو یارمەتی بدە.

بەبێ ئەوەی کە سەیری دواوە بکەم چومە ژورەوە. لەناو ژوری دانیشتنەکەدا دانیشتم و چاوم بڕییە تەلەفیزیۆنەکە. دایکو باوکیشم لەدوای منەوە هاتنە ژورەکە. سەیرێکی یەکترییان کرد، وایان نیشاندەدا کە ئاگایان لەمن نییە.

نزیکەی دە خولەك دواتر دەنگی ئۆتۆمبیلەکەی خاتوو ترینەرم بیست کەبەڕێکەوت و لەماڵەکەمان دوور کەوتەوە و ڕۆیشت.

***

خوشکەکەم لەپاش گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەماوەی پێنج خولەکدا لەبەرامبەرمەوە وەستا. بەتوندی قاچەکانی کوتابوو بە زەوییەکەدا و بە قادرمەکاندا هاتبویە سەرەوە. دەرگای ژورەکەی کردەوە. گوتم:

—بەڵێ، وەرە ژورەوە.

[١٢] هەینی پێش جەژنی پاك، ڕۆژی ساڵیادی لەخاچدانی حەزرەتی مەسیحە.

لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشابوم و قاچەکانم نابوو بە دیوارەکەوە و سەیری سەقفەکەم دەکرد. گوێرەوی پانتۆڵ و پانتۆڵی شینی بە پولەکەچنراوم پۆشیبوو کە ئێستە بەشێوەیەکی زۆر خراپ پێچرابوو بەدەوری قاچەکانمدا.

کاترینا لەناو چوارچێوەی دەرگاکەدا وەستا.

—ئەوە ڕاستە؟

—دیمپانا گریشم، لە کۆتاییدا توانی بە شەق مێردە مێبازە ناپاکەکەی بکاتە دەرەوەو...

—کەر خۆتی، مەبەستم کارەکەتە. خۆت لە گێلی و نەزانی مەدە!

بەپەنجەگەورەی قاچم دەهێنا بەشوێنی نەخشەی کاغەزە دیوارییەکەدا.

—بەڵێ، یاداشتی وازهێنانم نوسی و پێکەشمکرد. دەزانی دایکم و باوك ڕازی نین. بەڵێ، بەڵێ، هەرچی دەڵێی ڕاست و دروستە.

بەهێواشی دەرگاکەی داخست. بەتوندی لەقەراخ تەختەکەدا دانیشت و بەتوڕەییەوە دەستیکردە قسەی ناشیرین و نابەجێ.

—هەرگیز باوەڕناکەم.

پاڵێکی توندی نا بەقاچمەوە، بەجۆرێك کە لە دیوارەکە سوڕایەوە و هاتە خوارەوەو کەوتە سەر قەرەویلەکە. خۆم ڕێك کردەوە.

—ئۆو..!

دەموچاوە شین و مۆر بوەکەی.

—باوەڕ بەمە ناکەم. دایکم لەخوار قادرمەکانەوەیە. باوکیشم خۆی هەر لێرەیە، بەڵام خۆی دەرناخات. ئێستە دەبێت بۆ پەیداکردنی پارە چ بیرێك بکەنەوە؟ خۆت دەزانی کە بابە هەمیشە خەمی کارییەتی. نەفرەتی، بۆچی دەبێت واز لە کارێکی بەم باشییە بهێنیت؟

—ترینا بێزەحمەت مەپۆرە سەر مینبەرو وەك ووتاربێژەکان قسە مەکە. قاقەتی ووتارم نییە.

—باشە دەبێت کەسێك ئەمەت پێبڵێت. لە هیچ شوێنێك ئەم پارەیەت پێنادەن. خراپ نییە سەیرێکی پێشینەی کاری خۆت بکەیت.

—ئەی هاوار خودایا، بێزەحمەت وا خۆت دەرمەخە کە لەبەر تۆو خواستەکانی تۆ نییە.

—چی؟

–تاوەکو ئەوکاتەی کە بتوانی دەرس بخوێنیت و بەشوێن بەرزەفڕییەکانتدا بڕۆیت، ئیتر چ گرنیگیەکی بۆتۆ هەیە کە کارەکەی من چییە. تۆ تەنها لەبیری خۆتدای. تەنها دەتەوێت کاربکەم و خەرجی دابینبکەم و چاودێری لە منداڵەکەت بکرێت. خودا هەموتان ببڕێت.

دەمزانی داومە لە بنی مەنجەڵەکە، بەڵام بەدەستی خۆم نەبوو، بەهەرحاڵ خەتای خوشکەکەم بوو کە ئێمە کەوتبوینە وەها کێچەڵێکەوە. ساڵانێك تووڕەییم پەنگی خواردبویەوە و ئێستە ئیتر دەڕژایە دەرەوە.

–ئێمە دەبوایە هەموو ئەوکارانە بکەین کە حەزمان لێی نییە بۆ ئەوەی کاترینای کچە بچوکی ماڵەوە بتوانێت بەشوێن دەسەڵاتخوازییەکانی خۆیدا بڕوات.

–نەخێر، بەوشێوەیە نییە.

–نەخێر..؟

–نەخێر، ئەوە تۆیت کە توانای کارکردنت نییە.

–کەوابوو بەلای تۆوە من تواناو غیرەتی کارکردنم نییە. باشە قبوڵە.

–هەقدەستەکەت زۆر زیاترە لە لایەنی کەمی موچەکان. تەنها ئەمەش گرنگە.

–خۆ ژیان هەمووی پارە نییە. لەمە تێبگە.

–بەڵێ؟ دەی کەوابوو ئەزیەت بکێشەو برۆرە خوارەوە و ئەمە بە بابەو دایە بڵێ.

–بێزەحت تۆ باسی پارە مەکە. تۆ کە ساڵانێکە قوزەڵقورتیشت نەهێناوەتەوە بۆ ناو ئەم ماڵە.

–تۆ خۆت دەزانی لەبەر تۆماسە کە نەمتوانیوە ئیش بکەم و پارە پەیدا بکەم.

بەئاراستەی دەرگاکە پاڵێکم نا بە خوشکەکەمەوە. لەبیرم نایەت کۆتا جار کەی بوو کە بەمشێوەیە ئەمکارەم بەرامبەری کردبێت. بەڵام لەوکاتەدا ئامادە بووم بە مستەکوڵە و پێلەقان بکەومە گیانی. لەوە دەترسام ئەگەر زیاتر لەلام بمێنێتەوە، کاربگاتە لێدان و کوتەککاری.

–ترینا برۆ لەبەرچام وونبە. تێگەیشتی؟ تەنها برۆو لەبەرچاوم وونبە و بەتەنیا بەجێمبهێڵە.

بەتوندی دەرگاکەم بەڕوی خوشکەکەمدا داخست. سەرئەنجام کاتێك دەنگی پێیەکانیم بیست بە هێواشی لە قادرمەکان چویە خوارەوە، حەزم نەدەکرد بیر لەوە بکەمەوە کە ئێستە بە دایکوباوکم چی دەڵێت، چۆن هەمویان ئەم ڕووداوەیان کردوەتە بەڵگە لەسەر بێ غیرەتی و

بێتوانایی من لە ئەنجامدانی کاروبارە بەنرخەکاندا. هەرگیز نەمەدەویست بیریش لە سایدی کارمەندی بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزی بکەمەوەو ئەوەی بۆ ڕونبکەمەوە کە بۆچی کارێکی نان و ئاوداری لەوجۆرەم واز لێهێناوە. نەمدەویست بیر لە کارگەی مریشك و جوجەڵەکان بکەمەوە کە بەگریمان هێشتا لەوانەیە ئەو جلوبەرگە پلاستیکی و کڵاوە تەندروستیەیان مابێت کە ناوی منی لەسەر نوسراوە.

دووبارە لەسەر قەرەویڵەکە پاڵکەتمەوەو بیرم لە ویل دەکردەوە. بیرم لە خەم و توڕەییەکەی دەکردەوە. بیرم لە قسەکانی دایکی دەکردەوە کە دەیگوت: من تەنها کەسێکم کە بتوانم پەیوەندی لەگەڵ ئەودا ببەستم. هەوڵم دەدا بیر لەو بکەمەوە بەبێ ئەوەی کە لەسەر بابەتی (گۆرانی موهلانکی) ئەو شەوەی قسە بکەین کە بەفر لەپەنجەرەکەی دەداو پێدەکەنین. بیرم لە پێستی گەرم و دەست و قژی نەرم و تۆڵی بوونەوەرێکی زیندوو دەکردەوە. بیرم لە مرۆڤێك دەکردەوە کە بەهۆشتروو شەنگ و شۆخ تەبعتر بوو لەمن، بەڵام نەیدەزانی بلکێت بە ئایندەیەکەوە کە باشتر بێت لە نابودی لەناوبردنی خۆی! لە کۆتاییدا توند سەرم خستە سەر پشتیەکە و دەستمکردە گریان. ژیانی من خەمهێنەرترو ئاڵۆزتر بوو لەوەی کە بیرم لێدەکردەوە. ئەی خۆزگایە کات و زەمانە بگەڕایەوە بۆ دواوە، بگەڕایەوە بۆ ئەوکاتەی کە تەنها خەم و پەژارەم ئەوە بوو ئایا من و فرانك بەپێی پێویست کێکی چێڵسیمان داواکردوە یان نا.

تەقەیەك درا لە دەرگاکە.

دەمولوتم سڕی.

—کاترینا لێرە بڕۆ.

—داوای لێبوردن دەکەم.

واقم بە دەرگاکەدا وڕما. دەنگەکە خاوو هێمن بوو، هەروەك بڵێی دەمی نابوو بە کونی قوفڵەکەوە.

–گوێبگره. خواردنەوەم بۆ هێناویت. مۆڵەت بدە بێمە ژورەوە. توخودا. وەگەرنا دایکم دەنگم دەبیستێت. دوو پەرداخ خواردنەوەی نایابم هێناوە. خۆت دەزانی کە حەزناکات لەمجۆرە شتانە بخۆینەوە.

لەسەر قەرەوێڵەکە هاتمە خوارەوە و دەرگاکەم کردەوە. سەیری دەموچاوی فرمێسکاوی کردم. یەکسەر هاتە ژورەوە و دەرگاکەی داخست. گوتی:

–باشە، ئێستە پێمبڵێ چی ڕویداوە؟

بە وردییەوە سەیری خوشکەکەم کرد.

–پەیمانم پێبدە کە باسی نەکەیت بۆ کەس. تەنانەت بۆ بابەیش. بەتایبەت دایە.

دواتر هەموو شتێکم خستە ڕوو. ئەمویست دەردەدڵ لەگەڵ کەسێکدا بکەم.

***

هۆکارگەلێکی جیاواز هەبوون بۆ ئەوەی خوشکەکەم خۆش نەوێت. تاوەکو ئەم چەند ساڵەی دوایی دەمتوانی پێرستێکی دورودرێژ لەو هۆکارانە بنوسم. ڕقم لێی بوو لەبەر ئەوەی کە قژێکی پڕو خاوی هەیە، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئەگەر قژەکانی من بگەیشتنایەتە سەرشانم، دەستیاندەکردە وەرین. خۆشم نەدەویست چونکە هەرکاتێك هەر قسەیەکم بۆ دەکرد، خۆی پێش من زانیبوی. لە هەموو ساڵەکانی قوتابخانەدا، مامۆستاکان سوربون لەسەر ئەوەی کە بە دەنگێکی هێواشەوە ئەیانویست بە من بڵێن کە ئەو چەندە زیرەك و وریایە، هەروەك بڵێی زیرەکی ئەو هۆکارێك بوو کە منی دەخستە پەراوێزەوە. ڕقم لێی بوو لەبەر ئەوەی کە من لە بیست و شەش ساڵیدا هێشتا لەناو ژورە شقارتەکەدا دەژیام، بەڵام ئەو لەگەڵ کوڕەکەیدا لە گەورەترین ژوری نوستنی ماڵەوەماندا دەژیان. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا هەندێکجار هەستێکی خۆش و ڕەزامەندانەم هەبوو کە خوشکمە.

کاتێك مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە، کاترینا نەترساو نەیقیژاند. تەنانەت بەوجۆرەیش نەدەهاتە بەرچاو کە توشی شۆك بوبێت. داوایشی لێنەکردم کە بابەتەکە بە دایك و باوك بڵێم. ئیتر بە منی نەگوت هەڵە بووم کە وازم لەکارەکەم هێناوە.

—قومێکی زۆری هەڵقوڕاند.

—ئۆو...

—بەڵێ...

—کارەکەی یاساییە. وادیارە ناکرێت ڕێگری لێبکرێت.

—دەزانم نەفرەتی، هەرگیز ناچێتە ئەقڵمەوە.

باسی بابەتەکەمان دەکرد و دەمانخواردەوە. هەستمدەکرد سەرکوڵمەکانم گەرم بوون.

—ترینا، حەزناکەم وازی لێبهێنم. بەڵام هەرگیزیش ناتوانم ببمە هاوبەشی ئەو تاوانە.

—تێدەگەم.

چوبو بەناو بیرکردنەوەیەکی قوڵدا. لەمجۆرە کاتانەدا قیافەیەکی بیرمەندانەی لەخۆ دەگرت. کاتێك خەڵکانیتر ئەم قیافەی ئەویان دەبیی دەوەستان و هیچ قسەیەکیان نەدەکرد. باوکم پێی دەگوتم کاتێك بیر دەکەیتەوە و لە خەیاڵدایت هەردەڵێی تەنگەتاویت و پێویستت بە توالیت هەیە. گوتم:

——نازانم چی بکەم... تیاماوم.

سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی کردم. کتوپڕ دەموچاوی کرایەوە.

—زۆر ئاسانە، ئاسانی ئاسان...

دووبارە پەرداخەکەی پڕ کردەوە.

—ئۆو، تەواومان کرد. بەڵێ زۆر ئاسانە. گوتت کە پارەدارو دەوڵەمەندن، ڕاستە؟

—بەڵام خۆمن پارەکەیانم ناوێت. پێشنیاری زیادکردنی موچەکەیان بۆ کردوم. بەڵام بابەتەکە ئەمە نییە.

بێدەنگبە بێئەقڵ گیان، پارەکە بۆ خۆت نالێم. بۆ خۆیان دەڵێم. بەگریمان لەسەر مەسەلەی دەعمەکە پارەیەکی زۆریان وەرگرتووە. باشە بەوان بڵێ پێویستت بە پارەیەکی زۆر هەیە، دواتر ئەم پارەیە لە خۆیدا خەرج بکەرەوە. چوار مانگ کاتت هەیە. هێشتا بوارو کاتی ئەوە ماوە کە کارێك بکەیت ویل بیرو بۆچونی خۆی بگۆڕێت.

–چۆن و بە چ شێوەیەک؟

–تۆ دەتوانی بیروڕای بگۆڕیت. گوتت کە ئەهلی گەشت و گەڕان بووە. دروستە؟ باشە، بە یەک شتی بچوک دەستپێبکە. بیبەرە دەرەوە، هەرکارێك، بۆ هەرجێگەیەك کە دەتوانی. هەرکارێکت لەدەست دێت بۆی بکە بۆ ئەوەی هەست بە زیندوبون بکات، بۆ ئەوەی واز لەم بیرۆکەیە بهێنێت. گەڕان بە وولآتاندا و سەربەگێچەڵی، مەلە لەگەڵ دۆڵفینەکاندا، هەرکارێك، هەرکارێك کە دەکرێت بۆ ئەوی ئەنجامبدەیت. من یارمەتیت دەدەم. لەناو کتێبخانەدا سەرێك لە ئینتەرنێت دەدەم، دەگەڕێم. دڵنیام دەتوانین کارانێکی باشی بۆ بدۆزینەوە. کارانێك کە شاد و دڵخۆشی بکەن.

واقم بەودا وڕمابوو.

–کاترینا...

–ها..؟ خۆم دەزانم.

کاتێك زەردەخەنەم کرد، ئەویش خەندەیەکی پۆزاوی کرد.

–هەر بەڕاستی، من کەسێکی هەڵکەوتوم.

{١٠}

کەمێك سەریان سوڕمابوو. هەوڵمدابوو بە هێمنییەوە مەسەلەکەیان بۆ باسبکەم. خاتوو ترینەر مات و بێدەنگ بوبو. دواتر کەمێك شپرزە بوو. دەموچاویشی هاتبویەوە یەك. کچەکەی کە لەتەنیشتیەوە و لەسەر قەنەفەکە بە جیجکانەوە دانیشتبوو. بەلاچاو سەیری دەکرد. ڕێك وەك ئەوکاتانەی کە دایکم ئەیویست هۆشداریم پێبدات و منیش حیسابی کاری خۆمم دەکرد. هیچ دەنگوباسێکی ئەو پێشوازییە گەرمەی کە چاوەڕێم دەکرد لێم بکرێت، نەبوو.

–باشە، ئێستە بەڕاستی بەرنامەت چییە؟

–هێشتا بەووردی نازانم. خوشکەکەم زۆر شارەزایی لەمجۆرە کارانەدا هەیە. زۆر باش دەزانێت بەناو ئینتەرنێتدا سێرچ بکات و بگەڕێت. هەوڵی خۆی دەدات بۆ ئەوەی بزانێت بۆ کەسانێکی وەك ویل چ ئیمکاناتێك بوونی هەیە. بەڵام زیاتر حەزدەکم بزانم ئێوە ڕەزامەندن یان نا.

لەناو ژوری پێشوازییەکەدا دانیشتبوین، هەمان ئەو ژورەی کە ڕۆژی چاوپێکەوتنەکە چوم بۆ ئەوێ. تەنها جیاوازییەکە ئەوەبوو کە خاتوو ترینەرو کچەکەی بەیەکەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوون. سەگە پیرەکەیان کە لیك بەدەم و لچیدا دەهاتە خوارەوە، لەنێوانیاندا دانیشتبوو. کاك ترینەریش لەتەنیشت ئاگرەکەوە دانیشتبوو. من چاکەتێکی قایمی مۆدێل فەرەنسی نیلی و پانتۆڵێکی کورت و پۆستاڵێکی سەربازیم پۆشیبوو. لەبەر خۆمەوە بیرم کردبویەوە و گەیشتبومە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەگەر ڕواڵەتێکی پیشەگەرانەم هەبێت، ئەوا بە ئاسانتر دەتوانم نەخشەو پلانەکەم جێبەجێ بکەم.

کامیلا ترینەر بەرەو پێشەوە چەمایەوە.

–بوەستە بزانم چی بوو. تۆ دەتەوێت ویل لەماڵەوە ببەیتە دەرەوە.

–بەڵێ.

—بیبەیت بۆ گەشت و گەڕان و گێچەڵ سەری.

بەجۆرێك قسەی دەكرد كە هەروەك بڵێی پێشنیارم كردبوو كە كاری نەشتەرگەری لاپاراسكوپی بسپێرین بە كەسێكی نەزانكارو ناشی.

—بەڵێ، هەروەك گوتم، هێشتا نازانم دەتوانین چ شتانێك ئەنجامبدەین. بەڵام دەیبەینە دەرەوە و دەرگاكانی دوونیایەكی تری بەڕوودا دەكەینەوە. لەوانەیە لەم شارو لەم ناوچەیەدا شتانێك هەبن كە سەرەتا بتوانین ئەنجامیانبدەین. دواتر دەچین بۆ شوێنێكی دورتر و لەپاشان دورتریش دەكەوینەوە.

—مەبەستت سەفەرو گەشتی دەرەوەیە؟

—دەرەوە؟

چاوەكانم داخست.

—سەرەتا دەتوانین بیبەن بۆ قاوەخانە یان نمایش.

—لەم دوو ساڵەی ڕابوردودا ویل زۆر بەكەمی لە ماڵەوە چووەتە دەرەوە. بێجگە لەوكاتانەی كە بۆ چارەسەر دەچێت بۆ نەخۆشخانە.

—باشە، بەڵێ. لەبەر خۆمەوە بیرم كردەوە كە هەموو هەوڵی خۆم دەدەم بۆ ئەوەی ڕازی بكەم.

جۆرجینا ترینەر گوتی:

—كەواتە خۆت لەگەڵیدا دەچیت بۆ هەموو شوێنەكان.

—گوێبگرن. هیچ شتێك نائاسایی نییە. قسەكەی من ئەمەیە بۆ دەستپێكردن دەبێت لەماڵەوە بیبەینە دەرەوە. سورێك بەدەوری قەڵاكەدا بدەین یان بچین بۆ قاوەخانە. دواتر چەندە باش دەبێت كە بچین بۆ فلۆریدا، مەلەكردن لەگەڵ دۆڵفینەكاندا زۆر گرنگە. لە بنەڕەتدا، ئامانجم ئەوەیە لە ماڵەوە بیبەمە دەرەوە، بۆ ئەوەی كۆمەڵێك بیرو خەیاڵیتر بخەمە ناو مێشكییەوە.

بەڵام ئەوەم نەگوت كە هێشتایش بیركردنەوە لە شۆفێری و بردنی ویل بۆ نەخۆشخانە جەستەم ئارەقێكی ساردو سڕی دەردەدا. هەربۆیە بیرۆكەی بردنە دەرەوەی وەك ئەوە وابوو بیربكەمەوە كە ئەمەوێت لە پێشبڕكێی ڕاكردنی ماراسۆندا بەشداری بكەم.

كاك ترینەر گوتی:

—چ بیرۆکەیەکی باشە! وابزانم بردنی ویل بۆ گەشت و گەڕان زۆر باش بێت. دەزانن هەرگیز باش نییە کە شەوو ڕۆژ دابنیشێت و سەیری چواردیواریماڵەکە بکات.

خاتوو ترینەر گوتی:

—ستیڤن، ئێمە هەوڵی زۆرماندا بۆ ئەوەی بیبەینە دەرەوە. یەکجار واش نییە کە وازمان لێهێنابێت بۆ ئەوەی لەماڵەوەی بڕزێت. چەندینجار زۆرم لێکردووە و هەوڵی خۆمم لەگەڵدا داوە.

—دەزانم ئازیزەکەم، بەلآم خۆ هیچ ئەنجامێکی نەبووە. ئەی وانییە؟ ئەگەر لوئیزا بتوانێت کۆمەڵێك پلان و بەرنامەی بۆ ئەم مەبەستە هەبێت، ئەوە زۆر باش دەبێت.

—ئەم قسەیەی تۆ پێویستی بەکارو کردارە.

منیش گوتم:

—ئێستە تەنها بیرۆکەیە.

کتوپڕ هەستم بە تورەیی کرد. دەمتوانی گومان ببەم کە لە زەینیدا چی دەگوزەرێت.

—ئەگەر ناتانەوێت من....

—ئیتر نایەیت؟

ڕاستەوخۆ سەیری منی دەکرد.

ڕوم لێوەرگێڕا. ئیتر لەو نەدەترسام. چونکە ئێستە ئیتر ئەوم بەباشتر لەخۆم نەدەزانی. چونکە ژنێکبوو کە تەنها دەیتوانی دابنیشێت و پاڵبدات بە کورسییەوە و ڕێگەبدات کە کوڕەکەی بەبەرچاوییەوە پەلەقاژێ بکات.

—بەڵێ، لەوانەیە.

—کەواتە هەڕەشە دەکەیت.

—جورجینا؟

—باشە بابە، بۆچی هێندە لە بابەتەکە دوور دەکەونەوە؟

ڕێك و ڕاست دانیشتم.

—هەڕەشە نییە. بەڵکو ڕۆڵێکە کە ئەمەوێت بیگێڕم. ناتوانم بێدەنگ دابنیشم و چاوەڕوان بم تاوەکو کاتی....

وردە وردە دەنگم لاواز بوو. هەمومان واقمان بە کوپە چاییەکاندا وڕمابوو. کاك ترینەر بە بڕشتەوە گوتی:

-هەروەك گوتم، بەبڕوای من بیرۆکەیەکی باشە. ئەگەر بتوانیت ڕەزامەندی ویل بەدەستبهێنیت و ڕازی بکەیت، ئەوا هیچ گرفتێك لەمکارەدا نابینم. بەڕاستی حەزدەکەم بڕوات و گەشت بکات و بگەڕێت. تەنها پێمانبڵێ دەبێت چی بکەین.

خاتوو ترینەر دەستی خستە سەر شانی کچەکەی.

-بیرۆکەیەك هات بە مێشکمدا. جورجینا لەوانەیە تۆیش بتوانیت لەگەڵ ئەواندا بڕۆیت.

من گوتم:

-بەبڕوای منیش ئەوە زۆر باشە.

بەڕاستی هەروایش بوو. چونکە شانسم لە بردنی ویلدا بۆ گەشت و سەفەری دەرەوە بە ئەندازەی شانسم بوو لە سەرکەوتن لە پێشبڕکێ و پاڵەوانیەتیەکاندا. جورجینا ترینەر بێقەرارو نائارام لە شوێنی خۆیدا سوڕایەوە.

-نازانم. خۆتان دەزانن کە دوو هەفتەی تر کارە نوێیەکەم دەستپێدەکەم. خۆ ناتوانم هەر لەو سەرەتایەوە مۆڵەت وەربگرم و بگەڕێمەوە بۆ بەریتانیا.

-دەگەڕێیتەوە بۆ ئوسترالیا؟

-بۆچی سەرت سوڕما؟ گوتبوم کە تەنها بۆ سەردان و دیبەنی دێمەوە.

-وازمانی... وامزانی بە سەرنجدان بە ڕووداوەکانی ئەم دواییە، لەوانەیە بتەوێت زیاتر بمێنیتەوە.

کامیلا ترینەر بە جۆرێك سەیری کچەکەی دەکرد، کە هەرگیز بەوشێوەیە سەیری ویلی نەدەکرد، هەرچەندە ویل بەوپەڕی گوساخانە و ڕوقایمیەوە ڕەفتاری دەکرد.

-دایە، کارێکم دەستکەوتووە، کە زۆر باشە. دوو ساڵە بەدوایدا دەگەڕێم.

سەیرێکی باوکی کرد.

-من ناتوانم لەبەر بارودۆخی ڕۆحی ویل ژیانم بوەستێنم.

بێدەنگییەکی قورس باڵیکێشا بەسەر شوێنەکەدا.

-ئەوە دواکارییەکی ویژدانانە نییە. ئەگەر منیش لەسەر کورسی تایەدار بومایەو داواتان لە ویل بکردایە لەبەر خاتری من هەموو بەرنامەکانی ژیانی بوەستێنێت ؟

خاتوو ترینەر سەیری کچەکەی کرد. منیش سەرم داخستبوو پێڕستەکەمم دەخوێندەوە، پەرڕەگرافی یەکەمم چەندینجار خوێندەوە.

جورجینا خەریکبوو بێزاری دەردەبڕی و سکالآی دەکرد.

—منیش ژیانم هەیە. دەبێت سەرقاڵی ژیانی خۆم بم.

کاك ترینەر دەستی خستە سەرشانی کچەکەی و بەئارامییەوە فشاریدا.

—دواتر لەبارەیەوە قسە دەکەین.

کاغەزەکانی بەردەمی هەڵدایەوە. دواتر سەیری منی کرد و گوتی:

—باشە، وابزانم دەبێت بەمشێوەیە بەرەو پێشەوە بچین. من دەبێت هەموو بەرنامەکانتان بزانم. دەبێت هەڵیانبسەنگێنم و ئەگەر بکرێت بەرنامەکەم بە جۆرێك ڕێکبخەم کە هەندێکجار مۆڵەت وەربگرم و لەگەڵتاندا بێم، کۆمەڵێك پشوی بێمانام هەیە کە....

—نەخێر.

هەمومان ئاوڕمان دایەوە بۆلای کاك ترینەر.

—نەخێر کامیلا. باوەڕناکەم کارێکی باش بێت تۆیش بڕۆیت. دەبێت بهێڵین کە ویل خۆی بەتەنیا بڕوات.

—ستیڤن، خۆ ویل ناتوانێت بەتەنیا بڕوات. شتانێکی زۆر هەیە کاتێك ویل دەچێتە دەرەوە دەبێت گرنگیان پێبدرێت و ئاگامان لێیان بێت. ئەمە کارێکی قورسە. وابزانم ناتوانین بیدەینە دەستی....

—نەخێر ئازیزەکەم، نیتن دەتوانێت یارمەتی بدات. لوئیزا خۆیشی کاروبارەکان ڕێکدەخات.

—بەلآم...

—دەبێت ویل هەست بەوە بکات کە هێشتا کەسێکی بەتوانایە. دەبێ هەستی پیاوەتی بپارێزرێت. ئەگەر بڕیاربێت دایکی یان خوشکەکەی لەگەڵیدا بن، ئەوکات هیچ سودێکی نابێت.

دڵم بۆ خاتو ترینەر دەسوتا و بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا هەمان قیافەی خۆبەزلزانانەی هەبوو، بەلآم دەمتوانی کە ببینم وێڵ و پەرێشانە. بەباشی لە مەبەستی مێردەکەی تێنەدەگەیشت، دەستی بردەوە بۆ ملوانکەکەی گەردنی.

منیش گوتم:

—بێخەم بن، بەباشی ئاگام لێی دەبێت. پێشوەختەیش هەموو بەرنامەکانم بۆ ئێوە باسدەکەم.

چەناکە و شەویلگەی بەجۆرێك پتەو بویەوە کە ماسولکەیەکی بچوك لە ژێر گۆنایەوە بەرز بوویەوە. حەزم دەکرد بزانم هێشتا ڕقی لەمنە.

لە کۆتاییدا گوتم:

—من ئەمەوێت ویل بیەوێت بژی.

کاك ترینەر گوتی:

—تێدەگەین. هەروەها ڕێز لە عەزم و ئیرادەو هەست و شعوری تۆ دەگرین.

حەزم دەکرد بزانم ئەو ووشەی شعورەی کە ئەو گوتی، تەنها سەبارەت بە ویل بوو، یان بەگشتی منی بە کەسێکی خاوەن هەستی و شعور دەزانی. دواتر هەستایەوە، منیش زانیم کە دەبێت بڕۆم. جورجیناو دایکی هێشتا لەسەر قەنەفەکە دانیشتبون. هیچ قسەیەکیشیان نەدەکرد. هەستمدەکرد هەرکە قاچم خستە دەرەوەی ژورەکە، قسەو باسێکی گەرم و گوڕ دروست دەبێت.

—ڕاستە. هەرکە بیرم لێکردەوە، دەنوسم. زۆر خێرا. کاتێکی زۆر...

کاك ترینەر دەستێکی میهرەبانانەی هێنا بەسەر شانمدا.

—دەزانم، بەڵام هەرچی دەکەیت ئێمە ئاگادار بکەرەوە.

***

ترینا خەریکبوو فوی لەدەستی خۆی دەکرد. بە بێ ویستی خۆی قاچەکانی بەرزو نزمیان دەکرد، هەروەك بڵێی لە شوێنی خۆیداو لە هەوادا هەنگاوی هەڵدەگرت، کڵاوە خورییە سەوزە تاریکەکەی منی لەسەر بوو، ئیرەییم دەبرد، کاتێك دەمبینی زیاتر لەو دەوەشێتەوە. چەمایەوە بۆ پێشەوە و ئاماژەی بۆ ئەو فەهرستە کرد کە لە گیرفانی دەریهێنا. دواتر دایبەدەستمەوە.

—وابزانم دەبێت بازنە بهێنیت بەدەوری ژمارە سێ دا تاوەکو دواتر کەمێك دوونیا گەرم دەکات.

سەیرێکی فەهرستەکەم کرد.

—تۆپی سەبەتەی کەمئەندامان و ئیفلیجەکان؟ نازانم لەوانەیە حەزی لە تۆپی سەبەتە نەبێت.

—گرنگ نییە، ئەی هاوار دوونیا چەند ساردە!

کڵاوەکەی تاوەکو نزیك گوێکانی هێنایە خوارەوە.

-گرنگ ئەوەیە کە بزانێت دەتوانێت چ کارانێك بکات. دەبینێت کە مرۆڤانێکیش هەن لەو خراپترن و دەتوانن وەرزش و ئەمجۆرە کارانەیش ئەنجامبدەن.

-دڵنیا نیم. تەنانەت ناتوانێت کوپێك بگرێت بە دەستیەوە، بەبڕوای من ئەمانە تەنها قاچەکانیان ئیفلیجن، بۆیە دەتوانن یاری تۆپی سەبەتە بکەن، باوەڕناکەم بەبێ بەکارهێنانی دەست بتوانرێت تۆپ بهاوێژرێت.

-لە خاڵە گرنگەکە تێنەگەیشتیت. خۆ ئەو ناچار نییە کە هەر دەبێت کارێك ئەنجامبدات. ئێمە تەنها ئەمانەوێت بیبەین بۆ دوونیایەکیتر، باشە؟ دەیبەین بۆ ئەوەی بزانێت کە ئیفلیجەکانیتر چ کارانێك ئەنجامدەدەن.

-ئێ باشە، مادەم تۆ وا دەڵێیت ئەوە شتێکی پەسەندە.

ژاوەژاوێك لەناو کۆمەڵەکەدا بەرز بوویەوە. ڕاکەرەکان نیوە هەستانەوەیان کرد و هەنگاوێك چونە دواوە. ئەگەر لەسەر پەنجەی قاچ بوەستامایە، دەمتوانی بیانبینم. نزیکەی سێ کیلۆمەتر دوورترو لە خوار چۆمەکەوە گروپێکی بچوك لە خاڵە سپییەکان بە جرت و فرتەوە لەناو هەوای سارد و شێداردا و بە درێژایی جادەکە ڕایاندەکرد. سەیری کاتژمێرەکەمم کرد. نزیکەی چل خولەك دەبوو کە لەسەر تەپۆڵکەیەك کە ناوەکەی خۆی بە خۆیەوە (تەپۆڵکەی ڕەشەبا) وەستابوین، لەوە زیاتر نەمدەتوانی لەسەر پێیەکانم بوەستم.

-هەموو بەرنامە ناوچەییەکانم لێکۆڵینەوە کرد و هەمویانم هەڵسەنگاند، ئەگەر ناتانەوێت زۆر دوربکەونەوە، یەك دووهەفتەی تر پێشبڕکێیەك لەناو ناوەندی وەرزشیدا ڕێکدەخرێت. تەنانەت دەتوانێت گرەو لەسەر ئەنجامی یارییەکە بکات.

-گرەو کردن؟

-بە گرەو کردن توشی یارییەکە دەبێت، بەبێ ئەوەی کە خۆی یاری بکات. ئۆو سەیری ئەوێ بکە. پێتوایە چەندێکی بوێت تاوەکو بگەنە لای ئێمە؟

لەنزیك هێڵی کۆتاییەوە وەستاین. لەسەر لافیتەکەی ڕاسەرمان کە ڕەشەبا دەیجولاندەوە نوسرابو (هێڵی کۆتایی سێ سوچی بەهارە).

-نازانم، بیست خولەك؟ لەوانەیشە زیاتر. چوکلێتی مارسم پێیە، ئەگەر دەتەوێت دەیکەم بە دوو بەشەوە.

دەستمکرد بەناو گیرفانمدا. ڕەشەباکە هێندە توند بوو کە نەدەکرا بەرگە چوکلێتەکە ڕابگریت.

—ئێ، چ شتانێکیترت دۆزیوەتەوە؟

—گوتت کە دەچن بۆ شوێنە دوورەکانیش، وایە؟

ئاماژەی بۆ دەستم کرد.

—گەورەترینەکەیان خۆت هەڵتگرت.

—وەرە بۆ تۆ. وابزانم هەموویان پێیانوایە من بەلاشخۆری دەکەم.

—لەبەر ئەوەی کە دەتەوێت چەند ڕۆژێکی نەفرەتی بیبەیتە دەرەوە؟ ئەی خودا! دەبێت خۆشحاڵ بن کە یەکێك هەوڵ بۆ کوڕەکەیان دەدات. نابێت بەوشێوەیە بیر بکەنەوە.

ترینا پارچە گەورەترەکەی هەڵگرت.

—بەهەرحاڵ، سەیری ژمارە پێنجی پێڕستەکە بکە، خۆ دەتوانێت بەشداری خولی کۆمپیوتەر بکات. شتێکی وەك پارچە دارێك دەخەنە سەرسەریانەوە، ئەوانیش بە ڕاوەشاندنی سەریان دەتوانن کلیك لەسەر دوگمەکانی لاپەڕەی سەرەکی بکەن. لەم ڕێگەیەوە دەتوانێت هاوڕێیانێکی زۆر پەیدا بکات. ئیتر ناچار نییە کە هەمیشە لەماڵەوە بچێتە دەرەوە. من تەنانەت قسەم لەگەڵ دوو کەسی ناو ژورەکەدا کرد، پێموابێت کەسانێکی ڕۆحیە بەرزو شاد بوون.

شانەکانی بەرز کردەوە.

—زۆر سروشتی و ئاسایی.

بێدەنگبوین و چوکلێتەکەمان خوارد. سەیری گروپی ڕاکەرەکانمان دەکرد. ماندویەتییەکی زۆریان پێوەدیار بوو. پاتریکم نەدەبینی. واتە هەر نەمبینیبوو. دەموچاوی بە جۆرێك بوو کە لەناو خەڵکەکەدا وندەبوو نەدەبینرا.

ترینا ئاماژەی بۆ پارچە کاغەزەکە کرد.

—ئێستە با بچین بۆ بەشی ڕۆشنبیری. کۆنسێرتی تایبەتی تواناویستانە. واتە شتەکە دەبێتە گاڵتەجاڕانە، وایە؟ (درك) هەمان پیاوی سمێڵ قایمی شوێنی کارەکەم، پێی گوتم کە کەمکێك دەنگە دەنگی تێدایە، چونکە مرۆڤە تواناویستەکان هەندێکجار هات و هاوار دەکەن. بەڵام دڵنیام زۆری پێخۆشدەبێت.

چرچێکم خستە لوتمەوە و گوتم:

—-ترینا نازانم...

– تۆ لەوە ترسایت کە گوتم ئەهلی زەوق. تەنها دەبێت لە تەنیشتیەوە دابنیشیت. بەبێ خشەخشکردن بە کاغەزی چپسەکە. یان ئەگەر شتێکی باشترت دەوێت...

زەردەخەنەیەکی کرد و لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—یانەی (سەمای خۆ ڕوتکردنەوە) لەناو لەندەندا هەیە. دەتوانیت بیبەیت بۆ ئەوێ.

—خاوەنکارەکەم ببەم بۆ سەیرکردنی (سەمای خۆ ڕووتکردنەوە)؟

—گوتت ئامادەیت هەموو کارێکی بۆ بکەیت. خۆ هەموو کارێك بریتی نییە لە پاکوخاوێنی و خۆراکپێدان و ئەمجۆرە شتانە.

ئەو چەند کەسەی کە لەدەوروبەرماندا بوون، ئاوریاندایەوە بۆلامان. خوشکەکەم دەستیکردە پێکەنین. خوشکەکەم بەمشێوەیە قسەی لەسەر مەسەلە سێکسییەکان دەکرد. هەروەك بڵێی کارێکی گەشتیاری و کات بەسەر بردن بێت و شتێکی هێندە گرنگ نەبێت.

—لەلایەکیترەوە، دەکرێت گەشت بۆ شوێنە دوردەستەکانیش بکرێت. نازانم خۆت حەزت لە چییە، بەڵام دەکرێت بچن بۆ (لوئارد)و شەرابەکەی بچێژن... بۆ دەستپێکردن ڕێگەیەکی دوور نییە.

—کێشەیەکی تێدا نییە کە ئیفلیج و کەمئەندامەکان مەست بن؟

—نازانم، لە خۆی بپرسە.

مۆرێکم کرد و گوتم:

—-کەوابوو دەچم و بە خانەوادەی ترینەر دەڵێم، ئەمەوێت کوڕی ئیفلیج و ئامادەباشەکەتان بۆ خۆکوشتن ببەم بۆ ئەوەی مەست ببێت. پارەکەتان لە (سەمای خۆڕوتکردنەوە) و ئەمجۆرە شتانەدا خەرج دەکەم، دواتریش پاڵیپێوە دەنێم و دەیبەم بۆ ئۆڵۆمپیادی تواناویستان.

ترینا کاغەزەکەی لەدەست ڕاکێشام.

—باشە، وادیارە لەگەڵ هیچکام لەمکارانەدا هاوڕا نیت.

—تەنها بۆچونی خۆمم دەربڕی.... جارێ نازانم.

دەستێکم هێنا بە لوتمدا.

–ڕاستیەکەیت بوێت، کەمێك دەترسم. تەنانەت کاتێك ئەمەوێت بیبەم بۆ ناو حەوشەکە، بە هەزار زەحمەت ڕازی دەکەم.

–باشە، ئەمەش قسەیەکە بۆخۆی! ئێو سەرکە. گەیشتن. باشتروایە زەردەخەنە بکەیت.؟

***

بە بێتاقەتی و بێحاڵییەوە هاوارم کرد:

–پاتریك.... خێراتر...

منی نەبینی.

بەوپەڕی خێراییەوە بەرەو لای هێڵی کۆتایی ڕایدەکرد.

***

ترینا کاتێك بینی لیستەکەیم بەوجۆرەی کە دەبوایەو پێویستبوو وەرنەگرت و قبوڵم نەبوو، تاوەکو دوو ڕۆژ قسەی لەگەڵدا نەکردم. دایکو باوکم ئاگایان لێنەبوو، لەوەی کە بیستیان واز لەکارەکەم ناهێنم زۆریان پێخۆش بوو. بەڕێوەبەرییەتی کارگەی مۆبێلیاتەکە بۆ کۆتایی هەفتە دانیشتنێکی ڕێکخستبوو. باوکیشم وایدەزانی یەکێکە لەو کەسانەی کە دەردەکرێت و بێکار دەبێت. چونکە کەسانی سەرو چل ساڵیان نەدەهێشتەوە.

دایکم گوتی:

–ئازیزەکەم زۆر سوپاست دەکەین کە لە خەرجیماڵەوەدا یارمەتیمان دەدەیت.

ئەم قسەیەی بەزۆری ئازاری دەدام.

هەفتەیەکی زۆر بێمانا بوو. ترینا دەستیکردە کۆکردنەوەی شتومەکەکانی. هەمو ڕۆژێك ناچار بووم کە بە دزییەوە بچمە قاتی سەرەوە و سەیرێکی ئەو جانتایانە بکەم کە کۆیکردبونەوە، بۆ ئەوەی بزانم چ شتێکی منی هەڵگرتوە بۆ ئەوەی بیبات. زیاتر جلوبەرگەکانم لە جێگەی خۆیاندا بوون و دەستیان لێنەدرابوو، بەڵام موجەفیفەکە، چاویلکە خۆرییەکەم کە مارکەی پرادۆ بوو، هەڵیگرتووە، هەروەها جانتا سەفەرییەکەم کە تایبەت بوو بە پێداویستیە تەندروستیەکانەوە و وەك لیمۆ دروستکرابوو، هەڵگرتووە. ناڕەزایەتیم دەردەبڕی، بەڵام شانەکانی هەڵدەتەکاند و دەیگوت:

–باشە دەی، خۆ تۆ هیچکاتێك بەکاریبان ناهێنیت.

هەروەك بڵێیی بابەتەكە هەر ئەمە بوو.

ترینا كەسێكی لەمشێوەیە بوو، هەمیشە حەق لەلای ئەو بوو. لەپاش لەدایكبونی تۆماسیش ئەم هەستەی لەدەستنەدا كە كاسەی خۆشەویست و پڕی ماڵەوەیە. ئەم هەستە بەجۆرێك لەناخی ئەودا ڕەگ و ڕیشەی داكوتابوو كە بەڕاستی وایدەزانی ناوەندی هەموو جیهان خۆیەتی. كاتێك منداڵ بوین و شتێكی منی بویستایە، هەرایەكی وەهای دروستدەكرد كە دایكم هەمیشە پێی دەگوتم: ( ئەو شتەی پێبدە). لەوانەیە دایكم تەنها ویستبێتی هێمنی ماڵەكە بپارێزێت. بەڕاستی تاوەكو بیست ساڵی دواتریش شتێكی ئەوتۆ نەگۆڕدرا. ئێمە ناچاربوین چاودێری تۆماس بكەین، تاوەكو ترینا بتوانێت بچێتە دەرەوە. منداڵەكەی بۆ تێر بكەیت بۆ ئەوەی ئەو نیگەرانی هیچ نەبێت. دیاری جەژنی كریمس و ئاهەنگی لەدایكبونی ڕێكوپێكی بۆ بكڕین، لەبەر ئەوەی (ئێستە تۆماس هەیە، كەمتر دیاریمان بە خۆی دەدا). بەڵام ئێستە دەبوایە بەبێ جانتای سەفەری كەرەستە تەندروستیەكانی بڕۆشتایە. یاداشتێكم لكاند بە دەرگای ژورەكەیەوە: (شتومەكی من هی خۆمە. تۆیش لێرە بڕۆ). ترینا یاداشتەكەی دڕاند و بەدایكمی گوت كە من هێشتا گەورە نەبووم و تەنانەت لە تۆماسیش منداڵترم.

ئەم بابەتە بیروهۆشمی زۆر بەخۆیەوە سەرقاڵكرد. شەوێكیان كاتێك ترینا چوبو بۆ خولی شەوانە، منیش لەسەر مێزی چێشتخانەكە دانیشتم، دایكم خەریكی جیاكردنەوەی كراسەكانی باوكم بوو بۆ ئوتوكردن.

—دایە...

—گیان.

—تۆ بڵێی لەپاش ڕۆیشتنی ترینا بتوانم شتومەكەكانی خۆم ببەمە ژورەكەی و لەوێدا بمێنمەوە؟

دایكم ساتێك وەستا، كراسە نیوە دەقكراوەكەی گوشی بە سینگیەوە و گوتی:

—نازانم. هەر بیریشم لێ نەكردوەتەوە.

—كاتێك ترینا و تۆماس لێرە نەبن، ئیتر حەق وایە من ژورێكی ڕێكوپێكم هەبێت. گاڵتەجاڕانەیە ئەو ژورە خاڵی بێت، ئەگەر ئەو بیەوێت بچێت و لەناو شوقەكانی زانكۆدا بژی.

دایكم سەرێكی ڕاوەشاند و بە هێواشییەوە كراسەكەی خستە ناو سەبەتەكەوە.

—بەڵێ، پێموابێت تۆ ڕاستدەكەیت.

—هەر لەو سەرەتایەشەوە مافی من بوو کە لەوێدا بژیم، چونکە لەو گەورەتر بووم. تەنها لەبەر تۆماس بوو.

قسەکەم زۆر لۆژیکی بوو بەلایەوە.

—زۆر ڕاستە. قسە لەگەڵ ترینادا دەکەم.

کاتێك بیرم کردەوە، لەبەر خۆمەوە گوتم خۆزگایە پێشتر بە خوشکەکەم بگوتبایە.

سێ سەعات دواتر ترینا بە هات و هاوار هات بۆ ژوری دانیشتنەکە.

—بهێڵە کفنەکەم ووشك ببێتەوە دواتر داوای میراتی بکە.

بابەگەورەم لەخەو هەستا، لەسەر کورسییەکە خەوەنوچکەی بوو. بەشێوەیەکی خۆنەویست دەستی خستە سەرسنگی خۆی. منیش ڕوم لە تەلەفیزیۆنەکە وەرگێڕا.

—تۆ باسی چی دەکەیت؟

—ئەی من و تۆماس لە کاتی پشووەکاندا لە کوێ بمێنینەوە. خۆ ئێمە دوو کەسین و لەناو ئەو ژورە شقارتەییەدا جێگەمان نابێتەوە. تەنانەت شوێنی دوو قەرەوێڵەیشی نییە.

—منی داماو بۆ ماوەی پێنج ساڵ نەمتوانی هەناسەیەکی ئیسراحەت هەڵبکێشم.

ئم بیرکردنەوەیەی کە من هەرگیز خەتابار نیم، دەبویە هۆی ئەوەی زیاتر لەوەی کە مەبەستمە کاردانەوە نیشانبدەم.

—تۆ ناتوانیت ئەو ژورە بۆ خۆت داگیر بکەیت، ئەوە ویژدان نییە.

—خۆ خولەکەی خانم تەواو بووە.

—بەڵام نابێت. بەهیچ شێوەیەك من و تۆماس لەناو ئەوژورە شقارتەییەدا جێگەمان نابێتەوە. بابە تۆ پێی بڵێ!

باوکیشم قیافەیەکی بڕیاردەری لەخۆی نیشاندا. پەنجەکانی هەردو دەستی لەسەر سنگی لێکئالاند. پێی ناخۆش بوو کە ئێمە شەڕ بکەین. هەربۆیە پێی باشتر بوو چارەسەری مەسەلەکە بسپێرێت بە دایکم. هەربۆیە گوتی:

—کچەکان بێدەنگ بن.

—باوەڕناکەم، تەنها لەبەر ئەمە بوو کە یارمەتیدام بۆ ئەوەی بڕۆم.

—چی؟ ئەوەی کە تۆ لێم پاڕایتەوە بۆ ئەوەی واز لەکارەکەم نەهێنم تاوەکو بتوانم یارمەتی دارایت بدەم، ئێستە پیلانەکەی من بووەتە شەیتانی؟ ئاوا....!

–زۆر دوورویت!

دایکم لەناو چوارچێوەی دەرگاکەدا دەرکەوت.

–کاترینا بێدەنگ.

کەفاو لەو دەستکێشەکەیەوە دەچۆڕایە سەر فەرشی ژووری دانیشتنەکە کە لەناو چێشتخانەکەدا کاری پێدەکرد.

–بە هێمنیش دەتوانین قسە بکەین. ئەوەندە بابە گەورە توڕە و نیگەران مەکەن.

دەموچاوی کاترینا لە توڕەییدا پەڵە پەڵە بوو، لە منداڵیشدا کاتێك بە خواستەکانی نەدەگەیشت، هەروای لێدەهات.

–دڵی فێنك بووەتەوە کە من لێرە دەڕۆم. تەنانەت ناتوانێت بوەستێت تاوەکو بڕۆم. ئیرەییم پێدەبات کە خەریکە لە ژیانمدا شتێك دەکەم بە شتێك. تەنها ئەیەوێت کارێك بکات بۆ ئەوەی نەگەڕێمەوە ئەم ماڵە.

بە توڕەییەکی زۆرەوە هاوارم کرد:

–کێ دەڵێت کۆتایی هەفتەکانیش دێیتەوە، من زۆرم دەوێت نەك کۆمەد. ئەم هەموو ماوەیە باشترین ژووری نوستن لە دەستی تۆدا بووە، چونکە تەنها بەکەڵی ئەوە دێیت کە بتخەنە ناو بناغەی خانووەوە.

دایکم گوتی:

–لوئیزا!

–بەڵێ، ئەگەر ئەوەندە گەمژە نەبویتایە کە تەنانەت نەتتوانی کارێکی باش بۆ خۆت بدۆزیتەوە، ئەوکات دەتتوانی لێرە بڕۆیت و وونبیت. کچی زلەی ناشیرین، هەر دەڵێی وورچی. باشە پێمانبڵێ بزانین ڕاستی مەسەلەکە چییە؟ نەکا پاتریك نایەوێت خوازبێنیت لێبکات.

دەنگی باوکم بێدەنگییەکەی شکاند.

–بیبڕنەوە! بە پێی پێویست گوێم لە قسەی بێمانا بوو! بڕۆ بۆ چێشتخانە، لو تۆیش هەر لێرە دانیشەو دەمت داخە. خۆم لە ژیاندا بەپێی پێویست خەم و پەژارەم هەیە، ئیتر پێویستناکات بتانبینم قیژەو هاوار بکەن بەسەر یەکتریدا.

ترینا لەوکاتەی کەدایکم ئەیویست بە زۆر لەژوورەکە بیباتە دەرەوە، بەهێمنیەوە گوتی:

–به هەڵەدا چویت، ئەگەر وابزانی بۆ ئەو پێڕستە نەفرەتییە پارمەتیت دەدەم. هەرچییەکت بەسەردا دێت حەقی خۆتە.

گوتم:

–پێویستم بە یارمەتیت نییە، بەلاشخۆر!

دواتر کاتێك باوکم ڕۆژنامەکەی بۆ هاویشتم خۆم فڕێدایە ئەولاوە.

***

بەیانی شەممە چوم بۆ کتێبخانە. لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە بە گریمانی بەهێز لەوکاتەوەی کە دواناوەندیم تەواو کرد، ئەمە یەکەمینجارە کە دەچم بۆ ئەوێ، ئیتر خەمی ئەوەم نەبوو بەبیریان بێتەوە کاتێك پۆلی حەوت بووم، کتێبی (جودی بلوم )م ونکرد و کاتێك ئەمەوێت لە دەرگای کۆڵەکەداری شێوازی ڤیکتۆریایی باڵەخانەکە دەچمە ژورەوە، دەستی ئارەقاوی پۆلیسەکە بێتە بەردەمم و داوای ٣٨٥٣ پاوەند قەرەبوم لێبکات.

کتێبخانەکە گۆڕدرابوو. بەڕواڵەت سی دی و دی ڤی دی جێگەی نیوەی کتێبەکانیان گرتبویەوە. ڕەفەی گەورەی کتێب، تەنانەت شوێنی کارتەکانی پیرۆزبایی، پڕ بوبون لە کتێبە ئەلەکترۆنییە گۆیاکان. دەنگە دەنگ و ژاوەژاویش هەبوو. دەنگی گۆرانی و چەپڵە لە بەشی منداڵانەوە دەهات، ژمارەیەك دایکو منداڵ بەتەواوەتی سەرقاڵ بوون. خەڵکانێکیش گۆڤارییان دەخوێندەوە و بە هێواشی قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد. بەشی تایبەت بەو پیرە پیاوانەی کە بەسەر ڕۆژنامە خوڕاییەکانەوە خەویان لێدەکەوت، بەتەواوەتی پێچرابویەوەو لابرا بوو، لەبری ئەودا مێزێکی گەورەی هێلکەییان دانابوو، کە لە هەرچواردەوری کۆمپیوتەر دانرابوو. بە هێواشی لەبەردەم یەکێك لەو کۆمپیوتەرانەدا دانیشتم. حەزم دەکرد کەس ئاگای لێم نەبێت، کۆمپیوتەر، وەك کتێب، عەشقی خوشکەکەم بوو. خۆشبەختانە وادیاربوو چاودێرانی کتێبخانەکە دەیانزانی هەندێك کەسی وەك من بە بینینی ئەم گۆڕانکاری و جێگۆڕکێیانە توشی شۆك دەبن. یەکێك لە چاودێران و کارمەندانی کتێبخانەکە هات بۆلام و کارتێك و کاغەزێکی سیلفۆنداری دایە دەستم کە شێوازی کارپێکردنی کۆمپیوتەرەکەی تێدا نوسرابوو.

لەڕاسەریشمەوە نەوەستا. بەڵکو لەژێر لێوەوە گوتی، لەبەردەم ئەو مێزەدا دانیشوە و ئەگەر پێویستم بە یارمەتی زیاتر هەبوو دەتوانم ئاگاداری بکەمەوە. دواتر تەنها خۆم بووم و مێزێکی قاچ لەق و لاپەڕەیەکی سپی.

ئەم ساڵانە تەنها بە کۆمپیوتەرەکەی پاتریك کارم کردبوو. خۆی تەنها بۆ داونلۆدی بەرنامەکانی لەشجوانی و کتێبەکانی هونەری وەرزشی سودی لە سایتی ئامازۆن وەردەگرت. ئەگەر سودی تریشی لێوەرگرتبێت ئەوەم من هیچ ئاگادار نەبووم و حەزم نەدەکرد بزانم. بەپێی ئەو ڕێنماییانەی کە کارمەندی کتێبخانەکە پێیدابوم، دەستمپێکرد. لەپاش تەواو بوونی هەر قۆناغێك دووبارە کۆنترۆڵم کردەوە. بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەبینم کە دەرەقەتی کارەکە دێم. هەر بەڕاستی هیچ سەختیەکی تێدا نەبوو.

چوارسەعات دواتر، فەهرستەکەی خۆم بەدەستەوە بوو.

کەسیش باسی کتێبی جودی بلومی نەکرد. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم کە سودم لەکارتی ئەندامیەتییەکەی خوشکەکەم وەرگرت.

لەکاتی گەڕانەوەمدا بۆماڵەوە و لەسەر ڕێگاکەم سەردانێکی قرتاسیەم کرد و ڕۆژژمێرێکی دیواریم کڕی. لەوجۆرانەی کە لەناو بەڕێوەبەرێیەتیەکاندا هەیە و پشوە فەرمیەکانی تێدا دیاریکراوە. چوم بۆ ژورە بچوکەکە و کردمەوە. بە وردییەوەو بە سنجاق لکاندم بە پشتی دەرگاکەوە. ڕۆژی دەستپێکردنی کارەکەم لە ماڵی ترینەردا دیاریکرد. یەکی مانگی فبرایر بوو. ڕۆژەکانم یەك لەدوای یەك تێپەڕاند تاوەکو گەیشتمە ڕۆژی خۆکوشتنەکەی ویل کە ١٣ مانگی ئوت بوو. ئێستە ئیتر تەنها چوار مانگ کاتم هەبوو. یەك هەنگاو چومە دواوە و ساتێك واقم بەو بەروارەدا وڕما. ئەمویست بزانم ئەڵقەی بچوکی ڕەشی هەڵواسینی ڕۆژمێرەکە تاملی هەڵگرتنی ئەو کاغەزە دەکات یان نا. هەروا کە سەیرم دەکرد لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە. دەبوایە ئەو لاکێشە سپی و بچوکانەم بەباشترین بەرنامە پڕ بکردایەوە، کە دەیانتوانی شادی، خۆشبینی و ڕەزامەندی و چێژییان لەگەڵدا بێت. دەبوایە ڕۆژەکانی تەمەنی مرۆڤێکم بە ڕووداوە زۆر گرنگ و بێ وێنەکان پڕ بکردایەوە، مرۆڤێك کە دەست و قاچە بێتواناکانی لە خزمەتیدا نەبوون. تەنها

چوارمانگی بەنرخ بوارم هەبوو، دەبوایە بەرنامەم دابنایە و ئەم چوارمانگەم بە گەڕان و سەفەر دییەن و سەردانەکان، ڕیستوران و کۆنسێرت پڕ بکردایەوە. دەبوایە هەرکارێك بکەم کە سودی بۆ ئەم کارە هەبێت. دەبوایە بە تێرو تەواوی لێکۆڵینەوەم بکردایە بۆ ئەوەی دڵنیابومایە کە نەخشەو پلانەکانم دەبنە کرداری.

سەیری ڕۆژژمێرەکەم کرد. هێشتا پێنوسەکەم بەدەستەوە بوو. هەروەك بڵێی کتوپڕ هەموو ئەرك و لێپرسراوییەتیەکانی ناو ئەم پارچە کاغەزە کەتبونە سەرشانم. دەبێت لە ماوەی سەد و حەوت ڕۆژدا ویل ترینەر والێبکەم کە باوەڕ بەوە بکات ئەنگێزە و ئامانج و مەبەستێکی هەیە بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنێتەوە.

## {١١}

گۆرانی وەرزەکان لە هەندێك شوێندا بە کۆچی باڵندەکان یان مەد و جەزری دەریا دیاریدەکرێت. لێرەو لەمشارە بچوکەی ئێمەدا، بریتی بوو لە گەڕانەوەی گەشتیارەکان کە دەیگوت وەرز گۆڕدراوە. سەرەتا کۆمەڵێك خەڵکی کەم بە زەردەخەنەو جلوبەرگی مەتەری ڕەنگ ڕۆشن و کتێبی بچوکی دەلیل و ڕێنماکانیانەوە لە شەمەندەفەر یان ئۆتۆمبیل دادەبەزین، بە گەرمتر بوونی هەواو بەرەوپێش چوونی وەرزەکە، شەقامی سەرەکی پڕ دەبوو لەو گەشتیارانەی کە بەهۆی دوکەڵ و فسەفسکردنی ئۆتۆمبیلەکانیانەوە دادەبەزین و دەستیاندەکردە ڕشانەوە. ئەمریکایی و یابانی و گروپەکانی قوتابیانی دەرەوەی وڵات بەدەوروبەری قەڵاکەدا پەراگەندە بوبون.

زستانان فرۆشگاکان کەمێك دەکرانەوە. خاوەنی ئەو فرۆشگایانەی کە دەوڵەمەندتر بوون، لەم هەلە سودیان وەردەگرت و پشویان بەخۆیان دەدا، لە مانگە ساردەکانی ساڵدا دەچوون بۆ ئەو خانوانەی کە لە وڵاتانی دەرەوەدا هەیانبوو. مەراسیم و ئاهەنگە جیاوازەکانی کریسمس کە لەسەر ئاستی شار و شەقامەکاندا ڕێکدەخران، کۆنسێرتی گۆرانی و پێشانگاو بازاڕەکانی تایبەت بە جەژنەکانیان تێدا بوو. بە گەرم بوونی هەوا پارکینگ و گەراجی قەڵاکە پڕ دەبوو لە کەرەستەکانی گواستنەوە. قاوەخانە ناوچەییەکان ڕوبەڕوی داخوازییە زۆرەکانی ساندەویچ بەنان و پەنیر دەبونەوە. یەکشەممان کە ئاسمان ساماڵ بوایە، حاڵ و باڵی کەشوهەوای بێ جۆش و خرۆش و بازاڕ سستی شارەکەی ئێمە دەگۆڕدراو دەبویە ئامانجی سەردانی گەشتیارە کەلتورییە ئینگلیزەکان.

بەهەنگاونان بەتەپۆڵکەکەدا سەرکەوتم، هەوڵمدەدا ئەو گەشتیارانە نەبینم کە پێش هاتنی وەرز لە گەشتیاری بوون و بە جانتایەکی کەمەری و کتێبە بچوکە لاپەڕە چرچ بوو کۆن و دەلیلەکانەوە دەگەڕانەوە. هەمیشە کامێرایان بەدەستەوە بوو ئامادەی وێنەگرتنی دیمەنی

بەهارەی قەلاّکە بوون. کاتێك چاومان بە چاوی یەکتری دەکەوت، زەردەخەنەم دەکرد، چەندجاریش وەستام و بەو کامێرانەی کە دەیاندابەدەستمەوە وێنەیانم دەگرت. هەندێك لە خەڵکی دەشتەکی سکالاّیان لە وەرزی گەشتیاری هەبوو، ترافیکی قەرەباڵغ، توالیتی گشتی قەرەباڵغ، داخوازی خواردنە سەیرو سەمەرەکان، (سوشیتان نییە؟ تەنانەت ساندویچەکە؟)، بەلاّم من هیچ سکالاّیەکم نەبوو لەو بارودۆخە و بێتاقەت نەبووم. حەزم لە بینینی خەڵکی بێگانە بوو، ئەو وێنە گشتیەی کە لەبیرو زەینمدا سەبارەت بە خەڵکانی بێگانە هەمبوو، زۆر جیاواز بوو لەو وێنەیەی کە لە دەرەوە دەمبینی. حەزم لە بیستنی زمان و شێوەزارە جیاوازەکان بوو، حەزم دەکرد بزانم ئەم کەسانە لە کوێوە هاتون. بەوردی سەیری جلوبەرگانیانم دەکرد، کە هەرگیز لە کەتەلۆکی نێکستدا نەمبینیبون، یان لە مارکس ئەند سپنسردا نەمکڕیبون.

هەرکە جانتاکەم لەناو ڕێڕەوەکەدا دانا، ویل گوتی:

—خۆشحاڵی!

بەجۆرێك گوتی هەروەك بڵێی نابێت خۆشحاڵ بم.

—لەبەر ئەوەی کە ئەمڕۆ هاتووە!

—یانی چی؟

—دەچینە دەرەوە. ئەمانەوێت نیتن ببەین بۆ سەیری ئەسپسواری.

نیتن و ویل سەیری یەکترییان کرد و پێکەنین. بەیانی کاتێك خۆرم لە ئاسمانەوە بینی هەناسەیەکی ئیسراحەتم هەڵکێشا. کەشو هەواو زۆر خۆش بوو، دەمزانی هەموو شتێك بەباشی دەگوزەرێت.

—پێشبڕکێی ئەسپسواری؟

بەستەی کاغەزی یاداشتەکەم لە گیرفانم دەرهێنا.

—بەڵێ، پێشبرکێی ئەسپسواری لانگفیلد. ئەگەر ئێستە بەرێبکەوین ئەوا لەکاتی خۆیدا فریای خولی سێیەمی پێشبڕکێکە دەکەوین. منیش بۆ هەر مەسیرێك پێنج پاوەند لەسەر (مان ئۆ مان) گرەوم کرد. دەی کەوابوو باشتر وایە بەرێبکەوین.

—پێشبڕکێی سوارییە؟

—بەڵێ، نیتن تاوەکو ئێستە نەچووە.

بەبۆنەی وەها ڕۆژێکەوە، کراسی لە بەن چنراوی کورتی شین و پۆستاڵی چەرمی تایبت بە ئەسپسواریم پۆشیبوو. ملپێچێکیشم بەستبوو بە دەوری گەردنمەوە، کە هەرچوار دەوری گوڵەنگی ئەسپی پێوەبوو.

ویلم ئامادە کرد. دواتر کورسییەکەی خستە جوڵە و بەرەو لای پەرستارە پیاوەکەی ڕۆیشت(نیتن).

—نیتن ئارەزوی دێرینی تۆیە؟ زۆر حەزدەکەیت بڕۆیت؟

بە نیگا ئاماژەم بۆ نیتن کرد. نیتنیش بە زەردەخەنەوە گوتی:

—بەڵێ، زۆر. وەرن با بەڕێبکەوین.

ئەڵبەتە دەبێت ئەوە بڵێم کە پێشتر نیتنم لە مەسەلەکە ئاگادار کردبویەوە. هەینی تەلەفۆنی کردبوو گوتبوی کە چ کاتێك دەتوانێت لەگەڵماندا بێت. خێزانی ترینەریش ڕازی بوبون کە لەبری ئەوکارە زیادە پارەی پێبدەن. (خوشکەکەی ویل گەڕابویەوە بۆ ئوستڕالیا، وابزانم ئەیانویست بێخەم بن کە مرۆڤێکی ئاقڵم لەگەڵدایە). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دڵنیا نەبووم کە تاوەکو ڕۆژی یەکشەممە چ بەرنامەیەکم هەیە. بە دەسپێکێکی باش دەهاتە پێشچاو، کە لەوەها ڕۆژێکی دڵڕفێندا دەچوینە دەرەوە، نیو سەعات شۆفێریش زیاتر نەبوو.

—ئەگەر بڵێم نایەم؟

—ئەوکات تۆ دەبێت چل پاوەند بەمن بدەین.

—چل پاوەند؟ ئەمەت لە کوێوە هێنا؟

شانەکانی هەڵتەکاند.

—گرەوم کردووە. پێنج پاوەند بۆ هەر مەسیرێك، نزیکەی هەشت مەسیر دەبێت و دەکاتە چل پاوەند. دڵنیای دڵنیابە کە (مان نۆ مان) دەیباتەوە.

وادیاربوو غافڵگیرم کربوو.

نیتن دەستی خستە سەر ئەژنۆی.

—چەندەباشە! هەوایەکی خۆشی هەیە. دەتانەوێت خواردنیش بهێنم؟

گوتم:

— نەخێر، ڕیستورانێکی باشی لێیە. کاتێك ئەسپەکەی من بردییەوە هەموتان بۆ نانی نێوەڕۆ میوانی منن.

ویل پرسی:

--تۆ هەمیشە دەچیت؟

بەڵام پێش ئەوەی کە قسەیەکی زیاتر بکات، چاکەتەکەیم کردە بەری و خێرا ڕامکردە دەرەوە بۆ ئەوەی ئۆتۆمبیلەکە بهێنم.

***

بەتەواوەتی نەخشەو پلانەکەم دانابوو. لە ڕۆژێکی جوانی ساماڵدا دەچوین بۆ پێشبڕکێی ئەسپسواری. ئەسپەکان جوان و زینکراوو پێکەوتە بوون. سوارکارەکانیش بەوپەڕی شارەزاییەوە ئەسپەکانیان دەخستە غار و وەك ڕەشەبا تێدەپەڕین. وادیاربوو یەك دوو قایشی ڕەنگ برنجیان پێوە بوو (ڕەشوە). شوێنی تەماشاچیەکانیش بەدڵنیاییەوە پڕ بوو لەو خەڵکانەی کە هۆویان دەکرد. شوێنێکمان دەدۆزییەوە و لەوێوە هەستەکانمان بۆ ئەو ئەسپانە دەردەخست کە حەزمان دەکرد ببیەنەوە. بێگومان هەستی ڕکابەرییەتی ویل دەوروژاو نەیدەتوانی بێ مەیلی بکات و هەوڵی دەدا کە پێشی من و نیتم بکەوێت. حیسابی هەموو شتێکم کردبوو. ماوەیەك پاش سەیرکردنی پێشبڕکێکە دەچوین بۆ ڕیستۆرانێك کە بەباشی دەیڕوانییە سەر گۆڕەپانی ئەسپسوارییەکەو خواردنێکی شاهانەمان دەخوارد.

لەوانەیە گوێم بۆ قسەکەی باکم گرتبێت کاتێك دەیپرسی: (چۆن هیواو ئومێد دەتوانێت سەربەکەوێت بەسەر نائومێدیدا؟) ئەویش وەڵامیدابویەوە (بەرنامەیەکی خێزانی ڕێکبخەن و بچن بۆ گەشت و گەڕان).

لەشساغ و تەندروست گەیشتینە شوێنی مەبەست، بەبێ ئەوەی هیچ ڕووداوێك ڕوبدات. ئێستە متمانە بەخۆبونێکی زیاترم پەیداکردبوو، بێخەم بووم کە ئەگەر بە خێرایی دووسەد کیلۆمەتریش لە سەعاتێکدا بڕۆم، هیچ زیانێك بە ویل ناگەیەنم. هەوڵمدا تاوەکو ڕێگەکە بە گاڵتە و گەپ و پێکەنینەوە تێپەڕێنین. باسی ئاسمانی ساماڵ و جوان و دیمەنی سەوزی دەوروبەری شارم دەکرد کە بەڕاستی جوان و سەرنجڕاکێش بوو. هیچ قەرەباڵغییەکی ترافیکیش نەبوو. هیچ ڕیزێکیشمان بۆ چونە ناو شوێنی ئەسپسوارییەکە نەبینی، ئەڵبەتە ڕاستیەکەتان بوێت کەمێك درا لە زەوقم. گەراجەکەیش نیشانەی تێدا دانرابوو.

کەس نەیگوتبوو کە چیمەنە. چیمەنێك کە بەدرێژایی زستانی باراناوی بەهۆی تایەی ئۆتۆمبیلەکانەوە شێلرابوو. چوین بۆ بەشێکیتر، (ئەمەیان ئاستەم نەبوو، چونکە تەنها نیوەی

پڕ بوبەیەوە). هەرکە ڕەمپای ئۆتۆمبیلەکە کەوتە جوڵە، شلەژان و نیگەرانی هەمو گیان و جەستی نیتنی گرتەوە، گوتی:

—زۆر نەرمە. لەناویدا دەچەقێت.

سەیرێکی شوێنی تەماشاچیەکانم کرد.

—بەڵێ، بەلأم ئەگەر بتوانین بیبەن بۆ ئەو گوزەرگایە ئەوە زۆر باش دەبێت.

—ئەم کورسییە تایەدارە کێشەکەی یەك تۆن دەبێت. نزیکەی هەزارو پێنج سەد مەترێکیش ڕێگەیە.

—ئۆو وەرە بابە! بەدڵنیاییەوە ئەم کورسییە تایەدارەیان بەجۆرێك دروستکردووە کە بتوانێت بەسەر زەوی نەرمیشدا بڕوات.

بە هێواشی کورسییە تایەدارەکەی ویلم بەرەودواوە برد، چەند سانتیمەترێك تایەکانی چەقیبون بەناو قوڕەکەدا.

ویل بێدەنگبوو. زۆر بێزار دەهاتە پێشچاو. تاوەکو نیوەی ڕێگاکەیش هەر بێدەنگبوو. گوتم:

—بجوڵێ، بە دەست پاڵیپێوە دەنێین. دڵنیام بە هەردوکمانەوە دەتوانین بیبەین.

من یەکێك لە دەسکەکانیم گرتبوو ئەویتریشیان نیتن گرتبوی. بەڕاکێشان کورسییەکەمان بەرەولای ڕێڕەوەکە بردو کیسەڵی بەرەوپێشەوە دەچوین. ناچار بووم بوەستم، چونکە دەستم ئێشی دەکرد. قوڕێکی زۆر لکابوو بە پۆتینەکەمەوە. لە کۆتاییدا گەیشتین بە گوزەرگاکە، بەتانییەکەی ویل لەسەر قاچەکانی سوڕابویەوە و لە تایەکەی گیرابوو. سوچێکیشی دڕابوو قوڕاوی بوبو.

ویل بە بێتاقی و بێ مەیلییەوە گوتی:

—گرنگ نییە، نیگەران مەبە. پارچەیەك قوماشی کشمیر زیاتر نییە.

زۆر گرنگیم بە قسەکەی نەدا.

—ئەوەتا گەیشتین، ئێستەیش سەرقاڵییەکیتر!

بەڵێ، هەر بەڕاستی سەرقاڵی بوو! بەڕاستی کامە ئەقڵی دروست بیری دەکردەوە کە گۆڕەپانی ئەسپسواری دەبێت وەك فرۆشگاکان، پۆلیس و پاسەوانی هەبێت؟ کەی پێویستی دەکرد کە بیانەوێت خەڵکەکە کۆنترۆڵبکەن؟ سەیری دەرگای چونەژورەی پۆلیسەکانم کرد، دواتریش سەیرێکی کورسییە تایەدارەکەی ویل، لەپاشان من و نیتن سەیری یەکتریمان کردەوە.

نیتن لەبەردەم بلیت فرۆشەکەدا وەستا و بابەتەکەی بۆ ژنە پاسەوانەکە ڕوونکردەوە. ژنەکەیش ئاوڕیدایەوە و سەیرێکی ویلی کرد. دواتر ئاماژەی بۆ ئەوسەری شوێنەکە کرد و گوتی:

—جێگەی چونەژوورەوەی کورسییەکان لەوێوەیە.

بەجۆرێك ووشەی (کورسی تایەداری) گوت، هەروەك بڵێی لە پێشبڕکێی شێوازی دەربڕینی ووشەکاندا بەشداری کردووە. جێگەی چونەژوورەوەی کورسییە تایەدارەکان بەلایەنی کەمەوە دوو سەد مەتر مەودای هەبوو. سەرئەنجام کاتێك گەیشتینە ئەوێ، کتوپڕ ئاسمانە ساماڵەکە دیارنەماو باوباران دەستیپێکرد. هەربۆیە سروشتی بوو کە چەترم لەگەڵ خۆمدا نەهێنابێت. منیش سەرخۆشانە یەکسەر تێڕوانینی خۆمم ڕاگەیاند و گوتم چەندە گاڵتەجاڕانە و پێکەنیناوییە. قسەکانم تەنانەت بۆ خۆیشم وشك و بێزارکەر دەهاتنە بەرگوێ.

لە کۆتاییدا ویل گوتی:

—کلارك، تەنها بێدەنگبە، باشە، ماندوت کردم.

بلیتمان کڕی. دواتر کاتێك خۆمان گەیاندە ئەو شوێنە، هەناسەیەکی قوڵمان هەڵکێشا. کورسیە تایەدارەکەی ویلم برد بۆ بەشی سەرداپۆشراو کە نزیکی شوێنی بنەڕەتی بوو. کاتێك نیتن سەرقاڵبوو خواردنەوەی بە ویل دەدا، منیش بە هەلم زانی و سەیرێکی تەماشاچیەکانم کرد.

لەڕاسەرمانەوە و لەسەر بەلەکۆنی شوشەیی، پیاوانی چاکەتوپانتۆڵ لەپێی، خواردنەوەیان پێشکەشی ئەو ژنانە دەکرد کە جلوبەرگی شیك و جوانیان لەبەردابوو. گەرم و خۆمانە دەهاتنە پێشچاو. گومانم دەبرد لەوانەیە شوێنێکی تایبەت بێت. لەناو کوشکی بلیت فرۆشییەکەداو لەناو فەهرستی نرخەکاندا، ئەمجۆرە شوێنە گرانبەهایەم بینیبوو. ئارمی سوری سەر جلوبەرگەکانیان ئەوانی لە خەڵکانیتر جیادەکردەوە. حەزم دەکرد بزانم ئایا دەکرێت ئێمەیش ئارمە شینەکەمان بگۆڕین بە سور، بەڵام دواتر بیرم کردەوە ئێمە تەنها کەسانێکین کە بە کورسی تایەدارەوە هاتوین، هەر لەبەر ئەمەیە کە خۆ بەخۆ لە خەڵکیتر جیاوازین.

پەرداخی پلاستیکی نوشتاوەی قاوەو بوتڵی خاڵی ئاوو خواردنەوەکانیتر لەسەرانسەری شوێنی تەماشاچییەکانەوە پەرش و بڵاوبوبونەوە. پیاوانی بە چاکەت و پانتۆڵی خوری و ژنانیش بە جلوبەرگی مەتەری جوانی ئەپڵدارەوە لە هەموو شوێنێکدا دەبینران. بەڵام ڕواڵەتیان

ئاسایی بوو وەك ئێمە ئارمی شینیان هەبوو. دەوروبەری سیاجی نمایشەکە کۆمەڵێك پیاو بەکراسی خەت خەتی ئاسۆییەوە وەستابون و وادیاربوو لە سەفەری گەشتیاریدا بوون. سەرەتاشراوەکانیان ئەوەی نیشانددەدا کە سەربازین. لەوانەیە بیانەوێت جارجارێك نەشید و سرود بڵێن یان هات و هاوار وەرێبخەن، تەنانەت لەوانەبوو پێکدادانی فیزیکی ڕوو بدات. سەرەتاشراوەکانیان لەیەکتری دەدا یان دەستیان دەکردە ملی یەکترییەوە. کاتێك ویستم بڕۆم بۆ توالیت فیکەیان لێدا و منیش دەستم گرت بە پشتی سەرمەوە و جرتێکم بۆ لێدان. دواتر ئاگایان لە خۆیان نەماو سەرنجیان دایە ئەو حەوت هەشت ئەسپەی کە لە تەنیشت یەکەوە وەستابوون. هەموویان بەیەکجار بێدەنگبون و لەناو شوێنی تەماشاچییەکاندا هێور بونەوە.

کاتێك ئەسپەکان لە دەروازەی دەستپێکردنی پێشبڕکێکەوە تێپەڕین. هاواری گروپێکی بچوك کە لەتەنیشتمانەوە بون بەرز بوویەوە و منیش لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم. وەستام و سەیری ئەسپەکانم دەکرد کە غارییان دەدا. مات و بێدەنگ بۆ خۆم دانیشتبوم. ئەو شەپۆڵە هەیەجانییەی کە لەدوای ئەوانەوە بەڕێکەوت، کپ نەدەبویەوە، جۆش و خرۆشی پڕ لە شادی و خۆشی تەماشاچییەکان، ئەسپسوارەکانی کە بۆ بەدەستهێنانی پلەی بەرز ڕکابەرییان دەکرد، خستبویە جۆش و خرۆشەوە.

کاتێك براوە لە هێڵی کۆتایی تێپەڕی، گونجاو نەبوو کە مرۆڤ بێدەنگ بێت و هەستەکانی ئاشکرا نەکات و هاوارو هۆو هۆو نەکات.

سەیری (جامی سیستروود)مان دەکرد، دواتریش چوین بۆ (گۆڕەپانی ستیکن). نیتن لە گرەوەکەدا شەش پاوەندی بردەوە. بەڵام ویل بەشداری لە گرەوکردنەکەدا نەکرد. بێدەنگ و خامۆش. سەیری هەموو پێشبڕکێکانی کرد. سەری لەناو یەخەی درێژی چاکەتەکەیەوە بردبویە خوارەوە. بیرم کردەوە و لەبەرخۆمەوە گوتم لەوانەیە کاتێکی زۆر بێت کە نەهاتوەتە دەرەوە، هەر بۆیە هەموو شتێك کەمێك بەلایەوە نامۆیە. بەهەرحاڵ دەمزانی هەرگیز ئاگاداری ناخ و دەرونی نابم و نازانم چی لە دڵیدا دەگوزەرێت.

—دەبێت سەیری چەند پێشبڕکێ بکەیت تاوەکو بێخەم بین کە ئارەزوی دێرینت بەدی هاتووە؟

من گوتم:

—ئەوەندە خراپ مەبە. دەڵێن دەبێت هەموو شتێك یەکجار تاقیبکەیتەوە.

—بەلاّم بە بڕوای من، سەیرکردنی ئەسپسواری وەك بەشێکە لە (سەمای موریس)[14] و داوێنپیسی(زینا) لەگەڵ مەحرەمەکاندا، کە نابێت یەکجاریش تاقیبکرێتەوە.

منیش وەلاّمدایەوە:

—تۆ یەکێکیت لەو کەسانەی کە هەمیشە بەمن دەڵێیت دەبێت ئاسۆی بیرکردنەوەم زیاتر بکەم. خۆیشت کە حەزت لێیەتی، ئیتر وا خۆت نیشان مەدە..!

دواتر غارییاندا. کراسی (مان ئۆ مان) ئەرخەوانی بوو بە ئەڵماسی زەرد. دەمبینی بە خێراییەکی تەواوەوە بەدەوری خەتە سپییەکەدا ڕادەکات. سەری ئەسپەکە بەرزتر بوبویەوە، قاچەکانی سوارەکە بەرزو نزمیان دەکرد، دەستەکانیشی لەلای گەردنی ئەسپەکەوە بەرودوایان دەکرد.

نیتن بە پیچەوانەی حەزو ئارەزوی خۆیەوە چویە ناو گۆڕەپانەکە:

—هاوڕێ خێراتر.

توند دەستی نوقاندبوو. سەیری گروپی دیارینەکراوی ئەسپەکانی دەکرد کە لەبەشی دوورتری گۆڕەپانەکەوە غارییاندەدا. من هاوارم کرد:

—(مان ئۆ مان) خێراکە. گرەوم لەسەر کردویت بۆ ئەوەی ئستیك بخۆین.

سەیرم دەکرد کە چۆن هەوڵی دەدا پێشبکەوێت، بەلاّم نەیدەتوانی. کونە لوتی کرابویەوە و گوێکانی ڕویانکردبویە دواوە، هەستم دەکرد دڵم هاتوەتە ناو دەممەوە. کاتێك گەیشتنە (فرلانگ)[15]ی کۆتایی هات و هاوارەکانم بەرەو کپ بوونەوە ڕۆیشتن و نیوە بێدەنگێك بووم.

—زۆر باشە، قاوە، بە قاوەیش ڕازیم.

شوێنی تەماشاچی و خەڵکەکە لەتاو هات و هاواردا تەقییەوە. دوو کورسی لەولاتری ئێمەوە، کچێك هەڵبەزو دابەزی دەکرد. ئەوەندە هاواری کردبوو، دەنگی گیرابوو نوزەی دەهات. دەبینم خۆیشم لەسەر جێگەکەم هەڵبەزودابەز دەکەم. دواتر سەرم داخست و دەبینم ویل چاوەکانی داخستووە، چرچێکی نەرم لەسەر برۆکانیەتی. ئاگام لە گۆڕەپانەکە نەماو چۆکمدادا.

—ویل، تۆ باشی؟

---

[14] جۆرێکە لە سەمای ئینگلیزی.

[15] یەکەیەکی درێژییە کە بەرابەرە بە ١٢٠ مەتر.

چومە پێشترەوە.

—شتێکت پێویستە؟

وەڵامیدایەوە:

—ئیسکاچ، گەورەکەی.

چاوەکانی رووکردە لای من. بێحاڵ دەهاتە پێشچاو. بە نیتنم گوت:

—وەرە با برۆین و نان بخۆین.

(مان تۆ مان) ئەو چوارپێ فێڵبازە، لە هێڵی کۆتایی تێپەڕی و بۆ بێ شانسی من بوویە شەشەم. دووبارە هات و هاواری شادی و خۆشی بەرز بوویەوە، دەنگی بڵنگۆکە هاتەبەرگوێ: بەڕێزان (لاوبی ئیلیدی) پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، (ڤینرسان) پلەی دووەم، (برنی رایل) بویە خاوەنی پلەی سێیەم.

لەناو قەرەباڵغیەکەدا کورسییەکەم بەرەوپێشەوە پاڵپێوەنا. کاتێك دەمبینی کە ئاگایان لە دووەمین بێزەحمەت و ببورەی من نییە، منیش بە ئەنقەست کورسییە تایەدارەکەم دەکێشا بە قاچیاندا.

کاتێك سواری ئاسانسۆرەکە بوین دەنگی ویل هاتە بەرگوێ:

—باشە، کلارك. کەواتە ئێستە تۆ چل پاوەند قەرزداری منی؟

***

ریستورانەکە نۆژەن کرابویەوە. ئێستە خواردنەکانی بەدەستی چێشتلێنەرێکی شارەزا لیدەنران کە دەموچاوی لە وێنەکەدا بە پۆستەرەکانی چواردەوری پێشبڕکێکە داپۆشرابوو. پێشتر لیست و فەهرستی خواردنەکانمان هەڵسەنگاندبوو. بە هەردوکیانم گوت:

—خواردنی تایبەتیان مراوییە بە ساسی لیمۆوە. بە شێوازی دەیەی حەفتاکان.

ویل گوتی:

—رێك وەك جلوبەرگەکەی تۆ.

ئێستە ئیتر لەناو هەوای سارد و لەنێو قەرەباڵغییەکەدا نەبوین، رۆحییەتی کەمێك باشتر بوبو. لەناو لاکی خۆیدا هاتبویە دەرەوە و وردە وردە سەرنجی دەدایە دەوروبەرەکانی، ئێستە کە دەچوین بۆ ئەوەی خواردنی گەرم و خۆش بخۆین، سکم قۆڕەقۆڕی دەکرد. دایکی ویل هەشتا پاوەندی پێدابوین. بڕیارمدابوو پارەی نانی نیوەڕۆ خۆم بیدەم. وەسڵی ریستورانەکەم

نیشانیدەدا. هەربۆیە حەزم لە هەر خواردنێك بوایە دەمتوانی داوای بكەم، مراوی بەتەنور، یان هەرشتێكیتر.

گوتم:

—نیتن، زیاتر حەزت لەوەیە كە لەدەرەوە نان بخۆیت؟

وەلامیدایەوە:

—من زیاتر خۆراك دەكڕم و دەیبەمەوە ماڵەوە دەیخۆم. بەلاّم ئەمڕۆكە زۆر خۆشحاڵم كە لەناو ڕیستوراندا نان دەخۆم.

پرسیارم لە ویل كرد:

—كۆتاجار كەی بوو كە لەدەرەوە نانت خوارد؟

ئەوو نیتن سەیرێكی یەكتریان كرد. نیتن گوتی:

—لەوكاتەوە من هاتوم نەچوەتە دەرەوە.

—حەزناكەم لەبەرچاوی خەڵكی غەریبە كەوچكی چێشت بكەن بە دەممەوە.

گوتم:

—كەوابوو مێزێك هەڵدەبژێرین كە ڕووی لەخەڵكەكە نەبێت.

خۆم چاوەڕوانی ئەوەم دەكرد.

—ئەگەر كەسێكی بەناوبانگیش هات، ئەوكات خۆت زەرەر دەكەیت.

—لەبەر ئەوەی لە مانگی مارسدا كە نۆرەی پێشبڕكێی گۆڕەپانی خۆڵە، خەڵكانێكی بەناوبانگی زۆر دێن بۆ ئێرە!

دەرگای ئاسانسۆرەكە كرایەوە، گوتم:

—ویل ترینەر، خۆ خواردن ناكەیتە قوزەڵقورتم. كۆتاجار كە لە ڕیستوراندا نانم خوارد، ئاهەنگی لەدایكبونی منداڵێكی چوارساڵان بوو، لەناو هۆڵی بولینگی هیلزبریدا، هەموو خواردنەكانیشی هەویركاری بوو. ئەویش لەگەڵ كۆمەڵێك منداڵدا.

چوینە ناو ڕێڕەوێكی فەرشڕێژكراوەوە. ڕیستورانەكە لەولاكەیتری ڕێڕەوەكەوە بوو، لەپشتی دیوارێكی شوشەییەوە. لەناو ڕیستورانەكەدا كۆمەڵێك مێزی خاڵی هەبوون و كەسیان لەسەر دانەنیشتبوو. چوم بۆ بەشی داواكردنی خواردن و گوتم:

—سلاّو، بێزەحمەت مێزێكمان دەوێت بۆ سێ كەس.

لەژێر لێوەوە بە ژنەکەم گوت:

—بێزەحمەت سەیری ئەو مەکەن. پێی ناخۆشە. ئەمانەوێت دڵخۆش و شادومان بێت.

گوتی:

—بێزەحمەت با لۆگۆکەتان ببینم.

—ببورن تێنەگەیشتم.

— لۆگۆو ئارمی تایبەتتان.

واقم بە ژنەکەدا وڕما.

—ئەم ڕیستورانە تایبەتە بەوانەی کە ئارمی تایبەتیان هەیە.

لامکردەوە و سەیرێکی نیتن و ویلم کرد. دەنگی منیان نەدەبیست. هەروا چاوەڕوان بوون. نیتن خەریکبوو چاکەتەکەی ویلی دادەکەند.

—باشە، من نەمدەزانی کە ناتوانین لێرە نان بخۆین. ئێمە ئارمی شینمان هەیە.

ژنەکەیش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

—بەداخەوە تەنها خاوەنانی ئارم و لۆگۆی سوری تایبەت دەتوانن سود لەم ڕیستورانە وەربگرن. لەناو ئاگاداری و ڕیکلامەکانماندا نوسراوە.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.

—کێشە نییە، ڕیستورانێکیتر هەیە؟

—بەداخەوە ئێستە سەرقاڵی نۆژەنکردنەوەی ڕیستورانی (ڤیگینگ ڕووم)ن کە بۆ هەموانە، بەڵام لە دەرەوە کۆمەڵێك خواردنگە هەیە کە دەتوانن شتێك بکڕن و بیخۆن.

کاتێك بینی قیافەم چویەوە ناو یەك، لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—(پیگ ئین ئیپورك) شوێنێکی زۆر باشە. دەتوانن داوای ساندەویچ و هەمبەرگر بە ساسی سێو بکەن.

—کوشکەکە هی ساندەویچ فرۆشییەکەیە؟

—بەڵێ.

خۆم چەماندەوە بەرەو پێشەوە و گوتم:

—تکایە شتێکمان بۆ بکەن. لە ڕێگەی دورەوە هاتوین. هەوای دەرەوە زۆر ساردە، هاوڕێکەم سەرمای دەبێت. ڕێگەیەك هەیە کە بتوانین لێرەدا نان بخۆین؟ ئێمە دەبێت ناوبراو

لەکەشوهەوایەکی گەرمدا دابنێین. دەبێت کارێك بکەین ئەمڕۆی بە خۆشی و شادومانی بەسەر بەرێت.

چرچێکی خستە لوتییەوە.

—ئەمە لەدەرەوەی دەسەڵاتی مندایە. ڕێگەی ئەوەم پێنەدراوە. بەڵام قاتی خوارەوە بەشێکی تایبەت هەیە بە توانا ویستان، دەتوانن دەرگاکەی دابخەن. هەرچەندە ناڕوانێتە گۆڕەپانی پێشبڕکێکە، بەڵام گەرم و خۆشە.

سەیرێکی ژنەکەم کرد. جوڵەی فشاری عەسەبیم لە قاچەکانمدا هەستپێکرد. سەیری ئارم و لۆگۆکەی سەر سنگیم کرد. ناوی شارون بوو. گوتم:

—شارون، ئەم هەموو مێزە خاڵییە. خۆ باشتر وایە مێزەکان پڕ ببنەوە تاوەکو نیوەیان خاڵیبن، ئەوەش تەنها لەبەر یاسایەکی نهێنی چینایەتی ناو ڕێنماییەکان..!

دەموچاوە دەمبەخەندەکەی لەژێر ڕوناکییەکەدا دەدرەوشایەوە.

—خاتوون بارودۆخەکەم بۆ ڕوونکردنەوە. ئەگەر ڕێگە بە ئێوە بدەین، ئەوا دەبێت مۆڵەتیش بە خەڵکیتر بدەین.

—ئەمڕۆ دووشەمەیە، کەشوهەواکەیش باراناوییە. خۆ موشتەرییەکی زۆریشتان نییە. مێزەکانیش خاڵین .

داوای خواردنێکی تەواو دەکەین، کامەی زۆر گرانە. بە هەمووتێچوەکانییەوە. نامانەوێت قەپ لە ساندەویچ بگرین، یان لە ناو ژوری خۆگۆڕینەکەدا دابنیشین کە هیچ شوێنێکی لێوەدیار نەبێت. هیچ گرنگ نییە کە گەرم و خۆش بێت.

موشتەرییەکان ئاوڕیاندابویەوە بۆلامان و قسەوباسەکانی ئێمە سەرنجی ڕاکێشابون. ویلم دەبینی کە زۆر شڵەژاوە. ئەوو نیتن زانیبویان کە کێشەیەك هەیە.

—ئێوە دەبوایە لۆگۆی تایبەتتان بکڕیایە.

—زۆر باشە.

دەستم کرد بەناو جانتاکەمدا و بەشوێن کیفی پارەکانمدا گەڕام.

—چەند دەکات؟

کلێنس و بلیتی پاس و یەکێك لە لەعابەکانی توماس هاتن بە دەستمەوە. گرنگییەکی ئەوتۆم پێنەدا. تەنها ئەمویس ویل لە ڕیستورانێکی پێشکەوتودا خواردنێکی شاهانە بخوات.

—چەند دەکات؟ دە پاوەند، بیست پاوەند؟

یەك بەستە پارەم بەرەو ڕوی گرت.

سەیری دەستی کردم.

—شەرمەزارم، ئێمە ئارم و لۆگۆ نافرۆشین. ئێرە ڕیستورانە. دەبێت بگەڕێیتەوە و لە لای بلیت فرۆشەکە بیکڕیت.

—ئەو بلیت فرۆشییەی کە لەولای گۆڕەپانی پێشبڕکێکەوەیە.

—بەڵێ.

سەیری یەکتریمان کرد. دەنگی ویل هاتە بەرگوێ:

—لوئیزا وەرە با بڕۆین.

ساتێك هەستم کرد کە چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك. گوتم:

—نەخێر، ناکرێت. ئەم هەموو ڕێگەیەما بڕیوە. تۆ لێرە بمێنەرەوە. من دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی لۆگۆی تایبەت بکڕم، دواتر نان دەخۆین.

—لوئیزا، برسیم نییە.

—هەرکە نان بخۆین دێینەوە سەرخۆمان. دەتوانین سەیری ئەسپەکان و زۆرێك لە شتەکانیتر بکەین. کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین.

نیتن هاتە پێشەوە دەستی خستە سەردەستم.

—لوئیزا وابزنم ویل بەڕاستی ئەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

ئێستە ئیتر بوبوینە ناوەندی سەرنجی هەموو دانیشتوانی ڕیستورانەکە. موشتەرییەکان بە نیگاکانیان بەتەواوەتی لە ئێمە وردبوبونەوە. نیگاکانیان لە منەوە دەچوو بۆ ویل، بە بینی ویل هەستیان بە بەزەیی و لەوانەیشە نەفرەت دەکرد. زۆر بەتوندی هەستم بە شکست دەکرد. واقم بە ژنەکەدا وڕمابوو. بەلایەنی کەمەوە کە ئێستە ویل هاتبویە ناو قسەکانەوە، ژنەکە ئەوەندە ئەدەبی هەبوو کە قیافەیەکی شەرمەندە لە خۆی نیشانبدات.

بە ژنەکەم گوت:

—باشە، سوپاس بۆ ئێوە، سوپاس بۆ ئەو هەموو یارمەتیەی کە پێشکەشت کردین.

—کلارك...

ئاوازی دەنگەکەی ویل ئاگادارکەرەوە بوو.

–سوپاست دەکەم هێندە بەدەممانەوە بویت، بەدڵنیاییەوە ڕیستورانەکەتان بە هاوڕێ و ناسراوەکانم دەناسێنم و پێیاندەڵێم کە سەردانتان بکەن... !

–لوئیزا.. !

جانتاکەم لەسەر مێزی بەردەم ژنەکە هەڵگرت و خستمە بندەستم.

کاتێك خەریکبوم لەو دەرگایەوە کە نیتن بۆی کردبومەوە تێدەپەڕیم. دەنگی ژنەکەم بیست.

–هاوڕێکەتان بیر چووە.

بەشوێن ئەواندا چومە ناو ئاسانسۆرەکەوە. گوتم:

باشە بۆچی دەبێت ئەم ئارم و لۆگۆ نەفرەتییە تایبەتەیان بوێت؟

چوینە خوارەوە، کەس قسەی نەدەکرد. لەوماوە کەمەدا کە لەناو ئاسانسۆرەکەدا بوین، زۆرم لە خۆم دەکرد کە ڕێگری لە لەرزینی دەستم بکەم.

***

داوای سێ ساندەویچمان کرد، بە ساسی سێوو باڵی برژاوی مریشکەوە. لەژێر کەپرۆکە لارولەوێرەکەی بەردەم دوکانی ساندەویچەکەدا وەستاین و دەستمانکردە خواردن. من لەسەر سەتڵێکی بچوکی زبڵ دانیشتم و هاتمە ئاستی کورسییەکەی ویل، یارمەتیمدا بۆ ئەوەی ساندەویچەکە بخوات. ئەگەر پێویستبوایە ئەوا بەدەست بۆم دەکردە پارو. دوو ژن لەناو دوکانی ساندەویچەکەدا بوون و وایان نیشاندەدا کە ئاگایان لە ئێمە نییە. بەڵام ئاگام لێبوو کە لەژێرچاوەوە سەیری ویلیان دەکرد. هەندێکاتیش کە وایاندەزانی ئاگامان لێیان نییە، لەبەر خۆیانەوە قسەیان دەکرد: (پیاوی داماو). ئەوەشم دەبیست کە دەیانگوت (چ ژیانێکی سەختی هەیە !). هەوڵم دەدا بیر لەو هەستە نەکەمەوە کە لەو کاتەدا ویل دەتوانێت هەیبێت.

بارانەکە وەستابویەوە. گۆڕەپانی پێشبڕکێکەیش کە باوباران تێیدا شەپۆلی دەدا، کتوپڕ بە دلگیرو بێ گیان دەهاتە پێشچاو، سیاجی قاوەیی و سەوزی گۆڕەپانەکە بەهۆی پارچە کاغەزەکانی گرەوکردنەوە پەرش و بڵاوو شپرزە بوبو، هێڵی ئاسۆیی گۆڕەپانەکە خاڵی بوو. بارانەکە بوبویە هۆی ئەوەی کە گەراجەکە چۆڵ ببێت. بەڵام هێشتا دەنگی بڵنگۆکە لە دورەوە دەهات کە دەستپێکردنی پێشبرکێی دواتری ڕادەگەیاند.

نیتن هەروا کە خەریکبوو دەمی خۆی دەسڕی، گوتی:

—وابزانم ئیتر دەبێت بگەڕێینەوە. مەبەستم ئەوەیە کاتێکی خۆشمان بەسەر برد. بەڵام باشتر وایە زوو بڕۆین و نەکەوینە ناو ترافیکەوە.

دواترو لەوکاتەدا کە کورسییەتایەدارەکەی لەناو چیمەنەکەدا خستە جوڵە، یەکێك لەو دوو ژنە گوتی:

—خۆش نەبوو بەلایەوە؟

پاشماوەی ساندەویچەکەم خستە ناو سەتڵەکەوە و گوتم:

—نازانم، ئەگەر مرۆڤە فزولەکان لێرە نەبونایە کە چاوی تێببڕن، لەوانەیە زیاتر پێی خۆش بوایە...!

هێنانەخوارەوە و ڕێککردنی ڕەمپا لارەکە و سواربونی ئۆتۆمبیلەکە بەدەم کارێکی ئاسان بوو. لە چەند کاتژمێری ڕابوردودا، هاتوچۆی ئۆتۆمبیلەکان گەراجەکەیان وەك دەیمەنێك لە قوڕو لیتە لێکردبوو. سەرەڕای هێزی زۆری نیتن و شان و بازوڵە بەهێزەکانی منیش، تەنانەت نەمانتوانی کورسییەتایەدارەکە تاوەکو نیوەی ڕێگاکەو بەسەر چیمەنەکەدا ببەین. تایەکانی دەخلیسکان و دەنگێکی بێزارکەریان لێوەدەهات. نەماندەتوانی کورسییە تایەدارەکە لە ڕێگەیەکەوە ببەین کە بتوانین بەرەوپێشەوەی بەرین. قاچی من و نیتن لەناو قوڕەکەدا دەخلیسکا. هەموو پێڵاوەکانمان قوڕاوی بوبون. ویل گوتی:

—ئیتر نایەم بۆ ئێرە.

نیتن گوتی:

—وابزانم پێویستمان بە یارمەتییە. تەنانەت ناتوانم بیگێڕمەوە. چەقیوە. ویل بەدەنگی بەرز ئاهێکی هەڵکێشا، تاوەکو ئێستە ناوبراوم بەو شێوە بێ دڵ و دەماخە نەبینیبو.

—ویل، ئەگەر بمتوانیایە کەمێك بەرەو دواوە لاری بکەمەوە، ئەوکات دەمتوانی بەرزت بکەمەوە و بتخەمە سەر بەشی پێشەوەی کورسییەکە. دواتر لەوانەیە من و لو بتوانین کورسییەکە بەرز بکەینەوە و بیخەینە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە.

دەنگی ویل لەنێوان ددانە جیڕکردوەکانیدا بیسترا:

—نامەوێت کارم بگاتە لای ئاگرکوژێنەوە.

نیتن گوتی:

–هاوڕێ گیان شەرمەزارین، بەڵام من و لو توانای ئەمکارەمان نییە. لو تۆ لەمن باشتر دەزانی. بڕۆ یارمەتی بهێنە، دەڕۆیت؟

ویل چاوەکانی داخست و ئیتر هیچی نەگوت.

***

من بەگشتی لەگەڵ خەڵکانی نامۆو غەریبەدا مورتاح نەبووم. بەڵام ئەو فشارە عەسەبیەی کە لەوکاتەدا هەستم پێدەکرد، ترسی لەناخمدا نەهێشتبوو. لە گروپێکی تەماشاچییەوە چوم بۆ گروپێکیتر و چەند خولەکێك پیویستم بەیارمەتیان هەیە. ئەوانیش بەجۆرێك سەیری خۆم و جلوبەرگەکانیان دەکردم هەروەك بڵێی تەڵەو داوم بۆ دانابن. دەیانگوت (چاوەڕوانی پێشبڕکێی دواترین!)، یان (ببورە شەرمەزارین)، یان دەبێت تاوەکو سەعات دوونیو بوەستیت).

تەنانەت چوم بۆلای ئەسپسوارەکانیش، بەلا دەبینم جەستەیان لەمن بچوکترە. کاتێك چوم بۆناو گۆڕەپانی پێشبڕکێکە، بەهۆی ئەو تورەییەوە کە هەموو بوون و وجودی گرتبومەوە، ئاگرم تێبەربوبو. وابزانم بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین هاوارم بەسەر خەڵکیدا دەکرد. تا ئەوەبوو خۆشبەختانە لەگەڵ ئەو گروپەی کە کراسی خەت خەتی ئاسۆییان لەبەرکردبوو ڕوبەڕوبومەوە. لەپشتی کراسەکانیانەوە نوسرابوو (کۆتا پایەداری مارکی). کاتێك نزیکیان بومەوە هەلهەلەیان بەئاسماندا بەرز دەبویەوە. دودڵ بووم کە دووبارە جرتێکیان بۆ لێبدەم. یەکێك بەدەست کێشای بەسەرشانمدا و بنێشتی لەدەمدا بوو بە قەوچەقەوچ گوتی:

–ئازیزەکەم زەردەخەنە بکە، ڕۆژی کۆتایی پشووەکانی مارکییە!

هەوڵمدا بەبێ ئەوەی کە خۆم بدۆڕێنم وەڵامبدەمەوە.

–ئەمڕۆ دوو شەممەیە.

–گاڵتە مەکە. نە بابە. ئەمڕۆ دووشەممەیە؟

–بەڵێ، هاتوم بۆ ئەوەی داوای یارمەتیتان لێبکەم.

–بچکۆلە هەرچەندێك کە بتەوێت یارمەتیت دەدەم.

دواتریش چاوێکی داگرت.

هاوڕێکانیشی وەك ڕووەکە شینەکان لەدەوروبەریدا دەجولانەوە.

–ئەمەوێت یارمەتی هاوڕێکەم بدەن. لەناو گەراجەکەدایە.

–بچکۆلە، شەرمەزارم، شەرمەزارم، باوەڕناکەم بتوانم یارمەتیت بدەم.

—پێشبڕکێی دواتر دەستپێکردوە، مارکی، تۆ گرەوت لەسەر کردووە؟ وابزانم من کردبێتم.

ئاوڕپیاندایەوە بەرەو لای گۆڕەپانەکەو سەرنجیان بەرەو ئەوێ بوو. سەیرێکی دواوەی خۆمم کرد. جەستەی گرمۆڵەی ویلم بینی، نیتنیش دەسکی کورسییەکەی ڕادەکێشا، بەڵام بێ سود بوو.

لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە بە دایکوباوکی ویل دەڵێم کورسییە تایەدارە گرانبەهاکەی ویلمان لەناو گەراجەکەدا بەجێهێشتوە هاتوینەتەوە. دواتر چاوم کەوت بەو خاڵانەی کە یاریزانەکان کوتابویان، بە دەنگی بەرز گوتم:

—سەربازە، پێشتر سەرباز بووە.

یەك لەدوای یەك ئاوڕیپیاندایەوە.

—لەناو عێراقدا بریندار بووە. تەنها ئەمانویست ئەمڕۆکە بەخۆشی بیگوزەرێنێت، بەڵام ئەوەتا کەس یارمەتیمان نادات.

هەروا کە قسەم دەکرد چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك.

—لەکوێیە؟

—لەناو گەراجەکەدایە. چوم بۆلای زۆر کەس و داوای یارمەتیم لێکردن، بەڵام کەس بایەخی پێنەدام.

—کوڕینە وەرن.

هەمویان بە شوێنمدا هاتن. کاتێك گەیشتینە لایان، نیتن لەتەنیشت ویلەوە وەستابوو. لەگەڵ ئەوە کە نیتن بەتانییەکی تری دابوو بەسەرشانی ویلدا، بەڵام ویل لەبەر زۆری سەرماکە سەری تاوەکو بنی چاکەتەکەی کردبویەوە بەناودا، گوتم:

—ئەم جوامێرە گوڵانە هاتوون یارمەتیمان بدەن.

یەکێکیان گوتی:

—دەتانەوێت بۆ کوێی بەرن؟

ئەوانیتریش دەوری ویلیان گرت و بۆ قارەمانەکەیان سەریان ڕادەوەشاند. یەکێکیان بە بوتڵێك خواردنەوە خوڵکی ویلی کرد، هەروەك بڵێی نەیزانیبوو کە ویل ناتوانێت بەدەستەکانی هیچ شتێك بگرێت. نیتن ئاماژەی بە ئۆتۆمبیلەکە کرد.

–دەبێت بگێڕینەوە بۆناو ئۆتۆمبیلەکە. بەڵام سەرەتا دەبێت بیبەین بۆ شوێنی تەماشاچییەکان و دواتر سەیارەکە بەبەگ بهێنم.

یەکێکیان گوتی:

–پێویست بەوە ناکات.

دەستێکی خستە سەرشانی نیتن و گوتی:

–ئێمە خۆمان دەیبەین، ئەی وانییە کوڕینە؟

هەمویان بەیەکەوە گوتیان بەڵێ. دواتر دەوری کورسییە تایەدارەکەی ویلیان گرت و بەرزیان کردەوە. هەستم بە ناڕەحەتی کرد، بوێریم دایە بەرخۆم گوتم:

–ئەگەر بتانەوێت بەرزی بکەنەوە و بیبەن، ماندودەبن، چونکە ڕێگەکەی دورودرێژە و کورسییە تایەدارەکەیش زۆر قورسە.

بەڵام هەمویان خراپ مەست بوبون.

–بچکۆلە خەمت نەبێت. ئامادەین لەپێناو سەربازەکاندا گیانیشمان بەخت بکەین، ئەی وانییە کوڕینە؟

–هاوڕێ گیان ناتوانین لێرە وازت لێبهێنین. ئێمە هیچکاتێك پیاوێك بەتەنیا بەجێناهێڵین و ناڕۆین.

بە بینینی قیافەی شپرزەی نیتن، بەتوندی سەرم ڕاوەشاند. وادیاربوو ویل حەوسەڵەی قسەکردنی نەبوو. تورە بوبو قیافەیەکی ڕوگرژی لەخۆ گرتبوو، بەڵام دواتر کاتێك گەنجەکان دەوری کورسییە تایەدارەکەیان گرت و بەیەك هاواری توند بەرزیان کردەوە. کەمێك ترسا.

–بچکۆلە لەکامە یەکەدا خزمەتی سەربازی دەکرد؟

زۆرم لەخۆم کرد کە زەردەخەنە بکەم. لەناو بیرو زەینمدا بەشوێن ناوێکدا دەگەڕام.

–یەکەی چەکدار، یەکەی یازدەیەم.

یەکێکیان گوتی:

–نازانم کامەیە.

دەمم کەوتە تەتەڵە کردن:

یەکەیەکی نوێیەو...، نهێنی و.... لەناو عێراقدایە.

پێڵاوە وەرزشییەکانیان چەقیبون بەناو قوڕەکەدا. وامزانی ناوکم بەربویەوە. کورسییەتایەدارەکەی ویل چەند بستێك لەزەوییەوە بەرز بوو. هەروەك دارەمەیت. نیتن لەپێشەوە دەڕۆیشت بۆ ئەوەی دەرگای سەیارەکەیان بۆ بکاتەوە.

—لەناو کاتریمدا فێرکارییان بینیوە؟

گوتم:

—یەکێکیان بوو.

دواتر بابەتەکەم گۆڕی.

—باشە کامەتان ژنی هەیە؟

ژمارەمان بەیەکتریدا و لە کۆتاییدا لەدەستی مارکی و هاوڕێکانی ڕزگارمان بوو. دەستیانکرد بەناو گیرفانیاندا و نزیکەی چل پاوەندیان کۆکردەوە بۆ ئەوەی لە تواناویستی ویلدا خەرجی بکەین. تەنها کەمێك لەوێ بوون کە من گوتم خۆشحاڵ دەبین ئەگەر لەلایەن ئێمەوە خۆیان بانگهێشتی میوانی بکەن. ناچاربوم ماڵئاوایی لە یەك بەیەکیان بکەم. کاتی دەستوموشتاق تەواو بوو شتێکی نەمابوو بێهۆش ببم. ئەوەندە دەستم بۆ ڕاوەشاندن تاوەکو لە شوێنی تەماشاچییەکانەوە وونبون. نیتن هۆڕێنی بۆ لێدام تاوەکو سواری ئۆتۆمبیلەکە ببم.

هەروا کە خەریکبوم سەیارەکەم ئیش پێدەکرد، بە شادییەوە گوتم:

—یارمەتییەکی زۆریاندااین.

ویل گوتی:

—هەموو بوتڵی خواردنەوەکەی ئەو باڵابەرزەیان ڕژا بەسەر قاچی ڕاستمدا. بۆنی دێت.

نیتن گوتی:

—نەخێر بۆنی نایەت.

کاتێك لە دەرگای هاتنەژورەوەی سەرەکی دەردەچوین، نیتن گوتی:

—ئێوە سەیرکەن، سەیری ئەوێ بکەن، گەراجی تواناویستەکان لەوێوەیە. هەمویشی قیرتاوە.

***

دەتوانم بڵێم ویل پاشماوەی ئەو ڕۆژە بێدەنگبوو. کاتێك نیتمان لەبەردەم ماڵەکەیدا دابەزاند، ماڵئاواییم لێکرد. بەڵام تاوەکو گەیشتینە ماڵەوە بەدرێژایی ڕێگاکە ویل هەر

بێدەنگبوو. ترافیکەکان کەمبوبونەوە و پلەی سەرماکەیش کەم بوبویەوەو کەمێك هەوا خۆش بوبو. لە کۆتاییدا ئۆتۆمبیلەکەم لە دەرەوەی ماڵەکەوە وەستاندو پارکم کرد.

ویلم لە سەیارەکە هێنایە خوارەوە و سواری کورسییە تایەدارە تایبەتەکەی ماڵەوەم کرد. خواردنەوەیەکی گەرمم بۆ هێنا. پێڵاو پانتۆڵەکەیم گۆڕی، پانتۆڵەکەی کە لەك و پەڵەی گرتبوو پیس بوبو، خستمە ناو جلشۆرەکەوە. دواتریش زۆپاکەم داگیرساند.

تەلەفیزیۆنم داگیرساند و پەردەکانم دادایەوە. کەشوهەوای ژورەکە زۆر گەرم و خۆش بوو. لەوانەیە بەبەراورد بەو هەوا ساردەی کە لە دەرەوە هەبوو کەمێك گەرماکەی زیاتر بوو. کاتێك لەناو ژوری دانیشتنەکەدا و لەپاڵ ویلدا دانیشتم و چایم هەڵقوڕاندەوە، تێگەیشتم کە یەك وشەیش قسەی نەکردووە. لەبەر ماندویەتی نەبوو، یان ئەیویست سەیری تەلەفیزیۆن بکات. نەیدەویست قسە لەگەڵ مندا بکات.

کاتێك بۆ جاری سێیەم سەبارەت بە بیرو بۆچونم لەبارەی هەواڵەکانی ناوچەکەوە هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا، گوتم:

—شتێك بووە؟

—کلارك تۆ بەمن بڵێ.

—چیت پێبڵێم؟

تۆ دەزانیت کە شتێك لەبارەی منەوە هەیە دەبێت بیزانی. خۆت بەمنی بڵێ.

سەیریم کرد، سەرئەنجام گوتم:

—ببورە. دەزانم ئەمڕۆکە بەوجۆرە نەبوو کە من دەمویست. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا باشبوو کە چوینە دەرەوە. بەڕاستی پێموابوو چێژو خۆشییەکی زۆری لێوەردەگریت.

دواتر لەسەری نەڕۆیشتم و هیچ قسەیەکم نەکرد. چونکە دەمزانی هەر لەو سەرەتایەوە بڕیاری دابوو خۆی بێتام بکات. ئەوەم پێنەگوت کە چ دەردەسەرییەکم چەشتوە تاوەکو بتوانم ڕۆژێکی خۆش و شادی بۆ ڕێکبخەم. ئەوەم پێنەگوت کە خۆیشی بەهیچ شێوەیەك هەوڵینەدا دڵشاد بێت، ئەوەم پێنەگوت کە ئەگەر بیهێشتایە ئەو لۆگۆ سورە بێمانایە بکرم، دەمانتوانی وەك مرۆڤ خواردنێکی ڕێکوپێکمان بخواردایەو کێشەکان لەبیر بچنەوە.

—ئەوەی کە چ بیرۆکەیەکم هەیە.

—چ بیرۆکەیەکت هەیە؟

-تۆیش لەگەڵ ئەوانیتردا هیچ جیاوازییەکت نییە.

-یانی چی؟

-کلارك ئەگەر کەمێك خۆت ماندوبکردایە پرسیارت بکردایە، ئەگەر خۆت ماندوبکردایە و سەبارەت بەم گەشتە بێمانایە پرسیارت لەمن بکردایە، ئەوا دەمگوت کە زۆر ڕقم لە ئەسپ و پێشبڕکێکەشیەتی. واتە هەمیشە ڕقم لێی بووە. بەڵام زەحمەتت نەدایە بەرخۆت و لێت نەپرسیم! خۆت بڕیارتدا کە حەزدەکەیت من چی بکەم. خۆت پێشکەوتیت و هەموو شتێکت ڕێکخست. تۆیش هەمان کارت کرد کە ئەوانیتر دەیکەن. تۆیش لەبری من بڕیارتدا..!

تفی دەمم قوتدایەوە.

-مەبەستم ئەوە نەبوو...

-بەڵام خۆ هەر ئەمکارەت ئەنجامدا....

کورسییەتایەدارەکەی خستە جوڵەو لەمن دوور کەوتەوە. لەپاش یەك دوو خولەك لە بێدەنگی تێگەیشتم کە من دۆڕاندم.

{١٢}

دەتوانم بەوردی پێتان بڵێم لە ژیانمدا لە چ ڕۆژێکەوە بوێری خۆمم لەدەستدا.

نزیکەی حەوت ساڵ لەمەوبەر بوو. ڕۆژەکانی مانگی ژوئییە کە گەرم بوون و جەستەی مرۆڤیان خاوو سست دەکردەوە. شەقامە باریکەکانی دەوروبەری قەلاّکە پڕ بوون لە گەشتیار. دەنگی ئەو هەنگاوانەی کە لەودەوروبەرەدا هاتوچویان بوو، دەنگی ئۆتۆمبیلە ساردەمەنی فرۆشەکان کە لەسەر تەپۆڵکەکە ڕیزیان بەستبوو. هەموو شوێنێکی پڕ کردبوو.

دایە گەورەم لەپاش ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشی، مانگی پێشوو کۆچی دوایی کردبوو. هاوینێکی خەمبار بوو. هەرکارێکمان دەکرد، خەم و پەژارە وازی لێنەدەهێناین، شەوق و خۆشی و شادی لەمن و خوشکەکەم تۆرابوو. تەنانەت نەچوین بۆ گەشت و گەڕانە هاوینەکانیشمان. دایکیشم زۆربەی ڕۆژەکان لەتەنیشت سنگی قاپشۆرەکەدا دەوەستا، هەموو کاتێکیش زۆری لە خۆی دەکرد کە فرمێسکەکانی نەڕژێنە خوارەوە. باوکیشم هەموو بەیانییەك بە قیافەیەکی جیدییەوە لەماڵەوە دەچوو بۆ سەرکارەکەی. چەند سەعاتێك دواتر و لەکاتێکدا کە دەموچاوی بەهۆی گەرماوە سوربوبویەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە و پێش ئەوەی کە نەچوایە بۆلای بەفرگرەکە و سەری بوتڵی ئاوەکە نەکاتەوە و تێر ئاو نەخواتەوە، تاقەتی قسەکردنی نەبوو. خوشکەکەیشم ساڵی یەکەمی زانکۆی تەواوکردبوو گەڕابویەوە ماڵەوە. شارە بچوکەکەی ئێمەش وەلاّمدەرەوەی تواناو لێهاتنەکانی ئەو نەبوو.

ئەوکات تەمەنم بیست ساڵان بوو. کەمتر لە سێ مانگ دواتر بوو کە پاتریکم ناسی. یەکێك لەو هاوینە بێوێنانە بوو کە ئازادییەکی تەواومان هەبوو، هیچ ئەرکێکی دارایمان لەسەر شان نەبوو، قەرزداری هیچ کەس و هیچ شتێك نەبوین. کارێکی وەرزیم هەبوو، هەموو ئەو ماوەیە ئارایشتم دەکر و پێلاّوی پاژنە بەرزم لەپێدەکرد.باوکیشم لێم تورە دەبوو تەنها ئەیویست سەر لەوکارەم دەربهێنێت.

ئەو ڕۆژانە، زۆر ئاسایی جلوبەرگم دەپۆشی. یان باشتر وایە بڵێم وەك كچەكانیتری شار جلوبەرگم لەبەر دەكرد. قژەكانم درێژ بوون و دەگەیشتنە سەرشانەكانم. پانتۆڵی ئەستوری لەبەن دروستكراوی نیلیم دەپۆشی لەگەڵ بلوزێكدا كە خۆم بەبینینی پێكەنینم دەهات. كاتێكی زۆرم لە برقەداركردنی لێوو ڕەشتنی چاوەكانمدا بە كلی ڕەش سەرف دەكرد. ڕواڵەتمان هیچ گرفتێكی تایبەتی نەبوو، بەڵام هەمیشە لەبەر نەبوونی چەوری ژێر پێست و ووشكی و درزەكانی سەر پێستمان هاوارو سكاڵامان بوو بۆڵەمان دەهات.

من كۆمەڵێك بیرۆكەم لە مێشكدا بوو، كارانێك بوون كە ئەمویست ئەنجامیانبدەم. یەكێك لەو كوڕانەی كە لە قوتابخانەدا دەمناسی چوبو بۆ گەشتی هەموو جیهان، كاتێك گەڕایەوە بەجۆرێك لە جۆرەكان نەدەتوانرا دەركی بكرێت و مرۆڤ لێی تێبگات و زۆر گۆڕدرابوو. هەروەك بڵێی هەر ئەو كوڕە شپرزە یازدە ساڵەیە نەبوو كە لە خولی زمانی فەرەنسیدا بە تف گلۆپی دەكرد و لە دەمی فرێیدەدایە دەرەوە. منیش لە كەللەیدام و لە فرینێكی هەرزان باییدا بۆ ئوسترالیا بلیتم كڕی و شوێنم گرت. بەشوێن كەسێكدا دەگەڕام بۆ ئەوەی لەم گەشتەدا هاوڕێیەتیم بكات. زۆر حەزم لەوە بوو كاتێك دەمبینی گەشتی جیهانی ئەو كوڕەی لە قوتابیەكانیتر جیاواز كردووە. هەروەك بڵێی ئیتر ئەومان نەدەناسی. شنەبای نەرم و نیانی دونیایەكی پان و بەرینتر لەناوبراوی دابوو، شتێك كە بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر سەرنجڕاكێش و خەڵەتێنەر بوو. سەرەڕای ئەمەش مرۆڤەكانی شار كە ئاگاداری ئاشكراو نهێنی یەكتری بوون، ئاگایان لە هەموو شتێكی من هەبوو. لەلایەكیتریشەوە، لەگەڵ ئەو خوشكەی كە من هەمبوو هەرگیز نەمدەتوانی خۆم دەربخەم.

ڕۆژی هەینی بوو. هەموو ڕۆژەكەم لەگەڵ ئەو كچانەی كە لەقوتابخانە دەمناسین لەناو گەراجێكدا كارم كردبوو بەسەر دەبرد. ئەركمان ئەوەبوو ڕێنمایی ئەوكەسانە بكەین كە سەردانی پێشانگای (هینری) دەكەن. پیشانگاكە لەناو قەڵاكەدا دەكرایەوە. هەموو ڕۆژەكەمان بە شادی و پێكەنینەوە بەسەر بردبوو، لەگەڵ خواردنەوە گازدارەكاندا كە لەبەر تیشكی سوتێنەری هەتاودا هەڵماندەقوڕاند. بورجەكەی قەڵاكە بەهۆی تیشك و ڕووناكی ئاسمانی شینەوە وەك بروسكە داگیرسابوو. باوەڕناكەم ئەو ڕۆژە هیچ گەشتیارێك هەبوبێت كە زەردەخەنەی بۆ من نەكردبێت. خەڵكی ناخودئاگا زەردەخەنەیان بەرامبەر بە گروپێك كچی شاد و دەمبەخەندە دەكرد. سیی پاوەند هەقدەستیان پێدەداین. ڕێكخەرانی پیشانگاكە

ئەوەندە لە کارەکەمان ڕازی بوون کە بۆ هەرکەسێکمان پێنج پاوەندی زیادەیان دەدا. ئێمەش لەگەڵ ئەو کوڕانەی کە لە گەراجی تەنیشت ناوەندی گەشتیارییەکەدا کاریان دەکرد، چوین بۆ قاوەخانەکە و ئاهەنگمان گێڕا. هەمویان بلوزی وەرزشی ڕەگبییان لەبەر کردبوو ڕوخۆش و قسەخۆش بوون. یەکێکیان ناوی (ئید) بوو، دوانیشیان خوێندکار بوون–لەبیرم نایەتەوە کە خوێندکاری کوێ بوون– ڕۆژانی پشو کارییان دەکرد و داهاتێکیان بۆ خۆیان پەیدا دەکرد. کۆتایی هەفتەکان پارەیان بەدەستدەهێنا، کاتێك پارەی ئێمەی کچەکان تەواو بوو، بەگیان و دڵ خواردنەوەیان بۆ ئەو کچانە دەکڕی کە شاد و سەرخۆش بوون و قژەکانیان ڕادەوەشاند و لەسەر ڕانیان دادەنیشتن و دەیانقیژاند و پێیاندەگوتن زۆر قۆزن و سەریان دەخستە سەریان و سەمایان لەگەڵدا دەکردن. ئەم کوڕانە بەزمانی بێگانە قسەیان دەکرد، باسی ئەو هاوینانەیان دەکرد کە لە ئەمریکای باشوردا بەسەریان بردبوو. گەشتیاری کۆڵەپشتی بوون کە گەشتیان کردبوو بۆ تایلەند و ئەیانویست پشووی هاوینەکەیان لەدەرەوەی وولات بەسەر بەرن. لەبیرمە ئەوکاتەی کە دانیشتبوین و گوێمان بۆ قسەکانیان گرتبوو دەمانخواردەوە. خوشکەکەم لەتەنیشت باخچەکەوە وەستابوو چاوەڕوانی دەکردم، هەمان ئەو باخچەیەی کە هەمیشە لەسەر چیمەن و گژو گیاکانی تەپاوتلمان دەدا. بەدڵنیاییەوە چاکەتێکی کڵاوداری کۆنەی لەبەر کردبوو ماکیاجیشی نەکردبوو. لەبیرم چوبویەوە کە بڕیاروایە ئەو ببینم. بەوم گوتبوو کە بەدایکوباوکم بڵێت دەچم بۆ گەشت و تاوەکو تەمەنی سیی ساڵی ناگەڕێمەوە. ئەم قسەیەم بە جۆرێك لە جۆرەکان بەپێکەنیناوی دەهاتە پێشچاو، خوشکەکەم برۆکانی بەرز کردبویەوە و چاوەکانی لە سەرسوڕماندا دەرپەڕیبون. بەجۆرێك کە هەروەك بڵێی من بێزارکەرترین مرۆڤی سەر ئەم زەوییە بم.

کاتێك (ڕودلاین) کردییە پشوو، هەمومان بەیەکەوە چوین بۆ داڵانی سەرداپۆشراوی هەزار سوچی قەڵاکە و دانیشتین. یەکێك لە هاوڕێکانمان بە هەزار زەحمەت توانیبوی لە دەروازەکەوە بێتە سەرەوە. لەپاش قسەو باسێکی زۆر و پێکەنین و گاڵتە و گەپ هەمومان بەرێکەوتین. دیسانەوە دەستمانکردەوە بە خواردنەوە. یەکێك لە هاوڕێکان حەشیشی دەرهێناو ئێمەش دەست بەدەست دەمانگەیاند بەیەکتری. لەبیرمە سەرم بەرزکردبویەوە و سەیری ئەستێرەکانم دەکرد. هەستم دەکرد لەناو قوڵایی بێبنی ئەواندا نغرۆ بووم. هەروەك بڵێی زەوییەکە لەژێر قاچمدا دەجولاو هەروەك عەرشەی گەشتیەکی گەورەی لێهاتبوو. کەسێك سەرقاڵی ژەنینی

گیتار بوو. منیش بە پێڵاوە پەمەییە پاژنەبەرزەکەمەوە شەقم لە گیاکان دەداو بەرەو پێشەوە دەچووم، ئیتر سەیری دواوەی خۆیشم نەکرد. بەڕاستی وام هەست دەکرد کە دوونیا لەژێر پێیەکانمدایە.

نیوسەعات دواتر تازە بەئاگاهاتمەوە و زانیم هەموویان ڕۆشتوون.

پاش ماوەیەك، خوشکەکەم منی لەناو دالآن و ڕێڕەوی هەزار سوچی قەلآکەدا دۆزییەوە، هەموو جەستەم دەلەرزی. هەوری شەوانە ئەستێرەکانی داپۆشیبوو. هەورەك پێشتر گوتم، خوشکەکەم کەسێکی زۆر زیرەك و هۆشیار بوو، لەمن زیرەکترەو تەنها کەسێکە کە دەزانم دەتوانێت بە سەلامەتی خۆی بگەیەنێتە دەرەوەی دالآنە پێچ و قەمچ و ئالۆزەکەی قەلآکە.

***

—شتێکی زۆر پێکەنیناوی! بوومە ئەندامی کتێبخانە.

ویل سەرقاڵی سیدییەکانی بوو. سورێکیدا و چاوەڕوان بوو تاوەکو من پەرداخی خواردنەوەکەی بخەمە شوێنی تایبەتی پەرداخی سەر کورسییەکەیەوە.

—بەڕاست؟ چ جۆرە کتێبانێك دەخوێنیتەوە؟

—شتێکی تایبەت نییە. ئەی تۆ حەزت لێی نییە. تەنها کتێبە عاشقانەکان. بەڵام من حەزم لێیەتی.

قومێکی هەڵقوڕاند و گوتی:

—پێریێ سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبی (فلانری ئوکانر) بویت، ئەی وانییە؟ ئەو ڕۆژەی کە من هیچ حاڵم باش نەبوو.

—مەبەست ئەو چیرۆکە کورتەیە؟ باوەڕم نەدەکرد کە ئاگات لێ بوبێت..!

—نا کتوپڕ چاوم پێی کەوت. کتێبەکەت خستبویە سەر مێزەکەو منیش نەمدەتوانی هەڵیبگرم.

—ئەها....

—شتی بێمانا مەخوێنەرەوە. کتێبی چیرۆکی (فلانری ئوکانر) لەگەڵ خۆتدا ببەرەوە بۆ ماڵەوە. لەبری ئەودا ئەمە بخوێنەرەوە.

ئەمویست قبوڵی نەکەم. بەڵام لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە هەر بەڕاست باشە بۆ چی ئەمەوێت ڕەتیبکەمەوە.

—باشه قبوڵه، کاتێك تەواوم کرد، یەکسەر دەیهێنمەوە.

—کلارك، گۆرانی بخەرەسەر.

—حەزت لە چییە؟

وەڵامیدامەوە و بەسەر ئاماژەی بەرەولای سیدییەکە کرد. منیش گەڕام و سیدییەکەم دۆزییەوە.

—هاوڕێیەکم هەیە کە لە (ئالبرت سەمفۆنیا)دا ژەنییەری یەکەمی ویلنە. تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی کە هەفتەی داهاتوو لەم نزیکانەدا بەرنامەی هەیە. ئەم ئۆرکێسترایە دەناسی؟

—هیچ شتێك لەبارەی مۆسیقای کلاسیکەوە نازانم. ئەڵبەتە هەندێکجار باوکم بە ڕێکەوت ڕادیۆکە دەخاتە سەر ئێزگەی مۆسیقای کلاسیکی ئێف ئێم، بەلآم....

—تاوەکو ئێستە نەچویت بۆ کۆنسێرتەکان؟

—نەخێر.

سەری سوڕما.

—باشە، یەکجار چوم بۆ سەیری ڤیستلایف. بەلآم نازانم دەکرێت حیساب بکرێت یان نا. خوشکەکەم گوتی بابڕۆین. ئۆو، ئەمویست بۆ یادی لەدایکبونی بیست و دووساڵیم بچم بۆ بینینی (رابی ویلیامز)، بەلآم ژەهراوی بووم.

ویل بەیەکێك لەو نیگا تایبەتانەی خۆی سەیری کردم. یەکێك لەو نیگایانەی کە پێیاندەگوتم لە شاخەوە دابەزیوم.

—دەبێت بڕۆیت. بلیتیشی پێداوم. زۆر باشە. دایکیشت لەگەڵ خۆتدا ببە.

پێکەنیم و سەرێکم ڕاوەشاند.

—بڕواناکەم ئەوە بکرێت. دایکم ئەهلی چونە دەرەوە و گەشت و سەفەر نییە. خۆیشم حەزناکەم بیبەم.

—هەروەك ئەو فیلمانەی کە ژێرنوس کراون و حەزت لێیان نییە؟

مۆڕەیەکەم کرد.

—ویل، من بەرنامەی لێکۆڵینەوەکانی تۆ نیم، (خاتونی جوانی من)[١٦] نییە.

---

[١٦] فیلمێکە لە دەرهێنانی جورج کیوکرە و بەرهەمی ساڵی ١٨٦٤ کۆمپانیای برایانی ڤارنەرە. ئالن جی لرنر نوسیوەیەتی.

–پیگمالیون[١٧].

–چی؟

–ئەو نمایشنامەیەی کە ئاماژەت پێکرد، پیگمالیونە. (خاتونی جوانی من) مندالّی ناشەرعی ئەم نمایشنامە و شانۆگەرییەیە.

سەیرێکی توندی ناوبراوم کرد. بەلاّم بێ سود بوو. سیدییەکەم خستە سەر. کاتێك ئاوڕمدایەوە، دەبینم هێشتا سەری ڕادەوەشێنێت.

–تۆ ئیتر کێیت! بەڕاستی کەسێکی لەخۆڕازیت.

–کێ؟ من؟

–خۆت لە هەموو شتێك بێبەش دەکەیت، تەنها لەبەرئەوەی کە ئەهلی ئەو شتە نیت.

–نەخێر، بەوجۆرانەیش نییە.

–چۆن دەزانی ئەوجۆرەیش نییە؟ هیچکارێکت نەکردووە. بۆ هیچ شوێنێك نەچویت. هەربەڕاستی ئاگاداری خۆت هەیت کە کێیت؟

باشە کەسێکی وەك ئەو چۆن دەیزانی من چ جۆرە مرۆڤێکم؟ لەگەلّ کەسێکی وەك ویلدا کە نەیدەویست قبولّ بکات نەدەگونجام و نەمدەتونی سازشی بۆ بکەم.

–بەردەوامبە. هەرچی لە بیر مێشکدا هەیە هەلّیڕێژە.

–نەخێر.

–بۆچی؟

–لەبەر ئەوەی کە پێمناخۆشە، هەستدەکەم... دەزانێت.

–کێ؟ کێ دەزانێت؟

–هەموان دەزانن کە من مرۆڤی ئەوکارە نیم.

–باشە تۆ کەی ئاگاداری بیرو مێشکی خەلّکانیتریت؟

چاومان بڕیبویە یەکتری.

–کلارك، ئێستە بۆ هەرکوێییەك دەچم خەلّکی بەجۆرێك سەیرم دەکەن، هەروەك بلّێی ئەو شوێنە جێگەی من نییە و نابێت لەوێ بم.

---

[١٧] نمایشنامەیەکی برنارد شاوی ئینگلیزییە.

گۆرانییەکە دەستپێکرد و ئێمەش بێدەنگبوین. باوکی ویل لەناو هۆڵەکەدا بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. دەنگی پێکەنینەکەی بە کزی بەناو ماڵەکەدا خولی دەخوارد، هەردەتگوت دەنگەکە لەدورەوە دێت. ژنەکە لە ناو گۆرەپانی ئەسپسوارییەکەدا گوتبوی (شوێنی چونە ژورەوەی تواناویستان لەوێوەیە) هەروەك بڵێی ویل ڕەگەزێکی جیاوازتر بوو لە مرۆڤەکان.

سەیرێکی بەرگی سیدییەکەم کرد.

–ئەگەر تۆ بێیت ئامادەم برۆم.

–بەڵام خۆ لەبەر خاتری خۆت ناچیت.

–بڕیار نییە برۆم.

–یا عیسای مەسیح، بابە تۆ ئیتر کێیت!

–هەمیشە ئەمە بە من دەڵێیت.

***

ئەمجارەیان هیچ بەرنامەیەکی تایبەتم دانەنا نەوەك شتێك ڕوویدات. لەپاش بەسەرهاتی پێشبڕکێی ئەسپسوارییەکە و لەگەڵ ئەوەی کە لە هەنگاوی یەکەمدا شکستم هێنابوو، بەڵام بەردەوام لەناخی دڵەوە هیوام دەخواست کە ویل ئامادەیی پەیدا بکات و لەماڵەوە بێتە دەرەوە. هاوڕێ ڤیولن ژەنەکەی ویل پەیمانەکەی بردە سەرو بلیتی خۆڕایی و پاشکۆیەکی بۆ وەرگرتین کە زانیاری پێویستی تێدا بوو بۆی ناردین. بە ئۆتۆمبیل نزیکەی چل و پێنج خولەك ڕێگە بوو. کارەکانی ماڵەوەم ئەنجامدا. لێکۆڵینەوەم لەبارەی شوێنی ئەنجامدانی کۆنسێرتەکە و گەراجی تواناویستانەوە کرد. پێشتر تەلەفۆنم بۆ ئەو شوێنە کرد و سەبارەت بە بردنی کورسی تایەداری ویل بۆ ناو هۆڵەکە قسەم لەگەڵ بەرپرس و کارمەندەکاندا کرد. لە ڕیزی پێشەوە جێگەیان پێداین. منیش لەسەر کورسییەکی کۆکراوە و لەتەنیشت کورسییە تایەدارەکەی ویلەوە دادەنیشتم.

پاسەوانەکە گوتی:

–بەڕاستی باشترین جێگەمان پێداون. کاتێك لەنزیك ئورکێستراکەوە دابنیشن باشتر دەبینن و دەبیستن. خۆم بەزۆری حەزدەکەم لەوێدا دابنیشم.

تەنانەت لەمنی پرسیبو کە ئایا پێویستە کەسێك بێت بۆ گەراجەکە و یارمەتیمان بدات و ڕێنماییمان بکات بۆ ژورەوە. لەترسی ئەوەی کە مەبادا ویل بزانێت کە چاویان لەسەرمانە، گوتم نەخێر پێویستمان بە ڕێنما نییە.

بە نزیکبونەوەی کاتی ئورکێستراکە، نەمدەزانی شلەژان و دڵەڕاوکێی کاممان زیاتر دەبێت. خۆم یان ویل. ئەزمونی خراپی جاری پێشو، لەبەرچاوانم بوو. خاتوو ترینەریش هەرگیز یارمەتی نەدەدا. تەنها چواردەجار هاتوچۆی کرد بۆ ئەوەی لە شوێن و کاتی کۆنسێرتەکە دڵنیاببێتەوەو لە بەرنامەی وردی ئێمە سەر دەربهێنێت و تێبگات.

خاتوو ترینەر گوتی کاتێك لە کۆنسێرتەکە گەڕاینەوە، ویل کۆمەڵێك کاری هەیە کە بەپێی بەرنامەی شەوانە جێبەجێ دەکرێن. ئەیوست بێخەم بێت کە کەسێك هەیە یارمەتی دەدات. ئەو شەوە نیتن ئیشی هەبوو نەیدەتوانی بێت. کاك ترینەر(ستیڤن)یش شەو لەدەرەوە بوو. خاتوو ترینەر گوتی:

—بەلایەنی کەمەوە سەعات ونیوێکی پێدەچێت.

ویل گوتی:

—ئەی هاوار چەندە ماندوکەر..!

زانیم کە ویل بەدوای بیانویەکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی نەیەت. هەربۆیە گوتم:

—خۆم دەتوانم ئەوکارانە ئەنجامبدەم. ئەگەر ویل پێمبڵێت چی بکەم، ئەوا پێویستم بەیارمەتی نییە.

پێش ئەوەی بزانم بەڕاستی دەچمە ژێرباری چ ئەرك و لێپرسراوییەتیەکی قورسەوە، ئەم قسەیە لە دەمم هاتە دەرەوە.

ویل لەپاش ڕۆیشتنی دایکی بە ڕویەکی ترشەوە گوتی:

—باشە، ئێستە دوو شتمان هەیە کە بیری لێبکەینەوە. تۆ بەزەییت بەمندا دێتەوە. منیش لەناو جێگەی نوستنەکەمدا حەمام دەکەم چونکە ناچارم.

—من بەزەییم بەتۆدا نایەتەوە.

—کلارك، تاوەکو ئێستە هیچکەسێکم نەبینیوە کە وەك تۆ بە بینینی کەسێك ئەوەندە بێزارو بێتاقەت بێت بۆی و خەمی بخوات.

منیش بە سوپاسەوە وەڵاممدایەوە:

–کەوابوو بهێڵە با دایکت ئەمکارە بکات.

–بەڵێ، بەمشێوەیە بیرۆکەی چونەدەرەوە شیرینترو خۆشتر دەبێت.

دواتر کێشەی جلوبەرگ هاتەپێشەوە. نەمدەزانی چی لەبەر بکەم.

ڕۆژی پێشبرکێی ئەسپسوارییەکە جلوبەرگێکی گونجاوم لەبەر نەکردبوو. باشە چۆن دڵنیاببمەوە کە ئەمجارەیش جلوبەرگی ناحەزم نەپۆشیوە؟ پرسیارم لە ویل کرد کە دەبێت چ جلوبەرگێك لەبەر بکەم. ئەویش وەك کەسێکی ئاقڵ کە سەیری مرۆڤێکی نەفام دەکات، سەیرێکی کردم و گوتی:

–گڵۆپەکان دەکوژێننەوە، هیچ کەسێك سەیرت ناکات، هەموان سەرنجیان بەلای کۆنسێرتەکەوەیە.

–تۆ هیچ شتێك لەبارەی ژنانەوە نازانیت.

سێ دەستە جلوبەرگم لەگەڵ خۆمدا هێنا، تاوەکو لە کۆتاییدا یەکێکیانم لەبەر کرد. هەموویانم ئاخنییە ناو جانتا کۆنەکەی باوکمەوە و بە پاس هاتم. تەنها ڕێگەیەك بوو کە بتوانم متمانە بەخۆ بون پەیدا بکەم.

نیتن کاتژمێر ٣٠ :٥ خۆی گەیاندە لامان و کاتێك لەگەڵ ویلدا سەرگەرم بوو، منیش خێرا چوم بۆ توالیت بۆ ئەوەی ئامادە ببم. سەرەتا جلێکم تاقیکردەوە کە پێموابێت جلوبەرگێکی هونەری بوو. کراسێکی سەوزی مات بە زەنگیالەی گەورەی زەردی کارەباییەوە. وابزانم ئەو کەسانەی کە دەچن بۆ کۆنسێرتی موزیك بەدڵنیاییەوە زۆر هونەری و پڕ نزق و برقن. کاتێك چومە ناو ژورەکەوە نیتن و ویل واقیان بەمندا وڕمابوو.

ویل ڕێکو ڕاست گوتی:

–نەخێر.

نیتن گوتی:

–وەك ئەو جلوبەرگانەیە کە دایکم لەبەری دەکات.

ویل گوتی:

–هیچکاتێك باسی ئەوەت نەکردبوو کە دایکت نانا موسکورییە[18]!

---

[18] گۆرانیبێژێکی بەناوبانگی یۆنانییە کە لەساڵی ١٩٣٤ دا لەدایکبووە.

کاتێك خەریکبوم دەگەڕامەوە بۆ توالیتەکە، دەنگی پێکەنینەکەیانم دەبیست. دووەمیان کراسێکی ڕەشی سادە بوو، پەڕپەڕەی تێدا بوو سەرقۆڵەکانی و یەخەکەی سپی بوو. خۆم دوریبوم. بەلای خۆمەوە وەك جلوبەرگە دوراوەکانی پاریس شیك و جوان بوو.

ویل گوتی:

– مەگەر دەتەوێت ساردەمەنی بگێڕیت؟

نیتنیش بە ئاوازێکی پشتگیرکارانەوە گوتی:

–ئۆو... هاوڕێ، بویتە چ خاتوونێك! زۆر جوانە بۆ ئەو بۆنە و یادانەی کە لە ڕۆژدا ڕێکدەخرێن.

گوتم:

–بەیانی مستر ماسل[19] دەکەمە ناو کوپی قاوەکەی هەردوکتانەوە.

جلوبەرگی سێیەمم لەبەر کرد. کراسێکی کلاسیك لە ئاوریشمی سوری مات. زیاتر بەکەڵکی مرۆڤە دەستپێوەگرەکان دەهات. هەمیشەیش لەدڵمدا نزام دەکرد کە قەیتانی قەراخەکانی بەرز ببێتەوە. وەك نیمچە ئەستێرەکانی دەیەی ١٩٥٠ لێهاتبوو. یەکێك بوو لەو جلوبەرگانەی کە زۆر ئیسراحەت بووم تێیانداو هیچکاتێکیش پەشیمان نەبووم لەوەی کە لەبەرم کردون. سەرشانێکی ڕەنگ زیوینم لەسەر کراسەکەمەوە لەبەر کرد. دەستماڵێکی ئاوریشمی خۆڵەمێشیم بەست بەدەوری گەردنمەوە. بۆ ئەوەی سینگم نەبینرێت. تەختیتێکی لێوی هاوڕەنگی کراسەکەم کرد و چومەوە بۆناو ژورەکە.

نیتن بە ئاوازێکی ئافەرین ئامێزەوە گوتی:

–ئۆو ئەوە چییە!

ویل لەنوکی پێمەوە تاوەکو تەوقەسەرم سەیری کردم. تازە لێرەدابوو کە زانیم جلوبەرگەکانی گۆڕیوە و کراس و چاکەت و پانتۆڵی لەبەر کردووە، ڕیشی تاشیبوو قژەکانی بەجوانی داهێنابوو. بەڕاستی زۆر قۆز بوبو. کاتێك بینیم نەمتوانی خۆم بگرم و زەردەخەنە نەکەم. زۆر بەکەمی خزمەتی خۆی دەکرد. دیاربوو کە هەوڵی خۆیداوە.

گوتی:

---

[19] جۆرێکە لە پاککەرەوەی بەهێزی کاشی ناومال.

–ئەمە خۆیەتی.

دەنگی بێ هەست و بەجۆرێك لە جۆرەکان نامۆ بوو. کاتێك خەریکبوم یەخەی کراسەکەم رێکدەکرد، گوتی:

–بەلاّم بەبێ ئەو سەرشانە. دایکەنە.

ئەو راستی دەکرد، خۆیشم هەستم دەکرد کە باش نەبووە. سەرشانەکەم لابرد. بەوردییەوە دەقم کرد و دام بەسەر پشتی کورسییەکەدا.

–ئەو دەستماڵەی ملیشت لاببە.

ناخودئاگا دەستم چوبۆ گەردنم.

–دەستماڵی ملم؟ بۆچی؟

–لێی نایەت، هەردەڵێی دەتەوێت شتێکی لەژێردا بشاریتەوە.

–باشە، من... سنگم زۆر رووتە.

شانەکانی هەڵتەکاند.

–باشە؟ سەیرکە کلارك. ئەگەر دەتەوێت کراسێکی لەوشێوەیە لەبەر بکەیت، دەبێت متمانە بەخۆبونت هەبێت. لەڕوی زەینیشەوە دەبێت بەهەمان ئەندازەی جەستەیی ئیسراحەت بیت.

–ویل ترینەر، تەنها تۆیت کە دەتوانی بە ژنێك بڵێیت چۆن جولەبەرگ بپۆشێت.

بەلاّم دەستماڵەکەی ملم کردەوە.

نیتن رۆیشت تاوەکو جانتاکەی ویل ئامادە بکات. بەشوێن رستەیەکدا دەگەڕام بۆ ئەوەی بە تەشەرەوە بڵێم بەڕاستی هاورێیەتی مرۆڤ دەکات! کاتێك ئاوڕمدایەوە، دەبینم هەروا بەردەوام سەیرم دەکات. بە هێمنییەوە گوتی:

–کلارك، ئێستە زۆر باشە، زۆر جوان بویت.

***

هەمیشە لەبەر خاتری ویل لەگەڵ خەڵکی کوچە و کۆڵانەکاندا، یان هەروەك کامیلا ترینەر دەڵێت کرێکارەکان، شەڕو ئاژاوەم بوو. زۆرێك واقیان بە ئێمەدا وڕدەما. هەندێکیش بە حاڵەتێکی بەزەییانەوە زەردەخەنەیان دەکرد یان داخ و پەژارەیان دەردەبڕی. هەندێکجاریش لێیاندەپرسیم کە چی ڕوویداوە. بەزۆری ئەمویست وەلاّمبدەمەوە و بڵێم (بەداخەوە بە تفەنگی

ئێم ١٦ وایلێهاتوه). بۆ ئەوەی بزانم کاردانەوەیان چۆنە. بەڵام دانم بەخۆمدا دەگرت و هیچم نەدەگوت.

ئەمەویت شتێك لەبارەی چینی مامناوەندەوە بڵێم، ئەوان وا خۆیان نیشاندەدا کە سەرنجیان لەسەر ئێمە نییە، بەڵام سەرنجیان دەداین. ئەڵبەتە بەشەرمتر بوون لەوەی کە راستەوخۆ سەیرمان بکەن. هەربۆیە لەژێرچاوەوە سەیری ویلیان دەکرد و وایاندەزانی کە سەیری ناکەن. دواتر کاتێك ویل تێدەپەڕی، تەنانەت ئەگەر سەرقاڵی قسەکردنیش بونایە لەگەڵ کەسێکدا، هەر بەنیگاکانیان شوێنی دەکەوتن. هەرچەندە بابەتی قسەکانیان ویل نەبوو، چونکە بەلای ئەوانەوە ئەمە کارێکبوو دور بوو لە ڕەوشتەوە.

لەسەر سەرای چونە ژورەوەوە چوینە ناو هۆڵەکەوە. گروپ گروپ خەڵکانی شیك و مۆدێلی بە جانتاو دەلیلەوە لە دەستێکیان و خواردنەوەیش بە دەستەکەی تریانەوە وەستابون. ئاگام لە کاردانەوەی ئەوان بوو کە بەشێوەی شەپۆلێکی ئارام شوێنی ئێمە کەوتبوو کەبەرەو ڕیزی کورسییەکانی هۆڵەکە دەچوین. نازانم ویلیش ئاگادار بوو یان نا. هەندێکجار لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە تەنها ڕێگەی ڕوبەڕوبونەوە ئەوەیە کە وایانیشانبدات کە ئاگای لە خۆی نییە.

دانیشتین. تەنها ئەم دوو کەسەمان بوین کە لەڕیزی پێشەوە و لەبەشی ناوەندی هۆڵەکەدا دانیشتبوین. لەلای ڕاستمانەوە پیاوێکیتریش بە کورسی تایەدارەوە دانیشتبوو کە لەگەڵ ئەو دوو ژنەی کە لەملاو ئەولایەوە بوون دەمبەخەندە بوون و پێدەکەنین و قسەیان دەکرد. سەیری ئەوانم کرد، بەڵام حەزم دەکرد ویلیش سەیرییان بکات. بەڵام ویل سەیری بەرامبەری خۆی دەکرد. سەری کردبویەوە بەناو شانەکانیدا، بەجۆرێك کە خەریکبوو دیار نەمێنێت.

دەنگێك بە هێمنییەوە گوتی: (سودی نییە).

لەژێر لێوەوە بە ویلم گوت:

—شتێکت پێویست نییە؟

سەری ڕاوەشاند.

—نەخێر.

تفی دەمی قوتدایەوە.

—بەڵام ڕاستیەکەت بوێت بەڵێ، شتێك چووە بەناو یەخەمدا.

چەمامەوە و دەستمکرد بەنێو یەخەی کراسەکەیدا. هێشتا مارکەکەی پێوەبوو. ڕامکێشایە دەرەوە، هەوڵمدا لێبکەمەوە و فڕێیبدەم. بەڵام هەرچیمکرد لێنەکرایەوە.

—کراسی نوێ. زۆر ئازارت دەدات؟

—نەخێر، تەنها بۆ پێکەنین گوتم!

—لەناو جانتاکەدا مەقەست هەیە؟

—کلارك، نازانم. باوەڕ دەکەیت یان نا، بەڵام من زۆر بەکەمی جانتاکەی خۆی دەپێچمەوەو هەڵیدەپێکم!

لەناو جانتاکەدا مەقەست نەبوو. سەیرێکی دواوەی خۆمم کرد. تەماشاچییەکان خەریکبون لەشوێنەکانی خۆیاندا دادەنیشتن، لەژێر لێوەوە قسەیان دەکرد و دەلیل و دەفتەرچەی بەرنامەکانیان دەخوێندەوە. خۆ ئەگەر ویل بێزار بوایە و بەپێی پێویست تەرکیزی بەلای موسیقاکەوە نەبوایە، هاتنەدەرەوەمان بێ سود بوو. هەرگیز تامڵ و حەوسەڵەی پشێوییەکیترم نەبوو. گوتم:

—مەجوڵێ.

—بۆچی....

پێش ئەوەی کە قسەکەی تەواو بکات، هەڵمەتمدا و بە هێمنییەوە یەخەی کراسەکەیم لە ملی دورخستەوە، گازێکم گرت لە مارکەی کراسەکە. پاش یەك دوجار هەوڵدان توانیم بەددانەکانم توند بیگرم. چاوەکانم داخست، فشارم لەخۆم کرد کە هیچ گرنگییەك بەو بۆنە خۆشە نەدەم کە لەناوبراوەوە دەهاتە لوتمەوە. پێستی بەری پێستم دەکەوت و هەوڵمدەدا زۆر گوێی پێنەدەم. هەموو هەوڵێکی خۆممدا بۆ ئەوەی بیرنەکەمەوە کە چ کارێك دەکەم. لە کۆتاییدا توانیم کارەکە ئەنجامبدەم. سەرم هێنایە دواوە چاوەکانم کردەوە. بە سەرکەوتوانەوە مارکەی کراسەکە لەنێوان ددانەکانمدا بوو.

گوتم:

—لێمکردەوە!

مارکەی کراسەکەم گرت بە دەستمەوە و نیشانمدا. ویلیش واقی بەمندا وڕمابوو.

—بەڕاست؟

لەکورسییەکەمدا سورِێکم خوارد بۆ ئەوەی سەیری ئەو کەسانە بکەم کە هەمویان بێدەنگ بوبون و سەیری ئێمەیان دەکرد. دواتر ئاوڕمدایەوە بۆلای ویل.

—ئۆو وازیان لێبهێنە، هەروەك بڵێی تاوەکو ئێستە خۆیان ئەمکارانەیان نەکردووە.

وادیاربوو بەم قسەیە هەمویانم لە شوێنی خۆیاندا دانیشاند. ویل دوو سێ جاری یەك لە دوای یەك چاوەکانی داخست و کردییەوەو سەری راوەشاند. دەبینم ملی زۆر سور بووەتەوە. کراسەکەم رێککردو گوتم:

—بە هەرحاڵ. هەردوکمان دەبێت سوپاسی خودا بکەین کە مارکەی پشتی پانتۆڵەکەت نەبوو!

بەڵام پێش ئەوەی کە ویل وەڵامبداتەوە، ئەندامانی ئۆرکێسترا بە چاکەت و پانتۆڵی فەرمییەوە هاتنە سەر ستەیجەکە. بێدەنگی باڵیکێشا بەسەر هەموو هۆڵەکەدا. بەپێچەوانەی حەزی خۆمەوە هەستم بە هەیەجان کرد. هەردوو دەستم خستە سەر پێیەکانم و پشتم راست کردەوە. ئەندامانی ئۆرکێستراکە سەرقاڵی رێککردنی سازەکانیان بوون. دواتر کتوپڕ یەك دەنگ هۆڵەکەی پڕ کرد. زۆر توند و سێ لایەنە کە هەرگیز لە تەمەنمدا نەمبیستبوو. مووەکانی جەستەم راستبونەوە و هەناسەم سوار بوو.

ویل بەلاچاو سەیری منی کرد. هێشتا دەموچاوی وەك چەند ساتێك لەمەوبەر کراوە و روخۆش بوو. قیافەی دەیگوت: (باشە، قبوڵمە، ئەمشەو چێژ لە بەرنامەکە وەردەگرین).

رێبەری ئۆرکێستراکە هەنگاوێك هاتە پێشەوە، بە قاچ دووجار کێشای بە سەر ستەیجەکەدا. (هۆش)ێکی بەهێز هۆڵەکەی گرتەوە. بێدەنگییەکە زۆر موشتاق و زیندو بوو. دواتر رێبەری ئورکێستراکە دارەکەی خستە جوڵەو کتوپڕ دەنگی ساز لەوپەڕی بێگەردیدا هۆڵەکەی پڕ کرد. ئێستە ئیتر بەلای منەوە موسیقا بینراوییەکی مادی پەیدا کردبوو. شتێك نەبوو کە تەنها لە رێگەی گوێوە بیبیستم، بەڵکو لە هەموو بوون و وجودمدا دەڕۆیشت. دەوریدابوم و هەر پێنج هەستەکەی هێنابومە لەرزە. پێستم گەرم گەرم بوبو ناو لەپی دەستمدا ئارەقی کردبوو. ویل هیچ روونکردنەوەیەکی بەمن نەدابوو. وامزانیبو حەوسەڵەم بەسەر دەچێت. جوانترین شتێك بوو کە لەتەمەنمدا بیستبووم.

هێزی خەیاڵ و بیرکردنەوەم بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو شکۆفەی کرد و کرابویەوە، هەروا کە دانیشتبوم بیرم لەو شتانە کردەوە کە ساڵانێکبوو بیرم لێنەکردبویەوە. هەیەجانەکانی

ڕابورد لە سەرانسەری بوون و وجودمدا گەرم بوون و کەوتنە جۆش و خرۆش، بیرکردنەوە و ئایدیای نوێ لە مێشکمدا خولیان خوارد. هەروەك بڵێی تێڕوانین و بەسیرەتێکی ترم بەدەستهێناوە. شتانێکی زۆر هەبوون بەلأم هەرگیز نەمدەویست کۆتاییان پێبێت. حەزم دەکرد بۆ هەتا هەتایە لەوێدا دابنیشم. لەژێرچاوەوە سەیرێکی ویلم کرد، کەمەندکێشی سیحراوی نغرۆی تەماشاکردن بوو. ئاگای لە خۆی نەمابوو. ئیتر سەیریم نەکرد، هەروەك بڵێی دەترسام سەیری بکەم. لەو هەستەی کە هەیبوو دەترسام، لە قوڵایی ئەو لێدانە کە بەری کەوتبوو، لە فراوانی ترسەکانی دەترسام. ژیانی ویل ترینەر زۆر فراوانتر بوو لە ئەزمونی من و هەرگیز نەمدەتوانی خۆم بخەمە جێگەی ئەوەوە. باشە من کێ بووم کە بەو بڵێم دەبێت بییەوێت بە زیندویی بمێنێتەوە؟

***

هاوڕێکەی ویل یاداشتێکی نارد و داوای لێکردین لەپاش کۆنسێرتەکە بچین بۆ پشتی سەحنەو چاومان پێی بکەوێت. بەلأم ویل حەزی نەدەکرد.

جارێك هانمدا، بەلأم لەو قیافە جیدییەی کە لەخۆی گرتبوو، دەمزانی بیروڕای خۆی ناگۆڕێت و پێداگری بێ سودە. نەمدەتوانی سەرزەنشتی بکەم. لەبیرمە کە ئەو ڕۆژە، ڕۆپرتی هاوکاری پێشووی، چۆن واقی بەودا وڕمابوو. نیگایەکی ئاوێتە بە بەزەیی، ترس، بەجۆرێك لە جۆرەکانیش هەستکردن بە ئارامی کە خۆی لەوەها هەلومەرجێکدا نییە و بەلأیەکی لەو شێوەیەی بەسەردا نەهاتووە. دەمزانی ویل حەزو حەوسەڵەی ئەمجۆرە دیدارانەی نییە.

چاوەڕوان بوین تاوەکو هۆڵەکە چۆڵ ببێت، دواتر پاڵم بە کورسییە تایەدارەکەوە نا، بە ئاسانسۆر چوینە ناو پارکینگەکەوەو بەبێ کەمترین کێشە، ویلم سواری سەیارەکە کرد. قسەی زۆرم نەکرد، هێشتا مێشکم پڕ بوو لە دەنگی مۆزیك. نەمدەویست لە زەینمدا نەمێنێت. بیرم لەوو لە هاوڕێکەی ویل دەکردەوە چۆن لەو سازەدا کە لێی دەدا نغۆر بوبو. هەرگیز نەمزانی کە مۆسیقا دەتوانێت قوفڵی بوون و وجوی مرۆڤ بکاتەوە، مرۆڤ ببات بۆ جێگەیەك کە تەنانەت ئاوازدانەرەکەیشی چاوەڕوانی نەکات. نەمدەزانی مۆسیقا کاریگەری لەسەر ئیمە و جیهانی دەوروبەرمان دەبێت. هەروەك بڵێیت بۆ هەرکوێیەك دەچن کاریگەرییەکەیش لەگەڵ خۆتاندا دەبەن. کاتێك لەناو هۆڵەکەدا بوین، چەند ساتێك بەتەواوەتی لەبیرم چوبویەوە کە ویل لە تەنیشتمەوە دانیشتووە.

سەیارەکەم لەدەرەوەی باڵەخانە فەرعییەکەوە پارك کرد. لەبەرامبەرمانەوەو لەسەر دیوارەکەوە قەلاَکە دەبینرا، کە بەهۆی مانگەوە بەتەواوەتی ڕۆشن بوبویەوە و لەسەر تەپۆڵکەکە و لە شوێنی خۆیدا بەجوانی و زۆر بە بێخەم دەدرەوشایەوە.

—کەواتە تۆ ئەهلی مۆسیقای کلاسیك نیت!

لە ئاوێنەکەوە سەیری دواوەم کرد. ویل زەردەخەنەی بەسەر لێوەوە بوو.

—یەك تۆسقاڵیش خۆش نەبوو بەلامەوە.

—دەبینم.

— بەتایبەت بەشی کۆتایی هەر خۆش نەبوو بەلامەوە. هەمان ئەو بەشەی کە تەنها ڤیولنیان لێدا.

—زانیم کە حەزت لەم بەشەی نییە. ئەوەندە ڕقت لێی بوو کە فرمێسك لە چاوەکانتدا قەتیس مابوو.

زەردەخەنەیەکی کورتم کرد و گوتم:

—نەخێر، ڕاستیەکەیت بوێت، زۆر بەلامەوە خۆش بوو. بەلاَم دڵنیانیم کە بەگشتی حەزم لە مۆسیقای کلاسیك بێت. بەلاَم لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا سەرنجڕاکێش بوو.

دەستێکم هێنا بە لوتمدا و گوتم:

—سوپاس بۆ تۆ. سوپاست دەکەم کە منت لەگەڵ خۆتدا برد.

لە بێدەنگیدا دانیشتین و چاومان بڕییە قەلاَکە. شەوانە لەژێر ئەو ڕووناکییەی کە لەدەوروبەری دیوارەکەوە بلاَو دەبوویەوە بە ڕەنگێکی نارنجی زۆر جوان دەینواند، گوتم:

—بە بڕوای تۆ لەو شوێنەدا چ جۆرە مۆسیقایەکیان دەژەنی؟ شتانێك بوو کە گوێیان بۆ دەگرت.

—قەلاَ؟ لەسەدەکانی ناوەڕاستدا؟ عود، سازە ژێدارەکان. ئەو سازانە نین کە من حەزم لێیانە. بەلاَم شتانێکم هەیە کە دەیدەم بەلاتەوە بۆ ئەوەی گوێیان لێبگریت، ئەڵبەتە ئەگەر خۆت بتەوێت. ئەگەر بەڕاستی حەزبکەیت بەباشی هەستی پێبکەیت. دەبێت هیدفۆن بکەیتە گوێت و بڕۆیت بۆ دەوروبەری قەلاَکە بۆ پیاسە.

—نەخێر، ناڕۆم.

–هەمیشە هەر بەوجۆرەیە. بەزۆری ناچین بۆ ئەو شوێنانەی کە لە مرۆڤەوە نزیکن و لە دەوروبەرماندان.

کەمێك زیاتر دانیشتین. گوێمان بۆ دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبیلەکە گرت کە لەناو بێدەنگییەکەدا خولی دەخوارد. قایشەکەم کردەوە و گوتم:

–بەڵێ، باشتر وایە بچینە ژورەوە. ئیش و کارێکی زۆر چاوەڕێمانە.

–کلارك، یەك خولەك بووەستە.

ئاوڕمدایەوە بۆلای. دەموچاوی لە سێبەری تاریکاییەکەدا بوو، نەمدەتوانی بەباشی بیبینم.

–یەك خولەك زیاتر. تەنها یەك خولەك.

–تۆ باشیت؟

سەیری کورسییەکەیم کرد، لەوەترسام نەوەك کێشەیەکی بۆ دروست بوبێت و دوبارە بەزمێکی دروست کردبێت. لەوانەبوو شوێنێکی جەستەی لە شتێك گیرابێت.

–باشم. تەنها....

یەخەی سپی کراسەکەی و چاکەتە ڕەشەکەیم دەبینی کە زۆر دژبەری یەکتری بوون.

–ئێستە حەزناکەم بچمەوە بۆ ماڵەوە. حەزدەکەم لێرەدا دابینشم و بیرلە..... نەکەمەوە.

تفی دەمی قوتدایەوە.

تەنانەت لەسێبەری ڕووناکەکەیشدا دیاربوو کە سەر دەخاتە سەرخۆی و زۆر لە خۆی دەکات.

–تەنها ئەمەوێت چەند ساتێك زیاتر لەناو ڕۆڵی ئەو پیاوەدا بم کە لەگەڵ کچێکی سورپۆشدا چووە بۆ کۆنسێرتێك.

کیلۆنی دەرگاکەم بەردا.

–بەدڵنیاییەوە.

چاوەکانم داخست و سەرم نا بە پشتی کورسییەکەوە. هەردوکمان بە نیوە شاراوەیی لەژێر سێبەری قەلاَکەدا و لەسەر تەپۆڵکەکە، لە شەوێکی مانگەشەودا، هەروا دانیشتین و لەناو هەست و خەیاڵەکانماندا نغرۆ بوین کە بەهۆی مۆسیقاکەوە هێشتا لەناخ و دەرونماندا مابویەوە.

***

من و خوشکەکەم هیچکات باسی ئەوەمان نەکرد کە ئەو شەوە لە دالآنی هەزار پێچ و قەمچی قەلآکەدا ڕویدا، یان هەر نەمانگوت کە چی بووە و چی ڕویداوە. هەر لەبیریشم نایەت کە بەیەکەوە قسەمان کردبێت. چەند ساتێك بەتوندی منی گوشی بەخۆیەوە، دواتر یارمەتیدابوم بۆ ئەوەی جلوبەرگەکانم بدۆزمەوە، بە وردیش بەناو چیمەنەکەدا گەڕا بۆ ئەوەی پێلآوەکانم بدۆزێتەوە، بەلآم نەیتوانی بیاندۆزێتەوە. تاوەکو من گوتم گرنگ نییە. بە هەرحاڵ دووبارە ئەو پێلآوانەم لەپێنەدەکردەوە. دواتر بەپێ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. بەپێی پەتی و دەستم خستبویە ناو دەستی خوشکەکەمەوە. تەنانەت ئەو کاتانەیش کە پۆلی یەك بووم و دایکم ئەوی دەسپاردە دەستی من و داوای لێدەکردم کە دەستی بەرنەدەم، هەرگیز وەك ئەو شەوە بەتوندی دەستی یەکتریمان نەگرتبوو.

کاتێك گەیشتینە ماڵەوە، لەناو دالآنەکەدا وەستاین و خوشکەکەم قژەکانی بۆ ڕێککردم. بە دەستماڵی تەڕ چاوەکانی بۆ سڕیم. دواتر دەرگای مەدخەلەکەمان کردەوە و چوینە ژورەوە. هەروەك بڵێی هیچ شتێك ڕووینەداوە.

باوکم هێشا بەخەبەر بوو سەیری یاری تۆپی پێی دەکرد.

–کچینە کەمێك درەنگ هاتنەوە. دەزانم کە هەینیە بەلآم هێشتا....

هەردوکمان بەیەکەوە گوتمان:

–زۆر باشە باوکە...

ئەوکات ئەو ژورەی کە دواتر تایبەت کرا بە بابەگەورەوە، ژوری من بوو. بەخێراییەوە بەقادرمەکاندا چوینە سەرەوە و پێش ئەوەی کە خوشکەکەم هیچ قسەیەك بکات لەدوای خۆمەوە دەرگاکەم داخست.

هەفتەی داهاتوو قژم بڕی. بلیتی فڕۆکەکەم ڕادەستی کۆمپانیاکە کردەوە. لەوکاتەوە ئیتر هەرگیز لەگەڵ کچانی قوتابخانەدا نەچومە دەرەوە. دایکم مات و خەمبار بوو نەیزانی چی ڕوویداوە. باوکیشم هەرگۆڕانکارییەکی لە ڕۆح و دەرونماندا پەیوەست دەکرد بە (مەسەلە ژنانەکانەوە). تەنانەت ئەو نەریت و ڕەفتارە نوێیەم کە لەژورەکەم نەدەهاتمە دەرەوە، بە مەسەلەیەکی ژنانەی دەزانی. ئێستە ئیتر لە ڕاستی و واقیعیەتی خۆم گەیشتبوم، دەمزانی لەو کچە بەرەڵایانە جیاوازم کە لەگەڵ کوڕی غەریبەدا عەیشو نۆشیان دەکرد. کچێك بووم کە بە

جۆرێك جلوبەرگم لەبەر نەدەكرد كە سەرنجی كوڕان بەلای خۆمدا ڕابكێشم و بەحۆرێك بیرم لێبكەنەوە. جلوبەرگەكانیشم جێگەی سەرنجی ئەو پیاوانە نەبوو كە دەچون بۆ ڕودلاین.

ژیان گەڕایەوە سەر ئاوازی سروشتی خۆی. لەناو سالۆنی ئارایشتدا كارێكم دۆزییەوە، دواتریش لە باترداباندا سەرقاڵی كاركردن بووم. هەموو بارودۆخەكانم تێپەڕاند.

لەو ڕۆژە بەدواوە هەزاران جار لەتەنیشت قەلاَكەوە تێپەڕیم.

بەلاَم ئیتر هەرگیز نەچومەوە بۆ دالاَنە هەزار پێچ و قەمچەكەی.

{١٣}

پاتریك لەتەنیشت یاریگاکەوە وەستابوو، لە شوێنی خۆیدا هەڵبەزو دابەزی دەکرد. بلوزو شۆرتە وەرزشییە مارکە نایکە نوێکەی لکابوو بە جەستە تەڕبووەکەیەوە. چوبوم بۆ ئەوەی سلاوێکی لێبکەم و بڵێم کە ئەو شەوە لەگەڵیدا ناچم بۆ کۆبونەوەکەیان لەناو قاوەخانەکەدا. چونکە نیتن مۆڵەتی وەرگرتبوو دەبوایە من لە جێگەیدا بومایە.

—ئەمە جاری سێیەمە کە نایەیت.

—بەڕاست؟

بە پەنجە ئەو جارانەم ژمارد کە نەچوبوم.

—بەڵێ، وادیارە هەروایە.

—باشە دەبێت هەفتەی داهاتوو بێیت. بڕیاروایە بەرنامە بۆ ئێکستریم ڤایکینگ دابنێین. هێشتایش بەمنت نەگوتووە کە بۆ ڕۆژی لەدایکبونت چ بەرنامەیەکت هەیە.

دواتر دەستیکردە ئیحماو خۆ گەرمکردن. قاچەکانی بەرزو نزم پێکرد و سینگی توند لکاند بە ئەژنۆکانییەوە.

—دێیت بچین بۆ سینەما؟ ئەم ڕۆژانە کە ڕاهێنانمان هەیە، نامەوێت خواردنی باش بخۆم. باوك و دایکم بانگهێشتکراون بۆ خوانێکی تایبەتی ئێوارە.

پاژنەی پێی گرت و ئەژنۆی خستە سەرزەوی. ناخودئاگا بینیم کە قاچی بە شێوەیەکی زۆر سەیر ماسولکەی پەیدا کردووە.

—خۆ نانخواردنەکە لەناو ڕیستوراندا نییە، ئەی وانییە؟

—نەخێر، ئەوەندەیش تایبەت نییە. پاتریك من پێموایە دەبێت بەرنامەیەکمان هەبێت. دایکم ئەم ڕۆژانە هیچ دڵ و مێشکی لەسەر خۆی نییە.

هەفتەی پێشوو، ترینا ڕۆیشتبوو، (ئەڵبەتە بەبێ کیفە لیمۆییەکەی من کە پێداویستی ئارایشتم تێدەکرد)، دایکم ئەژنۆی خەمی لەباوەش گرتووە و بارودۆخەکە کارەساتبارتر بوو لەوەی کە بۆ یەکەمجار ترینا چوبو بۆ زانکۆ. دایکم زۆر خەمی تۆماسی بوو، هەروەك بڵێی دەستێك یان قاچێکیان بڕیبێتەوە

لەعابەکانی کە هەر لەو منداڵییەوە لەناو ژوری دانیشتنەکەدا پەرش و بڵاوبوبونەوە، کۆی کردبونەوەو لەبەر دەستدا لایبردبون. ئیتر لەناو کابینەکەدا چوکلێتی پەنجەیی و قوتوە بچوکەکانی خواردنەوە نەدەبینران. پاشنیوەڕوان کاتژمێر ١٥: ٣ خولەك بە پێ تاوەکو قوتابخانە نەدەچوو، کەس نەبوو بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو مەودا کەمەی تاوەکو ماڵەوە قسەی لەگەڵدا بکات. لەڕاستیدا هەلێك بوو بۆ ئەوەی دایکم لەماڵەوە بێتە دەرەوە. بەڵام بەڕاستی تەنیا بوبویەوە. ئەم ڕۆژانە بێجگە لە کڕینی هەفتانە کە باوکم دەیکرد، دایکم بەهیچ شێوەیەك نەدەچویە دەرەوە.

سێ ڕۆژی یەکەم، وەك ڕۆحێکی سەرگەردان لەماڵەوە دەسوڕایەوە. دواتر زۆر بە خەستی سەرقاڵی ماڵ پاککردنەوەی بەهارانە بوو. بابە گەورەم لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو دایکم بە گسکە کارەباییەکە ژێرەکەی گسك دەدا، بابەگەورەیشم بێزاتر دەبوو بۆڵەی دەهات. ترینا گوتبوی کە تاوەکو چەند هەفتەیەك ناگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی تۆماس لەگەڵ ئەو شوێنەدا ڕابێت و بیری ماڵەوە نەکات. هەر شەوێك کە ترینا تەلەفۆنی بکردایە، دایکم قسەی لەگەڵ هەردوکیاندا دەکرد، دواتریش دەچوویە ژورەکەی و بەلایەنی کەمەوە نیو سەعاتێك دەگریا.

—ئەم ڕۆژانە تاوەکو درەنگانێك لەسەر کاریت. خۆ ئیتر ناتبینم.

—ئێ باشە، خۆیشت کە بەردەوام سەرقاڵی ڕاهێنانی. پاتریك پارەیەکی باشم پێدەدەن، دودڵ دەبم و ناتوانم کارە زیادەکە ڕەتبکەمەوە.

پاتریك درێژەی بە قسەکانی نەدا.

لەمکارەمدا زیاتر لە هەرکاتێکی ژیانم پارەم دەستدەکەوێت. ئێستە دوو هێندەی جاران پارەم بە دایکوباوکم دەدا. هەموو مانگێکیش ئەندازێکم دەخستە ناو حیسابی پاشەکەوتەکەمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەوەندەم بۆ دەمایەوە کە نەمدەزانی چۆن خەرجی بکەم. بەشێکی هۆکارەکەی ئەوە بوو کە هەمیشە لەسەر کار بووم. لەو کاتانەی کە فرۆشگاکان

کرابونەوە، من لە گرنتاهاوس بووم. هۆکارێکیتریشی ئەوە بوو کە زۆر حەزم لە کڕین نەبوو. ئەو کاتانەی کە کارم نەبوو کاتەکانم لە کتێبخانە و لەبەردەم ئینتەرنێتدا بەسەر دەبرد.

بە کۆمپیوتەر هەموو دوونیا لەبەر دەستمدا بوو وردە وردە گۆڕدرابوو بە کەمەندکێشییەکی خەڵەتێنەر. دەستپێکردنی بە یاداشتێکی سوپا بوو. یەك دوو ڕۆژ دوای کۆنسێرتەکە بە ویلم گوت، باشتر وایە یاداشتێك بنوسین و سوپاسی هاوڕ ڤیولن ژەنەکەی بکەین.

گوتم:

—کاتێك دەهاتم لەسەر ڕێگاکەم کارتێکی جوانم کڕی. هەرچییەکت دەوێت بیڵێ بۆ ئەوەی بینوسم. پێنوسیشم هێناوە.

ویل گوتی:

—باوەڕناکەم پێویست بکات.

—بۆچی؟

—بیستت چیم گوت.

—ئەوەی کە گوتت پێویست ناکات؟ ئەم پیاوە ئێمە لە ڕیزی پێشەوە دانا، خۆت گوتت ئەمە زۆر کارێکی باشە. خۆ بەلایەنی کەمەوە ئەو کارەی کە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت سوپاسکردنە.

چەناکە و شەویلگەی ویل جێگیرە، بەبێ کەمترین جوڵە.

پێنوسەکەم دانا.

—لەوانەیشە وابزانیت خەڵکی ئەرکیانە کە کارێکت بۆ بکەن. هەربۆیە تۆیش ناچار نیت سوپاسیان بکەیت ئەرێ؟

—کلارك، تۆ هیچ نازانی. تۆ چوزانیت بۆ مرۆڤ چەندە سەختە کە خەڵکانیتر شتی بۆ بنوسن. دەستەواژەی ( لەلایەن..) زۆر سوکایەتیە.

—ئێ! خۆ لەهیچ باشترە. بە هەرحاڵ من سوپاسی دەکەم. ئێستە کە پێت ناخۆشە، دەتوانم ئاماژە بەناوی تۆ نەکەم.

یاداشتەکەم نوسی. لەمبارەیەوە قسەیەکی زیاترم نەکرد. بەڵام ئەو شەوە، هەروا کە قسەکەی ویل لە گوێمدا دەزرنگایەوە، چوم بۆ کتێبخانە. ئەمویست بزانم ئامێرێك هەیە کە ویل بتوانێت بەدەستی خۆی شتێك بنوسێت. لەماوەی یەك سەعاتدا سێ شتم بینی، ئامێرو

بەرنامەی ناسینەوە دەنگ، جۆرێکیتر لە ئامێرو بەرنامە کە بە چاوتروکاندن کار دەکات، هەروەك خوشکەکەم گوتبوی جۆرێکیش لە ئامێری لێدان کە ویل دەیتوانی بیبەستێت بەسەرییەوە.

خۆم پێشتۆ دەمزانی ویل بە بینینی ئامێرێك کە بیبەستن بەسەرییەوە مۆڕ دەکات و تورە دەبێت. بەلآم دانیبەوەدا نا کە بەرنامەی ناسینەوەی دەنگ شتێکی زۆر باشە. لەماوەی یەك هەفتەدا و بەیارمەتی نیتن توانیم ئەم ئامێرو بەرنامەیە لە کۆمپیوتەرەکەی ببەستم. ویل دادەنیشت و مێزی کۆمپیوتەرەکە بەسترابوو بە کورسییەکەیەوە. ئێستە پێویستی بە کەسێکیتر نەبوو کە تایپی بۆ بکات. سەرەتا ویل تورەو دەستەپاچە بوو، هەروەك بلێی تەریق دەبویەوە، بەلآم دواتر کە گوتم بەمە دەستپێبکە (میس کلارك، نامەیەك بنوسە)، هێمن بویەوە.

تەنانەت خاتوو ترینەریش شتێکی نەدۆزییەوە بۆ ئەوەی ڕەخنە بگرێت.

—ئەگەر کارێکیتر هەیە و پێتوایە کە بەسودە، بە ئێمەی بلێ.

بەجۆرێك لێوەکانی دەگوشی بەیەکەوە، هەروەك بلێی هێشتا باوەڕی نەکردوە کە چ کەرەستەیەکی باش خراوەتە بەردەستی کوڕەکەیەوە. سێ ڕۆژ دواتر ڕێك لەوکاتەدا کە دەچوم بۆ سەرئیش. پۆستەچییەکە نامەیەکی بۆ هێنام. لەناو پاسەکەدا نامەکەم کردەوە. وامزانی پیرۆزبایی پێشوەختەی یادی لەدایکبونە کە لەلایەن یەکێك لە کچە پورە دورە دەستەکانمەوە بۆم هاتووە. بە کۆمپیوتەر نوسرابوو:

***کلارکی ئازیز،***

***ئەم یاداشتەم نوسی بۆ ئەوەی پێت بلێم بەو شێوەیەش نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە و وادەزانیت من کەسێکی لە خۆبازیم، ڕێزو پێزانیم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششانەت هەیە کە لەپێناوی مندا دەیاندەیت.***

***سوپاس.***

***ویل.***

قاقا پێکەنیم، بەجۆرێك پێکەنیم کە شۆفێری پاسەکە گوتی وادیارە بلیتی یانصیبت بۆ دەرچووە.

لەپاش ساڵانێك خەوتن لەناو ژورە شقارتەییەکەدا و ئەو جلوبەرگانەی کە لەسەر بۆری ئاسنینی ڕیزەوەکەدا هەڵواسرابوون، ژورەکەی ترینا وەك کۆشك وابوو بۆ من. یەکەم شەو کە لەوێدا خەوتم دەستەکانم بڵاوکردەوە بەبێ ئەوەی بدەن لە دیوارەکان، ئەمە زۆر چێژبەخش بوو بۆ من. چوم بۆ فرۆشگای (دای) و بۆیەو پەردەی دەڕابەیی و گڵۆپی تەنیشت قەرەویڵەکە و چەند ڕەفەیەکم کڕی، کە خۆم دواتر ڕێکم کردن و هەمویان خستە سەر یەکتری. ئەڵبەتە بەو جۆرانەیش نەبوو کە ئەمکارانە بزانم. بەڵکو تەنها ئەمویست بزانم دەرەقەتی کارانێکی لەو شێوەیە دێین یان نا.

دیکۆری ژورەکەم گۆڕی. شەوێکیان لەپاشی کارکردن، یەك سەعاتم تەرخان کرد و ژورەکەم بۆیاخ کرد. کۆتایی هەفتە ژورەکە بە شێوەیەك گۆڕدرابوو تەنانەت باوکیشم گوتی زۆر جوان بووە. دەستیهێنا بە پەردە دەڕابەییەکەدا کە خۆم بڕیبوم و گوتی:

—لو، ئەمکارە دەبێتە هۆی سەرکەوتنت.

چەرچەفێکی نوێیشم بۆ لێفەکەم و قاڵییەکی بچوك و چەند سەرینێکی گەورەیشم کڕی، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك هات بۆ ژورەکەم و ویستی پاڵبداتەوە بیانخاتە ژێر شان و پشتی خۆی.

ڕۆژژمێرەکەیشم لکاند بە پشتی دەرگای ژورە نوێیەکەمدا. بێجگە لە خۆم کەسیتر نەیدەبینی. بێجگە لە خۆیشم هیچ کەسێکیتر ماناکەی نەدەزانی.

ڕۆژانە بەم بیرکردنەوە کە دەبێت ویل بۆ کوێ بەرم دەچووم بۆ سەر ئیشەکەم. هیچ بەرنامەیەکی گشتیم نەبوو، هەر ئەو ڕۆژە بیرم دەکردەوە کە چی بکەم، ویل ببەمە دەرەوە و کارێك بکەم کە خۆشحاڵ ببێت. هەندێك ڕۆژیش حاڵی باش نەبوو، فەتوت و بە ئازار لەسەر جێگەکەی ڕادەکشا، ئەم بەشەی ژیانی لە هەمووی قورستر بوو. بەڵام چەند جارێك کە هیچ گرفتێکی تێدا نەبوو سەرکەوتو بووم و توانیم بیبەمە دەرەوەو لەبەر خۆرەتاوی بەهاریدا بیگێڕم. ئێستە دەمزانی یەکێك لەو شتانەی کە ویل زۆر ڕقییەتی لێی بەزەیی هاتنەوە خەڵکانی بێگانەیە بەناویراودا. هەر لەبەر ئەمە بوو دەمبرد بۆ شوێنە جوانەکانی دەرەوەی شار و یەك دوو سەعاتێك دەگەڕاین و پیاسەمان دەکرد، شوێنێك کە بێجگە لەم دوو کەسەمان هیچ مرۆڤێکیتری لێنەبوو. دەچوین بۆ سەیران و لەناو دەشت و دەردا ویڵ دەبووین. چێژمان لەشنەباکەی وەردەگرت و خۆشحاڵ بوین کە لەماڵەوە نین.

ڕۆژێکیان پاشنیوەڕۆ کە خەریکبوم ساندەویچی پەنیرو خەیارشۆرم بۆ دروستدەکرد، گوتم:

—کوڕه هاوڕێکەم حەزدەکات بتبینێت.

چەند کیلۆمەترێك لەشارەوە دوور بوین. لەسەر تەپۆڵکەیەك دانیشتبوین و لەوبەری چۆمەکەوە بەباشی قەڵاکەمان دەبینی. مەودای نێوان ئێمە و قەڵاکە بە دەشتاییە سەرسەوزو دڵڕفێنەکان داپۆشرابوو.

—بۆچی؟

—حەزدەکات بزانێت شەوانە تاوەکو درەنگانێك من لەگەڵ کێدا کات بەسەر دەبەم.

هەستمکرد خۆشحاڵ بووە، زۆر سەیر بوو.

—ئەو پیاوەی کە وەرزشی ڕاکردن دەکات.

—وابزانم دایکوباوکیشم پێیانخۆش دەبێت.

—کاتێك کچێك پێمبڵێت کە دایکو باوکی حەز دەکەن بمبینن. دەشڵەژێم. ئەی دایکت چۆنە؟

—وەك هەمیشە، هەروەك خۆیەتی.

—ئەی کارەکەی باوکت چی لێهات؟ هەواڵێکی تازە نییە؟

—نەخێر، پێیانگوتوە هەفتەی داهاتوو. با واز لەمە بهێنین. پێیانگوتم ئەگەر پێموخۆشبوو هەینی بۆ یادی لەدایکبونم بانگهێشتت بکەم، زۆر ئاسان. ئەڵبەتە ئاهەنگ و میوانی خێزانییە. بالاَم باش دەبێت ئەگەر بێیت. پێمگوتون کە تۆ نایەیت.

—کێ گوتی من نایەم.

—تۆ ڕقت لە خەڵکی بێگانەیە. حەزناکەیت لەبەردەم خەڵکانیتردا خواردن بخۆیت. حەزیشت لە زۆربڵێی کوڕە هاوڕێکەم نییە، وەك ڕۆژی ڕووناك لێم ئاشکرایە.

تازە فێربوبوم کە چۆن لەگەڵ ویلدا مامەڵە بکەم. کاتێك ئەمویست ناچاری بکەم بۆ ئەنجامدانی کارێك، ڕێگەکەی ئەوەبوو کە بڵێم (دەزانم حەزی لێناکات و نایەوێت ئەوکارە بکات). هێشتا ملەجەڕی و یەك تایمی لە ناخیدا هەبوو نەیدەتوانی تامڵی ئەوە بکات کە کەسێکیتر لەبری ئەودا بڕیار بدات.

ویل سەرقاڵی خواردنی ساندەویچەکە بوو، یەك خولەك دواتر گوتی:

—نەخێر، دێم بۆ ئاهەنگی لەدایکبونەکەت. بەلایەنی کەمەوە خۆ هیچ نەبێ دایکت بابەتێکی دەست دەکەوێت کە بیری لێبکاتەوە.

—بەڕاست؟ ئۆو خودایە گیان! ئەگەر پێی بڵێم هەر ئەمشەو دەستدەکات بە شۆردن و سڕینەوەیماڵەوە.

—تۆ دڵنیایت لە سکی ئەودا هاتویتە دەرەوە؟ نابێت چوبیتەوە سەر ئەو؟ کلارك، بێزەحمەت ساندەویچم پێبدە، خەیارشوری زیاتری تێبکە.

خەریکبوم کەمێك سەربخەمەسەری. کاتێك دایکم زانی کە بڕیاروایە میوانی ئیفلیجی هەبێت شپرزە بوو. دەستی خستە سەر دەموچاوی، دواتریش دەستیکرە ڕێکوپێك کردنی ماڵەکە. هەروەك بڵێی گوتومە هەر ئێستە ویل دێت بۆ ماڵمان و دێتە ژورەوە.

—باشە ئەگەر ویستی بڕوات بۆ توالیت چی بکەین؟ خۆ لەقاتی خوارەوە توالیتمان نییە. باوەڕیش ناکەم باوکت بتوانێت بیباتە قاتی سەرەوە.

من دەتوانم یارمەتیتان بدەم... بەلاّم خۆ نازانم دەست بە کوێیەوە بگرم. پاتریك دەتوانێت یارمەتیتان بدات؟

—بەهیچ شێوەیەك خەمی ئەمجۆرە شتانەتان نەبێت.

—ئەی باشە چۆن خواردنی پێبدەین؟ دەبێت خواردنی تایبت بە خۆی بخوات؟ شتێك هەیە کە نابێت بیخوات؟

—نەخێر، تەنها دەبێت هاوکاری بکەین و بیکەین بە دەمییەوە.

—کێ ئەمکارە دەکات؟

—خۆم. بێخەمبە. زۆر نازەنین و جوانە. دڵنیام بەبینینی خۆشحاڵ دەبن.

هەموو شتێك ڕێکوپێك و ئامادەکرا. نیتن ویلی سواری ئۆتۆمبیلەکە کردبوو بەرەوماڵی ئێمە دەهاتن. دوو سەعات دواتریش دەهات و دەیبردەوە بۆ ماڵەوەو کارەکانی شەوانەی بۆ ئەنجامدەدا. خولکم کرد بۆ ئەوەی منیش بچم و یارمەتیان بدەم، بەلاّم هەردوکیان پێداگرییانکرد کە دەبێت ڕۆژی لەدایکبونەکەم بەخۆشی بەسەر بەرم. بەم قسەیاندا دیاربوو کە دایکوباوکم ناناسن.

لەسەعات حەوت و نیوی تەواودا دەرگای ماڵەکەمانم بەڕوی ویل و نیتندا کردەوە. ویل چاکەت و پانتۆڵێکی شیکو جوانی لەبەر کردبوو. نازانم خۆشحاڵ بم کە بە جوان و پێکەوتەییەوە هاتووە یان نیگەران بم. چونکە دایکم ئەیویست یەك سەعاتی سەرەتای ئاهەنگ و میوانییەکە بێتاقەت بێت کە بۆچی جلوبەرگێکی باشتری لەبەر نەکردووە.

لەدوای منەوە باوکیشم هاتە ناو ڕێڕەوەکەوە.

–کوڕینە ڕەمپاکە ئامادەیە؟

چونکە تەواوی پاشنیوەڕۆ باوکم سەرقاڵی دروستکردنی ڕەمپا بوو بۆ دەرگاکەی دەرەوە. نیتن بە خۆپارێزی و هێواشییەکی تەواوەوە کورسییە تایەدارەکەی ویلی پاڵپێوە دەناو بەناو ڕێڕەوی باریك و تەسکی ماڵەکەماندا تێپەڕاند. کاتێك نیتن هاتە ژوورەوە و ویستم دەرگاکە دابخەم گوتی:

–ئەمە باشە، زۆریش باشە. لەناو نەخۆشخانەکاندا لەمە خراپترم بینیوە.

باوکم دەستی بردە پێشەوەو تەوقەی لەگەڵ نیتندا کرد.

–بێرنارد کلارك.

دواتریش دەستی بەرەو ویل ڕاکێشا، بەڵام کتوپڕ حەپەساو دەستی هێنایە دواوە. بە دەمی تەتەڵە کردوەوە گوتی:

––بێرناردم، ببورە.... نەمدەزانی دەبێت چۆن چۆنی لەگەڵ.... ناکرێت تەوقە بکەین.

–هەر ئەوەی کە ڕێزی خۆتان دەربڕن بەسە!

باوکیشم ساتێك وڕبوو بە ناوبراودا. دواتر کە زانی ویل گاڵتە دەکات، بەوپەڕی ئاسودەییەوە دایە قاقای پێکەنین.

دەستێکی کێشا بەسەرشانی ویلدا و گوتی:

–بەڵێ..بەڵێ، ڕێز دەربڕین زۆریش باشە!

هەروا پێدەکەنی. بەستەڵەکەکە توایەوە. نیتن چاوێکی داگرت و دەستی ڕاوەشاند و ڕۆیشت. لەگەڵ ویلدا بەناو چێشتخانەکەدا تێپەڕین. خۆشبەختانە دایکم شانسی هەبوو، توشی ئەو کێشەیە نەبوو کە باوکم لەکاتی بینینی ویلدا و لە مەسەلەی تەوقە کردنەکەدا توشی بوو، چونکە قاپ و دەفری بەدەستەوە بوو. ئەم جوڵەیەی دایکم هەمیشە نیشانەیەکی باش بوو. بەڵام خراپی کرد کە سەرەتا دەستکێشەکەی دانەکەند. گوتی:

–ببورە شەرمەندەم، خواردنی ناو فڕن دەبێت لەکاتی خۆیدا بهێنرێتە دەرەوە.

ویل گوتی:

–تکا دەکەم. خۆ من چێشتلێنەر نیم. بەڵام عاشقی خواردنە خۆشەکانم، هەر لەبەر ئەمە ئەمویست ئەمشەو بێم بۆ ئێرە.

باوکم دەرگای بەفرگرەکەی کردەوە.

-باشە، ئەی ئەمەت پیٚ چۆنە؟ تایبەتە.

-مەمنونم.

ویل قومێکی هەڵقوڕاند. منیش لەناو چێشتخانەکەدا وەستابوم، کتوپڕ لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە خانوەکەمان چەندە بچوك و شپرزەیە. لەزگەی دیوارەکانی هی دەیەکانی ساڵی ۱۹۸۰ بوون، هەموو کابینەکانی کەوانتەری چێشتخانەکەمان شەق و شڕ بوبون. بەڕاستی ماڵی ویل بە سەلیقەیەکی زۆر جوانەوە پڕ کرابوو لە قەنەفە، دیکۆرێکی جوان و سادەی هەبوو. دیاربوو کە لەسەدا نەوەدی شتومەك و کەلوپەلەکانی ماڵی ئێمە لە هەرزان بازاڕییەکاندا کڕدرابون. هەر شوێنێکی دیوارەکە خاڵی بوو، بە قاغەزی چرچ و لۆچی ئەو وێنانەی کە تۆماس کێشابوی پڕ بوبویەوە. لەوانەیە ویل سەرنجی ئەم شتانەی دابێت، بەڵام خۆی دەرنەدەخست. باوکم و ویل بابەتێکی هاوبەشیان بۆ قسەکردن دۆزییەوە، بەڵام دواتر قسەکە هاتە سەر من و باسی ئەوەیاندەکرد کە چەندە بیٚ کەڵکم. گوێم بە قسەکانیان نەدەدا، هەرچییەك بوو گرنگ ئەوەبوو کە هەردوکیان خۆشحاڵ بوون.

-دەزانی جارێکیان کە بەگی دادەنا نەیزانی و کێشای بە سندوقی پۆستەکەدا، دواتریش خەتاکەی خستە ئەستۆی سندوقی پۆستەکە....

-دەبێت بێیت و کاتێك ئەیەوێت ڕەمپای سەیارەکە بهێنێتە خوارەوە ببینیت.

باوکم دەستیکردە پێکەنین.

هاتمە دەرەوەو ڕێگەمدا بۆ ئەوەی هەرچییەکیان پێخۆشە بیڵێن. دایکم هات بە شوێنمدا. بێتاقەت بوو. سینی پەرداخەکانی خستە سەر مێزی نانخواردنەکە، دواتر سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد.

-ئەی پاتریك لە کوێیە؟

-پاش تەواو بوونی ڕاهێنانەکانی ڕاستەوخۆ دێت بۆ ئێرە، لەوانەیە کەمێك دوا بکەوێت.

-نەدەکرا لەبەر ئاهەنگی لەدایکبونەکەی تۆ، ئەمشەو نەچێت بۆ ڕاهێنان؟ ئەگەر درەنگ بێت خواردنەکە سارد دەبێتەوە.

-دایەگیان. هیچ شتێك نابێت.

دەستم پێچا بە کەمەرییەوە باوەشم پێدا کرد. لە بێتاقەتیدا ووشك و ڕەق وەستابو. کتوپڕ بەزەییم پێیدا هاتەوە. دایکی من بوو، خۆ کارێکی ئاسان نەبوو.

—هەر بەڕاستی هیچ شتێك ڕوونادات.

سەری ماچکردم و کەمێك لێم دوورکەوتەوە. دەستێکی هێنا بە و پەڕۆیەی کە لە کەمەری خۆی بەستبوی.

—خۆزگایە خوشکەکەیشت لێرە بوایە. کارێکی باش نەبوو کە بەبێ ئەو ئاهەنگمان ڕێکخست.

بەلای منەوە بەو شێوەیە نەبوو. بۆ یەکەمینجار خەریکبوم چێژم وەردەگرت، لەبەر ئەوەی کە ناوەندی سەرنجی دەوروبەرەکانی خۆمم. لەوانەیە ئەم قسەیە منداڵانە بێت، بەڵام ڕاستی بوو. کاتێك دەمبینی باوکم و ویل بەکارەکانی من پێدەکەنن، پێمخۆش بوو. کاتێك دەمبینی هەموو خواردن و میوەو شیرینیەکان بەپێی حەزو ئارەزوی من دروستکراون، زۆرم پێخش بوو. زۆر مورتاح بووم لەوەی کە دەمتوانی هەمان ئەو کەسە بم کە پێمخۆشە و خوشکەکەم لەوێ نەبوو کە بەردەوام پێمبڵێ کە تۆ لە فلان و فلان دەچیت و ڕەخنەم لێبگرێت.

دەنگی جەرەسی دەرگاکەمان هات. دایکم دەستەکانی کێشا بەیەکدا و گوتی:

—هات، لو خواردنەکە ببە.

دەموچاوی پاتریك هێشتا بەهۆی وەرزشەوە سور بوبویەوە. بەپەلە هات و دەموچاوی ماچ کردم.

—لەدایکبونت پیرۆز بێت بچکۆلە.

بۆنی شامپۆو سابونی لێوە دەهات. قژڵێنیشی لە خۆیدابوو. سەرم بەرەو لای ژوری نانخواردنەکە ڕاوەشاند و گوتم:

—باشتر وایە یەکسەر بچین بۆ سەرمێزی نانخواردنەکە. خواردنی دایکم دەبێت ڕێك لە کاتی خۆیدا بخورێت.

پاتریك سەیری کاتژمێرەکەی خۆی کرد.

—تکایە ببورن، کاتەکەم لەدەست دەرچوو.

—تەنها کاتی خۆت لەدەست دەرنەچوو!

—بەڵێ؟

-هیچ.

باوکم ئەو مێزەی هێنابوو کە وەك چەکمەج وابوو دەچویەوە بەناو یەکدا، بە فەرمانی منیش یەکێك لە قەنەفەکانی لکاندبوو بە دیوارەکەوە بۆ ئەوەی ویل بەبێ هیچ ڕێگرییەك بتوانێت بێتە ناو ژورەکەوە. ویل کورسییە تایەدارەکەی برد بۆ ئەو شوێنە کە ئاماژەم بۆ کردبوو. دواتر کورسییەکەی ڕێککرد. ئێستە کەمێك بەرز بوبویەوە و لە ئاستی ئەوانیتردا بوو. من لەلای چەپییەوە دانیشتم و پاتریکیش لەبەرامبەرییەوە دانیشت. پاتریك و ویل و بابەگەورەم سڵاویان لەیەکتری کردو سەریان ڕاوەشان بۆ یەك. من پێشتر پاتریکم ئاگادار کردبویەوە کە دەست نەبات بۆ ئەوەی تەوقە لەگەڵ ویلدا بکات. تەنانەت کاتێکیش دانیشتبوم دەمبینی کە ویل چاودێری پاتریك دەکات. حەزم دەکرد بزانم بەو ئەندازەیەی کە کەمەندکێشی دایکوباوکم بووە، بەبینینی پاتریکیش ئاوا خۆشحاڵ بووە یان نا.

ویل سەری لارکردەوە بۆلای من.

-سەیری دواوەی کورسییەکە بکەیت دەبینی شتێکم بۆ نانی ئێوارە هێناوە.

منیش چەمامەوە و دەستمکرد بەناو جانتاکەیدا. بوتڵێکم هێنایە دەرەوە. ویل گوتی:

-هەمیشە دەبێت لە ڕۆژی لەدایکبونتدا لەمانە بخۆیتەوە.

دایکیشم کە خەریکبوو دەفری خواردنەکەی دەهێنا گوتی:

-ئۆو... سەیرکە، چەندە باشە! بەڵام ئێمە جامی تایبەتی ئەو شەرابەمان نییە.

ویل گوتی:

-ئەمە زۆر باشە.

پاتریك گوتی:

-من دەیکەمەوە.

بوتڵەکەی هەڵگرت و سیمەکەی چواردەوری سەرەکەی کردەوە. دواتر پەنجەگەورەی لە تەپەدۆرەکەی سەری گیراند. بەجۆرێك سەیری ویلی دەکرد کە هەروەك بڵێی هەمان ئەو کەسە نەبوو کە چاوەڕێی دەکرد.

-ئەگەر ئەمە بکەیت، ئەوا بە هەموو لایەکدا دەپرژێت.

کەمێك دەستی بەرز کردەوە و بە شێوەیەکی نادیار بە ئاماژە گوتی:

-ئەگەر پارچە تەپەدۆرەکەی سەری بە دەست بگریت و بوتڵەکە بسوڕێنیت، باشتر دەبێت.

باوکم گوتی:

–خۆی بوتڵەکەی باش دەناسێت. پاتریك دەی وابکە. بوتڵەکە بسوڕێنە.

پاتریك گوتی:

–دەزانم. خۆیشم ئەمویست هەر ئەمکارە بکەم.

بە خێرو خۆشی بوتڵەکە کرایەوە. بە سەلامەتی یادی لەدایکبونەکەی من خواردمانەوە. بابەگەورەم شتێکی گوت کە بە (ئافەرین) هاتە بەرگوێم.

منیش هەستامەوەو ڕێزی خۆم نواند. کراسی کورتی کەمەرچینی زەردی مۆدێلی دەیەی ١٩٦٠ م لەبەردا بوو، کە لە فرۆشگای خێرخوازیدا کڕیبوم. هەرچەندە لۆگۆکەیان لێکردبویەوە، بەڵام فرۆشیارەکە گوتبوی لەوانەیە مارکەی (بیبا) بێت.

باوکم گوتی:

–هیوادارم ئەمساڵ ئیتر لو گەورە ببێت. سەرەتا ویستم بڵێم کە هیوادارم ڕێگەی خۆی لە ژیاندا بدۆزێتەوە. بەڵام وادیارە سوپاس بۆ خودا ڕێگەکەی دۆزیوەتەوە. ویل، دەبێت بڵێم لەوکاتەوەی کە کار بۆ ئێوە دەکات ڕێگەکەی دۆزیویەتیەوە. لە کۆتاییدا لە لاکی خۆی هاتوەتە دەرەوە.

دایکم گوتی:

–جێگەی شانازی ئێمەیە، بۆ ئێوەش زۆر باشبووە کە داتان مەزراندووە.

ویل لە ژێرچاوەوە سەیرێکی منی کرد و گوتی:

–منیش زۆر سوپاسی دەکەم.

باوکم گوتی:

–من شانازی دەکەم بە (لو) بەهۆی ئەو سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکانەیەوە.

دایکم گوتی:

–هەروەها ئەندامانیتری خێزانەکەمان کە ئێستە لەلامان نین.

گوتم:

–وادیارە دەبێت هەموو ساڵێك ئاهەنگی یادی لەدایکبون بگێرم! خۆ ڕۆژەکانیتر هەمیشە سەرقاڵی هەراو هۆریاو شەڕکردنن.

دواتر سەرقاڵی قسەکردن بوون. باوکم کۆمەڵێك داستانی لە بەسەرهاتەکانی من گێڕایەوە و لەگەڵ دایکمدا پێدەکەنین. خۆشحاڵ بووم کە دەمبینین پێدەکەنن. ئەم هەفتانەی دوایی باوکم زۆر ماندوو پەرێشان دیار بوو. دایکیشم پەرێشان بوو چاوەکانی چوبونەوەی بە قوڵاییدا. هەروەك بڵێی ڕۆحی لە شوێنێکیتر بێت. حەزم دەکرد خۆشحاڵ بن و چێژ لە ساتەکانیان وەربگرن و بەدبەختیەکانیان لەبیر بچێتەوە. قسە بکەن و پێبکەنن و سەرلەنوێ ڕۆحیەتێکی شاد بەدەستبهێننەوە. هەربۆیە بۆ ساتێك هەستم کرد پێمناخۆش نابێت کە تۆماس و ترینایش لێرە بونایە.

بەجۆرێك بەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بوبوم، زۆری پێچوو تاوەکو بە قیافەی پاتریك بزانم. خەریکبوم خواردنم بە ویل دەدا، پارچەیەك ماسی دوکەڵیم هەڵگرت و خستمە ناو دەمی ویلەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خەریکبوم شتێکم بە بابە گەورەم دەگوت. بەشێك بوو لە ژیانی ڕۆژانەم کە هەرگیز بیرم لێنەدەکردەوە. هەربۆیە کاتێك قیافەی سەرسامی پاتریکم بینی، زۆر سەرم سوڕما.

ویل شتێکی بە باوکم گوت، منیش واقم بە پاتریکدا وڕمابوو. حەزم نەدەکرد بەوشێوەیە سەیری ویل بکات. لەلای ڕاستیەوە بابەگەورەم شۆخ و شەنگ کە یاری بە خواردنەکەی دەکرد. دەنگە دەنگێکی دروستکردبوو، هەمهەمەو ژاوەژاوێکی دڵخۆشانە، کە ئێمە ناومان لێنابوو (هات و هاواری نانخواردن). ویل ڕویکردە دایکم و گوتی:

–چ ماسییەکی خۆشە، بەڕاستی بەتامە!

دایکیشم بە زەردەخەنەوە گوتی:

–ئەمە خواردنێك نییە کە هەمیشە بیخۆین، ئەمانویست ئەمشەو لەگەڵ ڕۆژانیتردا جیاواز بێت.

هەموو هەوڵێکی خۆمم دەدا بۆ ئەوەی پاتریك تێبگەیەنم کە بەمشێوەیە سەیر نەکات. لە کۆتاییدا تێگەیشت و ڕوی لە ویل وەرگێڕا. بە بێتاقەت و بێزار دەهاتە پێشچاو.

پارچەیەکیترم خستە دەمی ویلەوە. دواتر دەبینم سەیری نانەکە دەکات، پارچەیەك نانیشم خستە ناو دەمییەوە. لەوکاتەدا زانیم ئیتر هێندە شارەزای خواست و داواکارییەکانی ویلم بووم کە پێیوستناکات سەیری بکەم بۆ ئەوەی بزانم چی دەوێت. ویل کە بەگریمان هەستی کردبوو بێتاقەتم، گوتی:

–پاتریك، لو دەڵێت ڕاهێنەری وەرزشیت، چ کارانێك دەکەیت؟

خۆزگایە نەیپرسیایە. پاتریك چویە سەر بڵنگۆ، ئیتر بۆ وازی لە قسەکردن دەهێنا! دەستیکرد قسەکردن لەبارەی ئەنگێزەو ئامانج و مەبەستە شەخسیەکانی خۆیەوە و ئەوەی کە چۆن لەشجوانی یارمەتیدەرێکی باشە بۆ تەندروستی رۆح. دواتریش دەستیکردە قسەکردن لەسەر بەرنامەی ڕاهێنانەکانی بۆ پێشبڕکێکە. من لەگەڵ ئەم قسانەدا ڕاهاتبوم، بەڵام لەوکاتەدا کە ویل لەلام دانیشتبوو، ئەم قسانەم زۆر بە ناپەوەندیدار دەبینی. باشە بۆچی ویل پرسیارێکی ناڕونی لەمجۆرەی کرد و دواتر بێدەنگبوو؟

–کاتێك لو گوتی تۆ دێیت، لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە کە سەیرێکی کتێبەکانم بکەم و بزانم هیچ وەرزشێك هەیە بۆ ئەوەی بڵێم تۆیش ئەنجامی بدەیت.

سەرقاڵی خواردنەوەکەم بووم و نوتقم لێبڕابوو.

–پاتریك، زۆر پسپۆڕییە. باوەڕناکەم لە بواری پسپۆڕی تۆدا بێت.

–من کارە پسپۆڕییەکان دەکەم، لەگەڵ مرۆڤە زیانبەرکەوتوەکاندا کار دەکەم. وەرزشی چارەسەری ئەنجام دەدەم.

–خۆ گلۆڵەو قولەپێی قاچت دەمارەکانی دەرنەکەوتون!

–یەك دوو ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ کەسێکدا کارم کرد کە لەکەمەرییەوە بەرەوخوار توشی ئیفلیجی بوبو، خۆی دەڵێت ئێستە باشبوەتەوە. لەناو پێشبڕکێی سێ لایەنەو زۆر شتیتردا بەشداری دەکات.

دایکم گوتی:

–چەندە باشە!

–دەڵێن لێکۆڵینەوە نوێکان لە وواڵتی کەنەدا ئەوەیان نیشانداوە کە ئەگەر ڕاهێنان بە ماسولکە بکەیت، ئەوا سەر لەنوێ دەتوانێت دەستبکاتەوە بە چاالکی. ئەگەر بەباشی دەمار بەکاربهێنی، ڕۆژانە وەرزش بکەیت، وەك شوێنی یەکگرتنەوەی دوو خانەی دەماری مێشك، دووبارە دەگەڕێتەوە. گرەو دەکەم ئەگەر بەرنامەی ڕاهێنان بەباشی جێبەجێ بکەیت، دەبینی کە دەمارەکانی جەستەتان چەندە باشتر دەبن. سەرەڕای ئەمانەیش لو دەڵێت پێشتر تۆ کەسێکی وەرزشکار بویت.

بە دەنگی بەرز گوتم:

—پاتریك تۆ هیچ شتێك لەمبارەیەوە نازانیت!

—تەنها ویستم...

—وازی لێبهێنە، ئیتر باسی مەکە.

هەموان لەدەوری مێزەکەدا بێدەنگبون. باوکم کۆکی، دواتریش داوای لێبوردنی کرد. بابەگەورەم بە شێوەیەکی نیگەرانکەر سەیری جێگەیەکی دەکرد.

دایکیشم جوڵەیەکیکرد هەروەك بڵێی ئەیەوێت فەرموو لە هەموان بکات بۆ نانخواردن، بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە.

پاتریك دووبارە دەستیکردەوە بە قسەکردن، بە ئاوازێك کە زۆر بێزار دەهاتە پێشچاو.

—کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە هەیە کە پێموایە کاریگەریان هەبێت. بەڵام شتێکی زیاترییان لەبارەوە نازانم و ناتوانم بیرو بۆچونی خۆم لەوبارەیەوە دەرببڕم.

ویل بە ئەدەبەوە زەردەخەنەیەکی کرد و سەیرێکی پاتریکی کرد، نەدەتوانرا شتێك لە دەموچاوی بخوێنرێتەوە.

—بەدڵنیاییەوە بەدواداچونی بۆ دەکەم.

هەستامەوە بۆ ئەوەی قاپەکان کۆ بکەمەوە. ئەمویست لەسەر مێزەکە رابکەم. بەڵام دایکم لێم تورە بوو گوتی دەبێت دابنیشم.

—وادیارە ئاهەنگی لەدایکبونی تۆیە!

هەروەك بڵێی کاتەکانیتر مۆڵەتی پێدەدام کە کاری ماڵەوە بکەم!

—برنارد، دەچیت مریشکەکە بهێنی؟

لەپاش ئەوە ئیتر کێشەیەك دروست نەبوو پاشماوەی خوارنەکەمان خوارد. ڕێك دەمزانی کە دایکو باوکم کەمەندکێشی ویل بوون. بەڵام پاتریك کەمتر. پاتریك و ویل لەپاش ئەوە کەمتر بەیەکەوە قسەیان کرد. دواتر دایکم پەتاتەی تەنوری بۆ هەموان تێکرد، باوکیشم وەك هەمیشە هەوڵیدا کە بەشێکی زیاتر بۆ خۆی ببات، لێرەدا بوو کە کەمێك هێمن بومەوە و نیگەرانیشم کەمتر بویەوە. باوکم لە هەموو بارەیەکەوە پرسیاری لە ویل کرد و شتانێکی زۆری پرسی، لە ژیانی رابوردویەوە تاوەکو دەعمەکەی. وادیاربوو ویلیش ئاسودە و ئیسراحەت وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە. لەڕاستیدا کۆمەڵێك شتم زانی کە پێشتر نەمزانیبون. بۆ نمونە کارێکی گرنگی هەبوو. هەرچەندە هەوڵیدا کە بەبێ نرخ نیشانی بدات. کڕین و فرۆشتنی بە پشکی

کۆمپانیاکانەوە دەکرد و قازانجێکی باشی دەکرد. باوکیشم بە شێوەیەکی زەینی حیسابی دەکرد و هەرجارێك قازانجێکی فراوانی دەکرد. دەبینم واقم بە ویلدا وڕماوە، بە خۆمم دەگوت ئەم پیاوەی کە دەیناسم هەمان ئەو سەرمایەدارە خاوەن ئیرادەیە کە ئێستە خەریکە پێناسەی دەکات. باوکم باسی ئەو کۆمپانیایەی دەکرد کە بڕیاربوو کارگەی دروستکردنی قەنەفەکان بکرێت. دواتر کاتێك ناوی کارگەکەی هێنا، ویل بە داخەوە سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی بەڵێ ئەو کۆمپانیایە دەناسێت. بەڵێ، لەوانە بوو خۆیشی ببوایەتە کڕیاری. بەجۆرێك قسەی دەکرد هەروەك بڵێی نەدەکرا هیچ هیوایەك بە کارەکەی باوکم هەبێت.

دایکم لەژێر لێوەوە شتێکی دەگوت و بەهبەهو چەهچەهی دەکرد. کاتێك زەردەخەنەکەیم بینی، تێگەیشتم کە پیاوی گەنجی جێگەی پەسەندی سەر مێزی نانی ئێوارە لەلای دایکم ویلە نەك پاتریك. پاتریکیش بەتەواوەتی بێ حاڵ بوو.

کاتێك دایکم سەرقاڵی کۆکردنەوەی دەفرەکان بوو، بابە گەورە گوتی:

—کێکی لەدایکبونەکەتە؟

هێندە ڕوون و سەرسوڕهێنەر بوو کە من و باوکم توشی شۆك بوین و سەیری یەکتریمان کرد. هەموو دانیشتوانی دەوری مێزەکە بێدەنگبون، بەدەوری مێزەکەدا سوڕامەوە و بابەگەورەم ماچکرد و گوتم:

—نا، بابەگەورە، شەرمەزارم، کێکی شوکولاتییە، حەزت لێیەتی.

سەری وەك بەڵێ ڕاوەشاند. دایکشم زەردەخەنەی بەسەر لێوەوە بوو. کێکە شکولاتیەکە هێنرایە سەر مێزەکە، لەگەڵیدا دەستەیەکی چوارگۆشەی وەك دەفتەری ڕێنمای تەلەفۆن کادۆی پێچراوە هەبوو. پاتریك گوتی:

—دیاری لەدایکبون؟ بەڵێ، ئەمەش بۆ تۆ.

زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و دیارییەکەی خستە سەر مێزەکە. منیش لە وەڵامدا زەردەخەنەیەکم بۆکرد. ئێستە کاتی دەمەقاڵێ نەبوو، باوکم گوتی:

—خێراکە بیکەرەوە.

سەرەتا دیارییەکەی دایکوباوك کردەوە. کاغەزی کادۆکەم بە هێواشی دەکردەوە بۆ ئەوەی نەدڕێت. ئەلبومی وێنە بوو هەموو لاپەڕەکانی پڕ بوون لە وێنەی منداڵی خۆم. لە شوێنێکدا منداڵم، من و ترینا دوو منداڵی جوانی خەپانەین کە زۆر توڕە دێینە بەرچاو. یەکەم ڕۆژ کە

چووم بۆ ئامادەیی تەنورەکە گەورەبوو بۆم و بە سنجاق قژەکانم کۆ کردبویەوە. کۆمەڵێك وێنەی نوێیشی تێدا بوو.

من و پاتریك، لەخودام دەویست کە ڕێگەی بگرێتە بەرو کەمێك زوتر بڕوات. دووبارە وێنەکەی خۆم بە تەنورەی خۆڵەمێشییەکەی یەکەم ڕۆژ کە چومە سەرکار بینی. کە لەناو وێنە خێزانییەکانماندا بوو، وێنەکانی تۆماس و ئەو نامانەی کە قوتابخانە بۆ گەشتی زانستی دەیناردن لەناو ئەلبومەکەدا بوون. دەستخەتی منداڵێك کە لەبارەی گەشتکردنمان بۆ کەنار دەریا نوسیبوم. باسی ئەو دۆندرمانەم نوسیبوو کە کەوتبونە سەر زەوییەکە، لەگەڵ باڵندە دەریاییەکان کە لەسەر ئاوەکەوە ماسیان قوت دەداو بە فڕین دەگەڕانەوە. ئەلبومەکەم هەڵدایەوە، ساتێك سەیری وێنەی ئەو کچەم کرد کە قژە درێژە ڕەشەکانی دابویە دواوە. دواتر ئەلبومەکەم داخست، ویل گوتی:

—دەکرێت سەیری بکەم؟

کاتێك لاپەڕەکانی ئەلبومەکەم بۆ ویل هەڵدەدایەوە، دایکم بە ویلی گوت:

—ئەمساڵ ساڵێکی باش نەبوو، ئەڵبەتە ئێستە باشترین و بارودۆخمان باشە. بەڵام خۆت دەزانی هەندێکجار کۆمەڵێك شت دێنە پێشەوە. بابەگەورە بەرنامەیەکی لەناو تەلەفیزیۆندا سەبارەت بەوەی کە خۆتان داهێنان بکەن و دیاری دروستبکەن بینیبو. منیش ئەم ئەلبومەم دروستکرد و پێموابوو کە شتێکی سەرنجڕاکێشە... خۆ ئاگات لێمە، گوتم سەرنجڕاکێشە.

چاوم پڕ بوو لە فرمێسك. گوتم:

—دایە گیان، بەڕاستی جوان و سەرنجڕاکێشە. زۆر زۆر باشە! زۆرم پێخۆشبوو. بەڕاستی مەمنونم.

گوتی:

—چەند دانە لەم وێنانە هەڵبژاردەی بابە گەورەیە.

ویل گوتی:

—زۆر جوانە.

دووبارە گوتم:

—زۆر بەلامەوە خۆشبوو.

ئەو هەناسە ئیسراحەتەی کە دایکوباوکم هەڵیانکێشا، خەمگین ترین شتێك بوو کە لەتەمەنمدا بینیبوم. پاتریك بەستەیەکی بچوکی لەسەر مێزەکە پاڵپێوەناو گوتی:

—دەی ئێستە کادۆکەی من بکەرەوە.

بە هێواشی کردمەوە. ساتێك شپرزە بووم کە لەوانەیە ئەڵقەی دەستگیرانی بێت. هەگیز ئامادە نەبووم. هێشتا نەمدەتوانی بیری لێبکەمەوە کە بچمە ناو ژیانی ژن و مێردایەتیەوە. پاکەتە بچوکەکەم کردەوە، لەناوەڕاستی قوماشە مەخمەڵە شینە تێرەکەدا زنجیرێکی ئاڵتونی زۆر جوان هەبوو کە ئەستێرەیەکی بچوکی پێوە بوو. زۆر جوان بوو بە سەلیقەیەکی جوانەوە هەڵبژێردرابوو، بەڵام لەوجۆرانەی من نەبوو. هەرگیز لە تەمەنمدا ئەمجۆرە خشڵانەم بەکار نەهێنابوو.

سەیرم کرد و بیرم کردەوە کە چی بڵێم. پاتریك چەمایەوە و ملیوانەکەی کردە ملمەوە. گوتم:

—زۆر جوانە.

پاتریك گوتی:

—خۆشحاڵم کە بەدڵتە.

لێوی ماچکردم. تاوەکو ئەو ڕۆژە لەلای دایکوباوکم بەوشێوەیە ماچی نەکردبووم.

ویل سەیری منی دەکرد، بە دەموچاوێکی ساردو سڕو بێ هەستەوە. باوکم گوتی:

—باشە، ئێستە دەبێت پودینگ بخۆین پێش ئەوەی گەرم ببێت.

دواتر بەهۆی قسە پێکەنیناوییەکەی خۆیەوە دەستیکردە قاقای پێکەنین. خواردنەوەکە بەتەواوەتی کاریگەری کردبویەو سەر هەموو جەستەی و کەمێك مەست بوبو.

ویل بە هێمنیەوە گوتی:

—لەناو جانتاکەمدا شتێکم بۆ هێناویت. جانتا ڕەشەکەی پشتی کورسییەکە. بەرگێکی کادۆی نارنجی پێوەیە.

پاکەتەکەم لەناو کۆڵە پشتەکەی ویلدا دەرهێنا. دایکم وەستا، کەوچکی کێکەکە بەدەستیەوە بوو.

—ویل، دیاری و کادۆت بۆ لو هێناوە؟ بەڕاستی لوتفت نواند. بێرنارد دەبینی چ لوتفێکی کردووە، ئەی وانییە؟

—بەڕاستی لوتفی نواندووە.

کاغەزەکە نەخشێکی ڕۆشنی کیمونە چینیەکانی هەبوو. یەکسەر بەخۆمم گوت کاغەزی کادۆکە هەڵدەگرم، تەنانەت لەوانەبوو جلوبەرگێکی لەو ڕەنگەیش بکڕم و لەبەری بکەم. قردێلەکەم کردە و خستمە لاوە بۆ ئەوەی دواتر سودی لێوەربگرم. لەپاشان کاغەزی بەستەبەندییەکەم کردەوە. لەناو پاکەتەکەدا، گۆرەوییەکی پانتۆڵی خەت خەتی زەرد و ڕەشی سەیرو سەمەرەی تێدابوو. قیاسە گەورەکەی، خوری و مات، هێندە نەرم و ناسك بوو کە لەدەستم دەخلیسکا. گوتم:

—باوەڕ بەچاوەکانم ناکەم.

دەستمکردە پێکەنین. پێکەنینێکی سەرخۆشانەی چاوەڕواننەکراو.

ئەی خودای گەورە! ئەمەت لە کوێ دەستکەوتووە؟

—خۆم داومە بە کردن. خۆشحاڵ دەبیت ئەگەر بزانی لەڕێگەی ئامێرو بەرنامەی ناسینەوەی دەنگەوە داوامکردوە و بە کردنمداوە.

پاتریك و باوکم بەیەکەوە گوتیان:

— گۆرەوی پانتۆڵی؟

—جوانترین گۆرەی پانتۆڵی دوونیا.

دایکم بە وردی سەیرێکی کرد و گوتی:

—من دڵنیام کاتێك منداڵ بویت دانەیەکی لەمەت هەبوو.

من و ویل سەیری یەکتریمان کرد. نەمدەتوانی ڕێگە لە پێکەنین و زەردەخەنەکەم بگرم. گوتم:

—حەز دەکەم هەر ئێستە لەبەری بکەم.

باوکم هەروا کە سەری ڕادەوەشاند گوتی:

—خودایە گیان ڕێك وەك مکس ڤالی[20] ناو فیلمی (کندو)ت لێدێت.

—برنارد، ئاهەنگی لەدایکبونیەتی! حەزی لە هەرچییەك هەیە دەتوانێت لەبەری بکات.

---

[20] هونەرمەندی کۆمیدی ئینگلیزی (١٩٩٠ – ١٩٠٨)

لەناو ژورەکەدا ڕامکردە دەرەوە. لەناو ڕێڕەوەکەدا دەرقاچەیەکم کردە بەرم، پەنجە گەورەم بەرز کردەوە و چێژم لە نەرم و نۆڵییەکەی وەردەگرت. باوەڕناکەم لە تەمەنمدا هیچ دیارییەك هێندە خۆشحاڵی کردبم.

گەڕامەوە و ویل بە هێواشی گوتی: هۆو..، بابەگەورە کێشای بەسەر مێزەکەدا، دایکو باوکیشم دەستیانکردە پێکەنین. پاتریکیش ماتی کردبوو.

گوتم:

–هەرگیز ناتوانم بە چ زمانێك بڵێم کە چەندە عاشقی ئەم گورەوییە پانتۆڵییەم. زۆر سوپاس، بەڕاستی سوپاست دەکەم.

دەستم بردە پێشەوە کێشام بەسەرشانیدا.

–پڕ بەدڵ حەزم لێیەتی و پێمخۆشە.

ویل گوتی:

–پاکەتێکی نامەش هەیە، دواتر بیکەرەوە.

***

کاتێك ویل خەریکبوو دەڕۆیشت باوکم دایکم بەشێوەیەکی زۆرو زەوەند لاواندیانەوە.

باوکم کە مەست بوبو، بەردەوام سوپاسی ویلی دەکرد کە دایمەزراندوم.

–ئەگەر ڕۆژێك کارەکەمم لەدەستدا دێم بۆماڵتان و بەیەکەوە سەیری یاری دەکەین.

ویل گوتی:

–چەندە باش دەبێت! منیش پێمخۆشە.

هەرچەندە هەرگیز نەمبینیبو کە سەیری یاری تۆپی پێ بکات.

دایکم کەمێك کێکی شوکولاتی پێچایەوە و بە زۆر دایبە ویل.

–زانیم حەزت لێیەتی.

وادیاربوو تاوەکو یەك سەعات لەپاش ڕۆیشتنی ئەیانویست بەشانوباڵیدا هەڵبدەن و بڵێن چ پیاوێك بوو! بەڕاستی پیاوێکی پیاوانەیە!

پاتریکیش تاوەکو ڕێڕەوەکە هات. دەستی کربوو بەبنی گیرفانیدا. وادیاربوو ئەیویست کێشەی تەوقەکردن لەگەڵ ویلدا چارەسەر بکات.

خۆشترین خەیاڵێکبوو کە دەمتوانی بیری لێبکەمەوە. ویل گوتی:

—خۆشحاڵم بە بینینت زۆر سوپاس بۆ ڕێنماییەکانت.

—ئۆو... تەنها لەبەر ئەوە بوو کە لوی هاوڕێم بتوانێت بەباشترین شێوە کارەکەی ئەنجامبدا.

ووشەی (هاوڕێم)ی زۆر بە جەختەوە گوتبوو. ویل گوتی:

—پیاوێکی بەشانسی.

نیتن ناوبراوی بەرەو لای دەرگاکە برد.

—لەسەر جێگایش بەباشی مرۆڤ دەشوات.

ئەم قسەیەی بەخێراییەوە کرد و پێش ئەوەی پاتریك بەتەواوەتی سەرنج بداتە سەر قسەکەی، دەرگاکە داخرا.

***

—خۆ نەتگوتبو لەسەر جێگەکەی دەیشۆیت.

هاتبوین بۆ ماڵی پاتریك، ئاپارتمانێکی تازە دروستکراوبو لە قەراخی شاردا. لەگەڵ ئەوەی کە دەیڕوانی بەسەر پارکێکی بچوکدا و سێ قات زیاتر نەبوو. وەك ژیانی ناو ژێرزەمین وابوو.

—مەبەستی چی بوو؟ مەگەر تۆ هەموو شوێنێکی بۆ دەشۆیت؟

پەمپی ئاوپرژێنی حەلاقەکەم هەڵگرت، یەکێك لەو کەرەستانە بوو کە ڕێگەی پێدابوم لەناو ماڵەکەیدا دایبنێم. بە کلێنسێکی ئارایشتی دەستمکردە سڕینی ماکیاجەکەم.

—خۆی گوتی:

—گاڵتەی لەگەڵدا دەکردی. ئەڵبەتە حەقی خۆت بوو، ئەوەندە دووبارەت کردەوە کە پیاوێکی وەرزشکارو چالاکبوو.

—ئەی باشە چ کارانێکی بۆ ئەنجامدەدەیت؟ هەرچەندە بەدڵنیاییەوە هەموی ناڵێیت.

—هەندێکجار دەیشۆم، بەڵام تاوەکو کەمەر.

سەیرکردنەکەی پاتریك زۆر شتی لێدەخوێنرایەوە. بەڵام لە کۆتاییدا ڕوی خۆی وەرگێڕا، گۆرەوییەکەی داکەند و خستیەناو سەبەتەی جلوبەرگە چڵکنەکانەوە.

—لە سەرەتاوە شتێکی وا لە ئارادا نەبوو. نەیانگوتبوو دەبێت لەمجۆر کارانە بکەیت. ئەمجۆرە کارە زۆر شەخسیانە لەناو وردەکاری ئیشەکەدا نەبوو.

دواتر کتوپڕ شتێك هات بە مێشکیدا.

–دەتوانیت سکالاّ بکەیت. وازهێنان لەکارەکەت بە شێوەیەکی یاسایی. بەڵێ هەر ئەمە. خۆ ئێستە هەلومەرجی کارەکەیان گۆڕیوە.

–قسەی بێمانا مەکە. ئەو کاتانە ئەوکارە دەکەم کە نیێن لەوێ نییە. بۆ ویل زۆر قورسە کە غەریبەیەك لە کۆمپانیای خزمەتگوزارییەوە بێت و ئەمکارانەی بۆ بکات. ئێستە لەسەر ئەمکارانە ڕاهاتوم، بەڕاستی ماندونابم.

چۆن دەمتوانی بۆی ڕونبکەمەوە کە مرۆڤ دەتوانێت خوو بگرێت بە جەستەیەکەوە؟ دەمتوانی بەوپەڕی شارەزاییەوە سۆندەکانی بۆ بگۆڕم و بەبێ ئەوەی کە کەمترین وەستان لە قسەکانماندا هەبێت و بە ئیسفەنج بەشی سەرەوەی کەمەری بۆ بشۆم.

تەنانەت جێگەی برینەکەی سەر مەچەکیشی بەلامەوە ئاسایی بوبویەوە. ماوەیەکی زۆر تەنها شتێك کە دەمبینی و سەرنجم دەدا ئەوە بوو کە مەبادا دەستبداتە خۆ کوشتن. ئێستە تەنها ویل بوو بۆمن، ویلێك مرۆڤی کەللەیی دەکرد و خاوەنی میزاجێکی سات ساتی و پێشبینی نەکراو بوو. کەسێکی هۆشیارو لەبەردڵان بوو. کەسێك بوو کە لەگەڵ مندا ڕەفتاری پیاوانە و گەورانەی هەبوو. جەستەی بەلای منەوە تەنها بەشێك بوو لە هەموو بوون و وجودی، شتێك کە لەناوبڕی قسەکانماندا پێیڕادەگەیشتم. بەلای منەوە کارەکانی پەیوەست بە جەستەیشی سەرنجڕاکێشی تایبەت بەخۆی هەبوو.

–باوەڕناکەم من و تۆ کە هاوڕێی نزیکی یەکترین، ماوەیەکی زۆر بێت یەکتریمان نەبینیبێت... لەم نێوەندەدا غەریبەیەك هەیە کە تۆ زۆر خۆشحاڵیت کاتی خۆتی لەگەڵدا بەسەر بەریت و هەمیشە لەلای بیت و....

–دەکرێت ئەمشەو واز بهێنیت و ئەوەندە لەسەر ئەعساب نەبیت؟ وادیارە بە ناخێری گیانم ناهەنگی لەدایکبونمە!

–ئەوە من نەبووم کە دەستمپێکرد، ئەی مەگەر من بووم کە باسی گەرماوو ئەمجۆرە شتانەم کرد؟

–لەبەر ئەوەیە کە قۆزە ئەرێ؟ لەوانەیە بەلاتەوە باشتر بوایە کە بونەوەرێکی ڕووەکی بێت، ئەوکات ئیسراحەتتر بویت، ئەی وانییە؟

–کەواتە بەلای تۆوە کەسێکی قۆزە.

–هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کە تۆ ئیرەیی پێبەریت.

—من ئیرەیی پێنابەم.

بە ئاوازێکی ساردو سڕو بێ مەیلەوە لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—باشە چۆن دەکرێت ئیرەیی بە کەسێکی کەمئەندام و ئیفلیج ببەیت؟

ئەو شەوە پاتریك ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا بۆ ئەوەی من بگەمە ڕەزامەندی تەواو، سەرکەوتویش بوو. بەڵام ئەوە تەنها لەبەر ویل بوو.

دواتر پاتریك یەکسەر خەوی لێکەوت، بەڵام من هەرچییەکم کرد خەوم لێنەکەوت. هەستامەوەو چوم بۆ قاتی خوارەوە، لەناو جانتاکەمدا کتێبی کورتە چیرۆکەکانی فلانری ئوکانرم دەرهێنا و زەرفی نامەکەیش لەگەڵیدا کەوتە خوارەوە.

بە مات و مەلولییەوە سەیری نامەکەم دەکرد. کارتەکەی ویل بوو. کاتێك لەسەر مێزەکە بوین. نەمکردبویەوە. ئێستە ئەوکارەم کرد و نامەکەم کردەوە. هەستمکرد شتێکی لەناودا هەیە. کارتەکەم بە هێواشی هێنایە دەرەوە، لەناویدا دە دراوی کاغەزی پەنجا پاوەندی هەبوو. دووبارە ژماردمەوە. باوەڕم نەدەکرد کە بەباشی بینیومە. لەناو کارتەکەدا نوسرابوو:

***(دیاری یادی لەدایکبونە. قەرەچی بازی مەکە، یاسا ناچارت دەکات! ویل)***

{١٤}

مانگی گولانی ئەو ساڵە زۆر سەیرو نامۆ بوو. ڕۆژنامەکان و تەلەفیزیۆنەکان پڕ بوون لە مانشێت و بەرنامەگەلێك کە پێیاندەگوتن (مافی مردن). ژنێك کە توشی نەخۆشییەکی چارەسەر نەکراو بوبو، پێشنیاری کرد کە دەبێت یاسا بەرگری لە هاوسەرەکەی بکات بۆ ئەوەی کاتێك نەخۆشییەکەی گەیشتە ئاستێکی توند و خراپ، بتوانێت بیبات بۆ (دیگنیتاس). یاریزانێکی گەنج، پاش ئەوەی کە قەناعەتی بە دایکوباوکی کرد کە بیبەن بۆ ئەو شوێنە، خۆی کوشت. پۆلیسیش هاتبویە ناو مەسەلەکەوە. لەناو ئەنجومەنی پیرانی بەریتانیاشدا دەمەقاڵێگەلێکی زۆر بوبو.

سەیری ڕاپرۆتە هەواڵییەکانم دەکرد، گوێم بۆ باس و خواسە یاساییەکان دەگرت کە خەڵکانی پسپۆڕ بابەتەکەیان لە ڕووە ئەخلاقیەکانیەوە هەڵدەسەنگاند. بەلاّم من ئەمشتانەم زۆر بە ناپەیوەندیدار بە ویلەوە دەبینی.

لەو ڕۆژانەدا، ئێمە وردە وردە توانیبومان زیاتر لە جاران قەناعەت بە ویل بکەین و بیبەینە دەرەوە. دەچوین بۆ سەیرکردنی نمایش، دەچوین بۆ سەیرکردنی سەمای موریس(ویل بە قیافەیەکی ووشك و جیدییەوە سەیری دەستماڵی زەنگوڵەی سەماکارەکانی دەکرد، بەلاّم لەبەر ئەو فشارەی کە لە خۆی دەکرد کەمێك دەموچاوی سور دەبویەوە)، ڕۆژێکیان عەسر بوو چوین بۆ کۆنسێرتی یەکێك لە شارە نزیکەکان، (زیاتر ئەو حەزی لێبوو تاوەکو من). جارێکیان چوین بۆ سینەمایەك کە چەند فیلمێکی نمایش دەکرد، بەلاّم بەهۆی لێکۆڵینەوەی کەمی منەوە، یەکێك لە فیلمەکان سەبارەت بە کچێك بوو کە نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراوی گرتبوو.

دەمزانی ویل گوێ بۆ هەواڵەکانی ڕۆژ دەگرێت. لەوکاتەوەی کە ئامێرو بەرنامە نوێکەمان بۆ دابینکردبوو، کاتێکی زیاتری لەگەڵ کۆمپیوتەردا بەسەر دەبرد. ئێستە ئیتر فێر بوبو کە بەیارمەتی پەنجە گەورەی ماوسەکە بخاتە سەر لاپەڕەکە. ئەم ڕاهێنانە قورسە، ناوبراوی

والێدەکرد کە بتوانێت هەواڵەکانی ڕۆژ لەناو ئینتەرنێتدا بخوێنێتەوە. ڕۆژێکیان بەیانی زوو کاتێك کوڕێك چایم بۆ هێنا، دەبینم سەرقاڵی خوێندنەوەی کۆمەڵێك بابەتە سەبارەت بەو یاریزانە گەنجە، نوسراوگەلێك بە وردەکارییەکانیەوە سەبارەت بەو هەوڵ و کۆششانەی کە ئەو گەنجە بۆ خۆکوشتن ئەنجامیدابون لەو بابەتەدا نوسرابوو. کاتێك زانی کە لەدوایەوە وەستاوم، لاپەڕەکەی گۆڕی، ئەمکارەی بوغزێکی وەهای لە گەرومدا بەدیهێنا، کە بەڕاستی نیوسەعاتی برد تاوەکو نەمێنێت.

چوم بۆ کتێبخانە و ئەو بابەتەم لەناو کۆمپیوتەردا خوێندنەوە. ئێستە ماوەیەکی زۆر بوو کە ڕۆژنامەم دەخوێندەوە. دەمبینی کە قسەو باس لەمبارەیەوە زۆر گەرم بووە. ئەو زانیارییانەی کە دەخرانەڕوو بە کۆمەڵێك حەقیقەتی تاڵ و جەرگبڕ کۆتاییان دەهات، زۆربەیان شتانێکی باش نەبوون.

چاپەمەنییە جەناجاڵەکان، ڕەخنەیان لە دایکوباوکی یاریزانە گەنجە دەگرت. تایتڵیان بەمجۆرە چاپ دەکرد (چۆن دەیانتوانی وازم لێبهێنن کە بمرم؟) منیش ئەم هەستەم هەبوو. (لیومکینرنی) تەمەنی تەنها بیست و چوار ساڵ بوو. سێ ساڵ لەمەوبەر توشی پێکان بوو کە ماوەکەی زۆر لە ویل زیاتر بوو. ئایا بێ ئەزمونتر بوو لەوەی کە بڵێت شتێك نەماوەتەوە بۆ ژیان. بابەتێك کە ویل لەبارەیەوە خوێندبویەوە، هیچ تێڕوانینێکی کارناسانەی تایبەتی نەدەخستەڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی ورد هەڵسەنگاندنی بۆ ئەوە دەکرد کە لەژیانی ئەم گەنجەدا ڕویدابوو. وادیاربوو نوسەرەکە قسەی لەگەڵ دایکوباوکیدا کردبوو.

دەڵێن لیو لە سێ ساڵییەوە یاری تۆپی پێی کردووە. هەموو ژیانی یاری بوو. لە ڕووداوێکدا توشی نەخۆشییەك دەبێت، کە دەیانگوت لە ملیۆنێکدا یەك کەس توشی دەبێت، کاتێك تکلەکە بەهەڵەدا چوو ئەو زیانەی بەرکەوت. هەموو کارێکی بۆ دڵگەرم کردنی ئەنجامداوە و هەوڵیاندابوو کە پێی بڵێن ژیانی هەر بە نرخ و بەهایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توشی خەموکی بوو. وەرزشکارێك بوو ئیتر نەیدەتوانی وەرزش بکات و هەندێکجاریش نەیدەتوانی بەبێ ئامێری یارمەتیدەر هەناسە بدات. ئیتر هیچ شتێك خۆشحاڵی نەدەکرد. ژیانی تاڵ و بەئازار بوو، بۆگەنی هەوکردنی برینەکانی کێشەگەلێکی زۆری بۆ دروستدەکرد. پێویستی بە چاودێری شەوانە ڕۆژی هەبوو. هاوڕێکانی لەدەستدابوو، واتە خۆی نەیویست ئیتر بیانبینێت. هەموو ڕۆژێك بەدایکو باوکی دەگوت ئیتر نایەوێت بژی. دەیگوت کە بینینی ژیانی خەڵکانیتر، تەنانە

کاتێك که وەك نیوەی بەرنامەکانی ژیانی ئەویش بێت، بە ئازارە بۆی و جۆرێکە لە ئەشکەنجە و ئازار. دووجار بە خۆبرسیکردن هەوڵی خۆکوشتنی دابوو، برا بۆ نەخۆشخانە. دواتر کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، تکای لە دایکوباوکی کرد کە لەخەودا بیکوژن و ڕزگاری بکەن. کاتێك لە کتێبخانەدا ئەم بابەتەم خوێندەوە، چاڵایی دەستم خستە سەر چاوەکانم بۆ ئەوەی ڕێگری لە ڕژانی فرمێسکەکانم بکەم، بەبێ ئەوەی کە بەدەنگی بەرز بگریم و هەناسە بدەم.

***

باوکم کارەکەی لەدەستدا و بێکاربوو. بەڵام بەهیچ شێوەیەك ڕۆحیەی لەدەستنەدا. ئەو ڕۆژە پاشنیوەڕۆ هات بۆ ماڵەوە، چاکەت و پانتۆڵی لەبەر کردبوو سواری پاسی دووەم بوو ڕۆیشت بۆ ئەوەی لە بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزیدا ناوی خۆی تۆار بکات. بەدایکمی گوتبوو کە لەپاش ساڵانێك ئەزمونی کار بڕیاریداوە ئەوە ڕابگەیەنێت کە تواناو شارەزایی هەموو کارێکی هەیە.

باوکم گرنگی بە ناڕەزایەتیەکەی دایکم نەداو گوتی: (باوەڕناکەم لە ئێستا لە هەلومەرجێکدا بین و بمانەوێت ئەم نەخێر و ئەو نەخێر بکەین).

کاتێك بۆ من بە سەختی و ئاستەم ئیش دەستدەکەوت، ئەوا بەدڵنیاییەوە بۆ پیاوێکی پەنجاوپێنج ساڵان کە لە تەمەنیدا تەنها یەك ئیشی هەبووە، زۆر سەختتر بوو.

لەپاش یەك چاوپێکەوتنی تر، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە نائومێدییەوە گوتی کە تەنانەت کاری پاسەوانی کۆگایشی دەستنەکەوتوە. پێیان باشتر بوو کە گەنجە حەڤدەساڵە لوت بەرزە متمانە پێنەکراوەکان دابمەزرێنن کە دەوڵەت موچەکەی دەدان، تاوەکو پیاوێکی گەورەی وەك من کە ئەزمونی کاری درەوشاوەی هەیە. لەپاش دوو هەفتە لە هەوڵ و کۆشش و نائومێدی دایکو باوکم هاتنە سەر ئەو بڕوایەی کە دەبێت داوای یارمەتی و قەرزی خەرجی ماڵەوە بکەن. بە درێژایی شەو دانیشتن و ئەو فۆڕمە پەنجا لاپەڕەییەیان پڕ کردەوە و وەڵامیاندایەوە کە جلشۆرەکەیان چەند کیلۆییە، کۆتا جار کە لە وولات چونەتە دەرەوە کەی بووە (باوکم دەیگوت ساڵی ١٩٨٨ بوو). منیش ئەو پارەیەی کە ویل وەك دیاری پێیدابووم خستمە ناو دەخیلەی پاشەکەتەوە لەناو ڕەفەی چێشتخانەکەدا. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە و گوتم ئێستە ئیتر بێخەم دەبن و خەیاڵیان ئاسودە دەبێت و هەست بە ئارامی دەکەن، بەڵام

بەیانی کاتێك لە خەو هەستام پارەکەم لەناو زەرفێکی نامەدا بینی کە لەژێر دەرگای ژورەکەمەوە خرابویە ئەمدیوی دەرگاکە.

دووبارە گەشتیارەکان هاتن و وردە وردە شار قەرەباڵغی تێکەوتەوە. ئەم ڕۆژانە کاك ترینەر زۆر بەکەمی دەردەکەوت، کاتێك ژمارەی سەردانیکارانی قەڵاکە زیاد دەبوو، سەعاتەکانی کارکردنی ئەویش درێژتر دەبوونەوە. ڕۆژێکیان پاشنیوەڕۆ کاتێك لە ووشکشۆرییەکەوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، کاك ترینەرم بینی. بینینی شتێکی نائاسایی نەبوو، بەڵکو مەسەلەکە ئەوە بوو کە ژنێکی قژ سوری لەگەڵدا بوو کە خاتوو ترینەر نەبوو، دەستیشی بەکەمەری ژنەکەوە بوو. بە بینینی من بەجۆرێکی خێرا دەستی لابرد کە هەروەك بڵێی دەستی لە ئاسنی سورەوکراو دورخستەوە. ڕوی خۆمم وەرگێڕاو وام نیشاندا کە سەیری جامخانەی دوکانەکە دەکەم. دودڵ بووم ئایا بهێڵم کە بزانێت پێمزانیوە و بینیومە یان نا. دواتر ئەوپەڕی هەوڵی خۆمدا و بابەتەکەم لەبیرخۆم بردەوە.

ئەو هەفتەیەی کە باوکم کارەکەی لەدەستدا، ڕۆژی هەینیەکەی کارتی بانگهێشتنامە هات بۆ ویل، کارتی ئاهەنگی هاوسەرگیری ئالیسیاو ڕۆپرت. کارتەکە لەلایەن دایکوباوکی ئالیسیاوە بوو، کە ویلیان بانگهێشتی ئاهەنگی هاوسەرگیری کچەکەیان لەگەڵ ڕۆپرتدا دەکرد. زەرفێکی نامەی گەورەو قایم لە جۆری کاغەزە ڕۆنییەکان لەگەڵ کارتی بانگهێشتەکەدا گەیشتبوو، کە بەرنامەکانی هاوسەرگیرییەکەی ڕووندەکردەوە، لەگەڵ پێرستێکی دورودرێژ سەبارەت بەو کەلوپەل و شتومەکانەی کە میوانەکان ئەگەر حەز بکەن بۆ بوك و زاوای بکڕن، من نەمدەزانی ئەو شتانە چین.

سەیرێکی پیتە ئاڵتونی و کارتە قەراخ ئاڵتونیەکەم کرد و گوتم:

—تەریق نەبوەتەوە؟ فرێیبدەم؟

—هەرچیت پێخۆشە بیکە.

قیافەی ویل زۆر گوێپێنەرد و بێ مەیل بوو. سەیرێکی فەهرستەکەم کرد.

—باشە دەفری کوسکوس[21] چ ناوو دەستەواژەیەکە؟

---

[21] خواردنێکی زۆر خۆشەویستی زۆرێك لە وولاتانی باکوری ئەفریقایە، کە لە باشوری ئیتالیاشدا زۆر ڕەواجی هەیە.

بەلأم من کارتەکەم فرێنەدا، لەوانەیە هۆکارەکەی حاڵەتەکەی ویل بوو کە خێرا ڕوی خۆی وەرگێڕاو خۆی بە لاپەڕەی سەرەکی کۆمپیوتەرەکەوە سەرقاڵ کرد، یان لەوانە بوو ئاوازی دەنگەکەی بوو. هەربۆیە خستمە ناو چەکمەجێکی کەوانتەری چێشتخانەکەوە.

ویل دیسانەوە کتێبی چیرۆکە کورتەکانی پێدام. لە سایتی ئامازۆندا داوای کردبوون. نوسخەیەك لە (شاژنی سور) بوو. دەمزانی لەوجۆرە کتێبانە نییە کە حەزم لێیەتی. لەپاش خوێندنەوەی بابەتەکانی بەرگی پشتەوەی کتێبەکە گوتم:

–کتێبی داستان نییە.

ویل گوتی:

–ها..؟ ئێستە کتێبێك بخوێنەرەوە کە ناچار بیت لەبارەیەوە کەمێك بیر بکەیتەوە. منیش دەستمکردە خوێندنەوەی، نەك لەبەر ئەوەی کە حەزم لە زانستی بۆ ماوەیی بوو، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەبوو کە تاقەتم نەبوو ویل بەردەوام سەرکۆنەم بکات کە کتێبەکەم نەخوێندوەتەوە. ئێستە ئیتر بوبو بەشەقاوە و بە شێوەیەکی ئازاربەخش تاقیدەکردمەوە، بۆ ئەوەی بزانێت کتێبەکەم خوێندوەتەوە یان نا. منیش بێتاقەتیم دەردەبڕی:

–خۆ تۆ مامۆستای من نیت.

ئەویش بوپەڕی هەستەوە وەلأمیدەدایەوە:

–دەی سوپاس بۆ خودا.

بەڕاستی کتێبەکە شیاوی خوێندنەوە بوو، سەبارەت بە کێبەرکێی مانەوە بوو. بانگەشەی ئەوەی دەکرد ژنان  پیاوان لەبەر ئەوە هەڵنابژێرن کە عاشقیان دەبن. دەیگوت کە مێینە هەمیشە بەشوێن بەهێزترین نێردا دەگەڕێت، بەوهیوایەی کە بەهۆی ئەوەوە باشترین بوونەوەر بهێنێتە دوونیاوە. شتێك نییە کە هەڵبژاردەی ڕەگەزی مێینە بێت. بەڵکو ئەوە سروشتیەتی کە ئەوە دەخوازێت.

هاوڕا نەبوم لەگەڵ ئەم قسەیەدا. حەزیشم نەدەکرد لەم بوارەدا قسەو باس بکەم. خاڵێکی ناسك کە لەو کتێبەدا هەبوو ئەیویست بیکات بەناو مێشکمدا، بەبڕوای نوسەر ویل لەڕووی جەستەییەوە لاوازو زیانبەرکەوتو بوو، هەربۆیە لە ئەنجامدا لە ڕوانگەی ژینگەناسییەوە هیچ پەیوەندییەکی بەم بابەتەوە نەبوو، بەڵکو ژیانی ویل تەنها لەڕوی جەستەییەوە توشی لاوازی بوبو.

کاتێك بیرو بۆچونی خۆمم دەربڕی گوتم:

-ئەم ماوە (ریدلی)[22] شتێکی لەبەرچاو نەگرتووە.

ویل سەری لەسەر کۆمپیوتەرەکە بەرز کردەوە و گوتی:

-باشە، چ شتێك؟

-باشە ئەگەر ئەم پیاوەی کە لەڕوی جینیەوە لەپێشترە، ئەی باشە ئەگەر بێ مێشك بێت چی؟

***

سێیەمین یەکشەممەی مانگ بوو، ترینا و تۆماس گەڕانەوە بۆماڵەوە. دایکم چوبو بۆ پێشوازییان، ئەوان هێشتا نیوەی شەقامەکەیان نەبڕی بوو، دایکم لەبەردەم دەرگاکە و لەناو حەوشەکەدا چاوەڕێی دەکردن. تۆماس خۆی فڕێدابویە باوەشی دایکمەوە، دایکم دەیگوت لەم ماوەیەدا تۆماس بالآی بەرز بووە و گۆڕدراوە و گەورەیش بووە. ئێستە ئیتر پیاوێکی بچکۆلانە بوو. ترینایش قژەکانی بڕیبوو قیافەی مرۆڤە خاوەن بڕوانامەکانی لە خۆی گرتبوو. چاکەت و پێلاوێکی هاوینەی قایشی لەبەر کردبوو کە پێشتر نەمبینیبوو. سەرم سوڕما و تەسکبیرانە لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە باشە پارەی لە کوێ بووە. کاتێك دایکم لەناو حەوشەکەدا تۆماسی دەگێڕاو بۆقە بچوکەکانی ناو حەوزە بچوکەکەی نیشاندەدا، پرسیارم لە ترینا کرد:

-ئێ ، دەنگوباست چۆنە؟

بابەگەورەم دانیشتبوو سەیری یاری دەکرد. کاتێك گۆڵێك نەدەکرا، دەنگی دەهات، بە بێ هیوابییەوە هاواریکردبوو.

-زۆر باشە، بەڕاستی باشە. ئەڵبەتە ئەوەی کە هیچکەسێك نییە کە چاودێری تۆماس بکات، کەمێك قورسە. هەندێکیشی خایاند تاوەکو لەگەڵ باخچەکەدا ڕابێت.

چەمامەوە بۆ پێشەوە.

-بەلآم هیچ شتێك بە دایە مەڵێ. پێمگوتوە کە هیچ کێشەیەکم بۆ دروست نەبووە.

-حەزت لە زانکۆ هەیە؟

دەموچاوی ترینا بە زەردەخەنەیەك کرایەوە.

---

[22] نوسەری کتێبی (شاژنی سور).

—لو، زۆریش. ناتوانم بڵێم تاوەکو چ ئەندازەیەك. زۆرم پێخۆشە کە دووبارە مێشکم خستوەتەوە کار، هەروەك بڵێی ئەو شتەی کە ساڵانێکی زۆرە لەدەستتداوە دووبارە بەدەستت هێناوەتەوە. بەلای تۆوە گاڵتەجاڕانە نییە؟

وەك نیشانەی نەخێر سەرم ڕاوەشاند. لەناخی دڵەوە بۆی خۆشحال بووم. ئەمویست باسی کتێبخانەو کۆمپیوتەرو ئەو کارانەی بۆ بکەم کە بۆ ویل ئەنجامعدابون. بەڵام بیرم کردەوە کە تازە گەیشتوە و خۆی دەبێت پرسیارم لێبکات. لەسەر کورسییەکانی مێزە چەکمەجیەکە دانیشتین، لەژێر چەترە دڕاوەکەی حەوشەکەدا، بە پەرداخە دەستکدارەکان قوم قوم خواردنەوەمان هەڵقوڕاند. من دەمبینی کە پەنجەکانی چ ڕواڵەتێکی جوان و ڕێکوپێکیان هەیە.

گوتم:

—زۆر بیرم دەکردیت.

—لێرە بەدواوە زیاتر کۆتایی هەفتەکان دێمەوە بۆ ماڵەوە، من....لو تەنها تۆماس نەبوو کە دەبوایە ڕابێت، خۆیشم پێویستم بە کات هەبوو بۆ ئەوەی بتوانم گۆڕانکاری بکەم. تەنها پێویستم بەکات هەبوو کە ببمە کەسێکیتر.

کەمێك گۆڕدرابوو. بەلامەوە سەیر بوو کە چەند حەفتە دووری لە ماڵەوە بتوانێت بەمجۆرە مرۆڤ بکاتە غەریبە. هەستم دەکرد بوەتە مرۆڤێك کە من نایناسمەوە، بەشێوەیەکی نامۆ هەستم دەکرد کە خۆم دواکەوتوم.

—دایکم گوتی کە ئەو پیاوە ئیفلیجەی لای تۆ هاتووە بۆ ئێرە.

—ئەوە ئیفلیجی من نییە، ناوی ویلە.

—ببورە، ویل. وادیارە بارودۆخی باشبووە. کاری هەمان ئەو پێڕستەیە کە من بۆم نوسیت؟

—بەڵێ، کەمتا زۆرێك. هەندێك بەرنامەکان باشتر بوون.

باسی ئەو کارەساتەم کرد کە لە پێشبڕکێی ئەسپسوارییەکەدا بۆمن دروستبوبو، هەروەها باسی سەرکەوتنی چاوەڕواننەکراوی کۆنسێرتی ویلولنم کرد. باسی ئەو سەیران و گەشتانەم کرد کە ئەنجاممان دەدان. کاتێك بەسەرهاتی ئاهەنگی لەدایکبونەکەم بۆ گێڕایەوە دەستیکردە پێکەنین.

دەمبینی هەوڵ دەدا کە دەرکێکی ڕاست و دروست لە بابەتەکە پەیدا بکات.

—بەبڕوای تۆ سەرکەوتو دەبین؟

هەروەك بلّێی جۆرێك لە پێشبڕكێ بوو. لقێكم لە گوڵی (ئەمین دەولە) لێكردەوە و یەك لەدوای یەك گەڵاكانیم لێكردەوە.

—نازانم، تەنها ئەوەندە دەزانم دەبێت تاوەكو كۆتاییەكەی بڕۆم.

قسەكانی خاتوو ترینەرم بۆ گێڕایەوە كە سەبارەت بە سەفەری دەرەوەی وولآت كردبوی.

—باوەڕناكەم تۆ چوبیت بۆ كۆنسێرتی ویلون.

—پێمخۆش بوو.

برۆكانی بەرز كردەوە.

—بەڵێ بەڕاستی بەلامەوە خۆش بوو، زۆر هەیەجانی هەبوو.

بەوردی سەیری كردم.

—دایكم دەڵێت زۆر جوانكیلە بوو.

—زۆریش جوان و پێكەوتە.

—مانای زیانی حەبلی شەوكی ئەوە نییە كە ئیتر وەك مرۆڤێكی كۆپارە لەپشتی لێبێت.

دواتر لە دڵمدا گوتم (تكایە مەڵێ چەند ترسناكە كە بەمجۆرە لەناو چوو!) بەلآم خوشكەكەم زۆر لەم قسانە هۆشیارترو زیرەكتر بوو.

—بەراستی دایكم سەری سوڕما، وابزانم خۆی ئامادە كردبوو كە پیاوێكی كۆپارە لەپشت ببینێت.

پاشماوەی چایەكەم لەناو باخچەكەدا ڕشت و گوتم:

—ترینا كێشەكە لێردایە. خەڵكی زیاتر بەمجۆرە بیر دەكەنەوە.

***

ئەو شەوە بەدرێژایی نانی ئێوارە دایكم كەیف و خۆشی بوو ئاگای لە خۆی نەبوو. ئەو چێشتەی لێنابوو كە ترینا حەزی لێدەكرد، تۆماسیش بە شێوەیەكی بێوێنە ڕێگەی پێدرابوو كە تاوەكو درەنگانێكی شەو بەخەبەر بێت. دانیشتین و خواردمان و پێكەنین و سەبارەت بە زۆر شت قسەو باس و گاڵتەو گەپمان كرد، شتانێكی وەك تیپی یاری و ئیشەكەی من و هاوپۆلەكانی ترینا. لەوانەیە دایكم سەدجار لە ترینای پرسیبێت كە ئایا دەتوانێت دەرەقەتی هەموو كاروبارەكان بێت یان نا، ئایا تۆماس پێویستی بە هیچ نییە، بەجۆرێك قسەی دەكرد هەروەك بلّێی خۆی دەیتوانی هاوكاری بكات. خۆشحاڵ بووم كە پێشتر بە ترینام گوت دایكوباوكم

بارودۆخی داراییان باش نییە و دەستیان تەنگە. ترینایش بە ئەدەب و بەوپەڕی بڕشتەوە وەڵامیدایەوە کە هیچ کێشەیەکی نییە. بیرم لەوە کردبویەوە کە دواتر ڕاستیەکەی لێ بپرسم.

نیوەشەو بە دەنگی گریان لە خەو ڕاپەڕیم، تۆماس بوو کە لەناو ژورە شقارتەییەکەدا دەگریا. دەنگی ترینایشم دەبیست کە هەوڵی دەدا بێدەنگی بکات. دەنگی پلاکی کارەباکە هات کە داگیرساو کوژایەوە، قەرەوێڵەکەشیان جێگۆڕکێ پێکرد. لەناو تاریکیەکەدا ڕاکشام و سەیری ئەو ڕووناکییە کەمەم دەکرد کە لەسەر پەردە دەڕابەییەکەوە دەیدا لە سەقفی تازە بۆیاخکراوی ژورەکەم. چاوەڕێ بووم تاوەکو گریان و هات و هاوارەکەی تۆماس و ترینا نەمێنێت. بەڵام کاتژمێر دوو دووبارە هات و هاوار دەستپێکردەوە. ئەمجارەیان دەنگی پێی دایکم بە خشکاییەوە لەناو ڕێڕەوەکەدا بیست. چپەکردنەکانیان دەهاتە بەرگوێ، لە کۆتاییدا تۆماس بێدەنگ بوو.

کاتژمێر چوار بە دەنگی کرانەوەی دەرگای ژورەکەم خەبەرم بوویەوە. بە بێحاڵییەوە چاوم کردەوە و ئاوڕمدایەوە بۆلای ڕوناکییەکە. تۆماس لەناو سێبەرە ڕۆشنەکەدا وەستابوو، پانتۆڵێکی گەورەی لەپێدابوو پێچرابوو بە قاچەکانیەوە. ئەو نیوە بەتانییەی کە پێی بوو بەسەر زەوییەکەوە بوو.

دەموچاویم نەدەبینی، بەڵام دیاربوو دوودڵە و نازانێت چی بکات. لەژێر لێوەوە گوتم:

—تۆماس، وەر ژورەوە.

هەروا کە هێدی هێدی بەرەو لای من دەهات، دەبینم کە لەنێوان خەوو بێداریدایە. هەنگاوەکانی زۆر لەسەرخۆ بوون. پەنجەی لە دەمیدا بوو، بەتانییە خۆشەویستەکەی پێچرابوو بە لایەکیەوە. لێفەکەم لاداو تۆماس لەپاڵما ڕاکشا، سەرە قژنەکەیم خستە سەر سەرینەکە و هەروەك کۆرپەلە خۆی کۆکردەوە. منیش لێفەکەم دا بەسەریدا، لەتەنیشتیەوە خەوتم و سەیرم دەکرد. سەرم لەوە سوڕمابوو کە چەندە خێرا چویە ناو ئەو خەوە قوڵەوە.

نێوچاوانیم ماچکرد و لەبەر خۆمەوە گوتم:

—شەوشاد، ئازیزەکەم، شەوشاد.

دواتر هەستمکرد کە دەستێکی بچوك بلوزەکەی گرتم، تێگەیشتم ئەیەوێت دڵنیاببێت کە بەتەنها بەجێی ناهێڵم.

***

—باشترین شوێنێك كه له تهمهنتدا رۆیشتبیت كوێ بوو؟

لهژێر كوپرۆكهكهدا وهستابوین و چاوهڕوان بوین ئهو باوبۆرانهی كه كتوپڕ دهستپێكردبوو بوهستێتهوهو بتوانین لهناو كهشو ههوای سهوزو باخچهكانی پشتهوهی قهلآكهدا پیاسه بكهین. ویل حهزی نهدهكرد بچین بۆ بهشی سهرهكی قهلآكه، خهڵكانێكی زۆر لهوێ بوون و سهیرییان دهكرد. باخچهی سهوزهواتهكان كه خهڵكی زۆر بهكهمی دهچون بۆ ئهوێ، گهنجینه و كۆگای نهێنی ویل بوو. كۆمهڵێك ڕێڕهوی لمی باش ههبوون كه باخی میوه و باخچه پهرش و بلآوو دوره دهستهكانی قهلآكهیان لهیهكتری جیادهكردهوه، كورسییه تایهدارهكهی ویلیش دهیتوانی به ئاسانی بهناویاندا تێپهڕێت.

—لهبارهی چییهوه؟ ئهمه چییه كه دهتهوێت به منی بدهیت؟

لهناو تهرمۆزه تایبهتهكهدا كهمێك سوپم تێكرد و خستمه ناو دهمییهوه.

—سوپ و شۆربای تهماته.

—ئۆو... زۆر گهرمه. كهمێك بوهسته.

بهلآچاو سهیرێكی دووری كرد.

—له تهمهنی سیی ساڵیدا بهسهر چیاوی كلیمانجارودا سهركهوتم. بهڕاستی سهرنجڕاكێش بوو، شتێكی باوهڕپێكراو نهبوو.

—چهنده بهرز بوو؟

—نزیكهی شهش ههزار مهتر بوو تاوهكه لوتكهی ئوهورو، ههزار مهتری كۆتایی زیاتر خۆم دهخشاند. بهرزاییهكه زۆر خراپ مرۆڤی ئازار دهدا.

—ساردیش بوو؟

—نهخێر.

زهردهخهنهیهكی بۆ كردم و له قسهكانی بهردهوامبوو:

—وهك لوتكهی ئیڤرێست نییه. نهك ئهو كاتهی ساڵ كه من چووم.

سهیری دوری كرد و ماتی كرد. لهناو یادهوهرییهكانیدا نغرۆ بوبو.

—زۆر جوان بوو. پێی دهڵێن: (بانی ئهفریقا). كاتێك لهو سهرهوهیت ههر دهڵێی بنی ههموو دونیا دهبینی.

ویل ساتێك بێدەنگبوو. سەیریم کرد، بەراستی حەزم دەکر بزانم بە خەیاڵ لە کوێ بوو بیری لەچی دەکردەوە. کاتێك ئەم قسانەمان بەیەکەوە کرد، وەك قوتابی ناو پۆل بوو کە منیش مامۆستای بم. مێرد منداڵێك کە لەبەر کارە مەترسیدارەکانی حیسابی خۆی لەوانیتر بە جیاواز دەزانی.

—ئێ، ئیتر چ شوێن و جێگەیەکیترت بەلاوە جوان بوو؟

—کەنداوی دورگەی موریس، خەڵکانێکی خۆشەویست، کەنار دەریای جوان، ئای چەندە چوین بەناو قولایی ئاوەکانیدا، باخی گشتی تساڤو لە کینیا، خاکی سورو ژیانی گیانەوەرانی وەحشی. یوسمیت لە کالیفۆرنیا. تاشەبەردەکانی هێندە بەرزن کە ناتوانیت لە بیرو مێشکتدا حیسابیان بکەیت.

باسی ئەو شەوەی بۆ گێڕامەوە کە تاوەکو بەیانی بەتاشەبەردەکەدا چوبویە سەرەوە، لەسەر لێواری دوسەد سێسەد مەترییەکەی وەستاون و ماونەتەوە. خۆی خستبویە ناو کیسە خەوەکەیەوە، بەڵام پێشتر کیسە خەوەکەی بەستبوو بە تاشە بەردەکەوە. چونکە لەوانە بوو لە خەوەکەیدا تەپاوتل بدات و لە تاشەبەردەکە بکەوێت خوارەوە.

من گوتم:

—تۆ ئێستە کابوسە شەوانەکانم بۆ دگێڕیتەوە.

—زۆریش حەزم لە گەورەیی شارەکانە. عاشقی شاری سیدنیم. سەرزەمینەکانی باکور، ئایسلەندا، شوێنێك هەیە لە نزیك فرۆکەخانە کەدەتوانیت لەناو کانییە گەرمە بورکانییەکانیدا ئاوێك بکەیت بە خۆتدا. هێندەی جوانی سەرسوڕهێنەری تابلۆکان جوان بوون. ئەی هاوار (چین)ی ناوەندی! لەناوەندی پارێزگای سیچوئان، نزیکەی دوو ڕۆژ ڕۆیشتین تاوەکو گەیشتین بەو شوێنە، وەحشی و دەشتەکییەکان تفیان تێدەکردین، چونکە تاوەکو ئەوکاتە سپی پێستیان نەبینیبوو.

—شوێنێکیش هەیە کە نەچوبیت؟

کەمێك شۆربای خواردەوە.

—کۆریای باکور. تاوەکو ئێستەیش نەچوم و بۆ دیزنی لەند. باوەڕ دەکەیت، تەنانەت نەچوم بۆ دیسنی لاندی ناو پاریسیش.

—من یەکجار بلیتی فرۆکەم بۆ گەشتی ئوستralیا کڕی. بەڵام نەچوم.

بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم.

-کارێك هاتە پێشەوە، بەڵام گرنگ نییە، لەوانەیە هەر ڕۆژێك بێتتە پێشەوە و بڕۆم.

-مەڵێ، لەوانەیە. کلارك تۆ دەبێت ڕۆژێك لێرە بڕۆیت. پەیمانم پێبدە کە پاشماوەی تەمەنت لەناو ئەم وێرانەیەدا بەسەر نەبەیت.

-پەیمان بە تۆ بدەم؟ بۆچی؟

هەوڵمدەدا ئاوازی قسەکانم هێمن بن.

-ئەی تۆ دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟

-من تەنها.... هەرگیز ناتوانم بیریشی لێبکەمەوە، کە تۆ هەموو تەمەنت لێرەدا بەسەر بەریت.

تفی دەمی قوتدایەوە.

-تۆ زۆر گەنجیت، زۆر پڕ جۆش و خرۆشیت.

ڕوی لەمن وەرگێرا.

-مرۆڤ تەنها یەکجار دێتە دوونیاوە. هەربۆیە ئەرکە لەسەر شانت کە بەپێی توانا باشترین ژیان بگریتەبەر.

بە هێواشی و خۆپارێزییەوە گوتم:

-باشە، قبوڵمە، ئێستە تۆ پێمبڵێ من دەبێت بۆ کوێ بچم. ئەگەر خۆت توانای ئەوەت هەبوایە بچیت بۆ شوێنێك، بۆ چ جێگەیەك دەڕۆیشتیت؟

-هەر ئێستە؟

-بەڵێ، هەر ئێستە. نابێت بڵێیت کلیمانجارو. دەبێت شوێنێك بێت کە منیش حەزی لێبکەم.

کاتێك ماسولکەی دەموچاوی خاوبویەوە و هێمنی و ئارامش لە دەموچاویدا بینرا، ڕێك دەتگوت کەسێکیترە. ئێستە ئیتر زەردەخەنە لەسەر دەموچاوی بوو چاوەکانی لە خۆشی و شادیدا بریقەیان دەهات.

–دەچم بۆ پاریس، قاوەخانەیەکی دەرەوەی شار لەناو لومارەدا دادەنیشتم و قاوەم بە کروسانی[٢٣] گەرم و کەرێی بێ خوێ و مرەبای شلیکەوە دەخوارد.

–لومارە؟

–ناوچەیەکی بچوکە لەناوجەرگەی پاریسدایە. پڕ لە شەقامی فەرشڕێژ بەبەردو ئاپارتمانەکانی تەنیشت یەکتر، پیاوە شۆخ و شەنگەکان و جولەکە ئەرسۆزۆکسەکان و ئەو ژنە پیرانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوشێوەی برژیت باردو بوون. تەنها شوێنێکە کە دەکرێت مرۆڤ تێیدا بمێنێتەوە.

ئاوڕمدایەوە بۆلای. هەوڵمدا ئاوازی دەنگەکەم هێمن بێت.

–دەتوانین بە شەمەندەفەری خێرای نێوان لەندەن و پاریس بڕۆین بۆ ئەوێ. هیچ دژواریش نییە. پێموایە کە تەنانەت پێویستیش ناکات بە نیتن بڵێین لەگەڵماندا بێت، من تاوەکو ئێستە نەچووم بۆ پاریس. زۆریش حەزدەکەم بچم. لەناخی دڵەوە پێمخۆشە بڕۆم. بەتایبەت لەگەڵ کەسێکدا کە شارەزایی هەبێت، چی دەڵێیت ویل؟

خۆم لەناو قاوەخانەکەدا دەهاتەبەرچاو، کە لەوێم، لەسەر مێزێك دانیشتوم، لەوانەیشە جوتێك پێڵاوی فەرەنسی کە لە بوتێکێکی شیکدا کڕیومە لە پێمدایەو زۆر پێمخۆشە. لەوانەیشە بە دەستانێکەوە کە نینۆکەکانم بە شێوازی فەرەنسی بۆیە کردووە. نانێکی شیرین هەڵدەگرم و دەیخۆم. تەنانەت هەستم بە تاموچێژی قاوەکە دەکرد و مەزەکەی لەدەممدا بوو. لەکەنار مێزەکەیشەوە بۆنی جگەرەی مارکەی فەرەنسی دەهات.

–نا.

–ها..؟

ساتێکی خایاند تاوەکو لەناو ئەو حاڵ و بارودۆخەدا هاتمە دەرەوە.

–نا.

خۆت ئێستە گوتت کە...

–کلارك، تۆ تێنەگەیشتیت، نامەوێت بەمە بڕۆم... بەمە بڕۆم.

ئاماژەی بۆ کورسییە تایەدارەکە کرد. دەنگی زۆر هێمن بوبویەوە.

---

[٢٣] جۆرێکە لە نانی بەیانی فەرەنسی.

—حەزدەکەم هەمان ویلی پێشوو بم، ئەوکات بچم بۆ پاریس. حەزدەکەم لەسەر کورسی ئاسایی دابنیشم و قاچ بخەمە سەرقاچ. ئەو جلوبەرگەی کە حەزم لێیەتی لەبەری بکەم. کچە جوانە فەرەنسییەکان چاوم لێدابگرن و برۆم بۆ هەڵتەکێنن، هەروەك چۆن بۆ پیاوانیتری دەکەن. نەك ئەوەی کە بمبینن پیاوێکی گەورەم و وەك منداڵەکان لەناو گالیسکەدا دانیشتوم و یەکسەر رویان وەربگێڕن.

—بەڵام دەکرێت تاقیبکەینەوە. هەرگیزیش پێویستناکات...

—نەخێر، نەخێر. ناکرێت. چونکە هەر ئێستە دەتوانم چاوەکانم دابخەم و خۆم بهێنمە بەرچاوم کە جگەرەم بەدەستەوەیەو لەناو یەکێك لە شەقامەکانی پاریسدا دانیشتوم.، پەرداخێکی گەورەی شەربەتم لەبەردەمدایە، بۆنی ئیستیکی سورەوکراویش دێت و هەمیش دەنگی ماتۆڕی گازی لە دورە دەبیسترێت. بەباشی هەست بە هەمویان دەکەم.

تفی دەمی قوتدایەوە.

—ئەگەر برۆین، ئەوکات من بەم کورسییە نەفرەتیەوە، هەموو ئەو بیرەوەری و جۆش و خرۆش و هەیەجانانە، دەبنە بلقی سەرئاوو دەچن بە هەوادا. کاتێك ئەمەوێت هەوڵبدەم کە لەبەردەم میزێکداو لەسەر کورسی دابنیشم و بە جۆگەلە و شۆستەی شەقامەکانی پاریسدا بپەڕمەوە، شۆفێری تەکسییەکان سوارمان ناکەن، دوو لقی کورسی تایەدار کە لەگەڵ ڕێڕەوەکانی پاریسدا ناگونجێت، ئەوکات هەموو ئەو یادگارییە خۆشانە لەناو دەچن. باوەڕ دەکەیت؟

دەنگی توند و زبر بوبو، سەری تەرمۆزەکەم نایەوە. لەبەر ئەوەی نەمدەویست دەموچاوم ببینێت، سەرم داخست و سەیری پێڵاوەکانم کرد، گوتم:

—بەڵێ.

—بەڵێ.

دواتر ئاهێکی قوڵم هەڵکێشا.

لە خوار ئێمەوە، پاسێك وەستابوو بۆ ئەوەی ژمارەیەکیتر لە گەشتیارەکان لەبەردەم دەرگای چونەژورەوەی قەڵاکەدا دابەزێنێت. لە بێدەنگییەکەدا دانیشتین و سەیری ئەو کەسانەمان دەکرد کە لە پاسەکە دادەبەزین. گەشتیارەکان چونە ناو قەڵا کۆنەکەوە و ڕیزێکی ڕێکوپێکیان پێکهێنا. ئامادەبون بۆ ئەوەی شوێنەواری وێرانبوی سەدەی ڕابوردو ببینن.

بەدڵنیاییەوە ویل زانیبوی من کەمێك هێور بومەتەوە، ئەمڕۆ پاشنیوەڕۆ بۆ کوێ دەچین؟ دەچین بۆ دالآنی هەزار پێچ و قەمچی قەلآکە؟

—نەخێر.

پێش ئەوەی کە خۆم ئاگام لێبێت، وەلآمەکە لە دەمم هاتە دەرەوە. هەستم بە قورسی نیگاکانی ویل کرد.

—لە شوێنە داخراوەکان بێزارو هەراسانی؟

—تەقریبەن.

دەستمکردە کۆکردنەوەی شتومەکەکانمان.

—وەر بابگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.

***

کۆتایی هەفتەی دواتر، نیوەشەو چومە قاتی خوارەوە، بۆ ئەوەی ئاو بخۆمەوە. توشی بێخەوی بوبوم و هەرچیییەکم دەکرد خەوم لێنەدەکەوت. هەر لەبەر ئەمە بوو پێمباشتربوو هەستامەوە تاوەکو بەردەوام لەسەر جێگەکەم ڕابکشێم و مێشکم بە کۆمەڵێك فیکری بێماناوە سەرقاڵ بکەم.

هەرگیز حەزم نەدەکرد نیوەشەو لەخەو هەستم. بەبێئاگاییەوە بیرو زەینم بەرەو لای ویل دەچوو، حەزم دەکرد بزانم ئایا ئەویش لەوبەری قەلآکەوە و لەماڵی خۆیاندا خەوی لێناکەوێ. لەناو بیرو زەینمدا هەوڵم دەدا پەی بە بیرو فیکرەکانی ببەم و تێبگەم کە چی لە زەینیدا دەگوزەرێت، بەلآم بیرو مێشکی ئەو شوێنێکی زۆر تاریکبوو، چونەناوی شتێکی مەحاڵ و نەگونجاو بوو.

واقیعیەت و ڕاستیەك هەبوو. من و ئەو نەدەچوین بۆ هیچ شوێنێك، کات وەك بروسکە و هەوا تێدەپەڕی. تەنانەت نەمتوانیبوو باوەڕی پێبهێنم گەشتێك بکەین بۆ پاریس. کاتێك هۆکارەکەی گوت، ئیتر بوارێك بۆ چەلەحانێ نەمایەوە. پێشنیاری هەر سەفەرێکی دوورم دەکرد، بەبیانویەك ڕەتیدەکردەوە. ئەگەر بەوم نەگوتبایە کە بۆچی تاوەکو ئەم ئاستە نیگەرانم، ئەوکات نەمدەتوانی کاریگەری بکەمە سەری.

خەریکبوم لەتەنیشت ژوری دانیشتنەکەوە تێدەپەڕیم، دەنگێکم بیست، کۆکەیەکی نزم، لەوانەیە ناڵەو هاواریش بوبێت. وەستام چەند هەنگاوێك گەڕامە دواوەو لەبەرامبەر دەرگاکەوە

وەستام. بە هێواشی پاڵم بە دەرگاکەوە ناو سەرێکم کێشایە ناو ژورەکە. لەناو ژوری دانیشتنەکەدا گۆشەکانی قەنەفەکە لەسەر زەوییەکە بوون و دۆشەکەیەکیان لێدروستکردبون، باوك و دایکم بینی کە لە ژوری میوانەکەدا ڕاکشابوون و سەریان لەئاستی زۆپا گازییەکەدابوو. لەناو تاریکایی ڕوونی ژورەکەدا چەند ساتێك سەیری یەکتریمان کرد. پەرداخەکەم بەدەستەوە بوو بەبێ جوڵە وەستام.

—لێرە چی دەکەن؟

دایکم ئانیشکی داناو کەمێك بەرز بویەوە.

—هۆش... سوك قسە بکە، ئێمە...

سەیرێکی باوکم کرد.

—حەزمان کرد کەشو هەوایەك بگۆڕین.

—ها..؟

—حەزمان کرد کەشوهەوایەك بگۆڕین، تێناگەیت!

بەو نیگایەی کە ئاراستەی باوکمی کرد، بەزمانی حاڵ داوای یارمەتی لێکرد، باوکم گوتی:

—ژوری نوستنەکەمان داوە بە ترینا.

باوکم بلوزێکی شینی لەبەردا بوو کە سەرشانەکەی دڕابوو. قژەکانیشی بەرەو یەك لای سەری بەرز بوبونەوە.

—تریناو تۆماس لەناو ژورە شقارتەییەکەدا ئیسراحەت نەبوون. ئێمە گوتمان دەتوانن لەناو ژورەکەی ئێمەدا بخەون.

—بەڵام خۆ نابێت لەسەر زەوییەکە بخەون، ئاوا ئیسراحەت نین.

باوکم گوتی:

—ئازیزەکەم، ئیسراحەتین باوەڕ بکە!

دواتر هەروا کە بەبێدەنگی وەستابوم و هەوڵمدەدا بزانم چی بووە، باوکم لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—تەنها کۆتایی هەفتەکان، تۆیش ناتوانیت لەناو ئەو ژورە شقارتەییەدا بخەویت، تۆ دەبێت لەژورەکەی خۆتدا بخەویت. ئەمە...

تفی دەمی قوتدایەوە.

—تۆ تەنها کەسێکیت کە دەچیت بۆ سەرئیش.

باوکم کە بوغزی کردبوو، سەیری چاوەکانمی نەدەکرد. دایکم کردمیە دەرەوە.

—لو بگەڕێرەوە بۆ ژوورەکەت و بخەوە، خێرا، ئێمە خەوتوین.

بە قادرمەکاندا چومە سەرەوە. لەبەر پێخاوسییەکەم بەهیچ شێوەیەك دەنگی پێم لەسەر فەرشەکان نەدەهات. ژاوەژاوێکی ئالۆزم لە قاتی خوارەوە دەبیست، ساتێك لەودیوی دەرگای ژوری نوستنەکەی دایکو باوکمدا وەستام. ئێستە دەنگێکم دەبیست کە پێشتر نەمبیستبوو، لەناو ژورەکەدا دەنگی پرخە پرخە ناسکەکەی تۆماس دەهات، دواتر بە سەر نوکی پێ گەڕامەوە بۆلای قاردمەکان و چومەوە ژورەکەی خۆم، بەهێواشی دەرگاکەم داخست. لەسەر قەرەوێڵە گەورەکەم ڕاکشام. تاوەکو بەرەبەیان سەیری دەرەوەی پەنجەرەکە و ڕەنگە زیوییەکەی شەقامەکەم کرد. لە کۆتاییدا خۆشبەختانە چەند سەعات خەوێکی قوڵم لێکەوت.

ڕۆژژمێرەکە ئەوەی نیشاندەدا کە حەفتاو نۆ ڕۆژی ماوە. دووبارە توشی شڵەژان و دڵەڕاوکێ بوومەوە.

هەروەها تەنهایش نەبووم.

ڕۆژێکیان کاتی نێوەڕۆ، خاتوو ترینەر چاوەڕێی کردبوو تاوەکو نۆرەی نیتن بێت و ویل بگاتە ئەوێ، دواتر داوای لەمن کرد کە لەگەڵیدا بچم بۆ خانووی سەرەکی ماڵەکە. منی برد بۆ ژوری دانیشتنەکە و پرسی کە بەبڕای من بارودۆخەکە چۆنە. گوتم:

—ئێستە کاتانێکی زۆر دەچینە دەرەوە.

بە سەر ڕاوەشاندن بەڵێی بۆ کردم. هەروەك بڵێی بەلایەوە پەسەند بوو.

—لە جاران زیاتر قسە دەکات.

—لەوانەیە تەنها لەگەڵ تۆدا.

دواتر زەردەخەنەیەکی بچوکی کرد کە لەبنەڕەتدا زەردەخەنە نەبوو.

— سەبارەت بە گەشت و سەفەری دەرەوەی وولات قسەت لەگەڵدا کردووە؟

—نەخێر، هێشتا نا، بەڵام قسەی لەگەڵدا دەکەم.... خۆ خۆت شارەزای تەبیعەتی هەیت.

گوتی:

—ئەگەر دەتانەوێت بچن بۆ شوێنێك، هیچ گرفتێك نییە. دەزانم خۆیشت هێندە حەزت لێ نییە و لەسەر قسەکەی خۆت نیت، بەڵام ئێمە لەمبارەیەوە قسەمان کرد و بەیەکەوە ڕێککەوتین...

بێدەنگبوو، بەبێدەنگی دانیشتین. لەناو کوپێك و ژێرپیاڵەیەکی گەورەدا قاوەی بۆ هێنابوم. قومێکم خواردەوە. کاتێك ژێر پیاڵەکەم دەخستە سەر قاچم، هەستی مرۆڤە شەست ساڵەکانم هەبوو.

—ویل دەڵێت هاتووە بۆ ماڵتان.

—بەڵێ، ئاهەنگی لەدایکبونم بوو.

—ویل بارودۆخی چۆن بوو؟

—باش، بەڕاستی زۆر باش بوو، لەگەڵ دایکمدا زۆر گەرم و گوڕ بوو.

—مەبەستم ئەوەیە کە دایکم لەوکاتەوەی خوشکەکەم و کوڕەکەی لەلامان ڕۆیشتون، کەمێك مات و مەلول بووە، دڵتەنگ بووە. من وادەزانم ویل... ویل تەنها ئەیویست دایکم لەو بارودۆخە بهێنێتە دەرەوە.

خاتوو ترینەر بە سەرسام دەهاتە پێشچاو.

—ئەوە لە هەست و شعوری خۆیەتی.

—دایکیشم هەر ئەمەی دەگوت.

قاوەکەی تێکدا.

—هەرگیز لەبیرم نایەت کۆتاجار کە ئامادە بوو نانی ئێوارەمان لەگەڵدا بخوات کەی بوو.

هەوڵیدا زانیاریگەلێکی زیاتری دەستبکەوێت. بەڵام هەرگیز بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هیچ شتێکی نەپرسی، ئەوە نەریتی بوو. بەڵام نەمدەتوانی ئەو وەڵامانەی بدەمەوە کە ئەو بەشوێنیاندای دەگەڕا. ویل هەندێك ڕۆژ شاددتر بوو بەبێ هیچ دەردەسەرییەك ڕازی دەبوو کە بچینە دەرەوە، سەری دەخستە سەرم و گاڵتەو گەپی دەکرد. وادیاربوو کە پەیوەندی لەگەڵ دوونیای دەرەوەی ماڵەکەدا پەیدا کردووە. بەڵام بەڕاستی من چیم دەزانی؟ دوونیای ویل بریتی بوو لە کەنارێکی فراوان و دەرونێك کە ڕێگەی پێنەدەدام تەنانەت نیمچە سەیرێکیشی بکەم. لەم چەند هەفتەی دواییدا بەوپەڕی بێتاقەتی تەواوەوە هەستمدەکرد کەنارە فراوانەکەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ فرانتر دەبێت.

گوتی:

—بەرواڵەت کەمێك ڕۆحییەی باشتر بووە.

—خاتوو ترینەر ئەیویست دڵگەرمی و دڵخۆشی خۆی بداتەوە.

—بەڵێ، منیش وادەزانم.

—ئەم مەسەلە زۆر...

دەموچاوی بەرەو لای من سوڕایەوە و چاوەکانی بریقەیان لێوەهات.

—زۆر شیاوی سوپاسە. زۆر باشە کە دەبینم کەمێك وەك ڕابوردی لێهاتوەتەوە. هەموو ئەم پێشکەوتنانە بە قەرزداری تۆی دەزانین.

—نەك هەمووی.

—هەرگیز نەمدەتوانی پەیوەندی لەگەڵدا دروستبکەم. نەمدەتوامی نزیکی ببمەوە.

کوپەکە و ژێرپیاڵەکەی خستە سەر ئەژنۆی.

—ویل کەسێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە. هەر لە مێردمنداڵییەوە هەستم دەکرد وادەزانێت بە جۆرێك لە جۆرەکان هەڵەیەکەم بەرامبەری کردوە، هەمیشە لەگەڵ ئەم هەستەدا جەنگاوم، هیچکاتێکیش نەمزانی بە بڕوای ئەو چ هەڵەیەکم کردووە.

هەوڵمدا بەزۆریش بووە زەردەخەنە بکات، بەڵام نەیتوانی. بە کورتی سەیرێکی منی کرد و دواتر ڕوی خۆی وەرگێڕا.

وام نیشاندا خەریکم قاوەکەم دەخۆمەوە. لەکاتێکدا کە کوپەکە خاڵی بوو.

—لوئیزا، دایکت باشتر بووە؟

—بەڵێ.

دواتر لەقسەکانی بەردەوامبوو:

—بەڵام بەدەست خوشکەکەمەوە دەهری بووە.

خاتوو ترینەر سەیری دەرەوەی پەنجەرەکەی دەکرد، سەیری ئەو شوێنەی کە باخچە ئازیزەکەی خەریکبوو شکۆفەی دەکرد و دەگەشایەوە، شکۆفەو خونچەگەلێك کە ئامێزێکی جوان و گونجاو لە جۆرەها گوڵی پەمەیی و ئەرخەوانی و شینی تێدا بوو.

بەبێ ئەوەی کە ئاوڕبداتەوە بۆلای من گوتی:

—تەنها دوو مانگ و نیویتر کاتمان بەدەستەوەیە.

کوپەکەم خستە سەر مێزەکە. زۆر بە هێواشی کە هیچ دەنگێکی لێ بەرز نەبویەوە.

-خاتوو ترینەر من ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم.

سەرێکی ڕاوەشاند.

-دەزانم.. لوئیزا..

دواتر لە ژورەکە چویە دەرەوە.

***

لیومکینرنی لە ٢٢ مانگی گوڵاندا لەناو ئاپارتمانێکدا لە سویسرا کۆچی دوایی کرد. بلوزی ئەو تیپی یارییەی کە خۆشی دەویست لەبەریدا بوو، دایکوباوکی لەملاو ئەولایەوە بوون. برا بچکوکەکەی نەهات، بەڵام بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە و گوتی کە هیچکەسێك هێندەی براکەی خۆشەویست نەبوو. لیو کاتژمێر سێی پاشنیوەڕۆ گیراوەیەکی شیری ڕەنگی لەگەڵ دەرمانی باربیتوراتی[٢٤] کوشتندەدا هەڵقوڕاند. دایکوباوکی گوتیان کە لەماوەی چەند خولەکدا وای لێهات هەردەتگوت خەوێکی قوڵی لێکەوتووە. ئەو ڕۆژە پاشنیوەڕۆ کەمێك پاش کاتژمێر چوار، ئەو کەسەی کە چاودێری دەکرد و شاهێدی هەموو شتەکان بوو، مەرگی ناوبراوی ڕاگەیاند. بە کامێرایش تەسویر دەکرا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەواو چاودێری بکرێت.

ئەوەیان بەدەم دایکیەوە دەگێڕایەوە کە گوایە گوتویەتی: (بە هێمن و ئارام هاتە بەرچاوم، ئەمەش تەنها شتێکە کە من هێمن دەکاتەوە).

پۆلیس سێجار لێکۆڵینەوەی لە دایکوباوکی لیو کرد. تەنانەت لەوانەبوو لێکۆڵینەوەی یاساییان لەگەڵدا بکرێت، خەڵکی نامەی خراپ و بێزاری و پڕ لە قسەی ناشیرینیان فڕێدەدایە بەردەمماڵەکەیان. دایکی لیو بیست ساڵ پیر بوبو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاتێك قسەی دەکرد شتێك لە بوون و وجودیدا هەبوو، شتێك لە گەڵ ئەو خەم و پەژارەو شپرزەیی و دڵەڕاوکێ و ماندوبونەی کە باسی لە ڕزگاربون دەکرد، ڕگاربونێکی قوڵ.

-بەڵام سەرەئەنجام دووبارە بویەوە بەهەمان لیو.

---

[٢٤] یەکێك لە دەرمانە خەوهێنەرەکانە.

## {١٥}

–کلارک، بلێ بزانم، ئەمشەو چ بەرنامەیەکی هەیەجانیت بۆ خۆت لەبەرچاو گرتووەو دەتەوێت ئەنجامی بدەیت؟

لەناو حەوشەکەدا دانیشتبوین، نیتن سەرقاڵی عیلاج تەبیعی ویل بوو. بە هێمنیەوە ئەژنۆکانی تاوەکو سنگی بەرز دەکردەوە دەیبردنە خوارەوە. ویلیش لەسەر بەتانییەکەی ڕاکشابوو، دەستی وەك ئەوکاتە کردبویەوە کە خۆر دەگرن. منیش لەسەر چیمەنەکەی تەنیشتیان دانیشتبوم و ساندەویچەکەم دەخوارد. ئێستە ئیتر زۆر بە کەمی بۆ نانی نیوەڕۆ دەچومە دەرەوە.

–چۆن؟

–هەروا، تەنها بۆ زانیاری. بۆم گرنگ و سەرنجڕاکێشە بزانم کاتێك لێرە نیت سەرقاڵی چ ئیش و کارانێك دەبیت.

–باشە، بڕیار وایە ئەمشەو بچم بۆ سەیرکردنی پێشبڕکێیەکی زۆر نایاب، وەرزشە جەنگی و بەرگرییە پێشکەوتووە کان. دواتر بە هەلیکۆپتەر بۆ نانی ئێوارە بچم بۆ مۆنتیکارلۆ، دواتریش کاتی گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە دەچم بۆ میوانی کۆکتێل لەناو کانسدا. ئۆو.. ئەگەر ئەوکاتە کە سەعات دووە لەم ناوەدا بیت کاتێك دەگەڕێمەوە سڵاوت لێدەکەم و دەستت بۆ ڕادەوەشێنم.

کاغەزی ساندەویچەکەم لێکردەوە و سەیری پێکهاتەکانیم کرد.

–لەوانەیە کتێبەکە تەواو بکەم.

ویل سەیری نیتنی کرد و بە پێکەنینەوە گوتی:

–دە پاوەندییەکەتم بدەرێ.

نیتنیش دەستیکرد بە گیرفانیدا.

–دەی هەمتر!

سەیری ئەوانم کرد. کاتێك بینیم نیتن دە پاوەندی خستە ناو دەستی ویلەوە، گوتم:

—چی هەمتر؟

—ویل گوتی تۆ کتێب دەخوێنیتەوە. منیش گوتم سەیری تەلەفیزیۆن دەکەیت. ئەوەتا دیسانەوە ویل بردیەوە.

ساندەیچەکە لەبەردەم دەممدا مایەوە.

—دیسانەوە بردیەوە؟! ئێوە لەسەر ئەوەی کە کاتەکانم چۆن بەسەر دەبەم و چەندە ژیانم یەك شێوازە، گرەو دەکەن؟!

ویل گوتی:

—ناوی لێنانێین گرەو.

بەلآم شەرمی هەستپێنەکراوی ناو چاوەکانی پێچەوانەی قسەکانی دەگوت. پشتم ڕاستکردەوە.

—بهێڵە بزانم چی بووە، ئێوە گرەو لەسەر پاوەند دەکەن کە من شەوی هەینی لەماڵەوە کتێب دەخوێنمەوە یان سەیری تەلەفیزیۆن دەکەم.

ویل گوتی:

—نەخێر، زیاتر بیر دەکەمەوە کە سەرقاڵی سەیرکردنی هاوڕێ ڕاکەرەکەت دەبیت.

نیتن قاچی ویلی هێنایە خوارەوە. دەستی ڕێککردەوە و لە مەچەکەوە دەستیکردە مەساج کردنی.

—ئەگەر بڵێم بەهیچ شێوەیەك ئەمکارانە ناکەم چی؟

نیتن گوتی:

—نەبابە..!

پارەکەم لەدەستی ویل فڕاند.

—ئەم پارەیە لە بنەڕەتدا دەبێت بۆ من بێت. چونکە هەردوکتان هەڵەتان کرد.

ویل ڕەخنەی گرت و ناڕازی بوو:

—بەلآم خۆت گوتت کە دەتەوێت کتێب بخوێنیتەوە!

دە پاوەندییەکەم بەناو هەوادا سوڕاندەوە.

—ئەمە هی منە. بەپێی مادەی یاسای سزا نەخوازراوەکان، یان هەر ناوێکی لێدەنێن، ئێستە ئەمەوێت بچم بۆ سینەما.

هەستامەوە، پارەکەم خستە گیرفانمەوە و پاشماوەی ساندەویچەکەم خستەوە ناو کاغەزەکەیەوە. هەروا کە لەوان دوور دەکەوتمەوە، دەمم تاوەکو بناگوێم کرابویەوە. زۆر سەیر بوو! هەستمکر کە چاوەکانم لەبەر فرمێسك دەسوتێن، بەڕاستی بێ هۆکار بوو.

ئەو ڕۆژە بەیانی پێش ئەوەی بێم بۆ گرنتاهاوس، یەك سەعاتم لەگەڵ ڕۆژژمێرەکەدا بردە سەر، هەندێك ڕۆژ لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕادەکشام و لەدورەوە سەیری ڕۆژژمێرەکەم دەکرد. ماجیکی سیحریم بەدەستەوە بوو بیرم لەوە دەکردەوە دەتوانم ویل بۆ کوێ ببەم. هێشتا لە خۆمم ڕانەدەبینی کە بتوانم ویل ڕازی بکەم بۆ ئەوەی بچین و سەفەری دوور بکەین. بیرکردنەوە لەوەی کە بتوانم ویل ببەم بۆ گەشتێکی شەوو ڕۆژی، تەنانەت بەیارمەتی نیتنیش، ترس و دەڵەڕاوکێ بەردەبویە هەمو گیانم.

ڕۆژنامە ناوچەییەکانم ئەمدیوو ئەودیو کرد، پێشبڕکێکانی یاری تۆپی پێ و ئاهەنگە ناوچەییەکان سەرنجیان ڕاکێشام. بەڵام لەوکاتەوەی کە چوبوین بۆ پێشبڕکێی ئەسپسواری، ترسی ئەوەم هەبوو کە دیسانەوە کورسییە تایەدارەکەی ویل لەناو قوڕ و لیتەو چیمەن و گیاکاندا بچەقێت. باوەڕم بەوە هەبوو کە ئامادەبون لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دەبویە هۆی ئەوەی کە وا هەستبکات نمایش کراوە بۆ ئەوەی خەڵکی سەیری بکەن. دەبوایە بەرنامەکانی وەك ئەسپسواریم لەناو خشتەکەدا بکردایەتە دەرەوە، چونکە لە ناوچەیەکی وەك ئەم ناوچەی ئێمەدا بە شێوەیەکی زۆر سەیر هەمیشە تەماشاچی زۆری هەبوو. دەمزانی حەزناکات بێت و لەکاتی ڕاکردندا سەیری پاتریك بکات. کریکت و ڕەگبیش سەرنجیان ڕانەدەکێشا. هەندێك ڕۆژ کە دەمبینی هیچ بیرۆکەیەکی نوێ نایەتە زەینمەوە، هەستم بە بێتاقەتی و بێتوانایی دەکرد.

لەوانەیە نیتن و ویل ڕاستیان دەکرد کە من لەگەڵ ژیانێکی یەك شێوازو ماندوکەردا ڕاهاتبوم. لەوانەیە بێ غیرەت ترین مرۆڤی دوونیا بوم و نەمدەتوانی کارێك بکەم کە حەزوئارەزی ویل بۆ بەزیندویی مانەوە بووروژێنم.

کتێب یان تەلەفیزیۆن. کاتێك بەو جۆرە بیر لەمن دەکرایەوە، ئیتر چۆن دەمتوانی بە شێوەیەکیتر بیر بکەمەوە.

***

لەپاش ڕۆیشتنی نیتن، ویل هات بۆ چێشتخانەکە. لەسەر مێزێکی بچوك دانیشتبوم و خەریکی پاککردنی پەتاتە بووم بۆ چێشتی ئێوارەی. کاتێك لەناو چوارچێوەی دەرگاکەدا وەستا سەرم بەرز نەکردەوە بۆ ئەوەی سەیری بکەم. ماوەیەك لەوێدا وەستاو سەیری کردم. کاتێك زانیم بەو شێوەیە لێم ورد بووەتەوە. سور بومەوە، لە کۆتاییدا هاتمە گۆ.

—سەیرکە، لەوانەیە زۆر شپرزە هاتبمە بەرچاوت. منیش دەبوایە بمگوتایە کە تۆیش دانیشتویت و هیچکارێك ئەنجامنادەیت.

ویل گوتی:

—لەبیرم نایەت کە نیتن پێشنیارێکی نایابی هەبوبێت و بیەوێت بمبات بۆ ناو کۆڕو مەجلیسی ڕەقس و سەما!

—دەزانم گاڵتە بوو.

پارچەیەکی گەورە لە توێکڵی پەتاتەکەم لێکردەوە.

—بەڵام تۆ لەبەر ئەوە کار دەکەیت بۆ ئەوەی هەستبکەم کە چ مرۆڤێکی بێکەڵکم. کاتێك لەسەر یەکشێوازی ژیانم گرەو دەکەیت. ناچاریت کە بهێڵی تێبگەم؟ تۆو نیتن نەتاندەتوانی لەنێوان خۆتاندا بیهێڵنەوە و سوعبەتەکە لەنێوان خۆتاندا بێت؟

چەند ساتێك هیچی نەگوت. دواتر کاتێك سەرم بەرزکردەوە، دەبینم هەروا واقی بەمندا وڕماوە. گوتی:

—ببورە.

—بەڵام لێت ناوەشێتەوە.

—باشە، حەزم دەکرد ببیستی. ئەمویست ئاگاداری ڕۆژەکانی ژیانت بیت و بزانیت خەریکی چی دەکەیت.

—ئاگاری چی؟ ئەوەی کە خەریکم ڕۆژەکانی ژیانم بەرباد دەکەم؟

—بەڵێ، ڕێك وایە.

—ئەی خودایە گیان! ویل خۆزگایە ئەوەند پێت نەدەگوتم کە چی بکەم. ئەی ئەگەر بمویستایە تەنها سەیری تەلەفیزیۆن بکەم چی؟ ئەگەر بێجگە لە کتێب خوێندنەوە کارێکیترم نەکردایە چی؟

دەنگم تیژو قیژاوی بوبو.

—ئەی کاتێك ماندوو شەکەت دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە ئەوکات چۆن دەبێت؟ ئەی ئەگەر حەزنەکەم ڕۆژەکانی تەمەنم بە گێچەڵ سەری ببەمە سەرو پڕیان بکەمەوە چی؟

ویل بە ئاوازێکی هێمنەوە گوتی:

—بەڵام ڕۆژێك داخ و پەژارەی بۆ دەخۆیت. دەزانی ئەگەر من لە جێگەی تۆدا بومایە چ کارێکم دەکرد؟

ئامێری پەتاتەپاککردنەکەم هێنایە خوارەوە.

—دەمزانی دەتەوێت ئەمە بڵێیت.

—بەڵێ، هێندەی سەرەدەرزییەك پێمناخۆش نییە کە ئەمەت پێدەڵێم. دەچوم بۆ خولی شەوانە، خولی فێربونی بەرگدرویم دەبینی، یاخود هەر شتێکیتر کە حەزم لێیەتی.

ئاماژەی بۆ جلوبەرگەکەم کرد، کراسێکی گوڵ گەورەی مۆدێل کۆن، لەو قوماشانەی کە سەردەمانێك پەردەی ماڵی بابەگەورەکان بووە.

یەکەمینجار کە باوکم ئەم کراسەی بینی، بە پەنجە ئامازەی بۆ کردم و گوتی:

—هێی لو... ئەمە چ جلوبەرگێکە لەبەرت کردووە، کەمێك بەهۆش خۆت وەرەوە!

پێنج خولەکی خایاند تاوەکو پێکەنینەکەی تەواو بوو.

ویل لە قسەکانی بەردەوامبوو:

—بەشوێن ئەو شتانەدا دەگەڕام کە زۆر پارەیان پێویست نەبوایە، خولی وەرزشی، خولی مەلەوانی، کارە خۆبەخشییەکان. ئیتر هەر شتێك. فێری موسیقا دەبوم، سەگی خەڵکیم دەبرد بۆ گەشت و گەڕانی دوورودرێژ.. یان..

بە بێتاقەتیەکی تەواوەوە گوتم:

—زۆر باشە، زۆر باشە، تێگەیشتم. بەڵام من ویل ترینەر نیم!

—شانست هەبوو.

کەمێك بەبێدەنگی دانیشتین، ویل کورسییە تایەدارەکەی بردە ژورەوە. شوێنی دانیشتنی کورسییەکەی بەرز کردەوە تاوەکو هاتە ئاستی مێزی چێشتخانەکە. گوتم:

—باشە ئەی تۆ لە پشوەکان و ئەو کاتانەی کە بەتاڵ بویت چیت دەکرد؟ زۆر باش بوون؟

—کاتی پشوو بێکاری زۆرم نەبوو. بەڵام هەوڵم دەدا هەموو ڕۆژێك بەرنامەیەکم هەبێت. دەچوم بۆ ئیسکڤاش و شاخڕەوی لەناو هۆڵە داخراوەکاندا. دەچوم بۆ کۆنسێرت، دەچوم بۆ ئەو ڕیستورانانەی کە نەچوبوم.

بە ئاوازێکی ڕەخنەئامێزەوە گوتم:

—بەڵێ، کاتێك پارەت هەبێت ئەوە زۆر ئاسانە.

—دەچوم بۆ ڕاکردن، بەڵێ دەچوم بۆ ڕاکردن.

کاتێك برۆکانم بەرزکردەوە گوتی:

—هەوڵمدەدا فێری زمانە نوێکان ببم، بۆ ئەو کاتانە پێویستم دەبوو کە دەمویست بڕۆم بۆ وولآت و ناوچە نوێکان، هاوڕێکانم دەبینی، ئەوانەی کە پێموابوو هاوڕێمن...

بۆ ساتێك وەستا.

—بەرنامەی گەشت و سەفەرم دادەنا. دەگەڕام بەشوێن ئەو جێگایانەدا کە نەچوبوم. شتانێکی هەیەجانیم دەکرد بۆ ئەوەی لەو سنورە بچمە دەرەوە کە هەمبوو. یەکجاری تەواو لەناو نۆکەندەکەدا مەلەم دەکرد.

بەڵێ.

هەرکە ویستم شتێك بڵێم، لەقسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—دەزانم ئەمکارانە پارەیان پێویستە، بەڵآم نەك هەمیشە. باشە تۆ دەزانیت من لە کوێوە پارە پەیدا دەکەم؟

—خەڵکیت بە کارەکەت دەپلیشاندەوە.

—هەرکارێك کە خۆشحاڵی دەکردم ئەنجامم دەدا. هەرکارێك کە پێمخۆش بوایە. خۆم بەجۆرێك پەروەردەکردبوو کە بچم بەدوای کارێکدا کە هەردوکیانی تێدا بێت.

—بەجۆرێك قسە دەکەیت هەروەك بڵێی زور ئاسانە.

—ئاسانە. هەرچەندە کارانێکی سەختی زۆریش هەن، خەڵکیش نایانەوێت کاری زۆر ئەنجامبدەن.

پاککردنی پەتاتەکان کۆتاییهاتبوو. توێکڵەکانم خستە ناو سەتڵی خۆڵەکەوە. تاوەکەیشم خستە سەر تەباخەکە بۆ ئەوەی بۆ دواتر ئامادە ببێت. گەڕامەوە و بە یارمەتی دەستم خۆم بەرزکردەوە لەسەر مێزەکەو لەبەرامبەر ویلەوە دانیشتم و قاچەکانم شۆڕ بوبونەوە.

–بەدڵی خۆت کەیف و خۆشی دوونیات کرد، نا؟

–بەڵێ، بەتەواوەتی. کەمێك هاتە پێشترەوە. شوێنی دانیشتنی کورسییەتایەدارەکەی بەرزکردەوە و هاتینە ئاستی یەکتری.

–کلارك، لەبەر ئەمەیە کە لەدەستت تورە دەبم، تۆ دەهری و تورەم دەکەیت! چونکە هەموو ئەم توانایانە و هەموو ئەم....

شانەکانی بەرز کردەوە.

–ووزە و زیندویەتی و...

–بەس مەڵێ ووزە و زیندویەتی....

–ووزە و لێهاتویی، ئەری، ووزە و لێهاتویی. ناتوانم ببینم تۆ لەبەر من مل بۆ ژیانێکی یەك تایمی لەمشێوەیە کەچ بکەیت و هەموو تەمەنت بەوجۆرە بژیت. ژیان لەرووبەرێکی حەوت هەشت کیلۆمەتریدا، کەسیش نییە کە تۆ بخاتە هەیەجانەوە یان هانت بدات یاخود شتێکت نیشانبدات کە مێشکت هێندە سەرقاڵ بێت کە شەو نەتوانی بخەویت.

–ئەمەش شێوازی تۆیە بۆ ئەوەی پێمبڵێیت، دەبێت کارێکی باشتر و بەنرختر لە پەتاتە پاککردن بۆ تۆ ئەنجامبدەم.

–خەریکم پێت دەڵێم کە لەدەرەوە دوونیایەکی گەورەتر هەیە، ئەڵبەتە زۆر سوپاست دەکەم کە سەرەتا پەتاتەکانی من پاکبکەیت.

زەردەخەنەیەکی بەرامبەر کردم. منیش ناخودئاگا زەردەخەنەیەکم بۆ کرد، گوتم:

–تۆ بیرناکەیتەوە...

رستەکەم تەواو نەکرد.

–بەردەوامبە...

–پێتوانیە کە ئێستە بۆ تۆ زۆر قورسە کە خۆت بگونجێنیت؟ چونکە هەموو ئەمکارانەت کردووە.

–دەتەوێت بپرسیت کە ئارەزو دەکەم خۆزگایە ئەمکارانەم نەکردایە؟

–تەنها بیر لەوە دەکەمەوە کە لەوانەیە بۆتۆ ئاسانتر بێت. لەوانەیە ئەگەر ژیانێکی گورجوگۆڵ و کۆکراوەترو سادەترت هەبوایە، ئێستە ئاسانتر تامڵت دەکرد.

—من هەرگیز و هەرگیز خەم و پەژارە بۆ ڕابوردوم ناخۆم. چونکە کۆمەڵێك شتم کردووە. لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ کاتێك توشی ڕۆژانێکی لەمشێوەیە ببێت، بیرەوەرییەکان تەنها شتێکن کە بیەوێت بیربیان لێبکاتەوە.

زەردەخەنەیەکی کرد. زەردەخەنەیەکی جیدی و وشك. هەروەك بڵێی بەزۆر بوو.

—لە ئەنجامدا ئەگەر پرسیار لەمن دەکەیت، پێمباشترە باسی یادگارییە خۆشەکانم بکەم، دیمەنی خواردەمەنی فرۆشەکانی قەلاکە، یان ڕیزی جوان و سەرنجڕاکێشی دوکانەکانی خوارەوەی گۆڕەپانەکە. بەڵێ، سوپاس بۆ خودا ژیانم باش بوو.

لەسەر مێزەکە سوڕامەوە و چومە خوارەوە. دووبارە هەستمکرد کە لەم باس و گفتوگۆیانەدا کەمم هێناوە. بەجۆرێك لە جۆرەکان خۆم لە گێرەو کێشەدا دەبینی، بەلام نەمزانی کە چۆن تەختەی گوشت وردکردنەکەم لەسەر سەبەتەی دەفرە تەڕەکان هەڵگرت.

—لو، داوای لێبوردن دەکەم لەبارەی بابەتی پارەکەوە.

—کێشە نییە.

گەڕامەوەو تەختەکەم خستە بەردەم بەلوعەکە و ئاوێکم پێدا کرد.

—بەلام ئەوە لە مێشکت بکەرە دەرەوە کە دە پاوەندەکەت بۆ بگێڕمەوە.

***

دوو ڕۆژ دواتر ویل توشی هەوکردن بوبو، ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا. دەیانگوت دەبێت وەك خۆپارێزی کەمێك لە نەخۆشخانەدا بمێنێتەوە. بەلام دیاربوو ویل ئازارێکی زۆری دەکێشا. هەندێك لە ئیفلیجەکان هەستیان هەبوو، بەلام ویل لەگەڵ ئەوەی کە جەستەی لەبەرامبەر پلەی گەرماوە بەرگری دەکرد، لە ژێر سنگیەوە هەم ئازاری هەبوو هەم هەستی دەستلێدانیش. دووجار چوم بۆ سەردانی. گۆرانی و شتانێکی بەتامم بۆ برد بۆ ئەوەی گوێیان لێبگرێت و بیانخوات. لەلای دەمامەوە تاوەك بێتاقەت نەبێت. بەلام خێرا تێگەیشتم و بەجۆرێك لە جۆرەکان هەستم کرد کە ویل حەزناك لەوشوێنەدا سەرنج و گرنگی تایبەتی پێبدرێت. هەربۆیە پێی گوتم کە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوەو بۆ خۆم ئیسراحەت بکەم و بێخەمی ئەویم.

ئەگەر ساڵێك لەمەوبەر بوایە، ئەوا ئەم ڕۆژانەم بە بەزم و ڕەزمەوە بەسەر دەبردو کاتم دەکوشت، لەناو فرۆشگاکاندا دەگەڕام، یان لەوانەیە بچومایەو نانی نیوەڕوانم لەگەڵ پاتریکدا

بخواردایە. دادەنیشتم و سەیری بەرنامە تەلەفیزیۆنیەکانم دەکرد. جلوبەرگەکانم ڕێکو پێك دەکرد و زۆریش دەخەوتم.

بەڵام ئێستە زۆر بێقەرار بووم. زۆریشك شپرزەو سەرقاڵ، بەیانیان ئەنگێزە و مەبەستێم بۆ هەستان لەخەو نەبوو، بیانویەکم نەبوو کە ڕۆژەکەمی پێ دەستپێبکەم.

کاتی نیوەڕۆ بوو کە هات بە بیرمدا دەبوایە لەم چرکەساتانە زۆرترین سود و کەڵکم وەربگرتایە. چوم بۆ کتێبخانە و دەستمکردە کارکردن. سەردانی هەر وێب سایتێکم دەکرد کە پەیوەندی بە ئیفلیجەکانەوە هەبوو، شتانێکم دەستکەوت. لیستێکم لەوکارانە ئامادەکرد کە دەمانتوانی لەپاش باشتربونی حاڵی ویل ئەنجامیان بدەین. لەتەنیشتیەوە کەرەستەو پێداویستیەکانی هەریەکە لە بەرنامەکانم نوسی. زۆری گفتوگۆی خەڵکانی زیانبەرکەوتویی مێشك و دەماریم دۆزییەوە و دەبینم بە هەزاران ژن و پیاو لە هەمان هەلومەرج و باوردۆخی ویلدان و بە ژیانگەلێکی پشتی پەردە لەشاری لەندەن، سیدنی، ڤینکور و تەنانەت لەناو ئەم گەڕەکەشدا بە یارمەتی خزمان و دۆستانیان ژیان بەسەر دەبەن. تەنانەت هەندێکات بەشێوەیەکی زۆر داماوانە بەتەنهایی دەژین.

لەو سایتەدا من تاکە پەرستار نەبووم کە بەشوێن ئەو شتانەدا بگەڕێم. کچانێك هەبوون کە پرسیارییان دەکرد کە چۆن بتوانن متمانە بەخۆبون بۆ هاوڕێکانیان لە کچ و لە کوڕ بگێڕنەوە، بۆ ئەوە لەماڵەکانیان بێنەدەرەوە. هاوسەرانێکیش هەبوون کە ئەیانویست ئاگاداری تازەترین تەکنۆلۆژیاو پێشکەوتنەکانی چارەسەرکردن ببنەوە.

کۆمەڵێك ڕیکلامی فرۆشتنی کورسییەتایەدارەکان بوو کە بەسەر لم و چەویشدا دەڕۆیشتن، بەرزکەرەوە زیرەکەکان و کەرستەی هەوایی بۆ گەرماوو بوارەکانی شۆردن.

باس و گەڕانەکانیشیان ڕەمزو ئامازەی نهێنی خۆی هەبوو، ئەوکات زانیم کە (ئێس سی ئای) بەمانای زیانی مێشك و دەمارە و (یو تی ئێن) بەمانای بۆگەنکردن و هەوکردن دێت. زیانی بڕبڕەی ٤ و ٥ یش خراپترە لە زیانی بڕبڕەی ١١ و ١٢ە، چونکە لە حاڵەتی دووەمدا کەسەکە دەتوانێت دەست و جەستەی بجولێنێت. چ داستانگەلی عەشق و بێ وەفایی زۆرو زەوەند لەناو ئەو سایتانەدا لەنێوان خۆشەویستان و هاوسەراندا هەبوو کە یەکێکیان بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە گیرۆدە بوبو ئەویتر لەلای مابویەوە یان بەجێی هێشتبوو. ژنانێك هەبوون کە بڕیارییاندابوو لەلای مێردە ئیفلیج و منداڵە بچوکەکانیان بمێننەوە و بە جوانی بەخێویان

بکەن. ژنانێکیش هەبون کە هەستیان بە تاوان دەکرد و خۆیان نەدەبەخشی کە داوایان لە خودا کردبوو هاوسەرەکانیان لەدەست و پێ بکەون بۆ ئەوەی نەتوانن لێیانبدەن. ئێستە زانیبویان کە نەدەبوو هەرگیز ئەم نەفرەتانەیان بکردایە. پیاوانێکیش هەبوون کە ئەیانویست هاوسەرەکانیان بەجێبهێڵن، بەڵام بوێرییان نەبوو لە کاردانەوەی دەوروبەرەکانیان دەترسان. نائومێد و ماندوو داماو بوون. زۆرێکیش باس و بەسەرهاتی تاڵ و ناخۆش سەبارەت بە دڕان و کونبونی کێسە میزەکان و کارە بێ ئەقڵانەکانی خەڵکانیتر ئیتر لەڕوی خێرخوازییەوە بوو یان بەهۆی کۆمەڵێك ڕووداوی نەخوازراوەوە کە بەهۆی مەستی کەسەکانەوە ڕوویاندابوو. کەوتنە خوارەوە لەسەر کورسییە تایەدارەکان کە شتێکی زۆر ئاسایی بوو. باس و خواسی خۆکوشتنیش کرابوو. کۆمەڵێك ئیفلیج کە ئەیانویست خۆیان بکوژن و ئەوانەی کە داوایان لە ئیفلیجەکان دەکرد کاتێکی زیاتر بە خۆیان بدەن و بەشێوەیەکی نوێترو کراوەتر سەیری ژیانیان بکەن. هەموو بابەتەکانم خوێندەوە و ئاگاداری ئەو مەترسییانە بوومەوە کە بوونیان هەبوو. هەستمدەکرد بە دزییەوە چومەتە ناو بیرو مێشی ویلەوەو خەریکە سەر لە زەینیاتەکانی دەردەکەم.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو نوسیم:

*(سڵاو، من هاوڕێ و پەرستاری پیاوێکی سیی و پێنج ساڵەم کە بڕبڕەکانی ٥ و ٦ زیانیان بەرکەوتووە. پێشتر زۆر چالاك و سەرکەوتو بووە، ئێستە زۆر بەسەختی دەتوانێت خۆی لەگەڵ ئەم هەلومەرجە نوێیەدا بگونجێنێت. لەڕاستیدا دەزانم کە نایەوێت بەردەوامی بە ژیانی خۆی بدات، منیش بە شوێن ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕێم کە بیرو باوەڕی بگۆڕێت و هیوای بە ژیان هەبێت. ئایا کەسێك هەیە کە بتوانێت ڕێنماییم بکات و پێم بڵێت دەبێت چی بکەم؟ بەشوێن بیرۆکەی نوێدا دەگەڕێم کە بتوانێت ناوبراو بخاتە شادی و خۆشی یاخود بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕێم کە تێڕوانینی بۆ ژیان بگۆڕم.؟ پێشوازی لە هەر بیرۆکەیەکی نوێ دەکەین. سوپاس).*

ناوی خۆیشم نا (هەنگی کارزۆر). پاڵمدا بە کورسییەکەوە، چەند ساتێك قەپم لە نینۆکی پەنجە گەورەم گرت دواتر پەنجەم نا بە دوگمەی ناردنەکەدا.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێك چومەوە سەر کومپیوتەرەکە، دەبینم چواردە کەس وەڵامیانداوەتەوە. چومە ناو ژوری گفتوگۆوە، بە بینینی پێرستی ناوونیشانەکان چەندجارێك چاوم داخست و کردمەوە. لە هەموو شوێنێکی دوونیاوە وەڵامیاندابویەوە، لە هەر سەعاتێکی شەووڕۆژدا. یەکەمیان ئەمە بوو:

*(هەنگی کارتۆری خۆشەویست:*
*بەخێرهاتی بۆناو کۆمەڵەکەی ئێمە، دڵنیام هاوڕێکەت بە هەبوونی کەسێکی وەك تۆ دووبارە هێمنی و ئارامی بۆ دەگەڕێتەوە).*

لەبەرخۆمەوە گوتم بەڵام من دڵنیا نیم.

*(زۆربەی ئێمە کە لێرەداین لە ژیانماندا بە جۆرێك لە جۆرەکان گورزێکمان بەرکەوتووە. دیارە کە هاوڕێکەی تۆیش ئەو گورز و لێدانەی بەرکەوتووە، بەڵام مەهێڵە هاوڕێکەت تۆ لە خۆی دوور بخاتەوە. ئەوە بهێنە بە دەوری گوێیدا کە ئێمە لەو پلەو پێگەیەدای نین کە کەی دێینە دوونیاوە و کەیش دوونیا بە جێدەهێڵین. تەنها خودا خاوەنی ئەو دەسەڵاتەیە و بەویستی ئەوە کە ژیانی هاوڕێکەت گۆڕدراوە، بەرژەوەندی تێدایەو بەدڵنیاییەوەی حیکمەتێك لە کارەکەدا هەیە).*

ئەمەم بەنیوەو نیوەچڵی بەجێهێشت و چوم بۆ لای وەڵامی دووەم:

*(هەنگی خۆشەویست:*
*چارەیەك نییە، ئیفلیجی هەرچواریەل مرۆڤ لە هەموو شتێك بێ هیوا دەکات. ئەگەر هاوڕێکەت وەرزشکارو ئەهلی چالاکییە جەستەییەکان بووە، کەوابوو ئێستە ژیانی زۆر سەختە، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا شتانێك هەبوون کە یارمەتیدەری من بوون. هاوڕێیەتی و تێکەڵی زۆر، تەنانەت کاتێکیش حەزم نەدەکرد. خواردنی باش، دکتۆرە باشەکان. ئەگەریش پێویستبوایە دەرمانی دژە بێتاقەتی. نەتکوت لە کوێ دادەنیشیت، بەڵام ئەگەر*

*بتوانیت باوەڕی پێبهێنیت کە قسە لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵەی سی سی ئەی دا بکات، زۆر سودی دەبێت. من سەرەتا حەزم نەدەکرد، (وابزانم بەشێك لە بوون و وجودم نەیدەویست ئەوە قبوڵبکات کە هەرچوارپەل ئیفلیجم)، بەڵام کاتێك بزانیت کە تەنها خۆت نیت، زۆر کاریگەر دەبێت.*

*هەرگیزیش مەهێڵە سەیری فیلمانێکی وەك (جەرەسی غەواسی و پەروانە[25]) بکات. دەبێتە هۆی خەم و خەفت بۆی! هەرچییەکت کرد ئاگادارمان بکەرەوە.*

*بەهیوای سەرکەوتن.*

*ڕیچی)*[26]

کۆمەڵێك شتم لەبارەی فیلمی (جەرەسی غەواسی و پەروانە)وە خوێندەوە. هەروەك وێب سایتەکە دەیگوت: (داستانی ژیانی پیاوێك کە ئیفلیج دەبێت و ئەو هەوڵانەی کە بۆ پەیوەندیکردن بە دوونیای دەرەوە دەیدات) ناوی فیلمەکەم لەسەر کاغەز نوسی. نەمزانی بۆچی ناوەکەیم نوسی، ئەمویست لەبیرم بێت کە نەهێڵم ویل ئەم فیلمە ببینێت، یان تەنها ئەمویست لەبیرم نەچێت و خۆم سەیری فیلمەکە بکەم.

دوو وەڵامی دواتر لە کلێسای (چاوەڕوانانی دەرکەوتنی ڕۆژی حەوتەم)و پیاوێکەوە بوو کە ڕێگەچارە پێشنیارکراوەکانی بۆ بەهێزکردنی ڕۆحییەتی ویل بە هەموو شێوەیەك لەدەرەوەی کارو تواناو لێهاتنەکانی منەوە بوو. لە تەریقیدا دەموچاوم سوربوبویەوە، بەخێراییەوە چومە خواری لاپەڕەکە، خەمی ئەوەم بوو کەسێك لە دواوە سەیری لاپەڕەی کۆمپیوتەرەکەم بکات. لەسەر وەڵامی دواتر کەمێك هەڵوەستەم کرد:

*(سڵاو هەنگی زۆرکار:*

*بۆچی وادەزانی کە هاوڕێکەت، ئەو کەسەی کە لەبەردەستی تۆدایە یان هەر شتێکیتر، دەبێت بیروباوەڕی بگۆڕێت؟ من خۆم ئەگەر ڕێگەیەکم شك ببردایە کە بتوانم لە ڕێگەی تەقدیرو چارەنوسەوە لە دوونیا بڕۆم، ئەگەر دەمزانی ئەمکارە خانەوادەکەم لەناو نابات،*

---

[25] فیلمێکی سینەماییە لە دەرهێنانی جولین ئیشنابل بەرهەمی ساڵی ۲۰۰۷ .

[26] یەکێك لە مەزهەبە پرۆتستانە مەسیحیەکانە.

*بەدڵنیاییەوە ئەمکارەم دەکرد. ئەمە هەشت ساڵە کە دیلی ئەم کورسییەتایەدارە نەفرەتیەم و سەرانسەری ژیانم خەفەت و نائومێدییە. ئایا بەراستی دەتوانی خۆت بخەیتە جێگەی ئەوەوە؟ دەزانیت ئەوە مانای چییە کە تەنانەت توانای ئەوەت نەبێت بەبێ یارمەتی ڕیخۆڵەت خاڵی بکەیتەوە؟ دەزانی ئەوە مانای چییە کە تاوەکو کۆتایی تەمەنت لکابیت بەزەوەییەکەوە و نەتوانیت بەبێ یارمەتی نان بخۆیت، جلوبەرگ لەبەر بکەیت و پەیوەندی لەگەڵ دوونیای دەرەوەدا بیەستیت؟ هەرگیز نەتوانی سەر لەنوێ هاوسەرگیری بکەیتەوە؟ دەتوانی تەسەوری ئەوە بکەیت کە بێجگە لە ڕەنج و نەخۆشی و تەنانەت دەزگای هەناسەدانی دەستکرد هیچ شتێکیتر چاوەڕوانت ناکات؟ تۆ کەسێکی میهرەبان دیاریت و دڵنیام نیەت و مەبەستی خێرو چاکەت هەیە. بەڵام لەوانەیە هەفتەیەکیتر تۆ پەرستاری نەبیت، بەڵکو کەسێك بێت کە بێتاقەتی بکات. یان لەوانەیە هەر خۆشی نەوێت، ئەمەش وەك شتەکانیتر لە کۆنترۆڵی ئەو بەدەرە. ئێمە کە تووشی ئەم بەڵایە بووین دەزانین کە تاوەکو ئاستێکی زۆر لەدەستی ئێمەدا نییە بۆ ئەوەی بڕیار بدەین کێ خواردنمان پێبدات، جلوبەرگمان لەبەر بکات، بمانشوات، دەرمانەکانمان پێبدات، ژیان بەم بیرو فیکرانەوە پڕ ئازارو مەینەتە.*

*هەربۆیە بە بڕوای من پرسیارێکی بێجێگەت کرد. ئەمانە کێن کە بڵێن ژیانی ئێمە دەبێت چۆن بێت؟ ئەگەر ژیانی هاوڕێکەت شێوازی سروشتی نییە، باشترە بپرسیت کە (چۆن دەتوانم یارمەتی بدەم بۆ ئەوەی تەواوی بکات و ڕزگاری ببێت؟*

*سەرکەوتو بیت.*

*هێزی جی[٢٧]، میزوری، ئەمریکا)*

واقم بەم نامەیەدا وڕمابوو، پەنجەکانم لەسەر لاپەڕەی سەرەکی جوڵەیان لێ بڕا. دواتر چووم بۆ خوار لاپەڕەکە. چەند نامەیەکی تریش هەر لە ئیفلیجەکانەوە هاتبوو، لەبەر قسە نائومێدکارەکانی زۆر لۆمە و سەرزەنشتی هێزی جیم کرد، چونکە پێشتر گوتبویان ئومێدەوارن و ژیانیان زۆر بەنرخە.

[٢٧] یەکەی پێوانەی ڕێژەی ئەو فشارەی کە دەکەوێتە سەر ئەو جەستەیەی کە ڕاکردنی بەرەو زیادبون دەچێت.

دواتر دەرمانی دژە خەمۆکی، ماساژ، موعجیزە و باشتر بوونی هەندێك لە خەڵکی، داستان و چیرۆکانێکی وەك ئەوەی کە چۆن ژیان بەنرخ دەبێت. لەگەڵ چەند ئامۆژگارییەکدا: خواردنەوەی شەراب، مۆسیقا، وێنەکێشان، بەتایبەت ئەو کیبۆردانەی کە بۆ ئیفلیجەکان دروستکراون. گریس ٣١ لە برمینگەمەوە گوتی: (شەریکێکی ژیان، ئەگەر عەشقێك لە دڵیدا بێت، هەستدەکات کە دەتوانێت بەزیندویی بۆ ئەو بمێنێتەوە، بەبێ ئەو من تاوەکە ئێستە حەوت کفنم ڕزاندبوو). چەندین ماوە پێش ئەوەی لە کتێبخانە بێمە دەرەوە، ئەم قسەی کۆتایی لەسەرمدا خولی دەخوارد.

***

ویل ڕۆژی پێنج شەممە لە نەخۆشخانە دەرچوو، بە سەیارە چوم بەشوێنیدا و هێنامەوە بۆ ماڵەوە. ڕەنگی زەرد بوو ماندوبوو. بەدرێژایی ڕێگاکە بێ حاڵ و بێ حەوسەڵە بوو، سەیری دەرەوەی پەنجەرەکەی دەکرد، کاتێك پرسیم حاڵی چۆنە وەڵامیدایەوە:

—لەمجۆرە شوێنانەدا هەرگیز ناتوانی بخەویت. هەمیشە لەدەوروبەرتدا کەسێك هەیە کە بناڵێنێت.

بە ویلم گوت لە کۆتایی هەفتەوە کاتی هەیە کە سەرلەنوێ ووزەی خۆی تازە بکاتەوە. بەڵام دواتر کۆمەڵێك بەرنامەم هەیە بۆ چونە دەرەوە. گوتم کە بەپێی ئامۆژگارییەکەی جوڵامەتەوە و خەریکم شتانێکی نوێ تاقیدەکەمەوە. ئەویش ناچارە کە لەگەڵمدا بێت. گۆڕانکارییەکی هەستپێنەکراو لە شێوازی مامەڵەکردنمدا بەدی هاتبوو. دەمزانی تەنها بەم ڕێگەیە دەتوانم لەگەڵ خۆمدا بیبەمە دەرەوە.

لەڕاستیدا بەرنامەیەکی زۆر وردم بۆ دوو هەفتەی داهاتوو دارشتبوو. بە وردی و بە پێنوسی ڕەش بەرنامەکانم لەسەر ڕۆژژمێرەکە نوسی. بە پێنوسی سوریش ئەو دەستپێشخەرییە یەدەکانەم نوسی کە دەبوایە پێشتر لەبەرچاویان بگرم، هەروەها پێنوسی سەوزیشم بۆ نوسینی پێداویستیەکان بەکارهێنا. هەرکاتێك کە چاوم بە پشتی دەرگای ژورەکەم دەکەوت، کەمێك هەستم بە هەیەجان دەکرد. بەشێکی لەبەر ئەو بەرنامەرێژییانەبوو کە کردبوم، بەشێکیشی لەبەر ئەوەبوو کە هیوادارم ئەم بەرنامانە تێپەڕواین و سەرنجی ویل بۆ ژیان بگۆڕن.

هەروەك هەمیشە باوکم دەیگوت ئەقڵی بیرمەندی خێزانەکەمان خوشکەکەم بوو.

بەو سێجارەی کە بەدەوری گەراجەکەدا سوڕاینەوە بۆ ئەوەی شوێنێکی گونجاو بۆ وەستان و پارککردن بدۆزینەوە، لە ماوەی کەمتر لە بیست خولەکدا گەیشتینە پیشانگای وێنەکان. سەیری پیشانگاکەمان کرد، بەڵام هێشتا دەرگای هۆڵەکەم لە دوای خۆمەوە دانەخستبوو کە ویل گوتی چەندە شپرزە و بێمانابوو، هیچ خۆش نەبوو بەلامەوە. هۆکارەکەیم پرسی. گوتی: کاتێك خۆم نەمتوانی لە تابلۆی وێنەکان تێبگەم، ئیتر ڕونکردنەوەی وێنەکێشەکەیش بێ سود بوو. سینەماکەیش کەنسڵ کرایەوە، یەکێك لە لێپرسراوەکانی بە داوای لێبوردنەوە گوتی کە ئاسانسۆرەکە کارناکات. سەرگەرمییەکانیتریش، هەروەك چون بۆ مەلەکردن کە سەرکەوتو نەبوو، پێویستیان بە بەرنامەڕێژی زیاترو وردتر هەبوو، پێشتر تەلەفۆنم بۆ مەلەوانگەکە کرد، بۆ کاری زیادەیش لەگەڵ نیتندا هەماهەنگم کرد، بەڵام کاتێك گەیشتینە ناوەندی بنکە گەشتیارییەکە ویل ئامادە نەبوو لە سەیارەکە دابەزێت. لەناو پارکینگەکەدا بێدەنگ و خامۆش تەرمۆزی شوکولاتە گەرمەکەی خواردەوە و دواتریش بە بڕشتەوە گوتی با بگەڕێینەوە.

شەوی چوارشەممەی دواتر چوین بۆ کۆنسێرتی گۆرانبیژێك، کە پێشتر لە نیویۆرکدا یەکجار بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کۆنسێرتی ناوبراوی بینیبوو. خۆشبەختانە بەرنامەیەکی زۆر باشی لێدەرچوو.

ڕۆژی دواتر ویلم برد بۆ بەرنامەی تامکردنی شەراب، بەشێکبوو لەو ئاهەنگەی کە لە هۆڵی فرۆشگایەکی پیشەگەردا ڕێکدەخرا. نیتن بەزۆر پەیمانی لەمن وەرگرت کە نەهێڵم ویل زیادەڕەوی بکات لە خواردنەوەدا. ویل هێندە شارەزاو بە ئەزمون بوو لە تامو بۆنی شەرابەکاندا کاتێك کوپەکەم دەبرد بۆلای دەمولوتی پێش ئەوەی تامیان بکات دەیزانی چ تاموچێژێکیان هەیە. فشارم لە خۆم کرد کاتێك ویل شەرابەکە دەتفێتە ناو پێکەکەوە ئاخو ئۆف نەکەم، (گاڵتەجاڕانە). سەیری دەکردم و دەیگوت کە زۆر منداڵیت. خاوەنی فرۆشگاکە کاتێك بینی کەسێك بە کورسی تایەدارەوە هاتووە، سەرەتا پێی خۆش نەبوو، بەڵام دواتر کەوتە ژێرکاریگەرییەوە. کەمێك کات کە تێپەڕی، خاوەنی فرۆشگاکە دانیشت و بوتڵی زیاتری هەڵپچڕی و لەگەڵ ویلدا سەبارەت بە ترێ و ناوچەکە دەستیانکردە قسە کردن. منیش لەو ناوەدا پیاسەم دەکرد و سەیری مارکەی بوتڵە شەرابەکانم دەکرد، ڕاستیەکەی کەمێك حەوسەڵەیشم بەسەر چوبوو.

ویل بەسەر ئاماژەی کرد کە لەتەنیشتیەوە دابنیشم.

-کلارك، وەرەو لێوێك تەرکەرەوە.

-نەخێر، دایکم دەڵێت کارێکی خراپە کە شتێك بخەینە دەممانەوە و بیتفینەوە.

هەردوو پیاو بەجۆرێك سەیری یەکترییان کرد هەروەك بڵێی ڕوبەڕوی شێتێك بونەتەوە. لەپاش ئەو قسەی منەوە ویل کەمتر شەرابەکەی دەتفیەوە بۆ ناو پەرداخەکە. بەشێوەیەکی گوماناویش هەموو پاشنیوەڕۆی ئەو ڕژە پیشەگەری کرد و هەرشتێك هەبوایە پێدەکەنی، ئەڵبەتە لە هەمووکات زیاتر کەللەڕەقی کرد.

دواتر کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، بەناوچەیەکدا تێپەڕین کە بەشێوەیەکی ئاسایی لەو ڕێگەیەوە نەدەهاتین. هەروا کە لەناو ترافیکدابوین، من سەیرێکی دەرەوەم کرد و چاوم بە ناوەندێکی خاڵکوتان و تاتۆکردن کەوت. گوتم:

--هەمیشە حەزم لە خاڵکوتان و تاتۆکردن بووە.

دەبوایە بزانم کە نابێت ئەمجۆرە قسانە لەگەڵ ویلدا بکەم، چونکە ئیتر درێژەی بەباسەکە دەداو وازی لەم بابەت و مامەڵەیە نەدەهێنا. هەربۆیە یەکسەر پرسی ئەی باشە بۆچی تاوەکو ئێستە ئەوکارەم نەکردووە.

-پێموایە تەنها لەبەر قسەی خەڵکی بووە.

-بۆچی؟ مەگەر خەڵکی چی دەڵێن؟

-باوکم زۆر ڕقی لە خاڵکوتان و تاتۆکردنە.

-جارێکیتر پێمبڵێ تەمەنت چەندە؟

-ئەی پاتریکیش ڕقی لێیەتی؟

-ئەی خۆی هیچکاتێك کارێك ناکات کە تۆ ڕقت لێی بێت؟

-دەزانم دەکەومە ژێر فشارەوە و یەکسەر پەشیمان دەبمەوە.

-خۆ دەکرێت بە لەیزەر بیانسڕیتەوە.

لە ئاوێنەکەی پشتەوە سەیرێکیم کرد. چاوەکانی پێدەکەنین گوتی:

-واز لەوە بهێنە، ئێستە بڵێ بزانم حەزت لە چ جۆرە نەخشێکە؟

دەمزانی خۆیشم پێکەنین بەسەر لێومەوەیە.

-مار یاخود ناوی هیچکەسێکم نەدەکێشا.

-منیش پێموانەبوو کە شێوەی دڵ دروستبکەیت و ووشەی (دایك) لە ژێرەکەیەوە بنوسیت.

-پەیمانم پێدەدەیت پێنەکەنی؟

-خۆت دەزانی کە ناتوانم. ئۆو خودایە گیان! پەندی پێشینانی هیندی سانسکریت یان ئەمجۆرە شتانەیە کە ناتەوێت خاڵ بکوتیت، وایە؟ (ئەوەی کە نەمکوژێت، بەهێزترم دەکات).

-نەخێر، وێنەی هەنگم دروستدەکرد. هەنگێکی بچوکی زەرد و رەش. زۆر جوانن بەلامەوە.

-ئەی باشە کامە شوێنی جەستەت بە خاڵ دەکوتا؟ لەوانەیە نەدەبوو ئەم پرسیارە بکەم.

شانەکانم بەرز کردەوە.

-سەرشان، سمت، نازانم.

ویل گوتی:

-بوەستە.

بۆچی شتێك بووە؟ تۆ باشی؟

-هەر لێرەدا بوەستە. سەیرکە. ئەوەش لە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبیلەکان لەلای چەپەوە.

ئۆتۆمبیلەکەم لە تەنیش شۆستەو جۆگەلەی شەقامەکەوە وەستاند. ئاوڕمدایەوە بۆلای و سەیرێکم کرد.

-ئێستە برۆ بزانم، خۆ ئەمرۆ کارێکیترمان نییە؟

-بۆ کوێ بچم؟

-برۆ بۆ ناوەندی خاڵکوتان و تاتۆکردنەکە.

دەستمکردە پێکەنین.

-ئۆو، کەوابوو بەمشێوەیە!

-بۆچی نەچیت!

-تۆ شەرابەکانت نەتفییەوە و هەموویانت قوتدا.

-وەڵامت نەدامەوە.

سوڕامەوە. ویل زۆر جیدی بوو.

-ئێستە ناکرێت بچم و خاڵبکوتم. خۆر هەروا گاڵتە نییە.

-بۆچی؟

-چونکە....

سەیرێکی شەقامەکە و ناوەندی تاتۆکەم کرد. تابلۆی نیئۆن بە شێوەی دڵێکی گەورە، لەسەر پەنجەرەیەکی نیمچە دوکەڵاوی ناوەندی خاڵکوتانەکە دەبینرا، لەگەڵ چەند وێنەیەکی ناو چوارچێوەی ئانجیلیناجولی و میکی رورك.

دەنگی ویل منی لەناو بیرم خەیاڵەکانمدا هێنایە دەرەوە.

ئۆتۆمبیلەکەم کوژاندەوە. هەروا دانیشتین و گوێمان بۆ هەمهەمەی بێدەنگی ئەو ئۆتۆمبیلانە گرت کە لەتەنیشتمانەوە و بەسەر شەقامەکەدا دەڕۆیشتن.

—بە شێوەیەکی هەمیشەیی دەمێنێتەوە.

—نەخێر، نا بۆ هەمیشە.

—پاتریك ڕقی لێیەتی.

—هەروا دەتەوێ بەردەوامبی؟

—لەوانەیە بەهۆی دەرزییە ئالودە و پیسەکانیانەوە توشی هیپاتیت ببن، دواتریش بمرین. بەڵام مردنێکی هێواش و لەسەرخۆ، بەڵام تاڵو ترسناك.

سەیرێکیم کرد.

—لەوانەیە ئێستە خاڵ نەکوتن و کار نەکەن. خۆ ئێستە ناکرێت.

—لەوانەیە وانەبێت. باشتر نییە بچین و پرسیار بکەین؟

***

دوو سەعات دواتر لەناوەندی تاتۆکەدا هاتینە دەرەوە، هەشتا پاوەندم دابوو. هێشتا مرەکەبەکە ووشك نەبوبویەوە و لەفاف و لەزگەی نەشتەرگەرییەکە لەسەر سمتم بوو. تاتۆکارەکە دەیگوت لەبەر ئەوەی کە ئەندازەکەی بچوکە لەیەك دانیشتندا دەتوانێت نەخشەکەی بکێشێت و ڕەنگیشی بکات. منیش قبوڵم کرد و کارەکە ئەنجامدرا. لەوانەیە هەر بەوجۆرەی کە بەدڵنیاییەوە پاتریك دەیگوت تاوەکو کۆتایی تەمەنم دەبویە هۆی ترسانم. لەژێر لەفافە سپییەکەدا هەنگێکی توکاوی قەڵەوی بچوك کێشرابوو. وێنە و نەخشەکەی لەو نەخش و وێنانە هەڵمبژاردبوو کە تاتۆکارەکە لەناو دوکانەکەیداو لەکاتی چونە ژورەوەماندا نیشانیدابن، لەبەر هەیەجانی زۆر تورە بووم. بەردەوام دەستم لە تەداوییەکە دەدا بۆ ئەوەی چاوێکم بە خاڵکوتانەکە بکەوێت. بەڵام ویل نەیدەهێشت و دەیگوت لەوانەیە کێشەیەك بێتە پێشەوە.

لەوکاتەدا بوو کە ویل بەشێوەیەکی سەیرو سەمەرەوە خۆشحاڵ و سەریحاڵ بوو. کەس سەرنجێکی تایبەتی نەدایە ویل. لێپرسراوانی ناوەندەکە دەیانگوت تاوەکو ئێستە تاتۆیان بۆ چەند توانویستێت کردووە، لەوانەیە لەبەر ئەوەی مامەڵەیان هێندە ئاسایی بوو، ویلیش هەستی بە مورتاحی دەکرد. کاتێك ویل گوتی هەست بە دەرزییەکە دەکات، هەمویان سەریان سوڕمابوو. شەش هەفتە لەمەوبەر، لایەکی قاچی توانویستێکیان بەتەواوەتی تاتۆ کردووە. تاتۆکارەکە کە گوارەی لە گوێدا بوو، ویلی برد بۆ ژوورەکەی تەنیشت و بە هاوکاری تاتۆکارەکەی من لەسەر مێزەکە پاڵیانخست. دەرگاکە کرابویەوە و قاچەکانی ویلم دەبینی. چپەو پێکەنینەکانی هەردوو پیاوەکەم دەبیست کە سەرقاڵی کار بوون. بۆنی توندی مادەی دژە بۆگەنی و هەوکردن لوتی پڕ کردبووم.

کاتێك یەکەمین نوکە دەرزی درا لە پێستم، گازم گرتەوە لە لێوم، ئەمویست نەهێڵم ویل قیژەم ببیستێت. هەموو هەستم لەلای ژورەکەی تەنیشتم بوو. هەوڵم دەدا بزانم چی دەڵێت.

حەزم دەکرد بزانم چ جۆرە نەخش و وێنەیەك بۆ خاڵ و تاتۆکەی دیاریدەکات.

دەرگای سەیارەکەم کردەوە و ڕەمپاکەم هێنایە خوارەوە. گوتم:

—ویل ترینەر تۆ زۆرخراپ لە مێشکی منت داوە.

دەمم تاوەکو بناگوێم کرابویەوە، نەمدەتوانی کۆنترۆڵی بکەم.

—ئادەی بزانم.

سەیرێکی شەقامەکەم کرد، دواتر لەفافە پزیشکیەکەم کەمێك لەسەر سمتم لادا.

—زۆر باشە، هەنگە بچکۆلەکەت زۆر جوانە بەلامەوە.

—بۆ لەمەولاو پاشماوەی تەمەنم دەبێت لەلای دایکوباوکمدا پانتۆڵی کەمەر درێژ لەبەر بکەم.

یارمەتیمدا کە بچێتە سەر ڕەمپاکە، گوتم:

—ئاگاداربە ئەگەر دایکت بزانێت کە تۆ...

—بە دایکم دەڵێم کە کچ لەناو کۆمەڵگەی ڕێکخراوەییدا شاربەدەری کردم.

—زۆر باشە، ترینەر. ئێستە نۆرەی تۆیە کە خاڵ و تاتۆکەی خۆتم نیشانبدەیت.

بەوپەڕی خوێنساردییەوە سەیری کردم. زەردەخەنەیەکی نیوەو نیوەچڵ لەسەر لێوەکانی دەرکەوت، گوتی:

—کاتێك گەیشتینە ماڵەوە ناچار دەبیت کە لەفافەکەی بگۆڕیت.

—کێشە نییە، لەبەر ئەوەی کە جاری یەکەمە.

—دەی کەوابوو کراسەکەم لەلای ڕاستەوە بەرز بکەرەوە.

لە کورسی پێشەوە خۆم چەماندەوە، بلوزەکەیم هەڵدایەوە و سەیری ژێر لەفافەکەم کرد. لەسەر پێستە ڕەنگ پەڕیوەکەیدا لاکێشەیەکی ڕەش و سپی هەبوو، هێندە بچوکبوو کە ناچار بووم دووجار سەیری بکەمەوە تاوەکو بزانم چی نوسراوە.

(مێژووی بەسەرچون، ١٩ مارسی ساڵی ٢٠٠٧)

ماتم کرد. پێکەنیم، دواتر چاوەکانم پڕ بون لە فرمێسك.

—مێژوو بەرواری....

—ڕۆژی دەعمەکەم. بەڵێ.

سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە.

—ئۆو کلارك، توخودا زۆر توشی هەستیاری مەبە. تەنها بۆ پێکەنینە.

—پێکەنیناوییە. لەلایەکیشەوە هەر بەڕاستی گاڵتەجاڕانەیە!

—نیتن حەزی لێدەکات و پێیخۆشە. ئۆو... وازبهێنە. ئەم قیافەیە لە خۆت نیشان مەدە. مەگەر جەستەی تەندروستی خۆمم زایە کردووە، وایە؟

بلوزەکەیم هێنایە خوارەوە. ئاوڕمدایەوە دەستمپێکرد. نەمدەزانی چی بڵێم. نەمدەزانی کامیانە، لەگەڵ ژیان و واقیعیەتی خۆیدا دەست و پەنجەی نەرمکردووە یان بەمشێوەیە ئەیەوێت نەفرەتی خۆی بەرامبەر بەجەستەی نیشان بدات؟

هەرکە ویستم برۆم، گوتی:

—هێی کلارك، ئەزیەتێکم بۆ دەکێشیت؟ لەناو کۆڵەپشتیەکەدا، گیرفانە زنجیردارەکە.

لە ئاوێنەکەی پشتەوە سەیرم کرد، دووبارە برێکم ڕاکێشایەوە. لە کورسی پێشەوە خۆم لارکردەوە و بەپێی داواکارییەکەی دەستمکرد بەناو جانتاکەیدا. تەنها چەند سانتیمەترێك مەودام لەگەڵ دەموچاویدا هەبوو. بەبەراورد بەو ڕۆژەی کە لە نەخۆشخانە گەڕابویەوە، ڕەنگ و ڕووی کرابویەوە.

—حەبی ئازارشکێن و هێورکەرەوەت دەوێت؟ من چەند دانەیەکم لەناو....

—نەخێر، بەباشی بگەڕێ.

پارچە کاغەزێکم دەرهێنا، پاڵمدا بە کورسیەکەوە، دراوێکی کاغەزی دە پاوەندی قەد کراوبوو.

–ئێستە برۆ. هەمان ئەو دە پاوەندەیە کە بۆ کاتی پێویستم دانابوو.

–ئێ باشە چی بکەم؟

–بۆ تۆ.

–بۆچی؟

–بۆ خاڵکوتان و تاتۆکەت.

زەردەخەنەیەکی کرد.

–تاوەکو لەسەر کورسییەکە دانەنیشتیت، باوەڕم نەکرد کە تاتۆ بکەیت و خاڵ بکوتی، بۆ یەك ساتیش باوەڕم نەدەکرد هەر بەڕاستی ئەمکارە بکەیت.

## {١٦}

هیچ چارەیەکمان نەبوو. کۆتایی هەفتەکان کە ترینا دەهاتەوە، خەومان تێکدەچوو خانەوادەی کلارك یارییەکی باشی شەوانەیان وەڕێدەخست و لەم ژوورەوە بۆ ئەو ژوور جێگۆڕکێیان دەکردو هەموویان دەربەدەر دەبوون. شەوانی شەممە، لەپاش نانی ئێوارە، دایکم و باوکم ژووری نوستنەکەیان پێشکەش دەکرد و تریانایان دڵنیا دەکردەوە کە هێندەی مسقاڵە زەڕەو سەرەدەرزییەك پێیاننناخۆش نییە و باشتر وایە تۆماس لە ژوورێکدا بخەوێت کە ئاشنایە لەگەڵیدا، ترینایش قبوڵی دەکرد. بە قسەی ئەوان، بەمشێوەیە هەموان خەوێکی خۆشیان دەبێت.

بەڵام خەوتن لە قاتی خوارەوە بۆ دایکوباوکم، هێندەش ئاسان نەبوو، دایکم نەریتی وابوو بە لێفەو پشتی و تەنانەت چەرچەفەکەی خۆیەوە بخەوێت. دەبوایە شوێنی خەوەکەی بەوجۆرە بێت کە خۆی حەزی لێدەکات بۆ ئەوەی بە ئیسراحەت بخەوێت. هەربۆیە لەپاش نانخواردن دایکم و ترینا پێخەفەکانیان لەسەر قەرەوێڵەکەی دایکم و باوکم کۆ دەکردەوە و پێخەفی نوێیان دەخستە سەری، نایلیۆنیشیان دەخستە سەری بۆ ئەوکاتانەی کە تۆماس توشی کێشە دەبوو. پێخەفەکانی دایکو باوکمیان قەد دەکرد و دەیانخستە سوچێکی ژووری دانیشتنەکەوە. دواتریش تۆماس خۆی لەسەریانەوە فڕێدەدایە خوارەوە و لێفەکەی دەدا بەسەر کورسییەکانی مێزی نانخواردنەکەدا بۆ ئەوەی خانوی پێ دروستبکات.

بابەگەورەیشم ژوورەکەی خۆی دەبەخشی، بەڵام خوازیارو لایەنگری نەبوو. ژوورەکەی بۆنی کتێبە کۆنە و زەرد و گۆڤارەکانی ریسینگ پۆست و توتنی دەدا. هەموو کۆتایی هەفتەکانی پێویستبوو کە ئەو بۆنە نەمێنێت. هەندێکجار هەستم بە گوناح دەکردو لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئەمە هەمووی خەتای من بوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا نەمدەتوانی پێشنیاری ئەوە بکەم کە بگەڕێمەوە بۆ ژوورە شقارتەییەکە. ئەو ژوورە بچوك و خەفە و بێ پەنجەرەیە و بۆمن وەك

کابوسێك وابوو. بە بیرکردنەوەش لەوەی کە دووبارە لەناو ئەو ژوورەدا بخەوم هەناسەم توند دەبوو. تەمەنم بیست و حەوت ساڵان بوو. نانبدەی سەرەکی ماڵەکە بووم. نەمدەتوانی لەناو ژوورێکدا بخەوم کە لە بنەڕەتدا کۆمەدی شتومەك و جێگا بووە.

یەکێك لەم کۆتایی هەفتانە پێشنیارم کرد کە با شەوێك لە ماڵی پاتریك بمێنمەوە. دیاربوو کە هەموویان هەناسەیەکی ئیسراحەتیان هەڵکێشا، بەڵام کەس ئاشکرای نەکرد. شەو کاتێك لەماڵەوە نەبوبوم تۆماس بە پەنجە شیلاوییەکانی پەردەکەی خراپ کردبوم و بە ماجیکیش لەسەر لێفە نوێکەم وێنەی کێشابوو. هەربۆیە دایکم و باوکم بڕیارییاندا کە خۆیان لەناو ژوورەکەی مندا بخەون، بۆ ئەوەی تریناو تۆماس لەناو ژوورەکەی مندا بخەون. ئەوکات ئەگەر تۆماس زەرەرێکیشی بدابایە گرنگ نەبوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسانەوە ناچار بوون کە پێخەفەکانیان جێگۆڕکێ پێبکەن و بیانشۆن. بە قسەی دایکم خەوتنی من شەوانی هەینی و شەممە لەماڵی پاتریکدا یارمەتیدەرێکی گەورە نەبوو.

دواتریش مەسەلەی خودی پاتریك لە ئارادا بوو. پاتریك ئێستە مرۆڤێکی دڵدۆڕاوی تەواو بوو. هەموو هەست و هۆشێکی بەلای پێشبڕکێوە بوو. خەوی، خۆراکی، ژیانی و هەموشتێکی بوبو بە وەرزش. ئاپارتمانەکەی کە هەمیشە ڕێکوپێك بوو، ئێستە پڕ و پەرش و بڵاو بوو لەو کاغەزانەی کە پەیوەندییان بەبەرنامە و ڕژێمە خۆراکیەکانیەوە هەبوو. پاسکیلە سوکەکەی لەناو ڕێڕەوەکەدا بوو، من مۆڵەتی ئەوەم نەبوو کە دەستی لێبدەم، چونکە خودی پاتریك شتومەك و کەرەستە وەرزشییەکانی دانابوو، هەربۆیە ئەگەر من دەستکاریم بکردنایە لەوانەبوو هاوسەنگیان تێکبدەم.

پاتریك زۆر بەکەمی لەماڵەوە بوو، تەنانەت شەوانی شەممە و یەك شەممەیش. بەسەرنجدان بە سەعاتەکانی کارکردنی من و ڕاهێنانەکانی ئەو. لەسەر ئەوە ڕاهاتبوین کە یەکتری زۆر بەکەمی ببینین. دەمتوانی بچم بەدوایدا و سەیری بکەم کاتێك بەدەوری گۆڕەپانەکەدا دەسوڕێتەوە، تاوەکو بەتەواوەتی ڕاهێنانەکەی ئەنجامدەدات. یاخود بە تەنهایی لەماڵەکەیدا دابنیشم و لە گۆشەی قەنەفە چەرمییەکەیەوە کز بکەم و سەیری تەلەفیزیۆن بکەم. ئەڵبەتە بێجگە لە پارچەکانی سنگی قەل و خواردنەوە ووزە بەخشەکان بە خەستی هێلکەی بۆق، هیچ

شتێکیش لەناو بەفرگرەکەیدا نەبوو. من و ترینا یەکجار تاقیمان کردبویەوە، بەڵام هێندە تامەکەی ناخۆش بوو کە تفیمانەوە هەروەك منداڵان قرپ و قاپمان دەستپێکرد.

ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە حەزم لە ئاپارتمانەکەی پاتریك نەبوو، پاتریك ساڵی ڕابوردوو کاتێك لەوە دڵنیابویەوە کە دایکی دەتوانێت بە تەنهایی بژی، ئەو ئاپارتمانەی کڕی. کاروبارەکانیشی گەشەیان هەبوو. بە منی گوتبوو کە یەکێك لەم دوو کەسەمان دەبێت ئاپارتمانێکی بچوکیش بووە بیکڕین. بەم قسەیەی وامزانی بەم زوانە بابەتی قسەکە دەکاتەوە و لەگەڵ مندا سەبارەت بە ژیانی هاوبەش قسە دەکات. بەڵام بەوشێوەیە نەبوو. هەردوکمان پێتاقەت بووین و ئەهلی ئەوە نەبوین کە ئەو بابەتە بکەینەوە. سەر ئەنجام بێجگە لە ساڵەکانی هاوڕێیەتی، من هیچ شتێکم لەناو ئەو ئاپارتمانەدا نەبوو. هەرگیز نەمتوانی لەمبارەیەوە هیچ شتێك بە پاتریك بڵێم، هەرچەندە ئاپارتمانەکەی پاتریك پارکینگی تایبەتی هەبوو بە شێوەیەکی زۆر بێ وێنە دەیڕوانییە سەر قەڵاکە، بەڵام ماڵە بچوکەکەی باوکم بەو هەموو هات و هاوارو قەرەباڵغیەوە زۆر بەلاوە خۆشتر بوو تاوەکو ئەو ئاپارتمانە تاکە کەسییە بێ ڕۆح و گیان و بێزارکەرە.

سەرەڕای ئەمەش، ئاپارتمانەکەی پاتریك کەمێك پەرش و بڵاو بوو.

ئەگەر ئەوەم بە پاتریك بگوتبایە، وەڵامیدەدامەوە:

–بچکۆلە، بەرنامەکانم زۆر چڕو پڕن. ئەگەر لەم قۆناغەی پێشبڕکێکەدا لە سیی کیلۆمەتر کەمتر ڕابکەم ئەوکات لە بەرنامەکانم دوا دەکەوم.

دواتریش نوێترین تەختەبەندی شکاوی قاچی خۆی نیشاندەدام یاخود دەیگوت سپرای گەرمکەرەوەکەی بۆ ببەم.

کاتێکیش سەرقاڵی ڕاهێنان نەبوو، لەگەڵ ئەندامانی تیپەکەدا چوبو بۆ ئەو دانیشتنە تەواو نەکراوانە بۆ ئەوەی قسە لەسەر کۆتا ئامادەکارییەکانی گەشتەکەیان بکەن. دانیشتن لەناویاندا وەك بەشداریکردن بوو لە دانیشتنی کۆرییەکاندا. هەرگیز لە قسەکانیان تێنەدەگەیشتم و خۆیشم زۆر حەزم لێی نەبوو.

بڕیاروابوو هەفتەیەکیتر لەگەڵیاندا بچم بۆ نەرویج. هێشتا نەمدەزانی کە چۆن بە پاتریك بڵێم کە داوای مۆڵەتم لە خانەوادەی ترینەر نەکردووە. باشە چۆن دەمتوانی ئەوە بکەم؟ نزیکەی یەك هەفتە پاش دەستپێکردنی پێشبڕکێکە بڕیارنامەی کارەکەم کۆتایی دەهات. لەوانەیە بە شێوەیەکی منداڵانە بابەتەکەم پشتگوێ دەخست، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوە بوو تەنها شتێك کە

دەمبینی بریتی بوو لە ویل و ئەو کاتژمێرەی کە کرچ کرچی دەکرد، هەروەك بڵێی هیچ شتێکیتر گرنگ نەبوو.

نەگبەتیەکەی من لەوەدا بوو کە لەناو ئاپارتمانەکەی پاتریکدا خەوم لێنەدەکەوت. ئەو بەیانیانەی کە لەوێوە دەچوم بۆ سەرکارەکەم، دەنگم زۆر ماندوو بێحاڵ بوو قیافەیشم بە جۆرێکبوو هەروەك بڵێی مستەکۆڵەیان کێشاوە بەهەردوو چاومدا. نازانم بۆچی نەمدەتوانی لەوێدا بەباشی بخەوم. منیش بەوپەڕی بێخەمییەوە شینایيەکانی دەوری چاوەکانم بە کرێم و سپیاو دادەپۆشی.

***

ویل گوتی:

—کلارك دەنگوباس چییە؟

چاوەکانم کردەوە، دەبینم لەتەنیشتمەوەیە. خۆی لارکردبویەوەو سەیری منی دەکرد. هەستم دەکرد ماوەیەکە لەوێدایەو سەیرم دەکات. ناخودئاگا دەستم چویەوە بۆلای دەمم، چونکە لەوانەبوو لیك لەملاو ئەولای دەممەوە هاتبێتە خوارەوە.

ئەو فیلمەی کە بۆ نمونە خەریکبوم سەیرم دەکرد گەیشتبویە کۆتایی و ئێستە تیتراژەکەی بە خاوکراوەیی پەخش دەکرێت. خۆم رێك کردەوە گوتم:

—شەرمەندەم هیچ دەنگوباسێك نییە. تەنها ئەوەی کە ئێرە زۆر گەرمە.

بە وردی سەیری دەموچاوی کردم و گوتی:

—لەم سێ ڕۆژەی ڕابوردودا ئەمە سێیەمینجارە کە خەوت لێدەکەویت. بەجۆرێك لە جۆرەکانیش قیافەت تێکچووە.

منیش هەموو داستانەکەم بۆ گێڕایەوە. باسی خوشکەکەم و باسی بەرنامەی خەوو خۆراسی ماڵی خۆمانم بۆ کرد. ئەوەم گوت کە هەرگیز نامەوێت لەسەر ئەم بابەتە دەمەقاڵێ بکەم، چونکە هەرجارێك کە سەیری دەموچاوی باوکم دەکەم نائومێدی ڕەها لە قیافەیدا دەخوێنمەوە، لەبەر ئەوەی کە نەیتوانیوە خانویەك بۆ خێزانەکەی فەراهەم بکات کە جێگەی هەمویانی تێدا ببێتەوە.

—هێشتا هیچکارێکی نەدۆزیوەتەوە؟

—نەخێر، وابزانم هۆکارەکەیشی گەورەیی تەمەنی بێت. بەڵا ئێمە هیچ قسەیەك ناکەین...

شانەکانم هەڵتەکاند.

—هیچکەسێك مورتاح نییە کە ئەمەی پێبڵێت.

بە جۆرێك لە جۆرەکان هەستم دەکرد کە باسکردنی کێشەکانم بۆ ویل کارێکی دروست نییە. ئەوەش بەبەراورد بەو کێشانەی کە ئەو هەیەتی، بەڕاستی کێشەکانی من لەچاو کێشەکانی ئەودا زۆر بچوك و هیچ بوون، هەربۆیە گوتم:

—گرنگ نییە، ڕادێم، هەموو شتێك باش دەبێت.

پاشماوەی پاشنیوەڕۆ وادیاربوو کە بیرو هۆشی ویل لە شوێنێکیتر بوو مێشکی سەرقاڵە. لەپاش ئەوەی کە کاری شۆردن و پاکوخاوێنیەکەم ئەنجامدا، هاتم و کۆمپیوتەرەکەیم داگیرساند. کورسییە تایەدارەکەی بەرەو لای من سوڕاندەوە و گوتی:

—زۆر سادەیە.

هەروەك بڵێی خەریکبوین بەیەکەوە قسەمان دەکرد و لەناوەڕاستی گفتوگۆکانماندا بوین.

کۆتایی هەفتەکان دەتوانیت لێرە بخەویت. خۆ ئێمە ژوری چۆڵمان هەیە. باشتر وایە هەندێکجار کەڵکیان لێوەربگیرێت.

مات و بێدەنگ بووم، هەروا پەرداخەکەم بەدەستەوە بوو.

—نەخێر، ناکرێت.

—بۆچی ناکرێت؟ خۆ بۆ کاتژمێرەکانی کاری زیادە هەقدەست نادەم.

پەرداخەکەم خستەجێگە پەرداخی کورسییە تایەدارەکە.

—ئەوکات دایکت چی دەڵێت و چۆن بیر دەکاتەوە؟

—من چوزانم.

—بەدڵنیاییەوە قیافەم پەرێشان و شڵەژاو بوو، چونکە لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—کێشە نییە، خۆ من شوێنەکەم باش و بێخەمە.

—چی؟

—ئەگەر خەمی ئەوەت هەیە کە نەخشەو پیلانێکی شەیتانیم لەسەردا بێت بۆ ئەوەی دەرت بکەم، تەنها ئەوەندە بەسە کە دوو شاخەی کورسییەتایەدارەکە لە کارەباکە دەربهێنی.

—چەندە گاڵتەجاڕانە!

—هەر بەڕاستمە. بیری لێبکەرەوە. ئەمەش ڕێگەچارەیەکە. بەڵام خەمت نەبێت. بارودۆخ زۆر لەوە خێراتر دەگۆڕدرێت کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە. لەوانەیە خوشکەکەت بیربکاتەوە کە ناکرێت هەموو کۆتاییەکی هەفتە بێتەوە بۆ ماڵەوە. لەوانەیە ئاشنایەتی لەگەڵ کەسێکدا پەیدا بکات. دەکرێت هەزاران شت بێنە پێشەوە.

لە دڵمدا بەوم گوت: (لەوانەیشە دوو مانگیتر تۆیش نەمابیت). یەکسەر ڕقم لە خۆم بویەوە کە ئەم قسەیە هات بە خەیاڵمدا. کاتێك ویستی لە ژورەکە بچێتە دەرەوە، گوتی:

—شتێکم پێبڵێ. باشە بۆچی ئەم هاوڕێ ڕاکەرەت ناتباتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی؟

گوتم:

—ئۆو... دەمباتەوە!

سەیرێکی منی کرد. هەروەك بڵێی ئەیوست لەسەر باسەکە بەردەوام بێت. بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە.

—هەروەك گوتم دەتوانیت بیری لێبکەیتەوە.

***

—دوو هەفتە لەمەوبەر باوکمت لەناو شەقامدا بینی؟

—بەڵێ.

خەریکبوم ڕاخەرە شۆردراوەکانم هەڵدەخست، تەنافەکە لەو شوێنەدا کە خاتوو ترینەر ناوی لێناوە باخچەی چێشتخانە، شاردرابویەوە. وابزانم حەزی نەدەکرد کۆمەڵێك شتی وەك ڕاخەرە شۆردراوەکان دیمەنی باخچەکەی زایە بکەن. دایکی خۆم شانازی بەوەوە دەکرد کە جلوبەرگە سپیەکان هەڵبخات و گیرەیان لێبدات. هەروەك بڵێی بانگهێشتی دراوسێکان دەکات بۆ کێشەو بەرە: (خاتونەکان برۆن و لێرە وونبن) تەنها باوکم بوو کە توانی ببێتە ڕێگر لەبەر دەم دایکمدا و نەهێڵێت تەنافە سوراوەکەی دووەم لەناو حەوشەی پێشەوە دابنێت.

—لێی پرسیم، تۆ پێت گوتم کە بینیوتە.

هەوڵمدا کە قیافەیەکی گوێپێنەدەر لەخۆم بگرم.

—ئێ...

دواتر کە زانیم چاوەڕێی وەڵامە، گوتم:

—دیارە کە نالێم.

-کەسی لەگەڵدا بوو؟

کۆتا گیرەم خستەوە ناو تورەکەی گیرەکان و کیسەکەم لول کرد و خستمەناو سەبەتەی خاڵی جلوبەرگەکانەوە.

-بەڵێ.

-ژنێکی لەگەڵدابوو؟

-بەڵێ.

-قژێکی سوری پێوەبوو؟

-بەڵێ.

ویل چوبەناو بیر و خەیاڵدا و گوتی:

-ببورن ئەگەر وابیردەکەیتەوە دەبوایە ئەوەت بۆ بگێرمەوە. بەڵام.... ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بەمنەوە نەبوو. هەروەها گوتنیشی هەروا ئاسان نەبوو.

-بەڵێ. کلارک، لەوانەیە گوتنی ئەوە کەمێك هێمنم بکاتەوە، بەڵام دەبێت ئەوەت پێبڵێم ئەوە کاری یەکەمجاری نییە.

ئەمەی گوت و چویەوە بۆ ناوماڵەکە.

هەموو ڕۆژێك کاتێك ویل سەیری تەلەفیزیۆنی دەکرد، یان سەرقاڵی کارێکیتر بوو، من لەسەر کۆمپیوتەرەکەی دادەنیشتم و بەشوێن موعجیزەیەکدا دەگەڕام کە بەرنامەیەك بدۆزمەوە بۆ ئەوەی ویل خۆشحاڵ بکات. بەڵام بەردەوام کاتی تێدەپەڕی و دەمبینی کە پێڕستی کارەکانم پڕە لەو کارانەی کە ناتوانم ئەنجامیان بدەم، لەو شوێنانەی کە ناتوانین بۆیان بڕۆین. ئاستیان لەوە بەرزترە کە ئێمە بتوانین ئەنجامیان بدەین. کاتێك بارودۆخەکەم بەمجۆرە بینی، چومەوە بۆلای ژوری گفتوگۆی ئینتەرنێت و داوای ڕێنماییم کرد.

ریچی گوتی:

-سڵاو هەنگی خۆشەویست، بەخێرهاتی بۆناو دوونیاکەی ئێمە.

لەو قسەو باسانەی کە دواتر وەپێشهاتن، تێگەیشتم مەستکردن لەناو کورسی تایەداردا مەترسی خۆی هەیە، لەوانەش کێشەی پەیوەست بە (سوند)ەوە، کەوتنەخوارەوە لەسەر کورسی تایەدار، هەندێکجاریش لەلایەن کەسانی مەستەوە ڕێنماییان دەکرێت بۆ ماڵی خەڵکانیتر. لەوە تێگەیشتم کە هیچ شوێنێك بۆ کەسانی ئیفلیجی چوارپەل بوونی نییە کە لە

شوێنەکانیتر گونجاو بێت. بەڵام ئەوە دەڵێن کە پاریس لە هەموو شوێنەکانیتر لەگەڵ کورسی تایەداردا نامیهرەبانە، ئەمەش نائومێدکەر بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەشی خۆشبینی لەناو بوون و وجودی مندا هەروا هیواداربوو بۆئەوەی گەشت بۆ ئەو وڵاتە بکات.

دەستمکرد بە نوسینی فەهرستی ئەوکارانەی کە نەماندەتوانی ئەنجامیان بدەین.

سواربونی شەمەندەفەری ناوشار (بەزۆری وێستگەی میترۆو ئاسانسۆریان نەبوو)، کە مرۆڤ بتوانێت بە کرداری نیوەی زیاتری کارەکانی لەناو لەندەندا ئەنجامبدات، مەگەر ئەوەی کە بە تەکسی برۆیشتینایە. لەناو پایتەختدا کارێك نەبوو کە من بتوانم ئەنجامی بدەم.

مەلەوانی بەبێ یارمەتی. مەگەر ئەوەی کە پلەی گەرما ئەوەندە بەرز بێت کە لەو خولەکانەی سەرەتادا دەست نەکات بە لەرزین. ئەگەر مەلەوانگەکە مەسعەدی نەبێت، ئەوکات شوێنی تایبەتی ئیفلیجەکانیش بەکەڵك نایەت. ویلیش نەیدەهێشت سواری باڵابەری بکەین.

چون بۆ سینەما، مەگەر ئەوەی کە لە ریزی پێشەوە شوێنێکمان دەستبکەوتایە. یان ئەو رۆژە ویل توشی رەقبونی ماسولکەکانی نەبێت. بەلایەنی کەمەوە بیست خولەك لە فیلمی (پەنجەرەی پشتەوە) تێپەری بوو کە بە چوارپەل خزام و ئەو شتانەی بەهۆی بەرزبونەوەی کتوپری ئەژنۆی ویلەوە چوبون بەناو هەوادا کۆمکردنەوە.

چون بۆ کەنار دەریا، مەگەر ئەوەی کە چوپی کورسییەتایەدارەکە پانوپۆر بێت. بەڵام کورسییەکەی ویل بەوشێوەیە نەبوو.

چون بۆ شت کرین، مەگەر ئەوەی کە لەناو فرۆشگاکاندا رەمپایان دانابێت. زۆرێك لە فرۆشگاکانی چواردەوری قەڵاکە ئەوەیان رادەگەیاند کە بەسەرنجدان بەو هەلومەرجانەی کە هەن توانای کارێکی لەو شێوەیان نەبوو، ئەڵبەتە هەندێکیشیان راستیان دەگوت.

چۆن بۆ شوێنێکی زۆر گەرم یان زۆر سارد.

چونە دەروە بەبێ بەرنامەرێژی پێشوەختە، (دەبێت جانتا ئامادە بێت و رێرەوەکان لەروی شیاوییەوە دەستیان پێدا رابگات و لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکرێت).

چون بۆ ریستوران، لەکاتێکدا کە متمانە بەخۆبوون هەبێت و هیچ کێشەیەك نەبێت کە لەبەرچاوی خەڵکانیتر خواردن بکرێت بەدەمییەوە. یاخود پەیوەندی بە هەلومەرجی (سوند)ەوە هەیە. یاخود توالیتی ریستورانەکە قادرمەی نەبێت و رێرەوەکەی تەخت بێت.

چون بۆ ماڵی هاوڕێی و دۆستان، مەگەر ئەوەی کە ڕەمپای تایبەتی کورسی تایەدارییان هەبێت. زۆربەی ماڵەکانیش پلیکانەیان هەیە. ویل دەیگوت حەزی لەوە نییە کە سەردانی هیچکەسێك بکات.

چونە دەرەوە لەکاتی باراندا، بۆ سەر تەپۆڵکەکان (نەدەکرا متمانە بە ئیستۆپی کورسییەکە بکرێت، کورسییە تایەدارەکە قورس بوو منیش نەمدەتوانی ڕێگریم لە وەرگەڕانی).

چون بۆ شوێنێك کە دەکرا لێوێك تەڕ بکەیتەوە. ویل بەلای کەسە مەستەکانەوە سەرنجڕاکێش بوو. لەتەنیشتیەوە دەچەمینەوە و هەناسەیان دەکرد بەسەر ویلدا و بە شێوەیەکی پڕ بەزەییەوە سەیرییان دەکرد. هەندێکجاریش هەربەڕاستی ئەیانویست لەگەڵ خۆیاندا بیبەن.

ڕۆیشتن بۆ شوێنە قەرەباڵغەکان. هاوین نزیکبوو گەشت و گەڕان لە چواردەوری قەلاَکەدا ئاستەم تر دەبوو. نیوەی زیاتری ئەو شوێنانەی کە پێمباشبو بڕۆین، وەك پیشانگا، نمایشەکانی سەرشەقام و کۆنسێرتەکان هەڵدەوەشانەوە.

کاتێك دەربەدەربوم بەشوێن بیرۆکەی نوێدا، لەناو ئینتەرنێتدا پرسیارم لە کەسە تواناویستەکان دەکرد کە لە دوونیادا چ کارێکیان لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێت کە ئەنجامیبدەن. وەلاَمێك کە لەهەموویان زیاتر وەرمدەگرت ئەمە بوو(هاوسەرگیری)، بەبێ ئەوەی کە داوابکەم، بەووردی بۆیان باسدەکردم.

بەلاَم ئەوە یارمەتییەکی گەورە نەبوو، چونکە من تەنها هەشت هەفتە کاتم هەبوو هێشتا نەگەیشتبومە هیچ دەرئەنجامێك.

***

یەك دوو ڕۆژێك دواتر و لەپاش قسەکردن لە حەوشەکەدا، کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، دەبینم باوکم لەناو ڕێڕەوەکەدا وەستاوە. زۆر نائاسایی بوو، (هەفتەکانی کۆتایی بەو بانگەشەی کە بابەگەورەم بە تەنیا نەبێت، ڕۆژانە و لەسەر قەنەفەکان لەلای بابەگەورەمدا دادەنیشت). باوکم کراسی ئوتوکراوی لەبەر کردبوو. ڕێڕەوەکە بۆنی ئول ئیسپایسی دەدا. دڵنیابوم ئەم ئیفترشیویەی لە ساڵی ١٩٧٤ وە هەیە.

–هاتیتەوە؟

لەدوای خۆمەوە دەرگاکەم داخست.

-بەڵێ.

ماندوو بێحاڵ بووم. لەڕێگەی گەڕانەوەمدا بۆماڵەوە، هەموو ئەو ماوەیەی کە سواری پاسەکە بوبوم، خەریکبوم بە مۆبایل سەبارەت بەو شوێنانەی کە دەکرا ویل ببەم بۆیان، قسەم لەگەڵ یەکێك لە ئاژانسە گەشتیارییەکاندا دەکرد. بەڵام هەردوکمان مات و حەیران بوبوین.

-کێشە نییە ئەمشەو خۆت بە تەنهایی چای بخۆیتەوە؟

-نەخێر، لەوانەیە دواتر بچم بۆ بارەکە بۆلای پاتریك. بۆچی؟

چاکەتەکەم بە جلگیرەکەوە هەڵواسی. ئێستە کە تریناو تۆماس نەبوون، ئیتر جلگیرو شوێنی هەڵواسینی جلوبەرگەکان خاڵی بوو.

-شەو دایکت دەبەمە دەرەوە.

ساتێکی خایاند تاوەکو لە قسەکەی تێگەیشتم.

-ڕۆژی لەدایکبونەکەیم بیرچوبویەوە.

-ئەی تەواو، خۆ ئێمە ئاهەنگمان گێڕا.

دەنگی نزمکردەوە، هەروەك بڵێی نهێنیەك لەکارەکەدا هەیە.

-چومە سەرکار.

-نەبابە..!

ئێستە دەمتوانی ببینم کە لە خۆشیدا ئاگای لە خۆی نییە. دووبارە پشتی ڕاست بوبویەوە. دەمی تاوەکو بناگوێی کرابویەوە. چەند ساڵێك بە گەنجتر دەهاتە پێشچاو.

-بابە، چەندە جوان بویت!

-دەزانم. دایکت لە خۆشیدا دەفڕێت بە ئاسماندا. خۆت دەزانی کە ئەم ماوەیە زۆر نارەحەت بووە بۆی، کاتێك ترینا ڕۆیشت، بابەگەورەو هەموو ئەم شتانە کەوتنە سەرشانی ئەو داماوە. هەربۆیە بیرم کردەوە کە لەوانەیە بیبەمە دەرەوە بۆ ئەوەی کەمێك بەخۆشی بیگوزەرێنێت و خۆشحاڵ ببێت.

-باشە، ئێستە کارەکەت چییە؟

-بومەتە لێپرسراوی پاکوخاوێنی. پاسەوانی قەڵاکە.

برۆکانم بەرزکردوە.

-بەڵام خۆ ئەمە....

—بەڵێ کاك ترینەر. ڕاستە، تەلەفۆنی کرد و گوتی بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێت، ویلی هاوڕێیشت منی پێناساندبوو گوتبوی کە دەتوانم ئەوکارە بکەم. ئەمڕۆ پاشنیوەڕۆ ڕۆیشتم و گوتم کە دەتوانم چ کارانێك بکەم. یەك مانگ لەژێر تاقیکردنەوەدام. کارەکەیشم لە شەممەوە دەستپێدەکات.

—دەتەوێت کار بۆ باوکی ویل بکەیت؟

—بەڵێ، گوتی کە بەپێی ڕەوتی کارەکە دەبێت یەك مانگ بە شێوەیەکی ئەزمونی کار بکەم. ئەوەی گوت کە لەوباوەڕەدایە کە کارەکانت بەباشی بەرێوەدەبەیت و لە ئەزمونیەکەدا سەرکەوتو دەبیت.

—چەندە باشە...!

هەستێکی تایبەتم هەبوو، ئەم هەواڵە بەلامەوە سەیر بوو بەجۆرێك لە جۆرەکان پەرێشانی کردبوم.

—هەرگیز نەمزانیوە کە بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێن.

—منیش نەمدەزانی. لو، ئەمە زۆر باشە. کەسێکی سەرناسە. لەبارەی بەڕوی سەوزەوە قسەم لەگەڵدا کرد. هەندێك لەکارەکانی پاسەوانەکەی پێشوم نیشاندا. باوەڕ ناکەیت. توشی شۆك بوبو گوتی کە ئەوکارەی منی زۆر پێخۆش بووە. زۆر خۆشحاڵ و گەش بوو. چەندین مانگبوو نەمبینیبو کە هێندە گەش و شاد بێت. دایکم هات، لەتەنیشت باوکمەوە وەستا، ماکیاجی کردبوو قۆنەرە پاژنە بەرزە جوانەکەی لەپێ کردبوو.

—لو، سەیارەیان پێداوە. (ڤین) موچەکەیشی زۆر باشە. زۆر لەو پارەیە زیاترە کە لە کارگەی قەنەفە دروستکردنەکەدا وەریدەگرت.

دایکم بەجۆرێك سەیری باوکمی دەکرد هەروەك بڵێی هەموو دونیای فەتح و داگیرکردووە. کاتێك ئاوڕیدایەوە و سەیری منی کرد، دەموچاوی کرابویەوە و گوتی دەبێت منیش خۆشحاڵ بم و خۆشی خۆم دەرببڕم. ملیۆنان پەیام لە دەموچاوی دایکمدا شاردرابونەوە.

یەکێك لەو پەیامانە دەیگوت کە دەبێت ڕێگەبدەین باوکم ساتە خۆشەکانی خۆی هەبێت.

—بابەگیان چەندە باشە، زۆر نایابە...!

چومە پێشەوەو باوەشم پێدا کرد.

-باشە، ئازیزەکەم لە بنەڕەتدا دەبێت سوپاسی ویل بکەیت. پیاوێکی تەواوە. دەستی ماچ دەکەم کە منی لەبیردا بووە.

***

هات و هاواریانم دەبیست کە لەماوەڵەوە دەچونە دەرەوە. دەنگی دایکم کە لەبەردەم ئاوێنەکەدا قەرەباڵغی دروستدەکرد و دەنگی باوکم کە دڵنیایی دەدایە دایکم هێشتا وەك ڕابورد و جوانە و سەروفەساڵی جوان و پێکەوتەیە. باوکم دەستیکرد بەناو گیرفانیدا و تێستی قردێلەی کیفی پارەکەی کۆنترۆڵ کرد. دواتریش دەستیکردە پێکەنین. دەنگی دەرگاکە هات. دواتریش دەنگی ئۆتۆمبیل و دورکەوتنەوەی بیسترا. ئێستە ئیتر دەنگی تەلەفیزیۆن لەژورەکەی بابە گەورەوە دەهات. لەسەر قادرمەکان دانیشتم، مۆبایلەکەم دەرهێناو تەلەفۆنم بۆ ویل کرد.

کەمێکی پێچوو تاوەکو وەڵامیدایەوە. ناوبراوم بە (هند زفری) دەهاتە پێشچاو کە بە پەنجە گەورەی دەستدەنێت بە دوگمەکەدا.

-ئەلوو....

-ئەوە کاری تۆ بوو؟

ساتێك وەستاو گوتی:

-کلارك ئەوە تۆیت؟

-تۆ ئیشت بۆ باوکم دۆزیوەتەوە؟

هەستمکرد ساتێك هەناسەی توند بوو. لە خۆمم پرسی تۆ بڵێی حاڵی باش بێت.

-پێموابوو خۆشحاڵ دەبیت و پێتخۆشە.

-خۆشحاڵ بووم. ئەمە تەنها.... نازانم. هەستێکی زۆر نامۆم هەیە.

-ئەو هەستەت نەبێت. باوکت بە شوێن ئیشدا دەگەڕا. باوکی منیش پێویستی بە کەسێکی شارەزا بوو.

-بەڕاست..!

نەمدەتوانی گومان و دوودڵی و باوەڕنەکردن لە ئاوازی دەنگم دوربخەمەوە.

-بەڕاست..!

-چی بەڕاست..؟

—هیچ پەیوەندییەکی بەو شتەوە نییە کە پێرێ لێت پرسیم؟ لەبارەی ئەوو ئەو ژنەوە؟ هەڵوەستەیەکی دوورودرێژی کرد. دەمتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم، لەناو ژووری دانیشتنەکە و لە پەنجەرەی مۆدیل فەرەنسییەکەوە سەیری دەرەوە دەکات. کاتێك دەنگیم بیست زۆر خۆپارێزانە بوو.

—وامزانی دەمکوتانەم لە باوکم وەرگرتووە و ناچارم کردووە کە کار بۆ باوکی تۆ بکات؟

شتێکی لەمشێوەیە بەڕاستی لە بیرو زەینەوە دوور بوو.

—ببورن. تەنها بە جۆرێك لە جۆرەکان سەیر بوو بەلامەوە. هاوکاتیەکەی، چونکە هەموو شتێك لەگەڵ یەکتریدا ڕێك دەکەوت و جۆر بوو.

—کلارك، خۆشحاڵ بە. ئەمە هەواڵێکی زۆرباشە. بارودۆخی باوکت باش دەبێت. ئەمەش مانای ئەوەیە کە....

بێدەنگ بوو...

—ماناکەی چییە؟

—ماناکەی ئەوەیە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەتوانیت بڕۆیت و بگەڕێیت و پەڕو باڵ بگریت و بە ئارەزۆی خۆت بفڕیت. بەبێ ئەوەی کە خەمی دایکوباوکت هەبێت کە چۆن بتوانن ژیانیان بگوزەرێنن.

بەم قسەیەی هەردەتگوت زللەیەکی کێشا بە دەموچاومدا. هەستم بە تەنگەنەفەسی و خنکان کرد.

—لو..؟

—بەڵێ؟

—زۆر خراپ بێدەنگ بویت.

—من....

تفی دەمم قوتدایەوە.

—ببورە. ئاگام لە خۆم نەبوو. بابەگەورە بانگم دەکات. بەلام زۆر سوپاست دەکەم. سوپاست دەکەم کە ئەو داوایەت کردبوو.

دەبوایە تەلەفۆنەکەم دابخستایەوە، بوغز قورگمی گرتبوو دڵنیانەبوم کە بتوانم ووشەیەکیتر قسە بکەم.

***

بە پێ تاوەکو بارەکە ڕۆیشتم. هەوا پڕ بوو لە بۆنی خونچەو گوڵ و ئەو کەسانەی کە لە شەقامەکەدا بەلامدا تێدەپەڕین زەردەخەنە بەسەر لێویانەوە بوو. بەڵام من نەمدەتوانی لەوەڵامیاندا زەردەخەنە بخەمە سەر لێوەکانمەوە. تەنها ئەوەم دەزانی کە نەمدەتوانی لەماڵەوە بمێنمەوە و لەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ ببم. هاوڕێکانی پاتریك هەموویان لە حەوشەی بارەکەدا بوون، لە گۆشەیەکی تاریکی ڕوناکییەکەدا دوو مێزیان بەیەکەوە جوت کردبوو. دەست و قاچەکانی هەموویان لەژێر ڕووناکی پەمەیی ئەو شوێنەدا سێبەری درێژییان هەبوو. چەند کەسێك سەریان بۆ ڕاوەشاندم. (بەڵام هیچ کچێك سەری ڕانەوەشاند) پاتریك هەستایەوە و لەتەنیشت خۆیەوە جێگەی کردمەوە، لەوکاتەدا ئاواتم دەخواست خۆزگایە ترینام لەگەڵدا بوایە.

—پێمواننەبوو بێیت بۆ ئێرە، حەزت لە شتێك هەیە؟

—کەمێك بوەستە.

تەنها ئەمویست دابنیشم و سەر بخەمە سەر شانی پاتریك. حەزم دەکرد وەك پێشتر بم، هێمن، خەیاڵ ئاسودە و بەبێ هیچ کەڵکەڵەیەك. حەزم نەدەکرد بیر لە مردن بکەمەوە.

—ئەمڕۆکە ڕیکۆردەکەم شکاند. بیست و چوار کیلۆمەترم لە ٢ سەعات و ٧٩ خولەکدا بڕی.

—چەندە باشە..!

یەکێکیان گوتی:

—پوت(پاتریك) زۆر بەباشی کارت کرد..!

پاتریکیش هەردوو مشتی بەرز کردەوە و بە دەم دەنگێکی لە خۆی دەرکرد. من هەوڵم دەدا کە خۆم بە خۆشحاڵ نیشانبدەم.

—بەڕاستی زۆر باشە..!

دووجار داوای خواردنەوەم کرد. گوێم بۆ قسەکانیان گرت کە باسی کەمبونەوەی کارایی ئەو قاچانەیان دەکرد کە پێستیان هەڵدەدا و ئەو دڵە تەپانەی کە لەکاتی مەلەکردن و بەهۆی کەمبونەوەی پلەی گەرماوە دروستدەبن. ئیتر پاش ئەوە گوێم بۆ نەگرتن و سەیری پیاوێکی ناو بارەکەم کرد، حەزم دەکرد بزانم ژیانی ئەوان چۆنە، بەدڵنیاییەوە لە ژیانی خێزانی هەمویاندا کۆمەڵێك ڕوداو ڕوویانداوە. منداڵە خۆشەویستەکانیان لەدەستداوە، ڕازە

پەنهانییەکان، خۆشییە گەورە و تراژیدییەکان. بەڵام ئەگەر ئەوان دەیانتوانی ڕووداوەکانی ژیانیان لە شوێن و لە جێگەی خۆیاندا دابنێن و سەرقاڵی ژیانی خۆیان بن، ئەگەر ئەوان دەیانتوانی لە عەسرێکی خۆرەتاوو ساماڵدا لەناو حەوشەی بارەکەدا دابنیشن و چێژ وەربگرن، ئەی باشە بۆچی من نەتوانم.

دواتر هەواڵم بە پاتریك دا کە باوکم کاری دۆزیوەتەوە. یەك سات دەموچاوی گۆڕدرا، وامزانی خۆیشم هەمان ئەو قیافەیەم پەیدا کردووە. هەربۆیە ناچار بووم دووبارەی بکەمەوە. تەنها بۆ ئەوەی دڵنیاببێتەوە کە بەباشی گوێی لێبووە.

—ئۆو چ هاوڕێیانێکی باش.... ئێستە هەردوکتان بۆ ئەو کاردەکەن.

دواتر حەزم دەکرد بەو بڵێم، بەڕاستی حەزم دەکرد ئەوەی بۆ ڕونبکەمەوە کە هەموو هەوڵ و کۆششێکم پەیوەستە بە زیندوهێشتنەوەی ویلەوە لەم ژیانەدا. ئەمویست بڵێم نیگەرانم لەوەی کە ویل هەوڵ دەدات ئازادیم بۆ بکڕێت. بەڵام دەمزانی کە ناتوانم هیچ شتێك بڵێم. خۆم دەمتوانی دەرەقەتی بێم و پاشماوەیشی لەلای خۆم چارەسەرو حەل و فەسڵ بکەم.

—تەنها ئەمە نییە.... دەڵێت هەرکاتێك ویستم دەتوانم شەوانیش لەماڵەوەیاندا بمێنمەوە. بۆ ئەوەی کێشەی کەمی ژورەکان لە ماڵماندا چارەسەر ببێت.

پاتریك واقی بەمندا وڕما.

—تۆ دەتەوێت لەماڵی ئەواندا بمێنیتەوە؟

—لەوانەیە. پاتریك ئەمە لوتفێکی زۆر گەورەیە. خۆتۆ ئاگاداری ماڵی ئێمەیت. تۆ لەوێ نیت تاوەکو حاڵمان ببینی. حەزدەکەم بێم بۆ ماڵەکەی تۆ، بەڵام....باشە، ڕاستیەکەت بوێت لەوێ ئیسراحەت نیم.

هەروا واقی بە مندا وڕمابوو.

—باشە ئازاد بە. هەروەك ماڵەکەی خۆت هەست بە ئارامی بکە.

—چی؟

وەرە لەگەڵ مندا بژی. شتومەکەکانت بهێنە. جلوبەرگ و هەرشتێکیتر کە حەزت لێیەتی بیهێنە. ئێستە ئیتر کاتیەتی کە بەیەکەوە بژین.

دواتر کاتێك بیرم کردەوە تێگەیشتم کاتێك ئەم پێشنیارەی دەکرد، بەهیچ شێوەیەك خۆشحاڵ نەدەهاتە پێشچاو. وەك پیاوێك نەبوو کە سەرئەنجام تێگەیشتووە کە ناتوانێت بەبێ

کچە هاورێکەی بژی و ئەیەوێت یەکبونێکی دڵنشین لە ژیانیان دروستبکات. قیافەی وەك ئەو کەسانە بوو کە هەست دەکەن لەبەرامبەر ڕکابەرەکانیانەوە دۆڕاون.

—هەربەڕاست حەزدەکەیت بێم و لەگەڵ تۆدا بژیم؟

—بەڵێ، دیارە.

دەستێکی هێنا بە گوێیدا.

—مەبەستم ئەوەیە نەك ئەوەی کە هاوسەرگیری بکەین یان ئەمجۆرە شتانە. خۆ تێدەگەیت، ئەی وانییە؟

—هەمان ئەو پیاوە هەستیارو عاشقی پیشەکەی خۆی بوو هیچ نەگۆڕابوو.

—لو، واتە دەڵێم ئێستە ئیتر کاتیەتی. ئەڵبەتە ماوەیەکی زۆرە کە کاتیەتی. بەڵام من کارانێکی زۆرم هەبوو زۆر سەرقاڵبوم. وەرە بابەیەکەوە بژین. زۆر باش دەبێت.

باوەشی پێدا کردم.

—زۆر باش دەبێت.

کوڕەکانی گروپەکە بە ئەنقەست خۆیان وانیشاندا کە ئاگایان لێ نییەو دەستیان کردەوە بە قسەکانی خۆیان. کاتێك گروپێکی گەشتیاری یابانی وێنەیەکیان گرت، هات و هاوارییان بەناو هەوادا بەرز بویەوە. دەنگی خوێندن و ئاوازی باڵندەکان دەهات، خۆرنیشتبوو زەویش سوڕابویەوە. ئەمویست بەشێك بم لەو. نەوەك ژیان لە ژورێکدا و خەم و نیگەرانی بۆ پیاوێك بخۆم کە لەسەر کورسی تایەدار دەژی، گوتم:

—بەڵێ، زۆر باش دەبێت.

## {١٧}

خراپترین خاڵ لەبارەی کاری پەرستارییەوە ئەو شتە نییە کە بە گریمان بیری لێدەکەنەوە. پەیوەندی بەبەرزو نزمکردن و ئەمدیوو ئەودیوکردنی نەخۆشەکە یاخود داوو دەرمان و کلێنسی تەڕ یان بۆنی هەمیشەیی هەستپێکراوی بۆنبڕو دژە هەوکردنەوە نییە. تەنانەت ئەو ڕاستیەش نییە کە زۆربەی کەسەکان وابیر دەکەنەوە تەنها کارێکە کە لە دەستیان دێت. بەڵکو بریتیە لەو ڕاستیەی کە مرۆڤ کاتێك بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵ کەسێکدا دەگوزەرێنێت و ناتوانێت لە حاڵەتە ڕۆحیەکانی ئەو ڕابکات و تەنانەت ناشتوانێت لە حاڵەتە ڕۆحییەکانی خۆیشی ڕزگاری ببێت و گیرۆدەیان دەبێت.

لە بەیانیەوە کاتێك بەرنامەکەم بە ویل گوت، ڕەفتاری ووشك و سارد و سڕ بوو. ئەڵبەتە بە جۆرێك نەبوو کەسێك لەدەرەوە بزانێت، بەلاَم تەنها کەمتر قسەمان کرد و کەمتریش گاڵتەو گەپمان کرد. ئەویش هیچ شتێکی لەبارەی بابەتەکانی ڕۆژنامەوە نەپرسی.

-کەوابوو دەتەوێت ئەمکارە بکەیت.

چاوەکانی بریسکەیان دەهات. بەلاَم نەدەکرا لە قیافەیەوە شتێك بخوێنرێتەوە. شانەکانم هەڵتەکاند. دواتر وەك بەڵێ سەرم ڕاوەشاند.

-هەر بەڕاست کاتیەتی. مەبەستم ئەوەیە کە من ئێستە تەمەنم بیست و حەوت ساڵە. هەستم دەکرد ئەو وەلاَمەی کە دامەوە کەمێك نابەرپرسانە و منداڵانە بوو. بەوردی سەیری دەموچاوی کردم. ماسولکەی چەناکەی هاتبویەوە یەك. کتوپڕ بە شێوەیەکی تامڵ نەکراو هەستم بە ماندوبون کرد. پێموابوو دەبێت داوای لێبوردن بکەم، بەلاَم نەمدەزانی بۆچی.

سەرێکی ڕاوەشاند و زەردەخەنەیەکی کرد.

-خۆشحاڵم کە کێشەکانت چارەسەر بوون.

دواتر کورسییە تایەدارەکەی بەرەو چێشتخانەکە برد. لەدەستی تورەبوم. تاوەکو ئەوکاتە ئەوە ڕوینەدابوو کە بەوشێوەیە بکەومە بەر داوەری کەسێکەوە. هەروەك بڵێی ئێستە بڕیارمدا بوو کە لەگەڵ کورە هاوڕێکەمدا بکەم بە سەرو سامان. ئەمەش مانای ئەوەبوو کە سەرنج و گرنگییەکی کەمترم بەو داوە. هەروەك بڵێی ئیتر ناتوانم ببمە ئەو شتەی کە ئەو حەزی لێدەکات و نابمە مایەی دڵخۆشی بۆی. ئەڵبەتە نەمدەتوانی ئەم قسانە بە خۆی بڵێم. بەڵام منیش هەروەك خۆی ڕەفتارێکی ساردو سڕم گرتەبەر، بەهەمانشێوەو ئەندازەی کە ئەو لەگەڵ مندا دەجوڵایەوە.

ڕێکوڕاست بیڵێم بەڕاستی کارێکی زۆر قورس و ئاستەم بوو.

پاشنیوەڕۆ لە دەرگایاندا. بە پەلە بەناو ڕێڕەوەکەدا ڕامکرد. سەرقاڵی قاپ شۆردن بووم و دەستم تەڕ بوو. کاتێك دەرگاکەم کردەوە، پیاوێکم لەبەرامبەر خۆمەوە بینی. چاکەت و پانتۆڵی ڕەشی پۆشیبوو جانتایەك بەدەستیەوە بوو. هەرکە پیاوەکە ویستی شتێك بڵێت، هەوڵمدا دەرگاکە دابخەم، بە بڕشتەوە گوتم:

—ئۆو، نەخێر، ئێمە بوزایین.

دوو هەفتە لەمەوبەر، دوو کەس لە شاهێدانی یەهوە[28] هاتن و نزیکەی پازدە خولەك ویلیان لەبەردەم دەرگای پشتەوە بەگیرهێنابوو. بەردەم دەرگاکە گۆڕدرابوو ویل نەیدەتوانی کورسییەتایەدارەکەی بگێڕێتەوە. کاتێك لە کۆتاییدا من دەرگاکەم داخست، هاوارییان کرد کە ئەو لە هەموو کەسێك زیاتر دەبێت بزانێت کە چۆن سەیری ژیانی پاش مردن بکات.

پیاوەکە گوتی:

—من بۆ بینینی بەڕێز ترینەر هاتوم.

بە هێواشی و خۆپارێزییەوە دەرگاکەم کردەوە. لەو ڕۆژەوە کە لە گرنتاهاوسدا کارم دەکرد، نەمبینیبوو کە هیچکەسێکە لە دەرگای پشتەوە بێت بۆ بینینی ویل.

ویل لە دوامەوە دەرکەوت و گوتی:

—ڕێگەی بدە بێتە ژورەوە. من داوام لێکردوە بێت.

دواتر کاتێك بینی من هەروا بەبێ جوڵە وەستاوم لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

---

[28] یەکێك لە لقەکانی مەسیحیەتە کە لەسەدەی هەژدەیەمەوە دروستبووە.

—کلارك، کێشەیەك نییە، لە هاوڕێکانی منە.

پیاوەکە هەنگاوی نایە ناو چوارچێوەی دەرگاکەوە. دەستی هێنایە پێشەوە و تەوقەی لەگەڵ مندا کرد.

گوتی:

—مایکڵ لولەرم.

هەر ئەوکاتەی کە دەمی کردەوە شتێك بڵێت، ویل هاتە نێوان من و ئەوەوە و بە ئەنقەست ڕێگەی هەرجۆرە قسەیەکیتری گرت.

—دەچین بۆ ژووری دانیشتنەکە. بێزەحمەت قاوەمان بۆ دروستبکە. دواتریش چەند خولەکێك بەتەنهایی بەجێمان بهێڵە.

—بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.

جەنابی لولەر زەردەخەنەیەکی بۆ کردم کە کەمێك ناشیانە بوو. دواتر بەدوای ویلدا چوبۆ ژووری دانیشتنەکە. چەند خولەکێك دواتر کە بە سینیە قاوەکەوە چومە ژوورەوە، لەبارەی کریکتەوە قسەیانە دەکرد. قسەو باسەکەیان سەبارەت بە یاری بەردەوامبوو تاوەکو ئیتر بیانوم نەما بۆ ئەوەی لە ژورەکەدا بمێنمەوە. دەستم هێنا بە دامێنەکەمدا و ڕێك وەستام و گوتم:

—باشە، ئیتر من دەڕۆم.

—مەمنون، لوئیزا.

—دڵنیان پێویستتان بە هیچ شتێك نییە، جێگۆڕکێیەك، شتێك؟

—مەمنون لوئیزا.

ویل بەزۆری بە لوئیزا بانگی نەدەکردم. پێشتریش ئەوە ڕوینەدابوو کە شتێکم لێ بشارێتەوە.

جەنابی لولەر نزیکەی یەك کاتژمێر لەلای ویل مایەوە. کارەکانم ئەنجامدا. دواتریش لەناو چێشتخانەکەدا بەبێ ئیش دانیشتم. نەمدەزانی ئایا بوێری ئەوەم هەیە گوێیان بۆ بگرم یان نا. بەڵام ئەو بوێرییەم نەبوو. دانیشتم و دوو بسکیتی کرێمدارم خوارد. نینۆکەکانم دەجوی و گوێم بۆ ئاوازی هێمنی دەنگیان گرتبوو. بۆ پازدەیەمینجار لە خۆمم پرسی بۆچی ویل نەیویست ئەم پیاوە لە دەرگای سەرەکی ماڵەکەوە بێتە ژورەوە.

له پزیشکەکان یاخود ژمێریارەکانی نەدەکرد. لەوانەیە ڕاوێژکاری دارایی بێت. نەدەکرا بەڕواڵەتیدا هیچ شتێك بزانیت. بەدڵنیاییەوە قیافەی ئەو کەسانەی کە عیلاج و چارەسەری سروشتی دەکەن یان لە پەرستارە دەرمانگەرەکان یان پسپۆڕەکانی خۆراکی نەبوو. یاخود لە یەکێك لەو کەسانەی نەدەکرد کە دەسەڵاتدارانی ناوچەیی بۆ بەدواداچونی بارودۆخ و کێشەکانی ویل دەیاننناردن بۆ ماڵەوەیان. قیافەی ئەم کەسانە لە دوورە هاواری دەکرد. هەمیشە ماندو دیاربون، بەڵام زۆر شاد و گەش بوون و جۆش و خرۆشێکی زۆر لە بوون و وجودیاندا هەبوو. زیاتر جلوبەرگی خوری و پێڵاوێکیان بە ڕەنگێکی گونجاو لەبەر دەکرد. هەمیشە سواری ئەو ئۆتۆمبیلە حکومیانە دەبوون کە تەپوتۆز گرتبونی و پڕ بوون لە فایل و دۆسیە و کەرەستەو پێداویستی کەسانی ئیفلیج. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە جەنابی لولەر ئۆتۆمبیلێکی بی ئێم دەبلیو ڕەشی مۆدێل بەرزی پێبوو. وەجبەی پێنجەم، لە جۆری ئۆتۆمبیلە حکومییەکان نەبوو.

لە کۆتاییدا جەنابی لولەر هاتە دەرەوە. جانتاکەی داخست. چاکەتەکەی بەسەر دەستیەوە بوو. ئێستە ئیتر شپرزە و شڵەژاو نەدەهاتەبەرچاو. چویە ناو ڕێڕەوەکەوە.

—ببورە، توالیت لەکوێوەیە؟

ڕێنمایم کرد و بێدەنگ وەستام. بێدەنگ و بێقەرار بوم. لە توالیتەکە هاتە دەرەوە. ڕویکردە ویل و گوتی:

—ئەمرێکتان نییە؟

—سوپاست دەکەم مایکڵ.

ویل سەیری منی نەدەکرد.

—باشە، کەوابوو هەواڵمان پێبدە.

جەنابی لولەر گوتی:

—لەم هەفتەیەدا پەیوەندیتان پێوە دەکەم.

—ئیمەیل لە نامە باشترە— بەتایبەت بۆ ئێستە.

—بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.

دەرگای پشتەوەم کردەوە بۆ ئەوەی بڕواتە دەرەوە. ویل گەڕایەوە بۆ ژوری دانیشتنەکە. منیش جەنابی لولەرم تاوەکو دەرگای حەوشەکە ڕەوانەکرد و بە هێمنیەوە گوتم:

—لە شوێنێکی دورەوە هاتویت؟

چاکەت و پانتۆڵەکە زۆر بەجوانی دورابوو. زۆر شیک و گرانبەهاو بەو دوخت و شێوە جوانەیەوە کە هەیبوو، خاوەنەکەی لە خەڵکانیتر جیادەکردەوە.

—لە لەندەنەوە هاتوم و بەداخەوە دەبێت بگەڕێمەوە. هیوادارم ئەمکاتەی پاشنیوەڕۆ ترافیك قەرەباڵغ و قورس نەبێت.

خۆر لە ئاسماندا بەرز بوو تیشکەکەی چاوی دەبرد.

—کوێی شاری لەندەن؟

—-شەقامی رجنت.

—شەقامی رجنت، چەندە باشە.

—بەڵێ، شوێنێکی خراپ نییە. بۆ قاوەکەیش سوپاست دەکەم خاتوو....

—لوئیزا کلارك.

ساتێك وەستاو چاوی تێبڕیم. حەزم دەکرد بزانم ئایا بۆنی ئەوەی کردووە کە من هەوڵمداوە بزانم کێیەو لە شوناسی تێبگەم. کارێك کە نەدەبوو ئەنجامیبدەم.

—خاتوو کلارك، بۆ هەموو شتێك سوپاست دەکەم.

زەردەخەنە لێزانانەکەی دووبارە گەڕابویەوە بۆ دەموچاوی. دواتر سواری سەیارەکەی بوو ڕۆیشت.

ئەو شەوە، لەسەر ڕێگەکەم لەماڵەوە بۆ ماڵەکەی پاتریك سەرێکم لە کتێبخانە دا. دەمتوانی کۆمپیوتەرەکەی پاتریك بەکاربهێنم، بەڵام بە ئەرکی خۆم دەزانی کە پێشتر مۆڵەتی لێوەربگرم. دانیشتم و نوسیم (مایکل لولەر) و (لەندەن، شەقامی رجنت) و دەستمکرە گەڕان، لە دڵمدا گوتم: (ویل خواستن بریتیە لە توانایی).

٣٢٩٠ بابەت بوونیان هەبوو. سێ دانەی یەکەمیان دەیانگوت کە مایکل لولەر پارێزەری پسپۆڕە لە بواری وەسیەتنامە و بۆماوەیی و وەراسەت و پارێزەری سکاڵاکان. ئەدرەسەکەیش هەمان شەقام بوو. چەند خولەکێك واقم بە لاپەڕەی کۆمپیوتەرەکەدا وڕما. دیسانەوە ناوەکەیم نوسیەوەو بەشوێن وێنەکەیدا گەڕام. خودی خۆی بوو. چاکەت و پانتۆڵی ڕەشی لەبەر کردبوو بەشداری لە مێزگردێکدا کردبوو. مایکل لولەری پسپۆر لە بواری وەراسەت و وەسیەتنامە، هەمان ئەو پیاوە بوو کە ویل یەك سەعات بەتەنهایی لەگەڵیدا قسەی کردبوو. ئەو شەوە گواستمەوە بۆ ماڵی پاتریك. لەوماوە کاتییە یەك سەعات و نیوەی نێوان تەواوبونی کارەکەم و

چونی پاتریك بۆ ڕاهێنان. بێجگە لە قەرەوێڵە و پەردە دەڕابەییەکە، هەموو شتومەکەکانم برد بۆ ئەوێ. پاتریك بە سەیارەکەیەوە هات و شتومەکەکانی بارکردم. دووجار هات و هەموو شتەمەکەکانمی برد بۆ ماڵەکەی خۆی. تەنها کتێبەکانی قوتابخانەم لەو ژوورەدا و لەژێر بنمیچە لێژەکەدا مایەوە.

دایکم دەگریا، وایدەزانی بە جۆرێك لەجۆرەکان دەریان کردوم. باوکم دەیگوت:

--ئازیزەکەم بۆ خاتری خودا، کاتی ئەوەبوو کە ئیتر بەیەکەوە بژین. تەمەنی بیست و حەوت ساڵە.

دایکم دووپارچە کێکی میوەیی و جانتایەکی دەستی و کەرستەی شۆردنی دابەدەستمەوە گوتی:

—هێشتایش کچە بچکۆلەکەی منیت.

نەمدەزانی چی بڵێم. من حەزم لە کێکی میوەیی نەبوو.

زۆر بە ئاسانی لەماڵی پاتریکدا جێگەی خۆمم کردەوە و شتومەکەکانم جێگۆڕکێ پێکرد. پاتریك شتومەك و کەلوپەلی زۆری نەبوو. منیش کە زۆربەی تەمەنم لەناو ژوورە شقارتەییەکەی ماڵەوەماندا بەسەر بردبوو، شتێکی ئەوتۆم نەبوو. تەنها سیدیەکانم کێشەیان بۆ دروستکردم. لەزگم لە پشتی سیدیەکانی خۆمدا و تێکەڵی سیدیەکانی ئەوم کردن. دواتر هەموویانم بە تەرتیبی ئەلیف بێ ڕیزکرد.

پاتریك چەندینجار دووبارەی کردەوە:

—وابزانە لەناو ماڵی خۆتانی.

جەختکردنەوەکەی ئەوەی دەگوت کە میوانم. هەردوکمان تووڕە بووین و بەشێوەیەکی زۆر سەیر ڕەفتاری ناشیانەمان بەیەکەوە هەبوو، هەروەك بڵێی یەکەمین ژوانگەی یەکتر بینینمانە. کاتێك سەرقاڵی جێگۆڕکێکردن بووم بە شتومەکەکانم، چای بۆ هێنام و گوتی:

—ئەم پەرداخە دەسکدارە تایبەتە بەتۆ.

شوێنی شتومەکی چێشتخانەکەی نیشاندام. ئەڵبەتە چەندینجاریش دووبارەی کردەوە و گوتی:

—ئەگەر ویستت جێگۆڕکێ بە شتێك بکەیت، کێشە نییە.

کەوانتەری جلوبەرگەکان و دوو دانە لە چەکمەجەکانی ژورە زیادەکەی ئاپارتمانەکەی خاڵی کرد. دوو چەکمەجەکەیتر پڕ بوون لە جلوبەرگی وەرزشی خۆی. نەمدەزانی ئەم هەموو جلوبەرگە وەرزشییەی لە کالآی (پولیش ویلکرا)ی هەیە. جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکانم لەناو کۆمەدییەکەدا دەق کرد. هەریەکەیان لە ڕەنگێك بوون. خوارەوەی کۆمەدییەکە خاڵی بوو. تەختەکانی تاکی جلوبەرگەکان بە شێوەیەکی سەیرو سەمەرەو خەمهێنەر جیرەیان دەهات. سەیری کۆمەدییەکەم کرد و گوتم دەبێت جلوبەرگ بکڕم و پڕی بکەمەوە.

پاتریك بە حاڵەتێکی تورەییەوە پێکەنینێکی کرد و گوتی:

—ئەمە چییە؟

سەیری ئەو ڕۆژژمێرەی کرد کە بە دیواری ژورەکەدا هەڵمواسیبوو. بیرۆکەکانم بە ڕەنگی سەوز نوسیبوو، ئەو بەرنامانەیش کە ئەمویست جێبەجێیان بکەم بە ڕەنگی ڕەش نوسیبوم. ئەگەر بەرنامەیەك بەباشی بڕۆشتایە (وەك کۆنسێرت و شەراب چەشتن) لەتەنیشتیەوە شێوەی زەردەخەنەیەکم دادەنا. خۆ ئەگەر بەباشی نەڕۆشتایە (وەك پێشبڕکێی ئەسپسواری و پێشانگای وێنەکان)، ئەوا بەخاڵی دەمهێشتەوە. بۆ دوو هەفتە لەمەوبەر بەرنامەگەلی زۆرم نەبوو. ویل تاقەتی ئەم ناوەی نەبوو. لەلایەکیتریشەوە هێشتا نەمتوانیبوو باوەڕی پێبهێنم کە بچین بۆ شوێنێکی دوور. سەیرێکی پاتریکم کرد. دەبینم سەرنجی داوەتە سەر ڕۆژی ١٢ ئوت کە لەتەنیشتیەوە نیشانەی ئاگاداری بە ڕەنگی ڕەش هەبوو.

—ئەوە پەیوەندی بەکارەکەمەوەیە، بۆ ئەوەیە کە لەبیرم نەچێتەوە.

—تۆ پێتوایە دووبارە بڕیارنامەت لەگەڵدا ببەستن؟

—پاتریك نازانم.

پێنوسەکەی لە گیرەی ڕۆژژمێرەکە هەڵگرت. سەیری مانگی دواتری کرد و لەژێر هەفتەی بیستەمدا بە پەلە نوسی (دووبارە گەڕان بە شوێن ئیشدا).

—بەمشێوەیە ئامادەییت تێدایە بۆ هەرشتێك کە بێتە پێشەوە.

ماچی کردم و بەتەنها بەجێی هێشتم.

کرێم و شامپۆکانم بە وردی لەناو گەرماوەکەدا تەرتیب کرد، گوێزان و تەڕکەرەوە و کلێنسەکانم لەناو کابینەی ئاوێنەداری گەرماوەکەدا دانا. کتێبەکانیشم لەناو ژورە زیادەکەداو لەژێر پەنجەرەکەدا بەجوانی بەسەر یەکەوە هەڵچنی، لەوانەش ئەو کتێبە نوێیانەی کە ویل لە

کۆمپانیای ئامارۆندا بۆ منی داواکردبون. پاتریك پەیمانی پێدابووم کە هەرکاتێك بواری هەبوو ڕەفەیەکم بۆ ئامادە بکات.

پاتریك چو بۆ ڕاهێنان و منیش دانیشتم و لەو ناوچە پیشەسازییەوە سەیری قەڵاکەم کرد. لەژێر لێوەوە و لەبەر خۆمەوە دەمگوت (ماڵەوە).

مرۆڤێك نیم کە بتوانم ڕازو نهێنیەك لەناو دڵمدا بهێڵمەوە و یاخود بیشارمەوە. ترینا هەمیشە دەیگوت کاتێك بیرۆکەی درۆکردن لەسەرمدا بێت دەست دەهێنم بە لوتمدا. بەمکارە یەکسەر خۆم ئاشکرا دەکەم. دایکوباوکم هێشتا ئەو یاداشتانەیان لەبیر بوو کە لەبری ئەوان بۆ قوتابخانە دەمناردن بۆ ئەوەی نەچمەوە، باسیان دەکرد و پێدەکەنین. (خاتوو تروبریجی ئازیز، لوئیزا کلارك ئەمڕۆ نایەتەوە بۆ قوتابخانە، چونکە کەوتوەتە سوڕی مانگانەوەو حاڵی باش نییە). باوکیشم بە قیافەیەکی ووشك و ساردو سڕەوە شانەکانی بەرز دەکردەوە، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە چاوەڕێ دەکرا لێم تورە ببێت.

ئێستەش شاردنەوەی ئەو نهێنیەی ویل یەکێکیتربوو لەو شتانە، ئەڵبەتە دەمتوانی زمانم بگرم و هیچ بە دایکوباوکم نەڵێم، (بەم ڕەوشتەوە گەورە بووم)، بەڵام ئەوەی کە بتوانم شڵەژان و شپرزەییم بشارمەوە، ئەوە مەسەلەیەکی تربوو.

دوو سێ شەوی دواتر دانیشتم و بیرم لە ویل و بەرنامەکانی کردەوەو ئەوەی کە چی بکەم بۆ ئەوەی لە بڕیارەکەی پەشیمان ببێتەوە. کاتێکیش لەگەڵ پاتریکدا دادەنیشتم و قسەمان دەکرد، یان بەیەکەوە لە چێشتخانە بچوکەکەیدا خواردنمانە دروستدەکرد، بیرم هەر لەلای ویل بوو. (شتانێکی نوێیشم لەبارەی پاتریکەوە بۆ دەرکەوتبوو، بۆ نمونە دەیزانی بە سینگی قەل سەد جۆر خواردن دروستبکات). شەوان کەبەیەکەوە دەخەوتین بەزۆری وادیاربوو لەسەر ئەرکە. هەروەك بڵێی ئێستە کە لەتەنیشت یەکەوەین دەبێت ئەوپەڕی بەهرە لەیەکتری وەربگرین. هەستمدەکرد پاتریك پێیوایە من بەجۆرێك لە جۆرەکان قەرزداری ئەوم، چونکە زۆرترین کاتم لەلای ویل دەگوزەرێنم. هەرکە پاتریك خەوی لێدەکەوت، من یەکسەر بەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ دەبوم.

تەنها حەوت هەفتە مابوو بۆ وادەی خۆکوشتنەکەی ویل.

ویلیش بەرنامەڕێژی دەکرد بۆ سەفەرەکەی بەرەو سویسرا، تەنانەت ئەگەر منیش لەوێ نەبومایە.

هەفتەی داهاتوو نەمزانی ویل زانی کە بیروز زەینم سەرقاڵە و نیگەرانم یاخود نا. ئەگەریش هەستی بە شتێك کردبێت ئەوا هیچی ئاشکرا نەکرد. بەپێی بەرنامەو نەریتی ئاسایی ڕۆژەکانمان دەگوزەراند. بە ئۆتۆمبیل بەدەوروبەری شاردا دەگەڕاین، ئەو خواردنانەم دروستدەکرد کە حەزی لێیانە. کاتێکیش لە ماڵەوە بوین، بەرکاروبارەکانی ڕادەگەیشتم. ئێستە ئیتر هەرگیز لەبارەی پیاوە ڕاکەرەکەوە گاڵتەی لەگەڵدا نەدەکردم و سەری نەدەخستە سەرم و تورەی نەدەکردم.

قسەمان لەسەر ئەو کۆتا کتێبانە دەکرد کە پێی گوتبوم بیانخوێنمەوە: نەخۆشە ئینگلیزییەکەم پێخۆش بوو، چیرۆکە پۆلیسە سویدیەکەم بەلاوە خۆش نەبوو. ڕەفتارێکی خۆپارێزانەمان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد، زۆریش فەرمی و بە ئەدەب بوین. دڵم بۆ سوکایەتی و ڕەفتارە نابەجێکانی تەنگ بوبو. کاتێك قسەیەکی نالەباری نەدەکرد یان هەڵسوکەوتێکی بێتامی ئەنجامنەدابایە، زۆر هەستم بە مەترسی دەکرد.

نیتن ئاگای لە هەردوکمان بوو، هەروەك بڵێی ڕوبەڕوی کۆمەڵێك بونەوەری نوێ بووەتەوە. ڕۆژێکیان کاتێك لەناو چێشتخانەدا بوین بەمنی گوت:

—ئێوە بەیەکەوە شەڕتان کرد؟

خەریکبوم ئەو شتانەم جێگۆڕکێی دەکرد کە کڕیبوم، گوتم:

—باشتروایە لە خۆی بپرسیت.

—ئەویش ڕێك ئەمەی گوت.

لەژێرچاوەوە سەیری کردم. دواتر چو بۆ گەرماوەکە تاوەکو ڕەفەی دەرمانەکانی ویل بکاتەوە.

سێ ڕۆژ پاش هاتنی مایکل لولەر، سەبرو حەوسەڵەم لەدەستدا و تەلەفۆنم بۆ خاتوو ترینەر کرد و داوام لێکرد لە شوێنێکی بێجگە لەماڵەوە یەکتری ببینین. شوێنێکمان دیاری کرد و لەناو قاوەخانەیەکی بچوکی دەوروبەری قەڵاکەدا یەکتریمان بینی، لە خراپی و دەگەکانی ڕۆژگار، ئەو قاوەخانەیە هەمان ئەو قاوەخانەیە بوو کە بە کرانەوەی من کارەکەم لەدەستدابوو.

بەڵام لەو قاوەخانەیە زۆر شیك و جوانتر بوو کە من کارم تێدا دەکرد. مێز و کورسییەکانی هەمویان لە داری بەڕوو بە ڕەنگی سەوزی فستەقی بۆیاخ کرابوون. سوپی خۆماڵی و سەوزەوات و کێکی بەتامی دەفرۆشت. لەوێدا تەنها قاوەی ئاسایی یان تەنهای کاپوچینۆی ئیسپرسویان

نەدەدا. هیچ دەنگوباسێکی کرێکاری بیناسازی یان کارمەندانی ئارایشتگاکە نەبوو. دانیشتم و یەك کوپ چایم هەڵقوڕاند. بیرم لەماڵی خاتوونی گوڵەگەزیزە دەکردەوە. حەزم دەکرد بزانم ئایا ئێستەیش حەز دەکات هەموو ڕۆژێك بێت بۆ ئێرەو ڕۆژنامە بخوێنێتەوە.

—لوئیزا، ببورە، درەنگ هاتم.

کامیلا ترینەر بە پەلە گەیشتە لام، بلوزێکی ئاوریشمی خۆڵمێشی و پانتۆڵێکی سورمەیی لەبەردابوو. جانتاکەی دەستی بە ئانیشکیەوە شۆڕ بوبویەوە. هەوڵمدا بۆ ئەوە لە شوێنی خۆم هەڵنەستمەوە. هەمیشە کاتێك ئەمویست قسە لەگەڵ خاتوو ترینەردا بکەم، هەستم دەکرد بە جۆرێك لە جۆرەکان خەریکم چاوپێکەوتنم لەگەڵدا دەکرێت.

—کارەکەم لەناو دادگادا درێژەی کێشا.

—شەرمەزارم کە ئێوەم لەسەر کارەکەتانەوە هێناوە بۆ ئێرە، من.... تەنها ئەوەی کە.... باشە، پێمباشبوو دەبێت ئێوە ببینم.

دەستی بەرزکردەوە و شتێکی بە گارسۆنەکە گوت. لەبەرامبەر منەوە دانیشت. بەجۆرێك واقی بە مندا وڕمابوو هەروەك بڵێی دەیتوانی بە قیافەو سەروفەسالمدا هەموو شتێك بخوێنێتەوە.

—ویل داوای لە پارێزەرێك کردبوو کە بێت بۆلای. بەو جۆرەی کە تێگەیشتم کابرا پسپۆڕی بواری وەسیەتنامە و ویراسەت و بۆماوەییە.

بێجگە لەم قسەیە هیچ ڕێگەیەکیترم نەدەزانی بۆ ئەوەی باسەکەی لەگەڵدا بکەمەوە. سەیری منی کرد، هەروەك ئەوە وابوو کە زللەیان لە دەموچاوی دابێت. تازە لێرەدا بوو کە تێگەیشتم، بەڵام درەنگ بوو. وامزانیبوو کە هەواڵێکی خۆشم بۆی هەیە.

—پارێزەر؟ تۆ دڵنیایت؟

—ناوەکەیم لەناو ئینتەرنێتدا دۆزییەوە. نوسینگەکەی لەناو شەقامی ریجنتی شاری لەندەندایە.

دواتر بەبێ هۆ لە قسەکانم بەردەوامبوم و گوتم:

—ناوی مایکل لولەرە.

چەندجارێك چاوەکانی داخست. وادیاربوو هەوڵی دەدا لەمانای قسەکەم تێبگات.

—ویل خۆی ئەمەی پێگوتیت؟

-نەخێر، باوەڕناکەم حەز بکات من بزانم... خۆم لە ئینتەرنێتدا گەڕام و پرسیاری ناوەکەیم کرد و دۆزیمەوە.

قاوەکەیان بۆ هێناو لەبەردەمیدا دایاننا. بەڵام خاتوو ترینەر هەرگیز ئاگای لەوە نەبوو. کچە گارسۆنەکە پرسی:

-حەزتان لە شتێکیتر نییە؟

-نەخێر، سوپاس.

-بۆ ئەمڕۆ کێکی گێزەرمان هەیە. خۆمان دروستی دەکەین. خامەییەو زۆریش بەتامە.....

-نەخێر.

ئاوازی خاتوو ترینەر بەهێز و بە بڕشت بوو.

-سوپاست دەکەم.

کچەکە چەند ساتێك بەو حاڵەوە وەستا، ئەیویست نیشانیبدات کە بێتاقەت بووە. دواتر سەری داخست و ڕۆیشت بەلای کاری خۆیەوە. کاغەزەکانی یاداشتەکە بەدەستیەوە هەڵدەدرانەوە. گوتم:

-ببورە. بەمنتان گوتبو کە هەواڵە گرنگەکانتان پێبدەم. تاوەکو نیوەشەو بێدار بووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە پێتان بڵێم یان نا.

ڕەنگ بەڕوویەوە نەمابوو. دەمزانی چ حاڵێکی هەیە.

-خۆی حاڵی چۆنە؟ تۆکارێکت... هیچ بیرێکی نوێت لێکردوەتەوە؟ گەشتێك؟ شوێنێك؟

-حەزناکات.

سەبارەت بە گەشت و سەفەر بۆ پاریس و ئەوکارانەی کە دەکرا قسەم کرد، لەهەموو ئەو ماوەیەی کە من قسەم دەکرد دیاربوو خەریکە کێشانە و پێوانەی مەسەلەکان دەکات و بارودۆخەکان هەڵدەسەنگێنێت. سەرئەنجام گوتی:

-بە هەرحاڵ، بۆ هەرشوێنێك کە ویستتان بچن، من تێچوەکەی دەدەم، تێچوی گەشت و سەفەرەکەی تۆو نیتنیش دەدەم. تەنها هەوڵبدە ڕازی بکەیت.

سەرم وەك نیشانەی بەڵێ باشە ڕاوەشاند.

-ئەگەر لەناو ماڵەکەی ئێمەدا کارێکیش نەبوو کە بیکەیت... تەنها تکام وایە واز لە کارەکەت مەهێنە، من لەشەش مانگ زیاتر مووچەت پێدەدەم.

—بەڕاستی مەسەلەکە ئەمەنییە و من تۆم بۆ ئەم بابەتە بانگ نەکردوە بۆ ئێرە.

لە بێدەنگیدا قاوەکەمان خواردەوە. هەردوکمان لەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بوبوین. لەژێرچاوەوە سەیرم دەکرد، قژەکانی کە هەمیشە رێك و ئاراستە بوون، ئێستە خەتی خۆڵەمێشیان هەبوو، چاوەکانی وەك چاوەکانی من چوبون بە قوڵاییدا و رەش بوون. دەبینم کە ئێستە باسی بابەتەکەم کردەوە و ئەویشم نیگەران کردووە، هێشتا حاڵم باشتر نەبووە. بەڵام ئایا چارەیەکیترم هەبوو؟ هەر رۆژێك کە تێدەپەڕی لە مەترسییەکە نزیکتر دەبوینەوە. کاتێك کاتژمێر گەیشتە دوو، خاتوو ترینەر لەناو بیرو خەیاڵەکانیدا هاتە دەرەوە.

—دەبێت بگەڕێمەوە بۆ سەرکارەکەم. لوئیزا، تکایە هەر بڕیارێکتدا و هەر بەرنامەیەکت هەبوو بەمنی بڵێ. ئەوە باشترە کە لەماڵەوە یەکتری نەبینین.

هەستامەوە و گوتم:

—با ژمارە تەلەفۆنە نوێیەکەمت لەلا بێت. چونکە من لەماڵی خۆمان نەماوم و ئێستە لەگەڵ دایکوباوکمدا نازیم. دەستیکرد بەناو گیرفانیدا تاوەکو قەڵەم و کاغەز دەربهێنێت.

—چوم بۆ ماڵی پاتریك، کوڕە هاوڕێکەم.

نازانم بۆچی لەم هەواڵە سەری سوڕما. تەکانێکی خوارد. دواتر پێنوسەکەی دابەدەستمەوە.

—نەمدەزانی کوڕی هاوڕێت هەیە.

—پێموانەبوو کە دەبێت بیڵێم.

وەستا. دەستێکی بەسەر مێزەکەوە بوو.

—پێرێ ویل گوتی کە لەوانەیە کۆتایی هەفتەکان لەماڵی ئێمە بمێنیتەوە.

ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەکەی پاتریکم نوسی و کاغەزەکەم دا بەدەستیەوە و گوتم:

—بیرم کردەوە باشتروایە بڕۆیت بۆ ماڵی پاتریك. بەڵام زۆر دوور نەکەوتمەوە، ناوچەی پیشەسازی. هیچ کاریگەرییەکی لەسەر کاتژمێرەکانی کارکردنم نییەو دەتوانم سەری سەعات خۆم بگەیەنمە سەر ئیشەکەم.

هەر لەوێدا وەستاین. زۆر شپرزە دەهاتە پێشچاو. دەستێکی هێنا بەقژی خۆیدا، دواتر دەستی هێنایە خوارەوە و زنجیرەکەی ملی خۆی گرت. بەڵام نەیتوانی لەمە زیاتر رێگری لە خۆی بکات، لە دەمی دەرچوو:

—باشە چی دەبوو ئەگەر بهاتایەو ئەم چەند هەفتەیەش تاملێت بکردایە؟

—ببورە، تێنەگەیشتم؟

—ویل... وابزانم ویل دڵی بە تۆوە بەستوە و هۆگرت بووە.

بە ددان لێوی خۆی گرت.

—نازانم... نازانم... ئایا بەڕاستی ئەم بابەتە چەندە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت.

—ببورە، مەبەستتان ئەوەیە کە نەدەبوو من بچم و لەگەڵ کوڕە هاوڕێکەمدا بژیم؟

—من تەنها گوتم کاتێکی گونجاو نەبوو. ویل لەناو بارودۆخێکی هەستیاردایە. ئێمە خەریکین لە هەموو ڕۆژی خۆمان دەدەین تاوەکو کەمێك هیوای بە ژیان هەبێت...و تۆ....

—من چی؟

دەبینم کچە گارسۆنەکە سەرنجمان دەدات. بەستە کاغەزە یاداشتەکانی هەروا بەدەستەوە بوو.

—من چی؟ ئەوەی کە چوم بۆ ئەوەی جیا لەکارەکەم ژیانی خۆم بەسەر بەرم؟

دەنگی خۆی هێنایە خوارەوە.

—لوئیزا، هەرکارێك کە پێویست بێت دەیکەم تاوەکو ڕێگری... لەمکارە بکەم. تۆ دەزانیت ئێمە ڕوبەڕوی چ لێپرسراوییەتیەکی قورس بوینەتەوە. من تەنها ئەمەوێت بڵێم خۆزگایە—بە سەرنجدان بەوەی کە دڵی بە تۆوە بەستوە— کەمێك تامڵت بکردایە پێش ئەوەی خۆشبەختی خۆت بکێشی بەسەریدا.

نەمدەتوانی باوەڕ بەو شتانە بکەم کە دەیانبیستم. هەستم کرد دەموچاوم سور بووەتەوە، پێش ئەوەی کە قسەیەك بکەم، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.

—چۆن ڕێگە بەخۆتان دەدەن بە من بڵێن کارێکم کردوە تاوەکو دەگە لە هەستەکانی بدەم. من هەموو کارێکم بۆ کرد. هەرکارێك کە لەدەستم دەهات. بردمە دەرەوە، قسەم لەگەڵدا کرد، کتێبم بۆ خوێندەوە، چاودێریم کرد و ئاگاداری بووم. ئەم شتانەیش لەزارم هاتنە دەرەوە:

—پاکم کردەوە. سوندەکەییم گۆڕی. خستمە پێکەنین. زۆر لە ئێوە زیاتر پێیدا ڕاگەیشتم.

خاتوو ترینەر هەروا بە بێدەنگی و ڕێك و ڕاست وەستابوو، جانتاکەی کردبو بە ئانیشکیەوە و شۆڕبوبویەوە،

—خاتوو کلارك، باشتر وایە ئەم قسانە کۆتایی پێبهێنین.

—بەڵێ، خاتوو ترینەر، باشتر وایە کۆتایی پێبهێنین.

ئاوڕمدایوه و بەخێراییەوە لە قاوەخانەکە هاتمە دەرەوە.

کاتێك لەدوای خۆمەوە دەرگاکەم داخست، دەبینم دەلەرزم.

***

پاش ئەو قسەو باسانەی کە لەگەڵ خاتوو ترینەردا ئەنجاممدا، تاوەکو دوو سێ ڕۆژی دواتر شپرزە بوبوم. بەردەوام قسەکەی لە گوێمدا دەزرنگایەوە(با کەمێك تامڵت بکردایە پێش ئەوەی خۆشبەختی خۆت بکێشیت بەسەریدا) باوەڕم نەدەکرد کارەکانی من بۆ ویل گرنگ بن. کاتێك بینیم بێتاقەت بوو لەوەی کە بڕیارمدابوو لەگەڵ پاتریکدا بژیم، وامزانی لەبەر ئەوەیە کە خۆشی لە پاتریك نایەت، بۆیە بێتاقەتە، هەرگیز ئەوە بەبیرو زەیمدا نەهاتبوو کە بەرامبەر بەمن هەستێکی هەبێت. لەمەش گرنگتر، ئەوەبوو کە من هیچ جۆرە خۆشحاڵییەکی تایبەتم لە خۆم نیشان نەدابوو.

کاتێك لەماڵیشەوە بووم، دڵەڕاوکێکەم کەمتر نەدەبوویەوە. ڕەوتێکی هێمن بوو کە لەسەرانسەری جەستەمدا دەڕۆیشت. بە هەرکارێك کە ئەنجامم دەدا توندتر دەبوو. پرسیارم لە پاتریك کرد:

–ئەگەر خوشکەکەم پێویستی بە ژورەکەم نەبوایە، هێشتا هەر ئەمکارەمان دەکرد؟

واقی بەمندا وڕما، هەروەك بڵێی ڕوبەڕوی مرۆڤێکی شێت بووەتەوە. هاتە پێشەوە و منی بەرەولای خۆی ڕاکێشا، سەری ماچکردم و دواتر سەری داخست.

–ئێستە ناچاری کە ئەم پانتۆڵەی ماڵەوە بپۆشی کە من ڕقم لێیەتی؟

–زۆر ئیسراحەتن لەبەرمدا.

–دەبێت دایکم ئەم جلی خەوە لەبەر بکات نەك تۆ.

–ناتوانم هەر شەوێك جلوبەرگێك لەبەر بکەم کە تۆ پێتخۆشە. وەڵامی پرسیارەکەت نەدامەوە.

–نازانم، لەوانەیە بەڵێ.

–بەڵام هیچکاتێك لەبارەیەوە قسەمان نەکردبوو... کردبومان؟

–لو زۆربەی کات خەڵکی بەیەکەوە دەژین لەبەر ئەوەیە کە کارێکی باشە. لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەژین کە عاشقیانن، لەڕوی داراییشەوە بۆ مرۆڤ سود و کەڵکی هەیە.

–تکایە بەوجۆرە بیر مەکەرەوە من لەبەر ئەوە هاتوم بۆ ئێرە چونکە لەڕوی داراییەوە کارەکە بەسودە بۆم. حەزناکەم بەمجۆرە لەبارەی منەوە بیر بکەیتەوە.

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و بەپشتدا تەپاوتلیدا.

–باشە بۆچی ژنەکان نەریتیان وایە ئەوەندە قسە لەسەر بابەتێك بکەن و لەسەری برۆن تاوەکو بیگۆڕن و بیکەنە کێشەیەك؟ من عاشقی تۆم، تۆیش عاشقی منیت، نزیکەی حەوت ساڵیشە کە بەیەکەوە هاوڕێین. لەناو ماڵی باوکیشتدا خۆ زۆری زیادە نەبوو. هەر بەم سادە و ئاسانییە.

نەخێر، بەم سادەییەش نەبوو.

هەستم دەکرد ئەم ژیانەی من هەمە، ئەو شتە نییە کە چاوەڕوانیم دەکرد.

هەموو ڕۆژی هەینی باران باری، بارانێکی گەرم و توند. هەروەك بارانی ناوچە ئیستیواییەکان. پلورەکان پەڕین و کەوتنە هاژە و لق و ساقە تەڕو باریکەکان و نەمام و خونچە گولەکانیش وەك حاڵەتی پاڕانەوەو داوای یارمەتیکردن سەریان نەوی کرد. ویل هەروەك سەگێك کە لە پیادەڕەوێك بێبەش کراوە. لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. نیتنیش هاتوچۆی دەکرد. عەلاگەکەی لەڕاسەرییەوە ڕادەگرت، ویلیش سەیری فیلمێکی دۆکیۆمێنتاری سەبارەت بە بەتریقەکان دەکرد. دواتریش چو بۆلای کۆمپیوتەرەکەی. منیش خۆم بە کارەکانمەوە سەرقاڵ کرد، هەربۆیە ناچار نەبوین بەیەکەوە قسە بکەین، بەڵام بەتەواوەتی هەستم دەکرد کە هەردوکمان هەست بە ئازار دەکەین. مانەوە لە یەك ژوردا ئەویش بۆماوەیەکی دورودرێژ، هێندەیتر بارودۆخەکەی خراپتر دەکرد.

دواتر وردە وردە تێگەیشتم شۆردن و سڕینەوە هێورم دەکاتەوە. دەستمکردە پاکوخاوێنی کردن، پەنجەرەکانم شۆرد، چەرچەفەکانم گۆڕی. بەبێ وەستان کارم دەکرد و یەك چرکەیش نەدەوەستام. یەك تۆسقاڵ تەپوتۆز لەناو ماڵەکەدا لەبەرچاوم وون نەدەبوو لەك و پەڵە چاییەکانیش لە نیگا پۆلیسییەکانم بێوەی نەبوون. خەریکبوم بە خاوڵی کاغەزی تەڕکراو بە سرکە و قسڵم دەهێنا بەسەر بەلوعەکانی گەرماوەکەدا(ئەو هونەرو فێڵەی کە لە دایکمەوە فێری بوبوم)، دەنگی کورسییە تایەدارەکەی ویلم لە دوامەوە بیست.

–خەریکی چ کارێك دەکەیت؟

چەمابومەوە بەسەر تەشت و لەگانی ئاوەکەدا و ئاورم نەدایەوە.

—خەریکم بەلوعەکان پاکدەکەمەوە بۆ ئەوەی بریسکەیان بێت.

هەستم بە قورسی نیگاکانی دەکرد.

—دووبارە بیڵێرەوە.

—چی؟

—دووبارە بیڵێرەوە چیت گوت؟

پشتم ڕاستکردەوە و ڕێك وەستام.

—بۆچی؟ گوێت کێشەیەکی بۆ دروستبووە و بەباشی نابیستێت؟ خەریکم بەلوعەکان پاکدەکەمەوە بۆ ئەوەی بریسکەیان بێت.

—نەخێر. گوێم کێشەی بۆ دروست نەبووە. تەنها ئەمویست خۆت گوێت لێبێت کە چیت گوت. کلارك هیچ پێویستناکات بەلوعەکان بریسکەدار بکەیت. بەلای دایکمەوە زۆر گرنگ نییە. منیش حەقم نییە. گەرماوەکە بۆنی دوکانی ماسی فرۆشەکانی گرتووە. سەرەڕای ئەوەش، ئەمەوێت بچمە دەرەوە.

زوڵفەکانم لەسەر دەموچاوم لادا. ئەو ڕاستی دەکرد. گەرماوەکە بۆنی بۆگەنی ناو دوکانی ماسی فرۆشییەکانی دەدا.

—وەرە لە کۆتاییدا بارانەکە وەستایەوە، ئێستە قسەم لەگەڵ باوکمدا کرد. گوتی کە کاتژمێر پێنج کلیلی قەلاَکەمان پێدەدات. ئەوکاتەی کە چۆڵ دەبێت.

باوەڕم نەدەکرد پەیوەندییەکان ئەوەندە باش بن کە لەکاتی پیاسەکردندا لەدەورووبەری قەلاَکەدا بتوانین بە ئەدەبەوە قسە لەگەڵ یەکتریدا بکەین. لەگەڵ ئەمەشدا چونە دەرەوە لەماڵەوە بیرۆکەیەکی خراپ نەبوو.

—زۆر باشە. تەنها پێنج خولەك مۆڵەت بدە. دەبێت بۆنی سرکەکە بە دەستمەوە نەهێڵم.

***

جیاوازی نێوان پەروەردەی من و پەروەردەی ویل لەوەدابوو کە هیچکەسێك وەك ئەو خۆی بە شایستەی هەموو شتێك نەدەزانی! بەبڕوای من ئەگەر مرۆڤ لە هەلومەرجی ئەودا گەورە بوبێت، لەگەڵ دایکوباوکێکی دەوڵەمەند، لەماڵێکی گەورەدا، لە قوتابخانە نمونەیی و پلەیەکەکان و ڕیستورانە گرانبەهاکاندا ژیابێت، بەدڵنیاییەوە ئەو هەستەی هەیە کە هەمیشە

ژیان بەپێی خواست و موورادی مرۆڤە و بە شێوەیەکی سروشتی شوێنگە و پێگەیەکی بالآی لە دوونیادا هەیە.

ویل دەیگوت کاتێك منداڵبووە، هەمیشە هاتووە بۆ قەلآکە، باوکیشی ڕێگەی پێدەدا کە لەدەوروبەریدا بسوڕێتەوە و یاری بکات. دڵنیایش بووە لەوەی کە ویل دەستکاری هیچ شتێك ناکات. لەپاش کاتژمێر ٥:٣٠ کاتێك کە کۆتا گەشتیارەکان دەڕۆیشتن و باخەوانەکانیش سەرقاڵی کارەکەیان دەبوون، پاککەرەوەکانیش سەتڵی خۆڵەکانیان دەڕشت و کارتۆنە خاڵیيەکانی ساردی و چوکلێتەکانیان دەبرد، ئیتر حەوشەی قەلآکە دەبوویە گۆڕەپانی یاری تايبەتی ئەو.

—لەتەنیشت پردە جولآوەکەوە بوو کە بۆ یەکەمینجار لە تەمەنمدا کچێکم ماچکرد.

هەروا کە خەریکبوم بەناو ڕێڕەوی ڕیکیدا دەڕۆیشتم، خێراییمان کەمکردەوە بۆ ئەوەی پردە جولآوەکە ببینین.

—پێت گوت کە ئێرە هی ئێوەیە؟

—نەخێر، لەوانەیە دەبوو بمگوتبایە. یەك هەفتە دواتر کچەکە وازی لێهێنام و کەوتە شوێن کوڕێکیتر، کە لەناو فرۆشگای خۆراکدا کاری دەکرد.

ئاوڕمدایەوە و بەسەرسوڕمانەوە سەیرم کرد.

—نەکا مەبەستت تری رولندز بێت؟ هەمان ئەو کوڕە قژ ڕەشەی کە ڕۆن بەکاردەهێنێت و دەستی تاوەکو ئانیشکی خاڵ و تاتۆی کردووە؟

—بەڵێ، خۆیەتی.

—هێشتا لەوێدا ئیش دەکات. لەناو دوکانی خواردن فرۆشییەکەدا. پێتخۆش بێت بزانیت.

—باوەڕناکەم کاتێك بزانم کارم گەیشتە کوێ، دیسانەوە ئێرەییم پێیبباتەوە.

وەستام و دووبارە سەرگەرمی قسەکردن بوینەوە.

بینینی قەلآکە بەوشێوە بێدەنگ و خامۆشە هەندێك بەلامەوە سەیر بوو. تەنها ئەم دوانەمان بوین، ئەڵبەتە بێجگە لەو باخەوانەی کە لەو دەوروبەرەدا سەرقاڵی کارکردن بوو. ئێستە لەبری ئەوەی کە واقم بە گەشتیارەکاندا وڕبمێنێت و شێوەزارو غەریبی و نامۆ بونیان بیرو خەیاڵم ببات، لەوانەیە بۆ یەکەمینجاربوو کە خودی قەلآکەم دەبینی و بە توندی کەمەندکێشی کۆنییەکەی بوبوم. دیوارە بەردینەکانی هەشت سەد ساڵ زیاتر بوو کە بەپێوە بوون.

خەڵکانێکی زۆر لەوێدا لەدایکبوبون و مردبوون. چەندین دڵ لەو شوێنەدا لەبەر عەشق لێیاندابێت یان شکێنراون! ئێستە لەناو ئەو بێدەنگییەدا دەمانتوانی لەسەر ڕەسیفی بەردینی ئەو ناوە دەنگیان ببیستین و هەست بە هەنگاوەکانیان بکەین. گوتم:

—ئێستە کاتی دانپێدانانە. پێمبڵێ بزانم، هیچکاتێك بووە لێرەدا سورێك بخۆیت و لەناو دڵتدا وا هەست بکەیت کە یەکێکیت لە شازادەکانی سەلەحشور؟

ویل بە لاچاو سەیرێکی کردم.

—ڕاستیەکەیت دەوێت؟

—بەدڵنیاییەوە.

—بەڵێ، تەنانەت یەکجار یەکێك لە شمشێرەکانی سەر دیواری (گریت هال)م هەڵگرت. کە نزیکەی یەك تۆن کێشی هەبوو. لەبیرمە کاتێك زانیم ناتوانم بیگێڕمە سەر جێگەکەی خۆی، لەترساندا خەریکبوو زیرە بکەم.

گەیشتبوینە سەر تەپۆڵکەکە. لەێوە و لەبەرامبەر خەندەقەکەوە دەمانتوانی ڕوبەری فراوانی دەشتاییە سەرسەوزەکە ببینین، کە دەگەیشتەوە بە دیوارە وێرانبوەکان. دیوارەکان سنورەکانیان دیاری دەکرد. لە پشتی ئەوانیشەوە شار خۆی حەشاردابوو. تابلۆ بێ ڕەنگ و بۆکان و ڕیزی ئۆتۆمبیلەکان و ئەو هات و هاوارەی کە نیشاندەری کاتژمێرەکانی قەرەباڵغییە. بەلآم لێرەدا بێدەنگی هەبوو بێجگە لە ئاوازی باڵندەکان و گیزەی نەرمی کورسییە تایەدارەکەی ویل هیچ دەنگێکیتر نەدەهاتە بەرگوێ.

ویل کورسییەتایەدارەکەی وەستاندو سوڕایەوە. ئێستە ئیتر بەجوانی ڕومان کردبویە چواردەوری قەلآکە. ویل گوتی:

—سەرم سوڕدەمێنێ کە من و تۆ هیچکاتێك لێرەدا یەکتریمان نەبینیوە. مەبەستم ئەوکاتەیە کە گەورە بووم. لەکاتێکدا کە مەسیرو ڕێڕەومان یەکێکبووە.

—نەخێر، باوەڕناکەم، ڕێڕەومان جیاواز بوو. ئەوکاتەی کە تۆ شمشێرت دەسوڕاندەوە من لەناو گالیسکەدا دانیشتبوم.

—ئێ، بەڵێ. لەبیرم چوبویەوە. من تەمەنی بابەگەورەتم هەیە!

—هەشت ساڵ ئەوەندە هەیە کە تۆ بوبیتە پیاوێکی گەورە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك مێردمنداڵ بووم هەرگیز باوکم ڕێگەی پێنەدەدام ببمە هاوڕێی پیاوێکی گەورە.

—تەنانەت ئەگەر ئەم پیاوە گەورەیە سەردەمێك خاوەنی قەڵایەكیش بوبێت؟

—باشە، بەمشێوەیە بابەتەكە جیاوازی هەبوو.

هێدی هێدی سەرقاڵی پیاسەكردن بوین. بۆنی خۆش و دڵنشینی گژوگیاكان دەهاتە لوتی مرۆڤەوە، كورسییەتایەدارەكەی ویلیش لەكاتی ڕۆشتنیدا بەناو چاڵوچۆڵەكانی ئەو شوێنەدا جیڕەی تایەكانی دەهات. من هەستم بە ڕزگاربون دەكرد. ئەوە ڕاستە كە قسەكانمان وەك جاران نەبوو. بەڵام هەمیشە چاوەڕوانی لەمەش زیاترمان لەیەكتری نەدەكرد. خاتوو ترینەر ڕاستی دەگوت، بۆ ویل زۆر سەخت و ئاستەمە كە ببینێت خەڵكی بەشێوەیەكی ئاسایی ژیانی خۆیان دەگوزەرێنن. بە خۆمم گوت لە ئێستە بەدواوە دەبێت ئاگام لە كاریگەری ئەو ڕەفتارو هەڵسوكەوتانە بێت كە كاریگەریان لەسەر ویل دەبێت. تورەییم كەلاوی كردبوو، نەمدەویست لەمە زیاتر تورە ببم.

—وەرە بابچین بۆناو دالآنی هەزار پێچ و قەمچ، سالآنێكە كە نەچووم.

لە ناو بیرو خەیاڵەكانمدا هاتمە دەرەوە. سەیرێكی دەوروبەرم كرد بۆ ئەوەی بزانم لە كوێین.

—ئۆو، نا، مەمنون.

—بۆچی؟ لەوە دەترسیت وون ببیت؟ كلارك، وەرە بابە. مرۆڤ دەكەوێتە كێشەوبەرەوە. بزانم دەتوانی ئەوە بەبیری خۆت بهێنیتەوە كە لەكامە ڕێگاوە هاتویت، بۆ ئەوەی لە هەمان ڕێگەوە نەگەڕێیتەوە؟ لە ڕێگەیەكیترەوە وەرە دەرەوە. كاتت پێدەدەم. هەمیشە ئەمكارەم ئەنجامدەدا.

گەڕامەوە و سەیرێكی خانووەكەم كرد.

—نەخێر، پێمباشترە نەڕۆم.

تەنانەت بیركردنەوە لێی حاڵی خراپ دەكردم.

—دەترسی؟

—نەخێر، مەسەلە ئەم قسانە نییە.

—قەیدێ ناكات. بەردەوامدەبین لە پیاسەكردنەماندوكەرەكەمان و دواتر دەگەڕێینەوە بۆناو قەفەسە دڵگیرەكەمان.

دەمزانی خەریکە گاڵتە دەکات، بەلام شتێك لەناو قسەکەیدا هەبوو کە کاریگەری کردە سەر من. بیری دایکوباوکم کەوتەوە. بیری خوشکەکەم کەوتەوە کە ئەو ژیانە خۆش و باشەی بۆ خۆی دروستکردبوو. بەلام من ژیانێکی داخراوم هەبوو دونیاکەم زۆر بچوکبوو. زۆریش بەرزەفریم نەبوو.

سەیرێکی ڕێڕەوو دالآنە هەزار پێچ و قەمچەکان و پەرژینە ڕەش و قایمەکەیم کرد. بەڕاستی بێئەقڵ بوم. لەوانەیە ساڵانێکی زۆرە وەك بێئەقڵەکان ڕەفتارم کردبێت و جوڵابمەوە. بەلام ئێستە ئیتر کۆتاییهاتبوو. ئەمویست لەوانە تێپەڕم و بەجێیان بهێڵم.

—تەنها ئەوەت لەبیر بێت کە بەرەوکاملا سوڕایتەوە. دواتر لە پێچ و لای پێچەوانەکەیەوە وەرە درەوە. هێندەش قورس نییە کە سەرەتا دێتە بەرچاوی مرۆڤەوە.

پێش ئەوەی کە هەلی بیرکردنەوە بە خۆم بدەم، لە ویل جیابومەوە. هەناسەیکی قوڵم هەڵکێشاو چومە ناو ڕێڕەوێکەوە کە تابلۆیان بۆ دانابوو. (هاتنە ژورەوەی منداڵان بەبێ گەورەکان قەدەغەیە). بە چوست و چالاکی و چاپوکییەکی تەواوەوە بەناو پەرژینە تەڕو شێدارو ڕەشەکاندا کە هێشتا بە دڵۆپەکانی باران شەپۆلیان دەدا، دەچوم بەڕێگادا.

لەبەر خۆمەوە دەمگوت (قورس نییە، زۆر قورس نییە). سوڕامەوە بەلای ڕاست و دواتر بەرەو لای چەپ سوڕامەوە. بەناو کونی پەرژینەکەدا تێپەڕیم. بەرەو لای ڕاست سوڕامەوە. دواتریش بەرەو لای چەپ، هەروا کە دەڕۆیشتم لەناو بیرو زەینی خۆمدا ئەوەم دووبارە دەکردەوە پێچەوانەی ئەو شوێنەی کە منی لێم لە کوێیە. لەلای ڕاستەوەیە، یاخود لەلای چەپەوە. تێپەڕین بەناو کونی پەرژینەکەدا لای چەپی یاخود لای ڕاستی.

لێدانەکانی دڵم کەمێك پەلە بوبون. تەنانەت دەنگ ڕەوتی خوێنی ناو دەمارەکانی گوێم دەبیست. هەوڵم دەدا بیر لە ویل بکەمەوە کە لەوبەری پەرژینەکەوەیەو سەیری سەعاتەکەی دەکات، چ تاقیکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەیە. خۆ من کچێکی بێ ئەزمون و پێنەگەیشتو نەبووم، تەمەنم بیست و حەوت ساڵان بوو. لەگەڵ کوڕە هاوڕێکەمدا دەژیام. کارێکی پڕ ئەرك و لێپرسراوییەتیم هەبوو. ئێستە ئیتر مرۆڤێکیتر بووم.

گەڕامەوە. ڕێك بەرەوپێشەوە ڕۆیشتم و دووبارە سوڕامەوە.

دواتر کتوپڕ ترس وەك زەرداووسەفرا سەرانسەری جەستەی داگرتم. بەوجۆرە هاتە پێشچاوم کە لە کۆتایی پەرژینەکەدا پیاوێکم بینی کە وەك بروسکە تێپەڕی. بەخۆمم گوت

توشی خەیالآت بووم، ئەمەش بویە هۆی ئەوەی بیرو خەیالم بڕوات و تێکەڵی بکەم. ڕاست، چەپ، کونەکە، پەڕژین، ڕاست، ڕاست؟ بە هەڵە ڕۆیشتبوم؟ هەناسەم سوار بوو. بەزۆر بەرەو پێشەوە دەچوم. دواتر زانیم کە ڕێڕەوی خۆمم ونکردووە. وەستام و سەیری ڕێڕەوی سێبەرەکانم کرد. هەوڵمدا بزانم کاملایە خۆرئاوایە. هەروا کە وەستابوم دڵنیابومەوە کە ناتوانم ڕێگەکە بدۆزمەوە. نەشمدەتوانی هەروا لەوێدا بوەستم. سوڕامەوە و ئەمویست باشور بدۆزمەوە. دەبوایە ڕێگەی دەرەوەم بدۆزیبایەوە. بیست و حەوت سالم بوو. خۆ منداڵ نەبووم. دواتر دەنگی قسەکردنم بیست. دەنگی فیقەنە و پێکەنین. دواتر ئەوانم بینی کە بەخێراییەوە بەناو درزە گەورەکانی پەرژینەکەدا تێدەپەڕین، هەستم دەکرد زەوی لەژێر پاژنە بەرزەکانی پێڵاوەکانمدا هەروەك کەسە مەستەکان لۆقە و لارەی دەهات و بەرچاوم دە سوڕایەوە، کەوتم بەسەر پەرژینەکەدا و درکە تیژەکانی چەقین بە جەستەمدا. هەوڵمدا خۆم بە توندی ڕابگرم.

بەوانم گوت:

—ئێستە تەنها ئەمەوێت لێرە بڕۆمە دەرەوە.

دەنگم ئاڵۆزبوو دەلەرزی.

—کوڕینە ئەمەوێت لێرە بڕۆمە دەرەوە.

کتوپڕ هەمویان دیارنەمان. بێدەنگییەکی ڕەها بوو. تەنها لە دورەوە دەنگی چپەکردن دەهات، کە لەوانەیە ئەوان بوبن کە لەولاکەیتری پەرژینەکەوە بەیەکەوە قسەیان دەکرد، یان لەوانەیە دەنگی ڕەشەبا بوو کە گەڵاکانی دەجولاندەوە.

—ئێستە تەنها ئەمەوێت لێرە بڕۆمە دەرەوە.

دەنگم تەنانەت بە لەرزۆك دەهاتە بەرگوێی خۆیشم.

سەرم بەرزکردبویەوە و لەبەر فراوانی جەواهێرنیشانی ڕاسەرم هەستم بە نائارامی و ترس دەکرد. لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم، کەسێك باوەشی کردبوو بە کەمەرمدا، قژێکی ڕەشی ئەفریقایی گوتی:

— نا نەخێر ناکرێت. ئێمە لەناوەڕاستی یارییەکەداین، یارییەکەش تێکدەدەیت.

دواتریش تێگەیشتم، تەنها لەوەی کە دەستی بەری کەمەرم کەوت هاوسەنگی هەموو شتەکان تێکچوبوو هەڵسوکەوتەکانم لە کۆنترۆڵی خۆمدا نەبوون. پێکەنیم و توند دەستیم گرت، هەروەك بڵێی مایەی گاڵتەو پێکەنین بوو، حەزم نەدەکرد بزانێت کە دەزانم، دەنگیم بیست کە

بانگی هاوڕێکانی خۆی دەکرد. لەدەستی ڕامکردو یەکسەر دەستمکردە ڕاکردن، هەوڵمدەدا ڕێگەکەم بدۆزمەوە و بچمە دەرەوە. قاچم دەچەقی بەناو گژوگیا تەڕو شێدارەکاندا. دەنگیانم لەدەوروبەری خۆمدا دەبیست، هەستم بە دەنگە بەرزەکانیان و جەستە نەبینراوەکانیان دەکرد. لە ترساندا نەمدەتوانی هەناسە بدەم. ئەوەندە بەملاو بەولادا ڕۆشتبوم و ڕێگەم ونکردبوو، هەرگیز نەمدەزانی لە کوێم. پەرژینە بەرزەکان لول دەبوون و بەرەو لای من دەهاتن. هەروەها کە خەریکبووم بەرەو پێشەوە دەچوم و دەگلام و لەبەرزاییەکانی پەرژینەکەوە بازمدەدایە خوارەوە. هەموو هەوڵ و کۆششم ئەوە بوو کە خۆم لەدەستی ئەو هات و هاوارانەیان ڕزگار بکەم. بەڵام هیچ دەنگوباسێکی ڕێگەی چونەدەرەوە نەبوو. بەرەو هەرلایەك دەسوڕامەوە ڕوبەڕوی پەرژینێکیتر دەبوومەوەو قاقای پێکەنینێکم دەبیست.

تلێکمخوارد و کەوتمە ناو کونی پەرژینەکەوە. ساتێك هەستمکرد کە نزیکی ڕێگەی چونەدەرەوەکە بوومەتەوە. بەڵام دواتر دەبینم کە هێشتا لەناو پەرژینەکاندام، گەیشتم بە جێگەی یەکەمجارم. کاتێك بینیم کە هەمویان لەوێدا وەستاون، سەرم گێژی خوارد. هەروەك بڵێی وەستابون و چاوەڕوانی منیان دەکرد. یەکێکیان دەستیگرتم گوتی:

—من پێتانم گوت کە ئامادەباشی ئەمکارەی هەیە. لو وەرە، ماچێکم بدەرێ، من ڕێگەکەت نیشاندەدەم.

دەنگی نەرم و کێشدار بوو.

—ماچ بە هەمووومان بدە. ئێمە ڕێگاکەت نیشاندەدەین.

دەموچاویان نادیارو تاریکبوو.

—من... من تەنها ئەمەوێت ئێوە....

—وەرە... لو، تۆ هاوڕێت هەیە، ئەی نیتە؟ ڕاستیەکەی بڵێ! ئەی وانییە؟ زۆر سەختە؟

کەسێك پێکەنینێکی کرد.

—دواتر پێم نیشاندەدەن کە چۆن بچمە دەرەوە؟

هاتە پێشترەوە.

—تەنها یەك دانە.

هیچ قسەیەکم بۆ گوتن نەبوو.

—ئێستە نۆرەی جاکە.

بیرم نایەتەوە چ وەڵامێکمدایەوە. کەسێك دەستی گرتبوم، دەنگی پێکەنینم بیست.

—ویل...

ئێستە ئیتر خەریکبوم دەگریام. خۆم کۆکردبویەوە.

—ویل....

ناوەکەیم دووبار دەکردەوە. بۆ چەندینجار ئەمەم کرد. دەنگم ناقۆڵا و زبر بوو لەقوڵایی قەفەسەی سینگمەوە دەهاتە دەرەوە. دەنگیم بیست، کە لەدورەوە دەهات، لە شوێنێکی پشتەوەی پەرژینەکانەوە.

—لو! لو! تۆ لەکوێیت؟ چی بووە؟

لە گۆشەیەکی ژێر پەرژینەکەدا وەستابوم، فرمێسك چاوەکانمی لێڵ و ڕەش کردبوو. توند دەستەکانم پێچاوبوو بەدەوری خۆمدا، نەمدەتوانی بجوڵێمەوە. هەروەك بڵێی بۆ هەمیشە لەو شوێنەدا گیرۆدە بووم و ئیتر هیچکەسێك ناتوانێت بمدۆزێتەوە.

—ویل...

—تۆ لە کوێیت...

دواتر بینیم کە لەبەرامبەرمەوە وەستاوە. سەرم بەرزکردەوە، دەموچاوم زۆر پەرێشان بوو. گوتم:

—بەداخەوەم بمبورە نەمتوانی.

ئەو چەند سانتیمەترەی کە دەیتوانی، دەستی بەرز کردەوە.

—یاعیسای مەسیح، چی بووە؟ وەرە کلارك.

هاتە پێشەوە، بە بێتاقەتییەوە سەیری دەستی خۆی کرد.

—ئەی بێ کەڵکی هیچ و پوچ! هیچ نییە، تەنها هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژە، وەرە بۆ ئێرە. تەنها بەردەوامبە و هەناسەی قوڵ هەڵبمژە.

فرمێسکی چاوەکانم سڕی. ئێستە کە لەتەنیشتی خۆمەوە دەمبینی، ترسم نەمابوو. هەستامەوە. هاوسەنگیم لەدەستدابوو. هوڵمدا کە دەموچاوم حاڵەتی ئاسایی بۆ بگەڕێتەوە.

—ببورە من.... هەرگیز نازانم کە چی ڕوویدا.

—توشی ترس و هەراسانی بویت بەدەست شوێنە بنبەستەکانەوە؟

دەموچاوی تەنها چەند سانتیمەترێك لەمنەوە مەودای هەبوو شڵەژاو بوو.

—من زانیم کە ناتەوێت بڕۆیت. من.... تەنها بیرم کردەوە کە تۆ...

چاوەکانم داخست.

—ئێستە تەنها ئەمەوێت بڕۆین.

—دەستم بگرە با بڕۆین.

لەماوەی چەند خولەکدا منی لەو شوێنە بردە دەرەوە. ئەو شارەزای ڕێگاکە بوو. دەیزانی چۆن بەناو ڕێڕەوە هەزار پیچ و قەمچەکاندا بڕۆینە دەرەوە. هەروا کە لەڕۆشتن بەردەوامبوین قسەی لەگەڵدا دەکردم، دەنگی هێمن و دڵنیابەخش بوو. لە منداڵیدا هەوڵ و کۆششێکی زۆری دابوو تاوەکو توانیبوی فێری ڕێگەی چونە دەرەوەکە ببێت. دەستم لەناو دەستیدا بوو هەستم بە گەرماکەی دەکرد. گەرمای دەستی کەسێك کە ئارامبەخش بوو. کاتێك زانیم لەم هەموو ماوەیەدا کەڕامکردووە، چەندە لە دەمی چونەدەرەوەی داڵانە هەزار پێچوقەمچەکەوە نزیکبووم، بە بێ ئەقڵی و کەودەنی خۆم پێکەنیم.

کاتێك گەیشتینە دەرەوە، گەیشتینە پاڵ کەپرۆکەیەکی ئیسراحەت و پاڵدانەوەو وەستاین. لە پشتی کورسییە تایەدارەکەیەوە کلێنسێکم دەرهێنا. لە بێدەنگیدا دانیشتین. منیش لەقەراخ کەپرۆکەکەدا و لەتەنیشت ئەوەوە دانیشتم. هەردوکمان چاوەڕوان بوین کە هەناسە سوارییەکەمان کۆتایی پێبێت. ویل دانیشتبوو بە دزی و لەژێرچاوەوە سەیری دەکردم.

دواتر کاتێك زانی دەتوانم قسە بکەم، گوتی:

—باشە، ئێستە بۆم بگێڕەوە بزانم چی بووە؟

کلێنسەکەم لەناو دەستمدا لول کرد.

—ناتوانم.

بێدەنگبوو.

تفی دەمم قوتدایەوە. یەکسەر گوتی:

—-مەسەلەکە تۆ نیت. خۆ تاوەکو ئێستە لەبارەیەوە قسەم لەگەڵ هیچکەسێکدا نەکردوە.... گاڵتەجاڕانە.... زۆریش گاڵتەجاڕانەیە. هی ماوەیەکی زۆری لەمەوبەرە. پێموانەبوو.... من....

هەستم بە قورسی نیگاکانی دەکرد لەسەر خۆم. ئاواتەخوازبووم کە خۆزگایە ئاوا سەیری نەکردمایە. هەروا دەستم دەلەرزی. زۆر پەرێشان بووم.

سەرم ڕاوەشاند، زۆرم لە خۆم کرد بۆ ئەوەی ویل تێبگەیەنم شتێك نییە بۆ ئەوەی بتوانم بیلێم. حەزم دەکرد دووبارە دەستی بگرمەوە، بەڵام دەمبینی کە ناتوانم ئەوکارە بکەم. ئاگام لە نیگاکانی بوو هەستم بەو پرسیارانە دەکرد کە نەیدەتوانی بەزاری بیانکات. لەخوارمانەوە دوو ئۆتۆمبیل لە نزیکی دەروازەکەوە وەستان. دوو کەس دابەزین. لەو شوێنەوە بەباشی نەماندەتوانی ببینین. باوەشیان بە یەکتریدا کرد. چەند خولەکێك لەوێدا وەستان، لەوانەیە بەیەکەوە قسەیان دەکرد، دواتر سوار بوون و بە ئاراستەی پێچەوانەی یەکیتری ڕۆیشتن. سەیریم دەکرد، بەڵام هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو، مێشکم لەکارکەوتبوو. نەمدەزانی باسی چی بکەم و چی بڵێم.

لە کۆتاییدا ویل گوتی:

—زۆر باشە.

ئاوڕیدایەوە، سەیری منی نەدەکرد. لە قسەکانی بەردەوامبوو:

شتێکت پێدەڵێم کە تاوەکو ئێستە بە هیچکەسێکم نەگوتووە. باشە؟

—باشە.

کلێنسەکەم لەناو دەستمدا گرمۆڵە کرد و چاوەڕوان بووم.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.

—من بە هەموو بوون و وجودی خۆمەوە خەمبارم کە ژیانی من ئەیەوێت چۆن و بەچ شێوەیەك بەردەوامبێت.

ساتێك وەستا، دواتر بە ئاوازێکی هێمن و گونجاو لە قسەکانی بەردەوامبوو:

—دەزانم زۆربەی مرۆڤەکان وادەزانن ژیان لە هەلومەرجی مندا خراپترین شتێکە کە دەکرێت بۆ هەرکەسێك بێتە پێشەوە و دروست ببێت. بەڵام خۆ دەکرا لەمەش خراپتر ببێت. دەکرا کارم بە جێگەیەك بگات کە نەتوانم بەبێ یارمەتی دەزگای هەناسەدان هەناسەیش هەڵبمژم. نەتوانم قسە بکەم. لەوانەبوو توشی کێشەکانی سوڕی خوێن ببم کە دەرئەنجامەکەی بڕینەوەی یەکێك لە ئەندامەکانی جەستەم بێت.دیارنەبوو کە تاوەکو کەی لەنەخۆشخانەدا بمێنمەوە. کلارك ئەوە ژیان نەبوو. کاتێك بیردەکەمەوە کە دەکرا چەندە لەمەش خراپتر بێت، هەندێك شەو کاتێك لەسەر جێگەکەم ڕاکشاوم بەهۆی ئەم بیرکردنەوانەوە هەناسەم توند دەبێت.

تفی دەمی قوتدایەوە.

–دەزانی هیچکەسێك ئامادە نییە لەمبارییەوە قسەیەك ببیستێت. کەس نایەوێت تۆ باسی ترس یاخود ئێش و ئازاری بۆ بکەیت، یان ئەوەی کە چەندە دەترسی هەوکردن دروست ببێت و بمریت. هیچکەسێك نایەوێت بزانێت چەندە خراپە کە ئیتر ناتوانیت لەگەڵ ژنێکدا بخەویت، ناتوانی بەدەستەکانی خۆت نانێك کە دروستتکردوە بیخۆیت. هیچکاتێك ناتوانیت منداڵەکەت لەباوەش بگریت. هیچکەسێك نایەوێت بزانێت کاتێك من لەناو ئەم کورسییە تایەدارەدام هەندێکجار توشی ترس دەبمەوە لە فەزای داخراودا. کاتێك بیری لێدەکەمەوە کە ڕۆژێکی تر دەبێت لەناو ئەم شوێنە نەفرەتیەدا بەسەر بەرم، حەز دەکەم هەروەك شێتەکان هاوار بکەم. دایکم بە تاڵەموێك بەندە و ناتوانێت من ببەخشێت کە هێشتا عاشقی باوکمم و خۆشم دەوێت. خوشکەکەیشم لێم بێزارەو گلەییم دەکات کاتێك ببینێت دووبارە خستومەتەوە ژێر کاریگەری خۆمەوە. چونکە ئێستە کەوتومەتە ئەم بارودۆخەوە ئیتر ناتوانێت ڕقی لێم بێت، هەروەك ئەو کاتانەی کە منداڵ بوین. باوکم تەنها ئەیەوێت لەم بارودۆخەی من ڕابکات. لە کۆتاییدا هەمویان ئەیانەوێت نیوەی پڕی پەرداخەکە ببینن. هەروەها ئەیانەوێت منیش هەروەك خۆیان نیوەی پڕی پەرداخەکە ببینم.

بێدەنگبوو. دواتر لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

–پێویستیشە بەوشێوەیە بیربکەنەوە، چونکە هەر بەڕاستی ئەو نیوەپڕەیش بوونی هەیە.

چاوم داخست و دواتر کردمەوە و بە ئاوازێکی گونجاوەوە گوتم:

–منیش؟

سەری داخست و واقی بە دەستی خۆیدا وڕما.

–لەوکاتەوە توشی ئەم چارەڕەشییە بووم، کلارك تۆ تەنها کەسێکیت کە هەست دەکەم دەتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم و ڕازی دڵی خۆمی پێبڵێم.

منیش قسەم بۆکرد.

دەستیمگرت، هەمان ئەو دەستەی کە لەناو ڕێزەوە هەزارو پێچ و قەمچەکاندا هێنامیە دەرەوە. سەرم داخست، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو هەموو چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو شەوەم بۆ گێڕایەوە. ئەوەی کە چەندە پێم پێکەنین و گاڵتەیان پێکردم و چەندە سەرمەست و نەشە بووم و چۆن بورامەوە و خوشکەکەم دواتر گوتبوی کە چ کارانێکیان کرد کە ئێستە لەبیرم نایەنەوە، هێشتایش ئەو بیرەوەرییانە ئازارم دەدەن. دەبینی کە هێشتا لەبیرمایە،

پێکەنینەکانیان، جەستەیان و قسەکانیان. هێشتایش هەست بە سەرشۆڕی و پەستی دەکەم. بە ویلم گوت کاتێك لە شار دوور دەکەومەوە، دەیانبینم، سەرەڕای هەموو کێشە و گرفت و سەختیەکانی، بەڵام لەدوونیا بچوکەکەی خۆم و پاتریك و باوك و دایکم زۆر ڕازیم. چونکە ئەوان دەبنە هۆی ئەوەی کە هەست بە ئارامی بکەم.

کاتێك قسەکانمان تەواو بوون، دوونیایش تاریکی کردبوو. چواردە نامە لەسەر شاشەی مۆبایلەکەم بوو. نیگەران بوبون ئاخۆ لەکوێ بین. ویل بە هێمنیەوە گوتی:

—نەڵێیت کە خەتای خۆت نەبوو.

ئاسمانی ڕاسەرمان فراوان و بێبن بوو.

کلێنسەکەم لەناو دەستمدا لول کرد.

—بەڵێ ویل. دەزانم هەڵەکە لە خۆمەوە بوو. زۆرم خواردبویەوە و خەریکبوو هەڵدەهێنایەوە، زۆر خراپ ئەدا و ئیتوارم لە خۆم نیشاندەدا، من....

—نەخێر خەتای ئەوانیشی تێدا بوو.

تاوەکو ئێستە کەس ئەمەی پێنەگوتبوم. تەنانەت لەو قیافەیەی کە ترینا لەڕوی دڵسۆزییەوە لەخۆی نیشانی دەدا، سەرزەنشتی تێدا هەبوو. (باشە، ئەگەر ئاوا خۆت مەست بکەیت و لەگەڵ پیاوانێکدا کە نایانناسی...) .

پەنجەی دەستی گوشیم. جوڵەیەکی لاواز بوو، بەڵام هەبوو.

—لوئیزا، تۆ تاوانێکت نەبوو.

دووبارە دەستمکردەوە بە گریان. ئەمجارەیان هەنسکە هەنسك نەبوو. هێدی هێدی فرمێسك لەچاوەکانمەوە دەهاتنە خوارەوەو پێیان دەگوتم لە شتێك ڕزگارم بووە. هەستم بە گوناح و ئەوشتانەی کە ناویانم نەدەزانی دەکرد. هێواش سەرم خستە سەرشانی. ویلیش سەری لارکردەوە تاوەکو لەسەرسەری من وەستا.

—گوێ دەگریت؟

لەژێر لێوەوە گوتم بەڵێ.

—ئێستە با شتێکی باشت پێبڵێم.

کەمێك وەستا، ئەیویست دڵنیاببێتەوە کە هەست و هۆشم لەلای ئەوە.

–هەندێك لە هەڵەكان.... پاشهاتێكی خراپتریان لەوانیتر هەیە. بەڵام ڕێگە مەدە كە ماجەراو بەسەرهاتی ئەو شەوە كاریگەری بكاتە سەر ژیانت.

لەتەنیشت سەرمەوە هەستم بەسەری دەكرد.

–تۆ تواناو ئازادی ئەوەت هەیە كە ڕێگە نەدەیت ئەمە دووبارە ببێتەوە.

بەدەنگی بەرز ئاهێكم هەڵكێشا كە دەنگم لەرزۆكی تێدابوو. لەناو بێدەنگیدا دانیشتین. بیرم لە قسەكانی دەكردەوە تاوەكو لە ماناكانیان تێبگەم. دەمتوانی تاوەكو بەیانی بەوحاڵەوە دابنیشم، جیاواز لە هەموو دوونیا هەست بەگەرمای دەستی بكەم لەناو دەستمدا و بزانم ئەو هەستە خراپەی كە لەبارەی خۆمەوە هەمە هێدی هێدی كاڵ دەبێتەوە.

لە كۆتاییدا گوتی:

–باشتر وایە بڕۆین. پێش ئەوەی كە گروپی شۆڤاری و جاسوسی بنێرن بە شوێنماندا.

بە بێ مەیلییەوە دەستیم بەردا و وەستام. هەستم بە شنەبایەكی فێنك دەكرد لەسەر دەموچاوم. بەوپەڕی ئاسودەییەوە دەستم بەرز كردەوە و قەوسێكم خستە جەستەمەوە. لەهەوای شەودا پەنجەكانم ڕێككردەوە و فشارو پەستانی هەفتەكان و مانگەكان و لەوانەیشە ساڵەكانم لەخۆم دوور خستەوە و هەناسەیەكی قوڵم هەڵكێشا.

لەخوارمەوە شار وریچەی دەهات. بازنەیەك لەڕووناكی چواردەوری ڕەشایی شاری گرتبوو. ئاوڕمدایەوە بۆلای ویل.

–ویل؟

–بەڵێ؟

دوونیا تاریكبوو زۆر بە ئاستەم دەمبینی، بەڵام دەمزانی كە سەیری من دەكات.

–سوپاست دەكەم سوپاست دەكەم كە دەركم دەكەیت و لێم تێدەگەیت.

سەری ڕاوەشاند و كورسییە تایەدارەكەی بەئاراستەی ڕێڕەوەكە ڕێنمایی كردو بردی.

## {١٨}

—دوونیای دیزنی[٢٩] باشه.

—خۆ من گوتم، پارکی گەشتیاری نا.

—دەزانم گوتت. بەلاّم تەنها شەمەندەفەری هەوایی و چەرخ و فەلەك نییە. لەناو فلۆریدادا ستۆدیۆی فیلم و ناوەندی زانستیش هەیە. بەڕاستی شتانێکی زۆری فێرکاری و پەندئامێزی تێدایە.

—باوەڕناکەم پیاوێکی سیی وپێنج ساڵە کە ڕۆژێك بەڕێوەبەری کۆمپانیا بووە، پێویستی بە شتە فێرکاری و پەند ئامێزەکان بێت.

—توالیتی تواناویستەکان لە هەموو کون و قوژبنێکیدا هەیە. کرێکارەکانیش ئاگایان لە هەموو شتێك هەیە. هیچ کێشەیەك دروست نابێت.

—بەدڵنیاییەوە دواتریش دەتەوێت بڵێیت کەرەستەی یاریکردنی تایبەت بە ئیفلیجە و کەمئەندامەکانیشی تێدایە کە دەتوانم سواری ببم، ئەرێ؟

—بۆ هەموو جۆرە هەلومەرجێك ئیمکانات و پێداویستیان هەیە. خاتوو کلارك، باشە بۆچی فلۆریدا تاقیناکەیتەوە؟ ئەگەر بەدڵت نەبوو، دەتوانیت بڕۆیت بۆ(سی ۆرڵد). ئاوو هەواکەیشی زۆر خۆشە.

—ویل لە تەنیشت و نزیکی نەهەنگە وەحشیەکاندا! من دەزانم کێ دەیدۆڕێنێت.

هەروەك بڵێی هەرگیز گوێی بۆ من نەدەگرت.

---

[٢٩] پارکێکی گەشتیاری و شین و ئاوی بەناو بانگی ئەمریکایە.

-یەکێکە لەباشترینی ئەو شوێنانەی کەتواناویستان دەتوانن بڕۆن بۆی. دەزانیت بۆ ئەوکەسانەی کە نزیکی سەرەمەرگن، یەکێکە لە باشترین ئەو دامودەزگایانەی کە ئارەزوی دەکەن ببینن؟

-خۆ ئەم لەسەرەمەرگدا نییە.

ویل هاتە ناو ژورەکەوە، منیش تەلەفۆنەکەم بەسەر کارمەندی ئاژانسەکەدا داخست. گۆشییەکە بەدەستمەوە بوو دەستەپاچە بوبوم. ناشیانە گۆشییەکەم خستەوە جێگەی خۆی و دەفتەری یاداشتەکەم داخستەوە.

-کلارك، هەموو شتێك باشە؟

زەردەخەنەم کرد.

-بەڵێ.

-زۆر باشە، جلوبەرگێکی گونجاوت لەبەردایە.

-چی؟

-چ بەرنامەیەکت بۆ ڕۆژی شەممە هەیە؟

چاوەڕوانی وەڵام بوو. بیرو زەینم بەلای نەهەنگە وەحشییەکان و کارمەندی ئاژانسەکەوە بوو.

-پاتریك بەدرێژایی ڕۆژ لەوێ نییە، ڕاهێنانی هەیە. بۆچی دەپرسی؟

پێش ئەوەی کە وەڵام بداتەوە، چەند ساتێك وەستا. هەروەك بڵێی پڕ بەدڵ خۆشحاڵبوو کە خەریکە سوپرایزم دەکات.

-ئەمانەوێت بچین بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری.

***

هیچکات بەوردی تێنەگەیشتم کە بۆچی ویل بیروڕای گۆڕی و بڕیاریدا بڕوات بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەی ئالیسیا و ڕۆپرت. گومانم دەبرد کە لەم بڕیارەیدا ملەجەڕێ و کەللە شەقی ڕۆڵێکی زۆری هەبێت، هیچکەسێك چاوەڕوانی ئەمە نەبوو، بەلایەنی کەمەوە خودی ئالیسیاو ڕۆپەرت هەرگیز چاوەڕوانی شتێکی لەمجۆرە نەبوون. لەوانەیشە ئەیویست پەیوەندییان لەگەڵدا دروستبکات. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا بە گومانی من، لەم چەند مانگەی کۆتاییدا، مەسەلەو

بابەتی ئالیسیا لەگەرم و گوڕی کەوتبوو ئیتر هێندەیش نەیدەتوانی ببێتە هۆی ئەزیەت و ئازاری دڵ و دەرونی ویل.

من و ویل وامانزانی کە بەبێ یارمەتی نیتن دەرەقەتی ئەم سەفەرە دێین، پەیوەندیم کرد بۆ ئەوەی دڵنیاببمەوە کە شوێنی ئاهەنگەکە گونجاوە بۆ کورسی تایەدار یان نا. وادیارە ئالیسیا کاتێك زانی بانگهێشتەکەیمان قبوڵکردووە توڕەو دەستەپاچە بوو، بەجۆرێکبوو ئەوەم بەمێشکدا هات کە ناردنی کارتی بانگهێشتی ئاهەنگەکەی بۆ ویل، تەنها وەك شتێکی ڕواڵەتی بووە و مەبەستی ئەوە نەبووە ویل ئامادە بێت. ئالیسیا بە دەنگێك کە وردە وردە لاواز دەبوو گوتی:

–تەنها چەند پلیکانەیەکی بچوکی هەیە. بەڵام کارمەندەکانی هۆڵەکە دەتوانن ڕەمپاکە تێپەڕێنن.

منیش گوتم:

–زۆر باشە. سوپاست دەکەم. ڕۆژی ئاهەنگەکە دەتانبینمەوە.

لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە دیارییەکمان کڕی و ئامادەمان کرد. ویل ١٢٠ پاوەندی بۆ چوارچێوەیەکی زیوینی وێنە تەرخان کرد و ٦٠ پاوەندیشی دا بەو گوڵدانەی کە دەیگوت (شتێکی زۆر بێمانایە). کاتێك بینیم بڕێکی وەهای بۆ کەسێك سەرف کردووە کە هەرگیز خۆشی ناوێت، زۆر سەرم سوڕما. بەڵام لە هەمان چەند هەفتەی یەکەمەوە کە ئیشم بۆ خانەوادەی ترینەر دەکرد، تێگەیشتبوم کە پێناسەی ئەوان بۆ پارە زۆر جیاوازترە لە پێناسەی من بۆ پارەو سامان.

بڕیارمدا کراسە سورەکەم لەبەربکەم، بەشێکی لەبەر ئەوەبوو کە دەمزانی ویل بەلایەوە جوانە(ئێستە دەمزانی هەر شتێك ڕۆحییەتی بەهێز دەکات دەبێ بەدەستی بهێنێت). لەلایەکیتریشەوە جلوبەرگێکی باشترو جوانترم نەبوو کە بتوانم لەوەها کۆڕو مەجلیسێکدا بەو پەڕی متمانەبەخۆ بونەوە لەبەری بکەم. ڕۆحی ویلیش ئاگای لەوە نەبوو کە من لە ئامادەبون لە وەها ئاهەنگ و مەجلیسێکدا خەم و واهیمەم هەیە، ئەوەی کە وەك پەرستار بڕۆم ئەوە جێگەی خۆی هەبوو. هەرکاتێك بیری چپەچپە ئازاردەرو نیگا زاقەکانی خەڵکیم بەرەو خۆمان دەکردەوە، پێمباشتر بوو کە لەبری بەشداری لەئاهەنگەکەدا بڕۆم و سەیری پاتریك بکەم کە

ڕادەکات. لەوانەیە لەبەر لاوازیم بوبێت کە گرنگیم بەمجۆرە شتانە دەدا، بەلأم خۆ بەدەستی خۆم نەبوو. بەبیرکردنەوە لەوەی کە میوانەکانیتر سەیری ئێمە دەکەن حالّم زۆر خراپ دەبوو.

هیچم بە ویل نەگوت. بەلأم نیگەرانیشی بووم. چون بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری کچە هاوڕێ پێشوەکەی لەحالّەتی ئاساییشدا کارێکی ئازارویستانەیە. بەلأم ئامادەبون لە کۆڕو کۆبونەوە گشتیەکاندا، شوێنێك کە پڕییەتی لە دۆستان و هاوکارانی کۆن و بینینی هاوسەرگیری هاوڕێی پێشوو، بەبڕوای من ئەوەی نیشاندەدا کە ویل کەوتوەتە سەر ڕێڕەوی بێتاقەتی و بێزارییەوە. ڕۆژێك پێش وادەی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکە هەولّمدا کە بەرنامەیەکیتر ڕێکبخەم. بەلأ ویل هیچ گوێیەکی پێنەدام و گرنگی بە گەلألّەکەم نەدا.

–کلارك، من خەمی هیچ شتێکم نییە، ئیتر بۆچی تۆ دەبێت نیگەران بیت؟

تەلەفۆنم بۆ ترینا کرد و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش تەنها قسەیەك کە کردی ئەمە بوو:

–سەیری کورسییەتایەدارەی بکە، نەوەك ڤایرۆسی برینی ڕەش یان مادەی تەقینەوە لەگەلّ خۆیدا ببات.

–یەکەمینجارە کە دەیبەم بۆ شوێنێکی وەها دوور. زۆر بەخراپی ترسم لێنیشتبوو تۆقیبوم.

–لەوانەیە تەنها ئەیەوێت ئەوەی لەبیرنەچێت کە شتانێکی خراپتر لە مردنیش بوونیان هەیە، تۆ بلّێی؟

–چەندە گالّتەجاڕانە!

–باشە، بەخۆشیتان بێت. ئەها، بەڕاست، ئەو کراسە سورە لەبەر مەکە. سینگ و بەرۆکەکەی زۆر پانوپۆڕو کراوەیە.

***

بەیانی ڕۆژی ئاهەنگەکە ئاسمان سامالّ و ڕۆژەکەی زۆر خۆشبوو، شتێك کە خۆم پێشتر دەمزانی. چونکە کچانێکی وەك ئالیسیا هەمیشە کاری خۆیان بەباشی لەکات و ساتی گونجاوو بێ گیروگرفتدا ئەنجامدەدەن. کاتێك ئەم قسەیەم لەگەلّ ویلدا کرد، گوتی:

–کلارك، خراپ ژەهری خۆتت ڕشت.

–لەکەسە باشەکانەوە فێر بووم.

نیتن زوتر هات بۆ ئەوەی ویل ئامادە بکات، هەربۆیە دەمانتوانی پێش کاتژمێر نۆ بەڕێبکەوین. بە ئۆتۆمبیل دوو کاتژمێر ڕێگە دەبوو، ئەڵبەتە بە حیسابکردنی وەستانەکانی قەراغ جادەوە. بەوردی هەڵسەنگاندنم بۆ ڕێگاکە کردبوو، بۆ ئەوەی دڵنیاببمەوە کە زۆرترین پێداویستی و ئیمکاناتمان لەبەردەستدایە. چومە ناو توالیت و گۆرەوییەکەم لەبەر کرد. تازە قاچ و پوزەکانم تاشی بوو. ماکیاژی دەموچاوم کرد، بەڵام دواتر لەترسی ئەوەی کە نەوەك پیاوە مەعقولەکانی ئاهەنگەکە وابزانن کە من کچێکی تەلەفۆنیم، ئارایشتەکەم کەمێك سڕی. بوێریم دایە بەرخۆم و دەستماڵم نەبەست بەدەوری گەردن و سنگمدا، بەڵام شاڵێکی سەرشانم هێنابوو بۆ ئەوەی کاتێك کە زیاد لە پێویست سەرنجی ئامادەبوانم ڕاکێشا، بیدەم بەسەر شان و سنگ و بەرۆکمدا.

نیتن لە کەنارێکەوە وەستاو گوتی:

—خراپ نەبووە، نا؟

ویلیش چاکەت و پانتۆڵی ڕەش و کراسی شینی لێڵی لەگەڵ بۆینباخدا لەبەر کردبوو ڕیشی ساف تاشیبوو. دەموچاوی کەمێك ڕەنگی برونزی گرتبوو. بەهۆی کاردانەوەی ڕەنگی کراسەکەوە چاوەکانی ڕوونتر دەهاتنەپێشچاوو وەك خۆر دەدرەوشانەوە.

—نەخێر خراپ نەبوو.

نەمدەزانی بۆچی نەمدەویست بڵێم بەڕاستی قۆز بووە.

—گومانت لەوەدا نەبێت پەشیمان دەبێتەوە لەوەی کە بۆچی دەبێت لەگەڵ ئەو خوێڕی و سەرسەرییەدا هاوسەرگیری دەکات.

ویل سەری بەرز کردەوە و گوتی:

—نیتن هەموو شتەکانت خستوەتە ناو جانتاکەوە؟

نیتنیش ئاوڕیدایەوە بۆلای ویل و گوتی:

—بەڵێ. هەموو شتومەکەکانم تێکردووە. ئێستە ئیتر ئامادەن بۆ ڕۆیشتن. تەنها ماچ و موچ لەگەڵ براو برازاو...هتد کانی زاوادا قەدەغەیە..!

من گوتم:

—هەر دەڵێی ئەمیش دەیویست ماچ و موچ بکات. یەخەی هەموویان چین چینە و بۆنی ئەسپ دەدەن.

باوك و دایكی ویل هاتن بۆ خوداحافیزی و بەڕێكردنمان. وادیاربوو هەر ئێستە شەڕیان كردبوو. خاتوو ترینەر بەجۆرێك دەەستا كە لەتەنیشت مێردەكەیەوە نەبێت. بەتوندی هەردودەستی خۆی لەسەر سنگی لێكئالآندبوو، تەنانەت كاتێك بەگمدانا بۆ ئەوەی ویل سوار ببێت، یەكجاریش سەیری نەكرد. بە منی گوتبوو:

—لوئیزا، ئاگاداربە لە خواردنەوەدا زیادەڕەوی نەكات.

بۆ نمونە خەریكبوو ڕیشووی سەرشانەكانی ویلی دەتەكاند. ویل گوتی:

—چ كێشەیەكی تێدایە؟ خۆ من شۆفێری ناكەم.

باوكی گوتی:

—بەڵێ، تۆ ڕاستەكەیت، من خۆیشم دەبێت یەك دوو پەرداخ هەڵبدەم تاوەكو بتوانم تاكۆتایی ئاهەنگەكە بەردەوامبم.

خاتوو ترینەر لەژێر لێوەوە و بەجۆرێك كە ببیسترێت گوتی:

—ئازیزەكەم، زۆر جوان بویت.

چۆكی داداو دەرقاچەی پانتۆڵەكەی ویلی ڕێك كرد.

—زۆر جوان و قۆز بویت.

لەپشتی سوكانەكەوە هاتمە دەرەوە، جەنابی ترینەر سەیرێكی پشتگیریكارانەی كردم و گوتی:

—تۆیش جوان و قەشەنگ بویت. زۆر برۆرە دڵی خەڵكییەوە. ئادەی لوئیزا ئێستە تۆیش خۆتمان بۆ بسوڕێنەرەوە. ویلیش كورسییەتایەدارەكەی خستە جوڵە.

—باوكە، درەنگە. با خێراتر بەرێبكەوین. باش نییە لەپاش چونی بوكێ بگەینە ئەوێ. هەناسەیەكی قوڵم هەڵكێشاو سواری سەیارەكە بووم و سوكانەكەم گرت. ویلیش سوار بوو. چاكەتە شیك و جوانەكەی ڕێكوپێك و ساف، بە گیرەی كورسییەكەوە هەڵواسرابوو بۆ ئەوەی چرچ نەبێت. بەرێكەوتین. دەمتوانی ڕێك پێتان بڵێم كە ماڵی دایكوباوكی ئالیسیا چ جۆرە شوێنێكە، جۆرێكبوو هەروەك بڵێی پێشتر چوبوم بۆ ئەوێ. لە ڕاستیدا كاتێك ئۆتۆمبیلەكەم هێواش كردەوە، خەیاڵپەردازییەكەم هێندە بەهێزبوو كە ویل پرسی بۆچی پێدەكەنم. ماڵی قەشەی ناوچەكە، بەشێوازی سەدەی هەژدەیەم، بە پەنجەرەی ستونییەوە كە بەشێكیان جۆرێك لە چنگەپشیلە دایپۆشیبون و ڕێڕەوی ئۆتۆمبیلەكە بەسەر ڕەسیفێك بەردی ڕەنگ

نۆكیدا دەڕۆیشت، وەك خانویەكی زۆر گونجاو وابوو بۆ ئەفسەری سوپا. تەنانەت دەمتوانی ئەو بهێنمە پێشچاوی خۆم كە لەناو ئەو ماڵەدا گەورە بووە، بە دوو ئەگریجەی درێژی ڕەنگ ئاڵتونیەوە، لەسەر چیمەن و گژوگیاكە سواری یەكەمین ئەسپی قاچقوڵی خۆی بووە.

دوو كەس بە پەسەكی بێ قوڵی تاریكەوە ئۆتۆمبیلەكەیان بەرەو شوێنێكی نێوان ماڵەكەو كڵێساكەی تەنیشتی ڕێنمایی دەكرد. جامەكەم دادایەوە و پرسیم:

–لەتەنیشت كڵێساكەوە شوێنی وەستان هەیە؟

–خاتون، میوانەكان لەملایەوە.

–ئێمە كورسی تایەدارمان هەیە. لێرەدا و لەناو ئەم چیمەنەدا دەچەقێت. دەبێت شوێنێك بێت لە نزیكی كڵێساكەوە. من دەچم بۆ ئەو شوێنە.

دوو پیاوەكە سەیرێكی یەكترییان كرد و چپەیەكیان كرد. پێش ئەوەی كە شتێك بڵێن، من ڕۆیشتم و لەتەنیشت كڵێساكەوە ئۆتۆمبیلەكەم ڕاگرت، شوێنێك كە لەبەرچاوان نەبوو. بە خۆمم گوت دەستپێكرد. سەیارەكەم كوژاندەوە. لەئاوێنەكەی پشتەوە من و ویل چاومان بەیەكتری كەوت.

–كلارك، هێمن بەرەوە، هیچ شتێك ڕوونادات.

–بێخەم و ئاسودەم، بۆچی وابیردەكەیتەوە كە بەوشێوەیە نیم؟

–لەبەر ئەوەیە كە قیافەو سەروسیمات بەئاشكرا هاوار دەكات. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو ماوەیە كە شۆفێریت دەكرد، زۆر نینۆكت دەجوی.

–باشە، ئەمڕۆ كامە یاری دەكەین؟

ویل شوێنی نیگاكەم كەوت.

–ڕاستیەكەی بڵێم؟

–بەڵێ، دەبێت بزانم. تكایە مەڵێ (شوك و بهت). بڵێ بزانم چ نەخشە و پیلانێكی مەترسیدارت كێشاوە؟

چاوەكانی ویل لەچاوی من ئاڵان، چاوە شین و ئاماژەییەكانی كە نەدەكرا هیچ شتێكیان لێ بخوێنرێتەوە. دڵم زۆر خراپ هەروەك سیرو سركە جۆش و خرۆشی بوو.

–كلارك، ئێمە ئەمڕۆ وەك مرۆڤ هەڵسوكەوت دەكەین، بەجۆرێك كە هیچكەسێك باوەڕ نەكات.

دڵەخورپەم زیاتر بوو، هەروەك بڵێی لەناو دڵمدا پێخەف دەشۆن. ویستم شتێك بڵێم، بەڵام خۆی فرێدایە ناوەڕاستی قسەکانەوە و گوتی:

—سەیرکە، هەرکارێك کە بەلامانەوە خۆش بێت ئەنجامیدەدەین.

بەڕواڵەت چوون بۆ ئاهەنگی بوکێنی کچە هاوڕێ پێشوەکەی، ئێش و ئازارەکەی وەك نەشتەرگەری روت کانال وایە. بە هەرحاڵ ئەوە خواستی خۆی بوو. ڕۆژی خۆی بوو. هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا و هەوڵمدا خۆم کۆنترۆڵ بکەم.

بۆ چواردەیەمینجار سەرشانەکەم ڕێك کرد و گوتم:

—بەیەك ئاراوتە(استثناء).

—چی؟

—ئەگەر بتەوێت لاسایی کریستی براون بکەیتەوە، من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و تۆ لێرەدا و لەگەڵ ئەم سەرزلانەدا بەجێ دەهێڵم.

ویل بەڕێکەوت بەرەو کڵێساکە ڕۆیشت. گوێم لێبوو کە گوتی (جەوگیر).

هیچ کێشەیەك دروست نەبوو ئێمەیش دانیشتین. هەروا کە بیرم لێدەکردەوە بەڕاستی ئالیسیا جوان بوبو. پێستە قاوەیی ڕەنگەکەی دەدرەوشایەوە. کراسە ئاوریشمیە شیرییەکەی بەری، لەش ولارە ناسکەکەی دادەپۆشی و پڕ بەبەری بوو. هەروا کە لەناو ڕیزی مێزەکانەوە تێدەپەڕی، سەیرم کرد. لەخۆمم پرسی بالآی بەرز و قاچانێکی ئاوا گەورە چ هەستێك بە مرۆڤ دەدات، هاوشێوەی ئەوەم زیاتر لەناو پۆستەرەکانی ڕیکلامدا بینیبوو. حەزم دەکرد بزانم لەژێر جلەکانیەوە جلوبەرگی تایبەت بە هێنانەوەیەکی ورگ و کەلەکەی بەکارهێناوە یان نا. بەدڵنیاییەوە جلوبەرگێکی ناسکی ژێرەوەی لەبەرکردبوو خۆی کاری جلوبەرگی هێنانەوە یەکی ورگ و کەلەکەی دەکرد و پێویستی بە لەبەرکردنی شتێکی زیادە نەبوو. لەوجۆرانەی کە نرخەکەی هێندەی موچەی یەك هەفتەی من دەبێت.

کاتێك قەشەکە جەلەحانێی دەکرد، کوڕانی بچوکی خزم و نزیکی بوکێ بە پێڵاوی بالەوە لەسەر کورسییەکان دانیشتبون و بەملاو ئەولادا دەیانڕوانی، منیش سەیرێکی چواردەوری خۆم و هەموو میوانەکانم کرد. هەموو ژنەکان وەك ئەو ژنانە بوون کە مرۆڤ لەناو لاپەڕەکانی گۆڤارە لوکسەکاندا دەیانبینێت. ڕەنگی پێڵاوەکانیان ڕێك وەك ڕەنگی جلوبەرگەکانیان بوو. هەروەك بڵێی جاری یەکەم بوو کە لەبەریان بکەن. ژنە گەنجەکان پێڵاوی پاژنەبەرز و دە دوازدە

سانتیمەترییان لەپێدابوو بە شێوەیەکی زۆر جوان بۆیاخی نینۆکەکانیان کردبوو. ژنە بەتەمەنترەکانیش پێڵاوی پاژنە سێ بۆ چوار سانتیمەتری و چاکەت و پانتۆڵی دوخت جوان بە سەرشانگەلی ئەپڵدارو بەتانەی ئاوریشمیان بە ڕەنگی جۆراوجۆر پۆشیبوو، کڵاویشیان لەسەر کردبوو، هەروەك بڵێی چاوەڕوانی کەسێك بوون بۆ ئەوەی ڕوبەڕوی بارودۆخێکی خراپ و نەخوازراو ببنەوە.

پیاوەکان کەمتر سەرنجی مرۆڤیان ڕادەکێشا، بەڵام هەمویان هەست و حاڵێکیان هەبوو کە من هەندێکجار لە ویلدا دەمبینی، وەك سەروەت و سامان و متمانە و کەسایەتی، لەگەڵ ئەو هەستەی کە ڕۆژگار هەمیشە بەدڵی ئەوان دەسوڕێت. بیرم لەو کۆمپانیایانە دەکردەوە کە بەڕێوەیان دەبردن و ئەو دوونیایەی کە ئەوان تێیدا دەژیان. حەزم دەکرد بزانم سەرنج دەدەنە کەسانێکی وەك من، چ کەسێك چاودێری و پەرستاری لە منداڵەکانیان دەکات، یان لە چ ڕیستورانێکدا نان دەخۆن. یان چ کەسانێك بۆ هاوکارانی بازرگانیان سەمای میلە دەکەن. بیری ئەو چاوپێکەوتنەم کەوتبویەوە کە لە بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزیدا ئەنجاممدا.

ئەو ئاهەنگانەی کە من دەچووم، بەزۆری خزمانی بوك و زاوایان بەجیا لەیەکتری دادەنیشاند، لەترسی ئەوەی کە نەوەك کەسانی فزول و گێرەشێوێن شتێکی نالەبار بکەن.

مەراسیمی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە تەواو بوو، ویلیش ملی ڕێگای بەرەو دەرگای دەرچونەکە گرتەبەر. منیش لە پشتەوە سەیرم دەکرد، زۆر بەڕێزو شەریف و زۆریش بە ویقارو خاوەنی مەتانەت بوو. حەزم دەکرد بپرسم ئێستە کە هاتووە، هێشتایش وابیردەکاتەوە کە ئامادەبونی لەم ئاهەنگی بوکێنیەدا کارێکی دروست بووە یان ئێستە پەشیمانە. ئایا هێشتایش هەستی بەرامبەر بە ئالیسیا هەیە؟ حەزم دەکرد پێی بڵێم کە ئەم زۆر لەو ژنە پێست قاوەییە بێ ئەقڵە زیاتر بوو. ئێستە ئیتر خەڵکی ڕواڵەت بین هەرچیان دەگوت با بیڵێن. شتانێکیتری زۆریش هەبوون کە حەزم دەکرد بە ناوبراویان بڵێم.

مەبەستیشم تەنها ئەوە بوو کە ڕۆحیەت بە ویل بدەم.

بە ویلم گوت:

—تۆ باشی؟

لەگەڵ هەموو ئەم شتانەدا، بابەتی سەرەکی خودی خۆی بوو لەگەڵ هەستەکانیدا. چەندجارێك چاوی داخست و کردییەوە و گوتی:

—باشم.

بەجۆرێك هەناسەی دەردایەوە كە هەروەك بڵێی ماوەیەكبوو هەناسەی خۆی گرتبوو. سەری بەرز كردەوەو سەیری كردم.

—وەرە بابڕۆین و خواردنەوە بخۆینەوە.

شوێنی ئاهەنگەكە شوێنێكی سیاجدار بوو، دەرازەیەكی ئاسنینی گوڵ شەبەكەیی هەبوو كە بۆیاخی پەمەییان كرابوو. بارەكە لە كۆتایی شوێنەكەدا بوو پر بوو لە خەڵكی. بەناو مێزەكاندا تێپەڕیم كە پەردەیەكی كەتانیان درابوو بەسەرداو پڕبون لە چەقۆو چەتاڵ و دەفری شوشەیی كە لەتەمەنمدا نەمبینیبون. كورسییەكان پشتێكی ئاڵتونیان هەبوو، لەو مۆدێلانەی كە مرۆڤ لەناو هۆڵی مۆدەكاندا دەیبینێت. فانۆسێكی سپی لەسەر گوڵە سەوسەنەكان و فریزیایەك لەناوەڕاستی مێزەكانەوە شۆڕ بوبویەوە. فەزاكەیش پڕ بوو لە بۆنی خۆشی گوڵەكان. هەر بەڕاستی هەستم دەكرد خەریكە دەخنكێم. كاتێك سەرەم هات بە كابرای بارەكەم گوت:

—بێزەحمەت دوو دانە.

پیاوەكەیش زەردەخەنەیەكی كرد و گوتی:

—دواتر هەموو جۆرە خواردنەوەیەك پێشكەش دەكرێت، خاتوو (دوان) گوتیان كە بەم خواردنەوەیە دەستپێبكرێت.

حاڵەتی سەیركردنەكەی بۆ من كەمێك ڕەمزی و شاراوە بوو. لەو برۆیەی كە بەرزی كردەوە، زانیم كە لە بیرو زەینیدا چی دەگوزەرێت.

سەیری خواردنەوەی لیمونادی پەمەییم كرد. باوكم دەیگوت دەوڵەمەندەكان لە هەموو كەسێك ڕەزیل و چروك ترن. بەڵام من سەرم سوڕما كاتێك بینیم پێشوازی ئاهەنگەكەیان بە كحول دەستپێنەكردووە. پەرداخەكانم وەرگرت و گوتم:

—هەر دەبێت خواردنەوەی تر پێشكەش بكرێت.

ویلم بینی كە قسەی لەگەڵ كەسێكدا دەكرد. پیاوێكی چاویلكە لەچاوی گەنجی كەمێك چەماوە بوو، دەستیشی خستبویە سەر كورسییە تایەدارەكەی ویلەوە. ئێستە خۆر بەرز بوو منیش ناچار بووم چاوەكانم كۆ بكەمەوە تاوەكو بتوانم بەباشی ببینم. ئەوكات بوو كە سودی كڵاوە شەبقەییەكانم بۆ دەركەوت.

پیاوەكە خەریكبوو دەیگوت:

–چەندە باشە کە دووبارە دەتبینمەوە. نوسینگەکە بەبێ تۆ هیچ خۆشی و سەفایەکی نییە... بەڕاستی ئیتر وەك پێشوو نییە.

وەك ژمێریارەکان بوو. هەر ژمێریارەکان بوون کە بە چاکەت و پانتۆڵ ڕاهاتبون و ئیسراحەت بوون تێیدا.

–ئەوپەڕی لوتفی جەنابتە کە ئەمە دەڵێیت.

–کەشوهەواکە زۆر خراپ نائاسایی بوو، هەروەك بڵێی لە تاشەبەردەوە بەربویتە خوارەوە. ڕۆژێك تۆ لەوێ بویت و بەڕێوەبەر بویت، ڕۆژێکیش ئێمە دەبێت...

هەرکە بە منی زانی، سەری بەرزکردەوە و گوتی:

–ئۆو، سلاو.

لوئیزا کلارك، ئەمەش (فردی درونت)ە.

پەرداخەشەرابەکەی ویلم خستە شوێنی تایبەتی پەرداخی کورسییەتایەدارەکەی ویلەوەو تەوقەم لەگەڵ پیاوە گەنجەکەدا کرد. پیاوەکەش گۆشەی بینینی بەرامبەر بە خۆرەکە گۆڕی. دووبارە گوتی:

–ئۆو.

گوتی:

–یەکێك لە هاوڕێکانی ویلم.

دواتر نەمزانی بۆچی دەستم خستە سەرشانی ویلەوە. فردی درونت بە پێکەنینێکەوە کە زیاتر لە کۆکە دەچوو، گوتی:

–لەگەڵ هەموو ئەم شتانەدا وادیارە ژیان زۆر خراپیش نییە.

بە گوتنی ئەم قسەیە کەمێك دەموچاوی سور بویەوە.

–بە هەرحاڵ.... دەبێت تێکەڵی بکەیت. خۆ تۆ ئەمشتانە باش دەزانیت. ئەمەش هەلێکە بۆ دروستکردنی پەیوەندی کاری لەناو کۆڕو کۆمەڵی هاوڕێیاندا. ویل بەڕاستی زۆر خۆشحاڵ بووم بە بینینت. هەروەها تۆیش خاتوو کلارك.

خوداحافیزیمان کرد و بەڕێکەوتین. گوتم:

–بەڕواڵەت کەسێکی باش بوو.

دەستم لەسەرشانی ویل لابرد و پەرداخەکەم هەڵقوڕاند. بەتامتر بوو لەوەی کە بەڕواڵەت دیاربوو. خەیارەکەی زۆر نەهاتە ژێر زمانەوە.

—بەڵێ، بەڵی کوڕێکی باش بوو.

—بەبینینت دەستەپاچە نەبوو.

ویل سەری بەرز کردەوە، ڕوناکییەکە دەیدا لە چاوەکانی. سەیری کردم و گوتی:

—نەخێر هەرگیز دەستەپاچەیش نەبوو.

ئێستە فردی درونت هاتوەتە پێشەوە و چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسی لە ویل کردبوو، خەڵکانێکی زیاتر بوێرییان پەیدا کرد و هاتن بۆ سلاّوو ئەحواڵ پرسین. تاوەکو یەك سەعات دواتر هەروا خەڵکانێکی جیاواز دەهاتن بۆ لای ویل. هەندێك بەمەودا دەوەستان، بەمکارەشیان بەدڵنیاییەوە کێشەی تەوقەکردنیان لەگەڵ ویلدا چارەسەر دەکرد. هەندێکیش سەرئەژنۆی پانتۆڵەکەیان بەرزدەکردەوە و هاوئاست لەگەڵ ئاستی کورسییە تایەدارەکەدا جیجکانیان دەدا. من لە تەنیشت ویلەوە وەستام. بێدەنگ بووم و هیچم نەدەگوت. دواتر بینیم بە نزیکبونەوەی دووکەس، ماسولکەی ویل هاتنەوە یەك و گرژ بوون.

یەکێك لەو دووکەسە، پیاوێکی بالاّبەرزو جگەرە بەدەم بوو، کاتێك لەبەرامبەر ویلەوە وەستا، نەیدەزانی چی بڵێت. لە کۆتاییدا ئەم ڕستەیە لە دەمی دەرچوو:

—چ ئاهەنگێکی باشە، ئەی وانییە؟ بوکەخانیش زۆر جوان بووە.

وادیاربوو لە ڕابوردوی عەشقی ئالیسیا ئاگادار نەبوو.

دووەمیشیان کە بە ڕکابەری بازرگانی ویل دەهاتەپێشچاو، مامەڵەیەکی سیاسەتمەدارانەی کرد. لەگەڵ ئەمەشدا نیگا واقەکەی بە ویلدا و ئەو پرسیارە پەی بردوو شەفاف و ڕونانەی کە لەبارەی بارودۆخییەوە پرسی، دەمبینی ویلی توڕە کردووە. وەك دوو سەگ بوون کە بەدەوری یەکتریدا دەسوڕانەوەو بیریان لەوە دەکردەوە ئایا مۆرە لەیەکتری بکەن و ددانەکانیان نیشانبدەن یان نا.

کاتێك لە کۆتاییدا پیاوەکە دەستی ڕاوەشاند و ڕۆیشت، ویل گوتی:

—ئەوە بەڕێوەبەری گشتی ئەو کۆمپانیایەبو کە کارم تێدا دەکرد. دڵنیابوم کە تەنها دەیویست لەوە دڵنیاببێتەوە کە بەرنامەیەکم بۆ کڕینی پشکی زیاتر نییە، بۆ ئەوەی کۆمپانیاکە بخەمە ژێر کۆنترۆڵی خۆمەوە.

ئالیسیا ئەو ڕومەت جوانە ئاسمانییەی کە لەوناوەدا دەسوڕایەوە و بە جۆش و خرۆش و هەیەجانەوە ماچی هەوایی ئامادەبوانی دەکرد، هەرگیز نزیکی ئێمە نەبویەوە.

ویل دوو پێکی خواردەوە، سەیریم دەکرد و لەناخی دڵەوە خۆشحاڵ بووم.

***

نانی نیوەڕۆ کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ پێشکەش کرا. بەبڕوای من کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ نانی نیوەڕۆ، بەڵام هەربەوجۆرەی کە ویل چپاندی بە گوێمدا، ئاهەنگی بوکێنی هەروایە. هەروەك بڵێی کات کێشی هاتبوو. لەگەڵ ئەمەشدا، بەبێهودە و بێمانا کاتەکە تێدەپەڕی. پەرداخە تەواونەکراوەکانی خواردنەوە و قسەو باسە بێ کۆتاو نەبڕاوەکان وایاندەکرد کە هەست بە تێپەڕینی کات نەکرێت. نازانم لەبەر گەرمابوو یان بارودۆخی ئەو شوێنە بوو کاتێك گەیشتینە سەر مێزەکەمان هەستم بە سەرمەستی دەکرد. کاتێك بینیم خەریکی زۆربڵێیم لەگەڵ پیاوە بەتەمەنکەی لای چەپمدا، لەبەر خۆمەوە گوتم بەدڵنیاییەوە مەست بووم.

لەپاش ئەوەی کە خوێدانەکەم ڕژاند بەسەر قاچمدا، پرسیارم لە ویل کرد و گوتم:

—ئایا خواردنەوەکە کهولی تێدا بوو؟

—هێندەی یەك پەرداخ شەراب لەناو هەر پیاڵەیەکدا هەبوو.

بە ترسەوە سەیریم کرد. خۆیشی سەری سوڕما.

—گاڵتە مەکە، میوەی تێدا بوو! وامزانی کهولی تێدا نییە. ئێستە چۆن تاوەکو ماڵەوە شۆفێری بکەم؟

ویل گوتی:

—تۆ چ پەرستارێکیت!

برۆکانی بەرزکردەوە و لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—چیم بۆ دەکەیت ئەگەر ئەمە بەدایکم نەڵێم؟

لەو ڕەفتارەی کە ویل بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لە خۆی نیشانی دەدا توشی شۆك بوبوم. وامزانی لە درێژایی ئاهەنگ و مەراسیمەکەدا ویل کەمتر قسە دەکات، ئەگەریش قسە بکات تەنها ئەیەوێت مەتەڵ بڵێت. یان بەلایەنی کەمەوە مۆری بێدەنگی لە دەمی دەدات و قروقپ دەکات. بەڵام ویل ڕوخۆشی لە خۆی نیشاندەدا و لەگەڵ هەمواندا گەرم و گوڕ بوو. تەنانەت کاتێکیش سوپەکەیان هێنا، هەر بێتاقەت نەبوو. بە ئەدەبوە پرسی ئایا کەسێك هەیە کە سوپەکەی ئەم

لەگەڵ ناندا بگۆڕێتەوە. دوو کچ کە لە کۆتایی مێزەکەوە دانیشتبون، گوتیان کە گەنم بۆ ئەوان باش نییە، نانەکەی خۆیان نارد بۆ ویل.

هەرچی نیگەرانی من زیاتر دەبوو، لەوەی کە چۆن ئەم مەستیە لەسەرمدا نەمێنێت. بەڵام ویل بێخەمتر و سەرخۆشتر دەبوو. ژنی بەتەمەنی مەستی لای ڕاستی ویل نوێنەری پێشوی ئەنجومەن بوو لەبواری مافی تواناویستاندا چالاکی و کاری کردبوو. لەو ژمارە کەمەی خەڵکی بوو کە بینیم لەکاتی قسەکردن لەگەڵ ویلدا یەك تۆسقاڵ بێتاقەت نەبوو. جارێکیش بینیم کە پارچەیەك گۆشتی (برشی رولاد)ی[30] خستە دەمی ویلەوە. کاتێك ژنەکە ساتێك لەسەر مێزەکە ڕۆیشت، ویل لەژێر لێوەوە گوتی کە ئەو یەکجار چووەتە سەر لوتکەی کلیمانجارو. ویل گوتی:

– من عاشقی ئەم کەسە بەجەرگە پیرانەم. دەتوانم بە هێسترو ساندەویچەوە بیهێنمە پێشچاوی خۆم. بەهێزو تۆکمە هەروەك پۆتین و پۆستاڵە کۆنەکان.

سەبارەت بە پیاوی لای چەپم شانسێکی کەمم هێنابوو. چوارپێنج خولەکێك پرسیارو وەڵامی لێکردم کە کێم، لە کوێوە هاتوم و میوانی کامە لایانم، تاوەکو دواتر زانی قسەیەکم پێ نییە کە بەلای ئەوەوە سەرنجڕاکێش بێت. ئەوکات ئاوڕیدایەوە بۆلای ژنەکەی لای ڕاستی خۆی ڕێگەی پێدام کە سەردابخەم و پاشماوەی خواردنەکەم بخۆم. وردە وردە نیگەرانیم زیاتر دەبوو، دڵەخورپەیەکی توندم هەبوو. کتوپڕ بینیم کە دەستی ویل لە کورسی تەنیشتمەوە هاتە پێشەوە و کەوتە سەر دەستم. سەرم بەرزکردەوە و چاوێکی لێداگرتم. دەستیم گرت و توند گوشیم. خۆشحاڵ بووم کە دەتوانێت هەستبکات. دواتر ویل بە کورسییەتایەدارەکەیەوە چەند سانتیمەترێك چویە دواوە و منیش ڕێگەی خۆم بۆ قسەو گفتوگۆ لەگەڵ (مری رولینسن)دا کردەوە.

–ویل گوتویەتی کە چاودێری لە ئەستۆی تۆدایە.

چاوانێکی شینی تیژی هەبوو ئەو چرچ و لۆچانەی کە نیشانیاندەدا بەدرێژایی تەمەنی پارێزگاری لە پێستی دەموچاوی کراوە.

سەیرێکی ویلم کرد و گوتم:

–هەوڵی خۆم دەدەم.

---

[30] پارچە گۆشتێکە کە دەیپێچن بەدەوری گشتی قیمەکراوو گۆشتەکانیتردا و دەیبرژێنن.

—بەگشتی لەم بوارەدا کار دەکەن؟

—نەخێر، پێشتر لەناو قاوەخانەدا کارم دەکرد.

لەبیرم نایەتەوە ئەو ڕۆژە ئەم قسەیەم بۆ کەسێکیتر کردبێت. مری رولینسن وەك نیشانەی بەڵێ سەری ڕاوەشاند.

گوتی:

—من هەمیشە پێموابووە کارێکی سەرنجڕاکێشە. بەتایبەت ئەگەر مرۆڤ خەڵکانیتری خۆشبوێت و کەمێکیش سەری لەناو کاری خەڵکیدا بێت، کە من بەمجۆرەم.

ویل دەستی لەسەر دەستم لابرد.

—هەمیشە خەریکم هانی لوئیزا دەدەم کە کارانێکیتریش بکات، دیدو دونیابینی فراوانی هەبێت و ئاسۆی بیرکردنەوەکانی فراوان بکات.

مری رولینسن لێی پرسیم:

—شتێکت لەبیرو زەیندا هەیە؟

ویل گوتی:

—نەخێر، هیچ شتێك لەناو بیرو زەینیدا نییە. لوئیزا یەکێکە لەو مرۆڤە هۆشیارانەی کە لەتەمەنمدا بینیومە. بەڵام هەرچی دەکەم ناتوانم ئەوەی فێربکەم کە هەلەکانی ژیانی لەدەستنەدات.

مری رولینسن سەیرێکی توندی ویلی کرد.

—ئازیزم، تۆ پارێزگاری و پشتیوانی لێ مەکە. خۆی دەزانێت وەڵامبداتەوە.

چاوێکم داگرت، ژنەکەیش لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—وابزانم تۆ خۆت ئەمشتانە بزانیت.

ویل دەمی کردەوە بۆ ئەوەی شتێك بڵێت، بەڵام دواتر دەمی داخستەوە. چاوی بڕییە مێزەکە و کەمێك سەری ڕاوەشاند. بەڵام زەردەخەنەی بەسەرلێوەوە بوو.

—باشە، لوئیزا، پێموابێت کارەکەت ووزەیەکی فیکری زۆرت لێ ببات. باوەڕناکەم ئەم پیاوە گەنجەیش موشتەرییەکی بێ ئازار بێت.

—بەڵێ هەروایە.

–بەڵام ویل ڕاستدەکات کە دەڵێت هەلەکانی ژیانت لەدەست مەدە. ئەمە کارتەکەی منە. من ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری دەزگایەکی خێراخوازیم، کە کاری سەرلەنوێ فێرکردنەوە و ڕاهێنانەوە دەکات. لەوانەیە حەزبکەیت دواتر بەشوێن کارێکیتردا بگەڕێیت و کارێکیتر بۆ خۆت بدۆزیتەوە.

–مەمنونم، ئێستە جارێ لەکارکردن لەگەڵ ویلدا زۆر ڕازیم. مات و بێدەنگ بوبوم، ئایا بەڕاستی یەك تۆسقاڵ بۆ ئەم ژنە گرنگە کە من خەریکم چی لە ژیانی خۆم دەکەم. کاتێك کارتەکەیم وەرگرت هەستم بە دەغەڵبازی کرد. تەنانەت ئەگەر بشمزانیایە کە ئەمەویت چ ڕۆڵێك بگێرم، ئەوا هەرگیزو بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی واز لەکارەکەم بهێنم. لەلایەکیتریشەوە لە خۆمم ڕانەدەبینی کە بتوانم لە خوێندن بەردەوام بم. سەرەڕای هەموو ئەمانەیش بە زیندوهێشتنەوەی ویل لە پێشینەی هەموو کارەکانم بوو. بەجۆرێك بەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بوبوم کە دەتوانم بڵێم تاوەکو ئاستێکی زۆر ئاگام لە قسەکانی دوو کەسەکەی تەنیشتم نەبوو.

–....چەندە باشە کە کێشەکانت تێپەڕاندووە. دەزانم چەندێك ئازارت کێشا تاوەکو توانیت خۆت لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکانتدا بگونجێنیت.

سەیری دەفری خواردن و پاشماوەکەی ماسییە کوڵاوەکەم دەکرد. تاوەکو ئێستە نەمبینیبوو کەسێك بەمجۆرە قسە لەگەڵ ویلدا بکات.

ویل برۆکانی هێنایەوە یەك و واقی بەبەرامبەری خۆیدا وڕما. دواتر ئاوڕدایەوە بۆلای ژنەکە و بە ئاوازێکی هێمنەوە گوتی:

–باوەڕناکەم کێشەکانم تێپەڕاندبێت.

ژنەکەیش ساتێك چاوی بڕییە ناوبراو، سەیری منیشی کرد. نازانم ئایا شتێکی لە قیافەم خوێندەوە یان نا. دەستی خستە سەر بازۆڵەی ویل و گوتی:

–ویل، هەموو شتێك پێویستی بەکات هەیە. خاڵێك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم نەوەیەی ئێوە زۆر بەئاستەم دەتوانێت خۆی لەگەڵیدا ڕابهێنێت و بگونجێت. ئێوە هەموتان بە حەوت مانگی لەدایکبون و بەم چاوەڕوانییەوە گەورەبوون کە دەبێت بارودۆخەکان یەکسەر بەپێی ویست و خواستی ئێوە بن. هەموتان چاوەڕوانی ئەوەن کە ژیان بەپێی حەزو مەیلی ئێوە بەرەوپێشەوە بچێت. بەتایبەت پیاوێکی گەنج و سەرکەوتوی وەك تۆ. بەڵام خۆ ئەمە پێویستی بەکات هەیە.

ویل گوتی:

—خاتوو رولینسن مری، من چاوەڕێی چاکبونەوە نیم.

—مەبەستم لایەنی جەستەیی نییە. خەریکم ئەوەت پێدەڵێم مرۆڤ دەبێت ئەوە فێر ببێت کە بەسنگێکی کراوەوە ژیانی نوێی خۆی قبوڵبکات.

هەروا کە چاوەڕوانبوم بزانم ویل چ وەڵامێك دەداتەوە، دەنگی بەرزی لێدانی کەوچك بە پەرداخەکەدا هاتە بەرگوێ، هەموان بێدەنگبون بۆ ئەوەی گوێ بۆ وتارەکە بگرن.

سەرنجێکی ئەوتۆم نەدایە قسەو ووتارەکە. پیاوەکان بە چاکەت و پانتۆڵی ڕەش و کراسی سپییەوە، یەك لەدوای یەك دەهاتن و باسی خەڵکانێك و کۆمەڵێك شوێن و جێگەیان دەکرد کە بەلای منەوە ئاشنا بوون. ئامادەبوانیش بەوپەڕی ئەدەبەوە پێدەکەنین. منیش دانیشتم و یەك بەستە چوکلێتی تاڵم خوارد، کە بە سەبەتە زیوییەکانەوە هێنابویانە سەر مێزەکان. لەپاشان سێ کوپ قاوەیشم خواردەوە. بێجگە لە مەستی، تووڕە و شڵەژاویش بووم. ویل دیمەن و دیاردەی خامۆشی و بێدەنگی بوو. بێدەنگ دانیشتبوو سەیری میوانەکانی دەکرد، کە چەپڵەیان بۆ کچە هاوڕێکەی پێشوی لێدەدا. گوێی بۆ قسەکانی ڕوپرت گرت کە خەریکبوو باسی بێوێنەبونی ئالیسیای دەکرد. زۆر گرنگیان بە ویل نەدا. نازانم لەوانەبوو بیانەوێت هەستەکانی بریندار نەکەن، لەوانەیشە ئامادەبونی لەو شوێنەدا مایەی ئازارو ناڕەحەتی بوو بۆ ئەوان.

جارجارێك مری رولینسن سەری دەهێنایە پێشەوە و شتێکی دەچپاند بە گوێی ویلدا. ویلیش بە هێمنییەوە سەری ڕادەوەشاند و بەڵێ و پشتگیری بۆ دەکرد.

لە کۆتاییدا ووتارەکە تەواو بوو گروپێك لە خزمەتکارەکان هاتن و ناوەڕاستی هۆڵەکەیان بە مەبەستی سەماکردن خاڵی کرد. ویل بەرەو لای من چەمایەوە.

—مری گوتی لەناو ئەم شەقامەدا ئوتێلێکی باشی لێیە. پەیوەندی بکە و بزانە دەتوانین شەو بمێنینەوە؟

—چی؟

مری پارچەیەك کلێنسی دابە دەستمەوە، کە ناوو ژمارەی تەلەفۆنی لەسەر نوسیبوو.

ویل بە هێمنیەوە و بەجۆرێك کە مری نەیبیستێت گوتی:

—خەمت نەبێت. خۆم پارەکەی دەدەم. ئیتر تۆیش خەمی سەرمەستیەکەی خۆتت نەبێت.
کارتە بانکییەکەم لەناو جانتاکەمدا دەربهێنە. بەگریمان ژمارەی کارتەکەیان دەوێت.

کارتەکەم دەرهێنا. مۆبایلەکەیشم برد و بەرەو ئەولاکەی باخەکە ڕۆیشتم. پرسگەی ئوتێلەکە گوتی کە لە قاتی تەنیشتمانەوە دوو ژوریان هەیە. یەکێکیان یەك کەسی و ئەویتریشیان دوو نەفەرییە. بەڵێ، گونجاوە بۆ توانا ویستان. گوتم:

—زۆر باشە...

کاتێك نرخی ئوتێلەکەی گوت، زۆرم لەخۆم کرد کە سەرسوڕمانەکەم ئاشکرا نەکەم. ژمارەی کارتە بانکیەکەی ویلم پێدان. هەروا کە خەریکی خوێندنەوەی ژمارەکە بووم، هەستێکی خراپم هەبوو.

گەڕامەوە. ویل گوتی:

—چی بوو؟

—کارەکە تەواو بوو. بەڵام....

بە ویلم گوت کرێی ئەو دوو ژورە چەندێك بووە.

—کێشە نییە. ئێستەیش تەلەفۆن بۆ هاوڕێکەت بکە و پێی بڵێ کە شەو ناگەڕێیتەوە. دواتریش یەك پێکیتر هەڵدە. لە ڕاستیدا ئەوە دەبێتە شەشەم پەرداخ و پێك کە دەیخۆیتەوە. زۆرم پێخۆش دەبێت کە لەسەر گیرفانی باوکی ئالیسیا مەست و نەشە ببیت.

***

منیش گێلاسم هەڵدا.

ئەو شەوە ڕوداوێك ڕویدا. ڕوناکی گڵۆپ و فانۆسەکانیان کەم کردەوە. لە ئەنجامدا مێزە بچوکەکەی ئێمە کەمتر دەبینرا. بۆنی خۆشی گوڵەکان لەناو شنەو نەسیمی شەوانەدا گەیشتبویە لوتکەی خۆی. بە مۆزیك و شەراب و سەماکەدا دیاربوو کە هەموو شتێك زۆر باش و خۆش تێدەپەڕێت. هیچکاتێك ویلم بەوشێوەیە ئاسودە و بێخەم نەبینیبوو. لەنێوان من و مریدا بوو. لەگەڵ مریدا گاڵتەو گەپیان دەکرد و پێدەکەنین. ڕواڵەتە شاد و خۆشحاڵەکەی دەبویە هۆی ئەوەی ئەو کەسانەی کە ئەیانویست لەژێرچاوەوە سەیری بکەن، یان بە شێوەیەکی بەزەیی پێدا هاتنەوە سەیری بکەن، ئێستە ئیتر بەهیچ شێوەیەك سەیری نەکەن. ویل پێی گوتم

که شاڵەکەی سەرشانم شل بکەم و ڕێك دابنیشم. چاکەتەکەیم داکەند و بۆینباخەکەیشم بۆ شل کرد، هەردوکمان هەوڵماندەدا بە بینینی دیمەنی سەماکردنەکە پێنەکەنین. زمان کەموکورتە و ناتوانم بڵێم کە بەبینینی کەسانێك کە ئاوا جوان و پێکەوتە سەما دەکەن، چەندە حاڵم باشتر بوو. پیاوەکان هەردەتگوت کارەبا گرتبونی. ژنەکان پەنجەکانیان بەرەو ئەستێرەکان دەگرت و تەنانەت کاتێکیش دەسوڕانەوە و دەخولانەوە زۆر هۆشیارو بەئاگا دەهاتنە پێشچاو.

مری رولینسن چەندینجار لەژێر لێوەوە گوتی:

—ئەی هاوار خودای گەورە.

سەیرێکی منی کرد. لەگەڵ هەرپێکێکدا کە هەڵیدەدا زمانی تیژتر دەبوو.

—لوئیزا، ناتەوێت بچیت و هونەرنمایی بکەیت و خۆت بنوێنیت؟

—وای نەخێر!

—بەڕاستی کەسێکی ئاقڵیت. هەرگیز سەمای بەم شپرزەیی و بێماناییەم نەبینیوە.

کاتژمێر نۆ لە نیتنەوە نامەیەکم بۆهات.

*باروبۆخەکە باشە؟*

منیش وەڵامدایەوە:

*—بەڵێ! لەوانەیە باوەڕ نەکەیت، ویل زۆر خۆشحاڵ و شادومانە.*

هەر بەڕاستی ویل خۆشحاڵ و شادومان بوو. دەمبینی بە قسەکانی مری قاقا لێدەدات و پێدەکەنێت. هەستێکی نامۆ لەناخمدا بەدیهاتبوو. ئەم هەستە پێی دەگوتم کە دەکرێت هیوادار بم، ویل دەتوانێت شاد و خۆشحاڵ بێت، ئەگەر بێت و خەڵکانێکی باش لەدەوروبەریدا هەبن، ئەگەر بهێڵن هەمان ویل بێت، نەك پیاوێك بە کورسی تایەدارەوە، نەك پیاوێك کە چەندین نەخۆشی هەیە و کەسێك کە خەڵکی بەزەییان پێیدا دێتەوە...!

کاتژمێر دەی شەو سەماکە ئارام بویەوە. ڕۆپرتم بینی کە ئالیسیای بەرەو سەر ستەیجی سەماکردنەکە دەبرد، میوانەکانیش چەپڵەیان لێدەدا. قژەکانی ئالیسیا کەمێك پەرش و بڵاوبوبونەوە. دەستی کردە ملی ڕوپرتەوە، هەروەك بڵێی پێویستی بەیارمەتی و پارێزگاری هەبوو. دەستی ڕوپرتیش پێچرا بە دەوری کەمەری ئالیسیاوە و توند گوشی بەخۆیەوە. ئالیسیا زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو، لەگەڵ ئەمەشدا من بەجۆرێك لە جۆرەکان بەزەییم

پێیدا دەهاتەوە. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە لەوانەیە نەزانێت کە چ شتێکی لەدەستداوە، تاوەکو ئەوەی کە درەنگی کردووە.

لەناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا، ژن و پیاوە خۆشەویست و هاوسەرو هاوڕێکانیتریش چوەنە پاڵیان و بوك و زاوام بینی کە لەسەر ستەیجەکە هاتنەخوارەوە. هۆشم لەلای مری بوو کە خەریکبوو باسی بەردەوامی پەرستارەکانی دەکرد. دواتر کتوپڕ سەرم بەرزکردەوە و ئەوم بینی، ڕێك لەبەرامبەرمانەوە وەستابوو. دیمەن و ڕواڵەتێکی زۆر جوان لەناو کراس و جلێکی زارای ئاوریشمیدا. هری... ناوسکم بەربویەوە.

ئالیسیا بە سەر ڕاوەشاندن سڵاوی لە مری کرد. چەمایەوە تاوەکو ویل بتوانێت لەناو هات و هاواری مۆسیقاکەدا دەنگەکەی ببیستێت، ماسولکەی دەمو چاوی کەمێك هاتبویەوە یەك. زۆری لەخۆی دەکرد کە جڵەوی هەستەکانی خۆی بگرێت.

—ویل، هەر بەڕاستی خۆشحاڵت کردم کە هاتیت.

سەیرێکی لای منی کرد، بەڵام هیچ شتێکی نەگوت.

ویلیش بە هێمنیەوە گوتی:

—منیش خۆشحاڵم. ئالیسیا زۆر جوان بویت. ڕۆژێکی گەورەیە.

دەموچوی ئالیسیا لە سەرسوڕماندا بریسکەیەکی دایەوە، دواتر هەستێك لە داخ و پەژارەو ئەفسوس لەسەراپایدا دەرکەوت.

—بەڕاستی؟ تۆ وا بیردەکەیتەوە؟ پێموایە... واتە... شتانێکی زۆر هەیە کە ئەمەوێت پێتی بڵێم...

ویل گوتی:

—پێویستناکات. خۆ لوئیزات لەبیرە؟

—بەڵێ.

بێدەنگیەکی کورت بەرقەرار بوو.

ڕوپرتم دەبینی کە کەمێك لەولاترەوە ئەمپێ و ئەوپێ دەکات و بە نیگەرانییەوە چاوی بڕیوەتە ئێمە. ئالیسیا ئاوڕی دایەوە و سەیری کرد. دواتر دەستی هێنایە پێشەوە و ڕایوەشاند.

—باشه، ویل بەهەرحاڵ سوپاست دەکەم، بەم هاتنەت نیشانتدا کە بەڕاستی کەسێکی گەورەو بەڕێزیت. بۆ...

—بۆ ئاوێنە.

—بەڵێ بۆ ئاوێنە. زۆرم حەز لێیەتی.

هەستایەوە و بەرەو لای زاوا ڕۆیشت و دەستی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. دەمبینین کە بەرەو ستەیجی سەماکردنەکە دەچن.

—خۆ تۆ ئاوێنەت نەکڕیبوو.

—دەزانم.

ئالیسیا و ڕوپرت خەریکبون بەیەکەوە قسەیان دەکرد. یەك دووجار نیگای ڕۆپرت بەرەو ئێمە سوڕایەوە. وادیاربوو باوەڕی نەدەکرد ویل تاوەکو ئەم ئاستە مامەڵەیەکی باشی کردبێت. ئەڵبەتە خۆیشم باوەڕم نەدەکرد. بە ویلم گوت:

—نارەحەت بویت؟

سەیرێکی منی کرد و گوتی:

—نەخێر.

دواتر زەردەخەنەیەکیکرد. زەردەخەنەکەی بەهۆی مەستی و نەشەییەوە کەمێك ناهاوسەنگبوو لەهەمانکاتیشدا چاوەکانی بیرکەرەوە و خەمبار دەهاتنەپێشچاو.

ستەیجی سەماکردنەکە چۆڵ بوو بۆ ئەوەی سەمای دواتر دەستپێبکات. بەبێ ئەوەی کە خۆم ئاگام لێبێت، خەریکم بە ویل دەڵێم:

—ویل تۆ چی دەڵێیت؟ وەرە دەورێك بەیەکەوە سەما بکەین.

—چی؟

—وەرە، وەرە با بابەتێك مانای سەماکردنی ڕاستەقینە بدەین بەدەستی ئەم گوێرەکانەوە و تێیانبگەیەنین کە سەماکردن چۆن دەبێت.

مری پەرداخەکەی هەڵگرت و گوتی:

—ویل تاوەکو مۆزیکەکە هێمنە تۆیش وەرە. چونکە پێموانەبێت دواتر بتوانیت.

هەلی ملەجەڕێ و سەرپێچیم بە ویل نەدا، بە خۆپارێزییەوە لەسەرقاچی دانیشتم، دەستم کردە ملی و جێگۆڕکێم بەخۆم کرد. ویل چەند ساتێك واقی بەچاوەکانی مندا وڕمابوو.

ئەیویست بزانێت دەتوانێت سەرپێچی بکات یان نا. بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر کورسییەتایەدارەکەی بەرەو لای ستەیجی سەماکردنەکە برد و لەژێر ڕوناکی دیسکۆلایتەکاندا دەستیکردە سوڕانەوە.

زۆر بەتوندی هەستم بە متمانە بەخۆبون دەکرد، لەلایەکیشەوە توڕە بووم. بەو گۆشەیەی کە دانیشتبوم دامێنی کراسەکەم بەرز بوبویەوە. ویل چپاندی بە گوێمدا

—وازی لێبێنە.

—ئەمە...

—کلارك واز بێنە، جەوگیری مەکە.

چاوەکانم داخست و دەنگیم دەبیست کە لەگەڵ مۆزیکەکەداو لەبەر خۆیەوە بۆڵەی دەهات. ویل گوتی:

—هێشتا لەشوێنی خۆیاندا وەستاون و ناجولێن؟

چاوەکانم کردەوە، لەبەر ئەو ڕوناکییە لاوازەدا سەیرێکی دەوروبەرم کرد.

دوو سێ کەس بە حاڵەتێکی هاندانیەوە زەردەخەنەیان دەکرد. بەڵام زۆربەیان نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك مامەڵە بکەن. مری ئافەرینی کرد. دواتر سەیری ئالیسیام کرد کە لەگەڵ ئێمەدا ماتی کرد. دەموچاوی شۆڕ بوبویەوە. کاتێك زانی سەیری دەکەم، ڕوی خۆی وەرگێڕا و شتێکی بەڕۆپرت گوت. ڕۆپرتیش سەرێکی ڕاوەشاند، هەروەك بڵێی خەریکین کارێکی ناشیرین ئەنجامدەدەین. هەستمکرد زەردەخەنەیەکی سەرکێشانە و هاروهاجانە کەوتە سەر لێوم. گوتم:

—بەڵێ.

—وەرە پێشترەوە.

ئەگەر کەمێکیتر بەرەو لای چەپ بسوڕێیتەوە من دەکەومە خوارەوە.

ویل ڕێڕەوو ئاراستەکەی خۆی گۆڕی. کەمێك خۆم کێشایە دواوە بۆ ئەوەی سەیری بکەم. بەهیچ شێوەیەك ئاگام لە خۆم نەبوو. ویل سەیری منی کرد، ئەڵبەتە لە حەقیش لانەدەین، بەو شێوەو بارودۆخەی کە من دانیشتبوم، نەیدەتوانی بێجگە لەمن سەیری کەسیتر بکات.

ڕوی نیگای لەمن وەرگێڕاو برۆکانی بەرز کردەوە.

منیش بەوپەڕی هێمنی و خوێنساردییەوە سەیریم کرد.

—ئەگەر لەناو کورسی تایەداردا نەبوایەی هەرگیز سەیری منت نەدەکرد.

—نەخێر، بەوشێوەیە نییە. بەدڵنیاییەوە سەیرم دەکرد.

—ئەی کە وانییە. ئەوکات لەگەڵ میوانەکانیتردای سەرقاڵ بویت. ئەو کەسانەی کە مرۆڤ لەدوری چل هەنگاوەوە سەرنجیان دەدات. منیش بەوناوەدا بۆ خۆم لارەم دەهات و دەسوڕامەوە، بەهیچ شێوەیە کەس نەدەبینرا.

ویل چاوی داخست و کردیەوە. گوتم:

—ڕاستدەکەم، ئەی وانییە؟

ویل سەیری بارەکەی کرد، دواتر ئاوڕیدایەوە بۆلای من.

—بەڵێ. کلارک، لەبەرگریکردن لە خۆم دەبێت بڵێم ولاخ بووم.

دەستمکردە پێکەنین، هێندە قاقام لێدەدا کە هەموان سەرنجیاندداین. هەوڵمدا خۆم کۆ بکەمەوە، بە من من کردنەوە گوتم:

—شتێك دەزانی؟

تاوەکو کۆتایی شەو دەمتوانی بە هەمان حاڵەتەوە بمێنمەوە و سەیری بکەم، حاڵەتێك کە سوچی چاوەکانی چرچ بوبو، هەربەوجۆرەی کە ملی لار بوبویەوە.

—چی؟

—کلارک، تۆ هەندێکجار تەنها ئامانج و ئەنگێزەیەکی کە بەیانیان بە ئومێدی ئەوەوە چاوەکانم دەکەمەوە.

پێش ئەوەی کە بزانم چی دەڵێم، ووشەکان لەدەمم دەرچون.

—دەی کەوابوو وەرە بابچین بۆ گەشت.

—ها..؟!

—وەرە بابچین بۆ گەشت و سەفەر. وەرە با یەك هەفتە بچین بۆ شوێنێك و بەخۆشی رایبوێرین. تەنها من و تۆ. بەبێ ئەو....

—ئەم گوێرەکانە؟

—بەڵێ ئەم گوێرەکانە. ویل وەرە بابڕۆین.

چاوی بریبویە من و هەروا سەیری دەکردم. نەمدەزانی خەریکم چی دەڵێم. بەهیچ شێوەیەکیش نەمزانی ئەم قسەیەم لەکیوێوە هێنا. تەنها دەمزانی ئەگەر ئەو شەوە بەو

ئەستێرە و گوڵە بۆنخۆش و پێکەنیانەی مرییەوە نەتوانم بەڵێ و گفتی لێوەربگرم، ئیتر هیچکاتێك ناتوانم ئەوکارە بکەم.

–تکایە...

ئەو ساتانەی کە چاوەڕێ بووم تاوەکوە وەڵامم بداتەوە، هەروەك بڵێی سەدساڵی خایاند.

گوتی:

–باشە.

{١٩}

## نیتن

ڕۆژی دواتر دەوروبەری نیوەڕۆ، لە کۆتاییدا لە ئاهەنگی هاوسەگیرییەکە گەڕانەوە. خاتوو ترینەر بەجۆرێك توڕە بوبو تێکەڵی کردبو، کە زۆر بە ئاستەم دەیتوانی قسە بکات.

گوتی:

–باشە بۆچی تەلەفۆنتان نەکرد.

لەوێدا مابویەوە و چاوەڕوانی دەکردن بۆ ئەوەی بەچاوەکانی خۆی ببینێت کە هیچ کێشەیەك وەپێش نەهاتووە و بە ساغی و سەلامەتی گەڕاونەتەوە. لە کاتژمێر ٨ بەیانی کاتێك گەیشتمە ماڵی ترینەر، دەنگی قاچەکانیم لەسەر فەرشی ڕێڕەوەکە دەبیست کە سەرو خواری دەکرد.

–هەژدەجار نامەم بۆ هەردوکتان نارد. دواتر کاتێك تەلەفۆنم بۆ ماڵی (دوان) کرد، گوتیان (پیاوێك بە کورسی تایەدارەوە چو بۆ ئوتێلەکە، ئیتر زانیم کە لە ئوتوبانەکەدا توشی ڕووداوی هاتوچۆ نەبوون.

ویل گوتی:

–ئەها، (پیاوێك کە بە کورسی تایەدارەوە بوو) چەندە باشە!

بەڵام دیاربوو کە بیاقەت نەبووە. بێخەم و ئاسودە بوو. لەگەڵ ئەوەی کە گومانم دەبرد ئێشی هەیە، بەڵام خوماری و خەواڵویی بەیانیانی بە گاڵتەو گەپەوە دەگوزەراند. بەڵام کاتێك دایکی لومەو سەرزەنشتی لوئیزای دەکرد، زەردەخەنە بەسەر لێوەکانی ویلەوە تۆرا. ویل خۆی فڕێدایە ناو قسەکانەوە و بەدایکی گوت هەر هات و هاوارێکی هەیە با بەسەر ئەمدا بیکات، چونکە بیرۆکەی چون بۆ ئوتێل بڕیارو گەلاڵەی خۆی بووە.

—دایکه، ئەوەندەی من بزانم پیاوێکی سیی و پێنج ساڵە ئازادی و ئیختیاری لەدەستی خۆیدایەو ناچار نییە کە ڕونکرنەوە بۆ هیچکەسێك بدات کە بۆچی شەو لە ئوتێل ماوەتەوە، تەنانەت بۆ دایکو باوکیشی.

خاتوو ترینەر واقی بە هەردوکیاندا وڕما. لەژێر لێوەوە شتێکی گوت و گوێم لێبوو کە گوتی (ئەدەبیش شتێکی باشە). دواتر لە ژورەکە چویە دەرەوە.

لوئیزا کەمێك شکایەوە. بەڵام ویل چویە پێشەوە و بە چپەوە شتێکی پێگوت، لێرەدابوو کە من خاڵێك سەرنجی ڕاکێشام. دەموچاوی لو کەمێك سوربویەوە و پێکەنی. لەوجۆرە پێکەنیانەی کە مرۆڤ پێدەکەنێت و دەشزانێك کە کاتی پێکەنین نییە. پێکەنینێك کە بۆنی کەین و بەین و دەستتێکەڵکردنی لێدەهات. دواتر ویل بەلوی گوت کە سەخت نەیگرێت و ئیسراحەت بێت. بڕوات بۆ ماڵەوەو جلوبەرگەکانی بگۆڕێت و ئەگەریش ویستی سەرخەوێکی بۆ بشکێنێت.

—نەمدەتوانی لەگەڵ کەسێکدا کە بە سەروفەساڵ و قیافەیدا دیارە سەرەڕۆیی کردووە، بڕۆم و بەدەوری قەلاکەدا بسوڕێمەوە.

منیش بە ئاوازێکی سەرسوڕهێنەرەوە گوتم:

—سەرەڕۆیی کردووە؟

لو گوتی:

—نەخێر بەوشێوەیەش نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە!

دواتر بە شاڵەکەی سەرشانی کێشای بەمندا و کردی بە چاکەتەکەیدا بۆ ئەوەی بڕوات. ویل گوتی:

—بە ئۆتۆمبیل بڕۆ، بۆ گەڕانەوەت ئیسراحەت و ئاسانترە.

ویلم بینی کە بەچاوەکانی ناوبراوی تاوەکو بەردەم دەرگاکە ڕەوانەکرد. هەر لەو نیگایەوە یەك دونیا بابەتم دەستکەوت.

لەپاش ڕۆشتنی لو، ویل کەمێك بێ سەبرو حەوسەڵە بوو. هەروەك بڵێی چاوەڕێ بوو تاوەکو دایکی و لو بڕۆن خۆی ڕزگار بکات. منیش بەوردی سەیری ئەوم دەکرد. ئەو زەردەخەنەیەی کە لەسەر دەموچاویدا نەما، دەبینم ئیتر دەموچاویم خۆشناوێت. دەموچاوی کەمێك لەك و پەڵاوی بوبو. کاتێك وایدەزانی کەس هۆشی بەلای ئەوەوە نییە، نێوچاوانی دەهاتەوە یەك. تەنانەت

هەستمدەکرد موەکانی جەستەی ڕاست بونەتەوە. زەنگێکی مەترسی لەناخمدا لێدرا. لاواز بەڵام گوێکەرکەر.

—ویل تۆ باشیت؟

—باشم مەیکە بە هەرا.

—پێمنالێیت کوێت ئێش دەکات؟

دواتر قیافەی کەمێك کرایەوە. لەوانەیە دەیزانی کە من دەزانم درۆدەکات. ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ بوو کە بەیەکەوە کارمان دەکرد.

—باشە، بەڵێ کەمێك سەرم ئێش دەکا. دەبێت سوندەکانم زۆر خێرا بگۆڕدرێن.

لە کورسییەکەوە گواستمەوە، کەرەستەکانم ئامادە کرد.

—ئەمڕۆ بەیانییەکەی لو کەی سۆندەکانی گۆڕی؟

—نەیگۆڕی.

مۆڕی کردبوو کەمێك بێتاقەت دیاربوو.

—دوێنی شەویش.

—چی؟

لێدانی دڵیم بۆ گرت. کەرەستەکانی گرتنی فشارو زەختی خوێنم هێنا. پەستانی خوێنی زۆر بەرز بوو. کاتێك دەستم خستە سەر نێوچاوانی، لەپی دەستم لەبەر ئارەق کەمێك تەڕ بوو. چوم و لەناو ڕەفەکەدا دەرمان بهێنم، دەرمانی فراوانکەری دەمارەکان، کردمە ناو ئاوەوە و پێمدا بۆ ئەوەی بیخوات.

ئاگاداری بووم تاوەکو کۆتا دڵۆپی هەڵقوڕێنێت. دواتر ژێر باڵیم گرت، قاچەکانیم خستە لایەکی قەرەویڵەکەوە و بەخێراییەوە سۆندەکانم گۆڕی. هەموو ئەو ماوەیەش هەست و هۆشم لەلای ئەو بوو.

—ئوتونومیك دیس رفلکسیا؟

—بەڵێ.

ئوتونومیك دیس رفلکسیا خراپترین کابوسی ئێمە بوو. کاردانەوەی توندی جەستەی ویل بەرامبەر بە ئێش و بێتاقەتی یان سۆندەی خاڵی نەکراوو هەوڵی بێهودە و نابەجێی سیستەمی

عەسەبی زیانبەرکەوتوو بۆ پاراستنی کۆنترۆڵ، کتوپڕ وەپێشدەهات و جەستەی لێکهەڵدەوەشاند.

ڕەنگی ویل پەڕیبوو بە سەختی هەناسەی دەدا.

—ئەی پێستت چۆنە؟

—کەمێك دەکزێتەوە.

—ئەی بینینت؟

—باشە.

—کابرا پێتوایە دەبێت بچین بۆ نەخۆشخانە؟

—نیتن دە خولەك بوەستە. خۆت هەرکارێك پێویستبوو کردت. تەنها دە خولەك بوەستە.

چاوەکانی داخست. دووبارە پەستانی خوێنەکەیم گرتەوە، نەمدەزانی دەبێت تاوەکو کەی بوەستم و دواتر بانگی ئامبولانس بکەم. لە ئۆتونومیك دیس رفلکسیا زۆر دەترسام. چونکە کۆتایی کارەکە دیار نەبوو. پێشتریش یەکجار توشی بوبو، هەر ئەوکاتەی کە تازە دەستمکردبوو بەکارەکەم. برابو بۆ نەخۆشخانە و دوو ڕۆژ خەواندبویان.

—نیتن، ئەگەر هەستمکرد، کێشەیەك هەیە، خۆم پێت دەڵێم.

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. یارمەتیمدا کە بەپشتا پاڵبکەوێت. ئێستە سەری لەتەنیشت لای سەری قەرەوێڵەکەدا بوو.

بە منی گوت لو هێندە مەست بووە کە نەیویستووە کارێکی بێئاکام بکات و بهێڵێت بۆرییەکە بگۆڕێت.

—دیارنەبوو کە ئەیویست چ بەڵایەکم بەسەردا بهێنێت.

پێدەکەنی و قسەی دەکرد. دەیگوت تەنها نیوسەعاتی پێچوو تاوەکو لو لە کورسییەکەوە بیگوازێتەوە بۆ قەرەوێڵەکە. دووبارە هەردوکیان کەوتبونەوە سەرزەوییەکە.

—خۆشبەختانە هەردوکمان هێندە مەستبوین کە هیچ حاڵیمان نەبوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، لو ئەوەندە ئامادەباشی زەینی هەبوو، کە بتوانێت تەلەفۆن بۆ بەشی پرسگە و پێشوازی ئوتێلەکە بکات.

داوای یارمەتیان کردبوو تاوەکو ویل بەرز بکەنەوە.

–یارۆ کەسێکی باش بوو. سەرەتا لو دژایەتی کرد، کە بەخشیشێکی پەنجا پاوەندی پێبدەم. دەمزانی کە خراپ مەست بووە، لەبەر ئەوەی کە خێرا قبوڵی کرد.

کاتێك لە کۆتاییدا لو ئەوی بەجێهێشت، ویل خەمی ئەوەی هەبوو کە مەبادا لو خۆی بگەیەنێتەوە بە ژوورەکەی. لو دەهاتە بەرچاوی کە لول بووە و وەك تۆپێکی سور لەسەرقادرمەکانەوە دەکەوێتە خوارەوە.

لەوساتەدا هەستم دەکرد کە هێندە نیگەرانی لو نەبووم.

–ویل، هاورێ، بەبڕوای من ئەمجارە خراپ نییە کەمێك زیاتر نیگەرانی خۆت بیت، قبوڵە؟

–نیتن، من باشك هیچم نییە ئێستە حاڵم باشترە. هەروا کە خەریکی گرتنی لێدانەکانی دڵی بوم، هەستم بە قورسی نیگاکانی دەکرد لەسەر خۆم.

–ئەڵبتە لو هیچ خەتایەکی نەبوو.

فشارو زەختی خوێنەکەی دابەزی و ڕەنگی دەموچاوی ئاسایی بوبویەوە. هەناسەم دایە دەرەوە. بەبێ ئەوەی کە خۆم ئاگام لێبێت کە لەسینەمدا ڕامگرتبوو.

کەمێك قسەو گفتوگۆمان کرد. کات تێدەپەڕی و باروذۆخ دەگەڕایەوە حاڵەتی ئاسایی خۆی. لەبارەی ڕوداوەکانی ڕۆژی ڕابوردووەوە قسەمان کرد. وادیاربوو یەك تۆسقاڵیش سەبارەت بە کچە هاورێ پێشوەکەی بێتاقەت نەبوو. لەمبارەیەوە قسەیەکی زۆری نەکرد. لەگەڵ ئەوەی کە زۆر ماندو دەهاتەپێشچاو، بەڵام ڕۆحیەت و وورەی بەرز بوو.

مەچەکی دەستیم بەردا.

–ڕاستی چ تاتۆیەکی جوانە.

سەیرێکی هاروهاجانەی منی کرد.

لەگەڵ ئەو ئارەقەی کە کردبوی و ئەو ئازارەی کە هەیبوو حاڵەتی بەجۆرێکبوو هەروەك بڵێی بیرو زەینی لەشوێنێکیترەو بیر لە ناڕەحەتیەکانی ناکاتەوە. هەموو بیرو خەیاڵم دەچویەوە سەر خاتوو ترینەر کە ئەگەر بە بیرو خەیاڵەکانی ویلی بزانیایە هەرگیز ئەو قەرقەشەیەی وەڕێ نەدەخست.

***

ویل پەیمانی لێوەرگرتم کە لەبارەی ڕووداوەکانی ڕۆژی ئاهەنگەکەوە هیچ بە دایکی نەڵێم. منیش هیچم نەگوت. پاشنیوەڕۆ کاتێك لو گەڕایەوەو زۆر خراپ بێدەنگبوو. ڕەنگیش بەڕویەوە

نەمابوو. قژەکانی لەدواوە بەستبوو پاکوخاوێن هاتبوو. ئەیویست ڕواڵەتێکی مەعقول لە خۆی نیشانبدات.

بەڵام کەمێك پاشتر لەوە دڵنیابومەوە کە کێشەی تەنها خوماریيەکە نییە.

ویل یەکسەر لە لوی دەپرسی کە بۆچی ئەوەندە بێدەنگە. لویش لە کۆتاییدا وەڵامیدایەوە:

—بەڵێ. ئێستە تێگەیشتم کە کارێکی باش نەبوو شەو لەدەرەوە بم. ئێستە کە تازە ڕۆشتوم و ئەمەوێت لەگەڵ کوڕە هاوڕێکەمدا بژیم.

بەڕواڵەت خەریکبوو گاڵتەی دەکرد، کاتێك ئەمەی دەگوت، زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی بوو. بەڵام دیاربوو بە زۆر بوو. من و ویل هەردوکمان دەمانزانی کە بابەتێکی زۆر جیدی لەپشتی ئەو بێدەنگی و ماتیەی لوەوە هەیە.

نەمدەتوانی سەرزەنشتی کوڕە هاوڕێکەی بکەم. نەشمدەویست لەبارەی نەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە بیرێکیتر بکەمەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو پیاوەش کەسێکی ئیفلیج بێت. ئەو نیگایەی کە کوڕە هاوڕێکەی بەرامبەر بە لو هەیبوو زۆر جیاواز بوو لەو نیگایەی کە ویل بەرامبەر بەناوبراو هەیبوو.

پاشنیوەڕۆ کارێکی زۆرمان نەکرد. لو کۆڵە پشتیەکەی ویلی خاڵی کردەوە. شتومەکەکانی ئوتێلەکە وەك شامپۆ، نەرمکەرەوەکان، بەکرەو دەرزی و کڵاوی گەرماوی دەرهێنا. (لو گوتی: پێمەکەنە. پارەیەکی زۆرمانداوە. ویل پارەی کارگەی دروستکردنی شامپۆکەی دابوو). دانیشتین و فیلمێکی هەیەجانی یابانیمان بینی. ویل دەیگوت بینینی ئەم فیلمە، لەپاش خوماری زۆر باشە. هەموو ئەو ماوەیە لەدەورویەری ویلدا بووم، بەشێکی لەبەر ئەوەبوو کە ئەمویست پەستانی خوێنەکەی لە کۆنترۆڵمدا بێت، ڕاستیەکەتان بوێت بەشێکیشی بۆ ئەوەبوو دەنگوباسێك بزانم.

حەزم دەکرد، کاردانەوەیان ببینم کاتێك گوتم کە ئەمەوێت لەگەڵیاندا بمێنمەوە.

ویل گوتی:

—بەراستە؟ تۆیش حەزت لە میازاکیە؟

دواتر خێرا خۆی کۆکردەوەو گوتی ئەڵبەتە دەبێت پێتخۆش بێت، چونکە فیلمێکی زۆر جوانە. بەڵام هەستێکیتر بوونی هەبوو. ڕاستگۆیانە بڵێم بۆ ویل خۆشحاڵ بووم. چونکە ماوەیەك بیرو زەینی سەرقاڵ دەبوو بیری لەو پیاوە دەکردەوە.

هەربۆیە دانیشتین و دەستمانکردە سەیرکردنی فیلم. پەردەکانمان دادایەوە و تەلەفۆنمان داخست و دانیشتین و سەیری فیلمێکی کارتۆنی سەیرو سەمەرەمان کرد، فیلمەکە سەبارەت بە کچێکبوو کە کاری گەیشتە دوونیای هاوشانبون. بونەوەرانێکی سەیرو سەمەرەیشی هەبوو، نیوەیان بەجۆرێکبون کە نەدەکرا بگوترێت باشن یان خراپ. لو لە تەنیشت ویلەوە دانیشت و خواردنەوەکەی پێدەدا، چاویشی دەپرواند، هەروەك بڵێی شتێکی تێکەوتبێت. بەراستی باش بوو، هەرچەندە لەناخی دڵمەوە نیگەران بووم کە چی دەبێت. لەپاش ئەوەی کە لو پەردەکانی دادایەوە و چایی بۆ هێناین، نیگایەك لەنێوان ئەوو ویلدا گۆڕدرایەوە. هەروەك ئەو نیگایەی کە دوو کەس بە گومان و دودڵییەوە لەیەکتری دەکەن بۆ ئەوەی ئایا ڕازو نهێنی نێوانیان بەلایەنی سێیەم بڵێن یان نا. دواتر گوتیان کە ئەیانەوێت گەشت و سەفەرێك بکەن. دە ڕۆژی تر. بەلام هێشتا بەتەواوەتی نازانن بۆ کوێ، بەلام بەگریمانی بەهێز ڕێگەی دور دەبێت. پرسیان دەتوانم بڕۆم و یارمەتیان بدەم.

–چاکە و پرسیارکردن!

دەبوایە ئافەرینی ئەم کچەم بکردایە. چونکە ئەگەر چوارمانگ لەمەوبەر بە منیان بگوتبایە کە ویل لەناو ئەم چاردیوارەدا دەهێنینە دەرەوەو دەیبەین بۆ گەشت و سەفەری ڕێگەی دوور، بەدڵنیاییەوە دەمگوت کە ئەقڵتان لەدەستداوە! ئەڵبەتە پێش گەشتەکەیان سەبارەت بە چاودێرییە پزیشکیەکان قسەم لەگەڵ لوئیزادا کرد. ئەی ئەگەر لەدوری ئاوو ئاوەدانییەوە توشی کێشەیەك دەبوین ئەوکات چی بکەین؟ نەدەبوو دووبارە وەك ئەوجارە هەڵەبکەین.

تەنانەت بە خاتوو ترینەریشیان گوت. ڕێك لەوکاتەدا بوو کە لو ئەیویست بڕوات. ویل بەجۆرێك بابەتەکەی باسکرد، هەروەك بڵێی ئەیەوێت بۆ پیاسە دەچن بۆ دەوروبەری قەلاکەو شتێکی ئەوتۆ و گرنگ نییە.

دەبێت ئەوە بڵێم کە خەرکبوو لە خۆشحاڵیدا پەڕوباڵ دەربکەم. هەموو پارەکەم لە سایت پوکردا دۆڕاندبوو، هەربۆیە هیچ بەرنامەیەکم بۆ پشووەکان نەبوو. تەنانەت ئیتر ڕەخنەم لە لو نەدەگرت کە بۆچی بەگوێی ویلی کردوە کاتێك گوتویەتی کە پێویستناکات سۆندەکان بگۆڕێت. باوەڕ بکەن من لەسەر ئەم بابەتە گاڵتەوگەپێکی زۆرم وەرێخستبوو، بەجۆرێك کە ئیتر بە خراپ نەدەهاتەپێشچاو. کاتێکیش خەریکبوم چاکەتەکەم لەبەردەکرد، لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد و زۆر موشتاقی بینینی دەریا شینەکان و لمە سپییەکانی کەنار دەریاکان بووم. تەنانەت لەناو

ئەم بیرکردنەوەیەدابووم کە لەوانەیە بتوانم سەرێکی خێرا لە خانەوادەکەم لە (ئاکفیلد) بدەم. دواتریش ئەوان ببینم. خاتوو ترینەر لەدەرەوەی دەرگای پشتەوە وەستابوو. لویش لەپشتی سوکانی ئۆتۆمبیلەکەدا چاوەڕوان بوو تاوەکو بەڕێبکەوێت و بێتە ناو شەقامەکەوە. نەمزانی چ قسەو باسێك لەنێوانیاندا گۆڕدرایەوە، بەلآم دەمبینی کە هەردوکیان ڕوگرژن. من تەنها ئەو ڕستەی کۆتاییم بیست، کە پێموابێت هەر ئەوە بەسە.

—لو هیوادارم بزانیت کە خەریکی چ کارێك دەکەیت.

{٢٠}

—دەتەوێت چی بکەیت؟

لەسەر تەپۆڵکەکانی دەرەوەی شاردا بوین کە بابەتەکەم بە پاتریك گوت. داوای لەمن کردبوو هەروا کە بە پاسکیل لەدوایەوە دەڕۆم، کاتی بۆ بگرمەوە. نیوەی ڕێگە بیست و شەش کیلۆمەترییەکەمان بڕیبوو.پاسکیلسوارییەکەم باش نەبوو، لەوانەیە شتێکم لە فیزیا بزانیایە، بەڵام هیچ شتێکم لە پاسکیلسواری نەدەزانی. هەربۆیە بەردەوام لاردەبومەوە و قسەی ناشیرینم دەگوت و بە توڕەییەوە هاوارم دەکرد بەسەریدا.

کاتێك گەیشتینە سەر (شیفکوت هیل)، من هەناسە بڕکێم پێکەوتبوو قاچەکانم وەك شۆڕەبیان لێهاتبوو دەلەرزین، هەر لەوێدا بڕیارمدا کە باسی بابەتەکە بکەم. دەمزانی نزیکەی سیازدەکیلۆمەترمان تاوەکو ماڵەوە ماوەو بواری ئەوە هەیە تاوەك دووبارە شاد و خۆشحاڵ ببێتەوە.

—لەگەڵ تۆدا نایەم بۆ نەرویج بۆ پێشبڕکێکە!

نەوەستا، بەڵام هاتە پێشترەوە. ئاوڕیدایەوە بۆلای من. هەروا ڕایدەکرد. کاتێك بینیم بەمشێوەیە سەری سوڕما، پەشۆکام و خەریکبوو بکێشم بە درەختێکدا.

—چی؟ چۆن؟

—ناکرێت واز لە کارەکەم بهێنم.

مەودای لەمن وەرگرت و بەرەو لای جادەکە ڕۆیشت. خێراییەکەیشی زیادکرد. گەیشتینە لوتکەی تەپۆڵکەکە. ناچاربووم کەمێك ئیستۆپ بگرم تاوەکو نەکەومە پێشییەوە.

—باشە، لەکەیەوە ئەم بڕیارەتداوە؟

نێوچاوانی پڕ بوو لە دڵۆپە ئارەق. وردەدەمار لەپشتی پوزی قاچییەوە دەبینرا. کاتێك چاوم بەوە کەوت موچڕکە بەجەستەمدا دەهات.

—کۆتایی هەفتە تەنها چاوەڕێ بووم بڕیاری کۆتایی بدەم.

—بەڵام بلیتی فڕۆکە و شتەکانیترمان بۆ دابینکردویت.

—خۆ فڕینێکی هەرزان زیاتر نییە. ئەگەر پێتناخۆش نییە، سیی و نۆ پاوەند زەرەرەکەی دەدەم.

—مەسەلە پارەکەی نییە. وامزانی دێیت و هانم دەدەیت. خۆ تۆ گوتت کە دێیت.

پاتریک مۆڕی کرد. لەو سەرەتایەوە کە بەیەکەوە ئاشنا بوین، هەمیشە سەرم دەخستە سەری و پێمدەگوت جەنابی توڕە و هەڵچوو. خۆم پێکەنینم دەهات، پاتریک بەجۆرێك توڕە دەبوو کە بەزۆری نێوچاوانە مۆنەکەی دەکردەوە بۆ ئەوەی بێدەنگم بکات.

—ئۆو، وازبێنە بابە. من خەریکم هانی تۆ دەدەم، نا؟ پاتریك زۆر بێزارم لە پاسکیلسواری. خۆیشت باش دەزانی. بەمجۆرەیش من هەر هانت دەدەم و ئافەرینت دەکەم.

یەك دوو کلیۆمەترێك بەبێدەنگی ڕۆیشتین. لەپاشان پاتریك هاتەوە قسە. ترپەی پێیەکانی پاتریك لەسەر جادەکە زۆر توند و بەبڕشت بوو. لەکاتێکدا من دەبوو توڕە بم. چونکە هەموو ڕێگەکە بە هەورازدا سەرکەوتبوین و ئێستە شار لەخوارمانەوەیە. هەر لەبەر ئەمەبوو کە هەناسەم خراپ توند بوبو، هەرجارێك کە سەیارەیەك بەلاماندا تێدەپەڕی هەوڵمدەدا ڕێگری لە زیادبوونی لێدانەکانی دڵم بکەم، بەڵام سەرکەوتوو نەدەبوم. پاسکیلە کۆنەکەی دایکم بردبوو. (پاتریك مۆڵەتی نەدەدا دەستکاری شتومەکەکانی بکەم). پاسیلەکە ئەبوگێڕ نەبوو بەردەوام لە پاتریك دوا دەکەوتم.

سەیرێکی دواوەی خۆی کرد. هەنگاوەکانی کەمێك هێور کردەوە تاوەکو منیش پێی گەشتمەوە.

—باشە بۆچی هیچ کەسێك لە ئاژانسەکە دانامەزرێنن؟

—لە ئاژانس دابمەزرێنن؟

—بێت بۆ ماڵی ترینەر. ئەگەر بڕیاروایە کە شەش مانگ کار بکەیت، ئێ باشە خۆ پێویستت بە مۆڵەت و پشوو هەیە.

—خۆ بەم ئاسانیەش نییە.

—بەڵێ، زۆر ئاسانە. کاتێك دەستت بەکارکرد، هیچ زانیارییەکیان پێنەدابویت.

هەناسەی خۆم ڕاگرت. ئێستە کە خۆم بەهۆی پاسکیلسوارییەکەوە هەناسەم پێنەمابوو، کارێکی قورس بوو.

—لەبەر ئەوەیە کە دەبێت بڕوات بۆ گەشت.

—چی؟

—دەبێت بڕوات بۆ سەفەر. هەر لەبەر ئەمەیە کە پێویستیان بە من و نیتن هەیە کە لەگەڵیدا بڕۆین.

—نیتن؟ نیتن ئیتر کێیە؟

—پەرستارەکەی کە کارە پزیشکیەکانی بۆ دەکات. هەمان ئەو گەنجەی کەلەگەڵ ویلدا بینیت کاتێك هاتبو بۆ ماڵی دایکم. ئێستە پێش ئەوەی بپرسیت دەڵێم نەخێر، هیچ کەین و بەینێك لەنێوان من و نیتندا نییە.

هەنگاوەکانی هێور کردەوە. سەری داخست و واقی بە قیری شەقامەکەدا وڕما. ئەوەندە هێمنی کردەوە کە دەتوانم بڵێم لەشوێنی خۆیدا ڕایدەکرد و زۆر بەرەوپێشەوە نەدەچوو.

—لو چی بووە؟ چونکە... چونکە وادیارە سنوری نێوان کارو ئەو شتەی کە....

شانەکانی هەڵتەکاند.

—سروشتیە، خەوشدار بووە.

—ئەمە کارێکی ئاسایی نییە. خۆت ئەمە دەزانیت.

—بەڵام وادیارە لەم ڕۆژانەدا لەپێشینەیی بۆ ویل ترینەرە.

دەستم لەسەر سوکانی پاسکیلەکە لابرد و ئاماژەم بۆقاچەکانیکرد کە لەحاڵی جوڵەدا بوون و گوتم:

—ئۆو، ئەی ئەم ڕاکردنە بۆ تۆ شتێکی یەکەمایەتی و لەپێشینە نییە؟

—ئەمە جیاوازی هەیە.؟ تۆ هەموو ئیختیارێکی خۆتت داوەتە دەستی ئەو.

هەوڵمدا زەردەخەنە بکەم.

—تۆ دێیت بۆ ڕاکردن، منیش ناچارم بێم بۆ ڕاکردن.

ڕوی خۆی وەرگێڕا.

—ئەمە گاڵتەجاڕانەیە.

–پاتریك، ئەمە تەنها شەش مانگە. شەش مانگ. خۆ تۆ یەکەمین کەسێك بویت کە گوتت بچمە سەر ئەم ئیشە. دەی کەوابوو نابێت لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکەیت کە بۆچی گرنگی بەکارەکەم دەدەم.

–من پێموانییە بابەتەکە پەیوەندی بەکارەکەتەوە هەبێت، من تەنها.... من پێموایە شتێك هەیە کە ناتەوێت بیڵێیت.

وەستام. کەمێکی خایاند. دواتر گوتم:

–بەوجۆرە نییە.

–بەڵام ناتەوێت لەگەڵ مندا بێیت بۆ پێشبڕکێکە.

–پێمگوتیت کە من...

بە هێمنی سەری ڕاوەشاند، هەروەك بڵێی بەباشی دەنگی نەدەبیستم. دواتر دەستیکردە ڕاکردن و لێم دورکەوتەوە. لە حاڵەتەکەیەوە تێگەیشتم کە ئەوەندە تورەیە چەقۆی لێبدەیت خوێنی لێنایەت.

–وای... پاتریك. توخودا، ناکرێت یەك خولەك تامڵ بکەیت بۆ ئەوەی بەیەکەوە قسە بکەین؟

ملەجەڕێ لەناو ئاوازی دەنگیدا شەپۆلی دەدا.

–نەخێر، کاتم لەدەست دەردەچێت.

–باشە، کاتەکە ڕادەگرین. تەنها پێنج خولەك.

–نەخێر ناکرێت وەستانم هەبێت.

هەنگاوەکانی توندتر کرد، هەروەك بڵێی گیانێکی نوێ هاتبویەوە بەبەریدا. گوتم:

–پاتریك؟

هەوڵمدا خۆمی پێبگەیەنمەوە. پێیەکانم لەسەر پایدەری پاسیلەکە دەخلیسکان. جنێوم بەخۆم دەدا. پایدەرم لێدا و هەوڵمدا دووبارە خێراییەکەم زیاد بکەم.

–پاتریك؟ پاتریك!

چاوم بڕیبویە پشتە ملی. ووشەکان لەدەمم دەرچون و نەمزانی چی دەڵێم.

–باشە، ویل ئەیەوێت بمرێت. ئەیەوێت خۆی بکوژێت. ئەم سەفەرو گەشتەیش کۆتا هەوڵی منە بۆ ئەوەی لەوکارەی پاشگەزی بکەمەوە.

پاتریك هەنگاوانێکی کورتتری هەڵگرت و دواتر هێور بویەوە. بەمەودایەك لەدوری منەوە وەستا. پشتی ڕاستکردەوە. بە هێمنیەوە بەرەولای من گەڕایەوە. ئێستە ئیتر ڕاینەدەکرد.

—دووبارە بیڵێرەوە.

—ئەیەوێت بڕوات بۆ دیگنیتاس. منیش هەموو هێزو توانای خۆم بەکار دەهێنم بۆ ئەوەی بیرو ڕای بگۆڕم. ئەمە کۆتا چانسی منە.

واقی بەمندا وڕمابوو، نەمدەزانی باوەڕ بەقسەکەم دەکات یان نا.

—دەزانم گاڵتەجاڕانەیە. بەڵام دەبێت پەشیمان و پاشگەزی بکەمەوە. هەربۆیە ناتوانم لەگەڵ تۆدا بێم بۆ نەرویج.

—باشە بۆچی پێشتر ئەمەت پێنەگوتبوم.

—ناچار بووم پەیمان بە خانەوادەکەی بدەم کە ئەمە بە کەس نەڵێم. ئەگەر ئەم قسەیە بڕواتە دەرەوەو بڵاو ببێتەوە بۆ ئەوان زۆر خراپ دەکەوێتەوە. سەیرکە، خۆیشی نازانێت کە من دەزانم. مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزە. داوای لێبوردن دەکەم و بەداخەوەم کە ناتوانم بێم.

دەستم بردە پێشەوە بۆلای.

—ئەگەر بمتوانیایە، بەدڵنیاییەوە پێم دەگوتیت.

وەڵامی نەدایەوە. هەروەك کەسە شکستخواردوەکان بوو، هەروەك بڵێی من کارێکی خراپم ئەنجامدابێت. نێوچاوانی کەمێك چرچ بوبو. دووجار زۆر بەتوندی تفی دەمی قوتدایەوە.

—پاتریك...

—لو، نەخێر، ئێستە تەنها و تەنها دەبێت ڕابکەم. خۆم بەتەنهایی.

دەستێکی هێنا بەسەرو قژیدا.

—باشە؟

منیش تفی دەمم قوتدایەوە و گوتم:

—باشە.

بۆ ساتێك قیافەی بەجۆرێکی لێهات کە هەروەك بڵێی لەبیری چووەتەوە بۆچی لەوێین. دواتر بەڕێکەوت. من وەستام و سەیریم دەکرد کە لەجادەکەی بەرامبەرمەوە خەریکە لەبەرچاوان ووندەبێت. بەوپەڕی بڕشتەوە بەرەوپێشەوە دەیڕوانی. قاچەکانی زەوییەکەیان هەڵدەلوشی.

***

دووبەیانی ئەو ڕۆژەی کە لە ئاهەنگی بوکێنیەکە گەڕاینەوە داواکارییەکەم پێشکەش کرد:

*(کەسێك دەتوانێت شوێنێکم نیشانبدات کە کەسێکی ئیفلیج بتوانێت سەریەکێچەڵی هەبێت؟ بەشوێن کۆمەڵێك بەرنامەدا دەگەڕێم کە مرۆڤە تەندروستەکان ئەنجامیان دەدەن. بەرنامەگەلێك کە بینە هۆی ئەوەی کەئەم ماوەیە بێزارەم لەبیری بچێتەوە کە لەژیانیدا سنورداری هەیە. بەتەواوەتی نازانم کە چیم دەوێت، بەڵام پێشوازی لە هەموو پێشنیارەکانتان دەکەم. زۆریش خێراو بەپەلەیە.*

*هەنگی زۆرکان)*

کاتێك دووبارە چومە ناو سیستەمەکە، بە باوەڕنەکردنەوە سەیری لاپەڕەی بەرامبەرم کرد. هەشتاو نۆکەس وەڵامیاندابویەوە. چومە سەرەوە و خوارەوەی لاپەڕەکە، سەرەتا گومانم هەبوو کە هەموو ئەو شتانە وەڵامی داخوازییەکەی من بن. دواتر سەیری هەموو ئەوکەسانەم کرد کە لەناو کتێبخانەکەدا و لەدەوروبەرمدا دانیشتبون. ئەمویست یەکێك سەیرم بکات بۆ ئەوەی بتوانم داوای یارمەتی لێبکەم. هەشتاو نۆ وەڵام تەنها بۆ یەك پرسیارو داواکاری!

کۆمەڵێك چیرۆك و بەسەرهات و داستانیان سەبارەت بەوکارانە نوسیبوو کە ئیفلیجەکان دەتوانن ئەنجامیانبدەن. خۆهەڵدان لەبەرزاییەوە بەیارمەتی ڕاکێشانی پەت، مەلەکردن، لێخوڕینی بەلەم و تەنانەت ئەسپسواری بە یارمەتی چوارچێوە و شوێنی تایبەت. (کاتێك ئەو گرتە ڤیدیۆیانەم بینی کە لەوبارەیەوە ناردبویان، کەمێك بێتاقەت بووم، کاتێك بەبیرم هاتەوە کە ویل گوتبوی تاقەتی ئەسپەکانی نییە. لەکاتێکدا کە بەشتێکی زۆر باش دەهاتەپێشچاو).

مەلەکردن بە دۆڵفین و چونە بنی دەریا بە دەمامکی تایبەتی ئۆکسجین لەگەڵ هێزی یارمەتیدەردا، لەوکارانە بوو کە دەکرا ئیفلیجێك ئەنجامیان بدات. بە یارمەتی کورسییە تایبەتەکانی مەلەوانی دەیتوانی بچێت بۆ ڕاوەماسی. کورسییە چوارتایە تایبەتەکانی تواناویستان هەبوو کە دەیتوانی سواریان ببێت و شۆفێری بکات.

هەندێکیان وێنە یان ڤیدیۆی خۆیان ناردبوو. چەند کەسێك لەوانەیش (ریچی) پۆستەکانی پێشوی منیان لەبیر بوو موشتاق بوون بزانن ویل چی دەکات.

*(وادیاره باروبۆخ باشه. ڕۆحیەی باشتره؟)*

منیش خێرا وەڵامدایەوە:

*(لەوانەیە، بەڵام زۆر هیوادارم ئەم سەفەرە بتوانێت سودی هەبێت بۆی).*

ریچی وەڵامیدایەوە:

*(ئافەرین بۆتۆ کچی باش! ئەگەر بتوانیت بیهێنیتە سەر ڕێگە، ئەوا پان و بەرینی ئاسمانیش بەس نییە بۆ کاروچالاکیەکانی ئەو).*

سکوتاگرل نوسی:

*(لەبیرت نەچێت چەند وێنەیەکی بە شتومەك و جلوبەرگی خۆ هەڵدان و ڕاکێشان بە پەتی هاوڕێکەتمان بۆ بنێرە. حەزدەکەم قیافەی مرۆڤەکان لەوکاتەدا کە سەرەتایانە کارێك دەکەن، ببینم!).*

عاشقیان بووم، عاشقی ئەم ئیفلیج و پەرستارانەیان، زۆر بەرێزو گەورەبون و مرۆڤیان دڵگەرم دەکردەوەو هێزێکی بیرکردنەوەی باش و بەهێزیان هەبوو. ئەو شەوە نزیکەی دوو کاتژمێر دانیشتم و پێشنیارەکانیانم لەسەر کاغەز نوسی. سەرێکم لە لینکی ئەو سایتانەدا کە بەرنامەکانیان تاقیکرابونەوە، تەنانەت قسەم لەگەڵ هەندێکیشیاندا کرد. لە کۆتاییدا کاتێك لە کتێبخانەکە چومە دەرەوە. ئامانج و بەرنامەگەلی زۆرم بە دەستەوە بوو، دەمانتوانی بچین بۆ کالیفۆرنیا بۆ کێڵگەی فوڕ ویندس، کێڵگەیەکی تایبەت کە یارمەتییە ئەزمونییەکانی پێشکەش دەکرد، بە قسەی وێب سایتەکەی (بەجۆرێك ئەو یارمەتیانەتان پێشکەش دەکات کە بیرتان دەچێتەوە کەسێکی تواناویست و کەمئەندامن). خودی کێڵگەکە خانویەکی دارینی نزم بوو، لەناو دارستانێکی نزیکی یوسمیت کە ئاڵۆگۆڕکارێك دایمەزراندبوو. ئەم ئاڵۆگۆڕکارە ڕێگەی نەدا کە زیانی مێشك و دەمار ژیانی سنوردار بکات. کەسانێکی زۆر کە چوبون بۆ ئەوێ، بەوپەڕی خۆشحاڵی و هەستێکی زۆری قەدرزانییەوە کۆمەڵێك یادگاری و یاداشتیان لە ئینتەرنێتدا بلاوکردبویەوە کە ئەو پیاوە ئالوگۆڕکارە تێڕوانینی ئەمانی بۆ ژیان گۆڕیبوو، ئێستە بە جۆرێکیتر سەیری خۆیان و بێتواناییی خۆیان دەکەن. بەلایەنی کەمەوە شەش کەس چوبون بۆ ئەو شوێنە. هەموشیان دەیانگوت کە ژیانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

ئەم کێڵگەیە بێجگە لەوەی کە هەموجۆرە پێداویستیەکی تواناویستانی فەراهەم دەکرد. وەك ئوتێلێکی لوکسیش دەژمێردرا. کۆمەڵێك جاکوزی گەورەی بەڕوی فەزای کراوەدا هەبوو، کە لەخواری ئاستی ڕوی زەوییەوە بوون، لەگەڵ کۆمەڵێك مەسعەدی بێوەی و کەسانی مەساجکاری شارەزاو پسپۆڕ. کارمەندی پیشەگەری چاودێرە پزیشکیەکانیشان هەبوو، کاتێك ئاوی ناو جاکوزییە گەورەکان گەرم دەبوو دەتوانرا لەناویدا دابنیشن و سەیری ئەستێرەکان بکەن. یەك حەفتە دەمانتوانی لەوێدا بمێنینەوە. چەند ڕۆژێکیش لەکەناری ئوتێلێکدا کە ویل دەیتوانی مەلە بکات و بەبینینی هێڵی کەنارە بەردینەکەی چێژ وەربگرێت. لە هەمووی باشتر، لوتکەی ئەو گەشتانە شتێکبوو کە ویل هەرگیز فەرامۆشی نەدەکرد، ئەویش بریتی بوو لە پەڕەشوت بازی بەیارمەتی ڕاهێنەرانی پەڕەشوتی ڕزگاری، کە بەتایبەت بۆ یارمەتیدانی کەسانی ئیفلیج فێرکارییان بینیبوو. کۆمەڵێك کەرەستەی تایبەتیان هەبوو کە ویلیان دەبەست پێیانەوە( لە بڕیارنامەکەوە دیاربوو کە گرنگترین خاڵ پەیوەندی هەبوو بە بێوەیی قاچەکانەوە و ئەوەی کە نابێت لەهەوادا بجوڵێن و بەرەولای دەموچاو هەڵنەگەڕێنەوە).

کتێبە بچوکەکەی تایبت بە ڕێنمایی ئوتێلەکەم نیشانی ویل دەدا، بەڵام نەمدەویست لەمبارەیەوە ڕونکردنەوەیەك بدەم. تەنها ئەمویست لەگەڵ ویلدا بڕۆین و دواتر تەماشای بکەم کە چی دەکات. لەوساتە بەنرخانەدا ویل کێشی نەدەماو ئازاد دەبوو. لەو کورسییە ترسناکە ڕزگاری دەبوو لە هێزی کێشکردنی زەویش ئازاد دەبوو.

هەموو زانیارییەکانم نوسی و لەبەرچاوی خۆمدا دامنا. هەرکاتێك سەیرم دەکردن، خەریکبوو لە خۆشیدا پەڕو باڵ دەربکەم و بفڕم. بەهۆی بیرکردنەوە لەوەی کە بۆ یەکەمینجارە گەشتێکی باش و ڕێکوپێك دەکەم، هەروەها بیرکردنەوە لەوەی کە دەگەیشتم بە ئامانجەکەم، بێگومان زۆر شادومان بووم. بێگومان ئەمە هەمان ئەو شتەبوو کە بیرو بۆچونی ویلی دەگۆڕی.

بەیانی ڕۆژی دواتر یاداشتەکەم نیشانی نیتن دا. لەناو چێشتخانەدا بەدزییەوە بەسەر کوپی قاوەکانماندا چەمابوینەوە، ئەگەر کەسێك ئێمەی بدیبایە وایدەزانی کارێك ئەنجامدەدەین. هەروا کە خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی یاداشتەکەم بووم، گوتم:

—قسەم لەگەڵ ئەو کەسانەدا کردووە کە چەتربازییان کردووە. لەڕوی پزیشکیەوە هیچ کێشەیەکی نییە. بۆ مەسەلەی خۆهەڵدان بە پەتیش بەهەمانشێوە بێ گیرو گرفتە. چونکە کۆمەڵێك کەرەستەی تایبەتیان هەیە کە ڕێگرن لە هەرجۆرە زیانێك بە مێشك و دەمار.

بە نیگەرانییەوە واقم بەدەموچاویدا ورما. دەمزانی کاتێك مەسەلە پزیشکیەکانی ویل لە ئارادا بێت، ئیتر نیتن من بەکەسێکی شیاوو شارەزا بۆ ئەوکارە نازانێت. هەربۆیە بەلامەوە زۆر گرنگ بوو کە لەبەرنامەڕێژییەکەم ڕازی بێت.

—لێرەدا هەموو پێداویستیەکان هەیە. دەڵێن ئەگەر پێشتر هەواڵیان پێبدەین و وەرەقەی پزیشکمان پێبێت تەنانەت دەرمانە تایبەتەکانیش کە پێویستمانە بۆمانی ئامادە دەکەن. هەر لەبەر ئەمەیە بەبێ دەرمان نابین.

چرچێکی خستە نێوچاوانی. سەرئەنجام گوتی:

—وادیارە کە باشە. کارێکت کرد بەراستی کارستان بێت.

—بەبڕوای تۆ پێی خۆش دەبێت؟

شانەکانی هەڵتەکاند.

—هیچ گومانێکم نییە بەلام....

کاغەزەکانی یاداشتەکانی دابەدەستمەوە.

—لو سوپرایزت کردین.

زەردەخەنەیەکی هاروهاجانەی کرد و بەرەولایەك دەموچاوی ڕادەکێشرا.

—دیسانەوە دەتوانیت دووبارەی بکەیتەوە. بەڵێ بۆنا.

کەمێك وەستام، خاتوو ترینەر ئۆتۆمبیلەکەی بەرەو لای ڕێڕەوی ئۆتۆمبیلی ماڵەکە برد، شوێنێك کە لەدوری گوڕەپانی بەردەم پەنجەرەکەی ویلەوە بێت، دواتر چومە پێشەوە و گوتم:

—دەزانم تێچویەکی زۆری بۆ ئێوە دەبێت. بەلام بەبڕوای من زۆر باشە. بەڕاستی پێموایە کۆمەڵێك کاتی زۆر خۆشن بۆ ویل. ئەگەر... ئەگەر بەباشی لە مەبەستەکەم تێگەیشتبن.

لە بێدەنگیدا هەڵسەنگاندنی بۆ یاداشتەکەم کرد. دواتریش سەیری نرخەکانیکرد.

—ئەگەر بتانەوێت خۆم تێچوەکەی دەدوەم. بۆ فڕۆکە و ئوتێلەکە. حەزناکەم کەس وابزانێت...

قسەکەی بڕیم و گوتی:

—زۆر باشە. هەرکارێك کە پێویستە ئەنجامیبدە. ئەگەر پێتوایە کە دەتوانیت بیبەیت، ئەوا جێگەی بگرن.

لە مەبەستەکەی تێدەگەیشتم، ئێستە کاتی کۆمەڵێك بیرۆکەی تر نەبوو. پرسی:

—پێتوایە بتوانی ڕازی بکەیت؟

—باشە، ئەگەر..ئەگەر گومانەکەم دروست بێت...

تفی دەمم قوتدایەوە.

—بەشێکی لەبەرخاتری منە. ویل پێیوایە من کارێکی تایبەتم لەژیانمدا ئەنجامنەداوە. هەمیشە پێمدەڵێت کە دەبێت سەفەرو گەشت بکەم. دەبێت کارێك ئەنجامبدەم.

بەوردی واقی بەمندا وڕمابوو. بەسەر ڕاوەشاندن بەڵێی کرد و گوتی:

—بەڵێ، ئەمە بۆچونیەتی.

یاداشتەکانی دایەوە دەستم.

—من...

هەناسەیەکم تازە کردەوە. لە کۆتاییدا بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دەبینم ناتوانم قسە بکەم. زۆر بە ئاستەم تفی دەمم قوتدایەوە.

—ئەو شتەی کە پێشتر گوتت.... هیچکات مەبەستم.... خۆشحاڵی ویل بەلای منەوە لە هەموشتێکیتر گرنگترە. من، من...

وادیاربوو نەیدەویست چاوەڕێی پاشماوەی قسەکەم بکات. سەری داخست. پەنجە ناسکەکانی لە زنجیرەکەی ملی ئاڵاند.

—بەڵێ، باشە، باشتروایە بچمە ژورەوە. بەیانی دەتبینمەوە. بۆم بگێڕەوە کە چی گوت.

***

ئەو شەوە نەچوم بۆ ماڵی پاتریك. ئەمویست بچم، بەڵام شتێك منی لە پارکێکی پیشەسازی دوردەخستەوە. چومە ئەوبەری شەقامەکەوە و سواری پاس بووم و بەرەو ماڵەوەمان بەڕێکەوتم. ١٨٠ هەنگاو بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتم و چومە ژورەوە. شەوێکی گەرم بوو هەموو پەنجەرەکان کرابونەوە بۆ ئەوەی شنەبا بچێتە ژورەوە. دایکم لەناو چێشتخانەکەدا سەرقاڵی چێشت لێنان بوو لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەگوت. باوکیشم پەرداخە دەستکدارە قاوەییەکەی بەدەستەوە بوو لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو. بابەگەورەیشم لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو سەرخەوی دەشکاند، سەری بەلایەکدا شۆڕ بوبویەوە. تۆماسیش بە ماجیك وێنەی لەسەر پێڵاوەکانی دەکێشا. سڵاوم کرد و بەلایاندا تێپەڕیم. سەرم لەوە سوڕدەما کە چەندە زوو ئەم هەستە لەمندا بەدیهاتووە کە ئیتر پەیوەست نیم بەوماڵەوە.

ترینا لەناو ژورەکەی مندا سەرقاڵی ئیش بوو. تەقەیەکم لە دەرگاکە دا و چومە ژورەوە. دەبینم لەسەر مێزەکە دانیشتوە و بەسەر کۆمەڵێك کتێبدای چەماوەتەوە. چاویلکەیەك لەسەر لوتی بوو کە تاوەکو ئێستە نەمبینیبو. بینینی ئەو لەناوەڕاستی ئەوشتانەی کە من بۆ خۆمم ئامادەکردبون زۆر نائاسایی بوو. ئەو دیوارانەی کە من بە وەسواسییەکی تەواوەوە بۆیاخم کردبوون. ئێستە پڕ بوبون لە وێنەکێشراوەکانی تۆماس. هێشتا بە قەڵەم خەریکبوو سوچێکی پەردەکەمی خەت خەت دەکرد. بیرو زەینی خۆمم کۆکردەوە بۆ ئەوەی ناخودئاگا توڕە نەبم.

سەیرێکی دواوەی خۆی کرد و گوتی:

—دایکم ئیشی پێم هەیە؟

سەیری سەعاتەکەی کرد.

—وامزانی خەریکە چایی بۆ تۆماس لێدەنێت.

—بەڵێ. تۆماس خەریکە لەفەو قەباڵەی گۆشتی ماسی دەخوات.

سەیری منی کرد و دواتر چاویلکەکەی لابرد.

—تۆ باشیت؟ بۆچی قیافەت وەك ئەوی لێهاتووە؟

—خۆیشت هەروایت.

—دەزانم ئەم ڕژێمە گاڵتەجاڕانەیەم گرتوە. هەمیشەیش زیبکەو لیر دەردەکەم.

دەستی برد بۆ چەناکەی.

—تۆ پێویستت بە ڕژێم نییە.

—بەڵێ... باشە، یەکێك لەناو خولی ژمێریاری ٢ دا هەیە کە خۆشم لێی دێت. دەبێت هەوڵی خۆم بدەم. زیبکەو لیری گەورەی دەموچاویش مرۆڤ ناشیرین و ناقۆلا دەکەن.

لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتم. بەرگی لێفەکەی من بوو. دەمزانی کە پاتریك لەبەر شێوە ئەندازیارییە گاڵتەجاڕانەکانی ڕقی لەم بەرگە لێفەیە. سەرم لەوە سوڕ دەما کە چۆن کاترینا ڕقی لێیان نییە.

کتێبەکەی داخست و پاڵیدا بە کورسییەکەوە.

—باشە، دەنگوباس چییە؟

لێوم بە ددان گرت، دوبارە پرسی.

—ترینا بە بڕوای تۆ من دەتوانم لە خوێندن بەردەوامبم؟

–درێژه به خوێندنەکەت بدەیت؟ چ خوێندنێك؟

–چوزانم، شتێك كه پەیوەندی بە مۆدەوه هەبێت. دیزاینەری، لەوانەیشە تەنها بەرگدرویی.

–باشه، ئەوه خولی خۆی هەیە. زانكۆی ئێمه لێیەتی. ئەگەر بتەوێت دەتوانم لێکۆڵینەوه و پرسیارت بۆ بکەم.

–باشه کەسانێکی وەك من وەردەگرن؟ ئەو كەسانەی كه هیچ تایبەتمەندی و پسپۆڕییەکیان نییە. پێنوسەکەی بەرەوسەرەوه فڕێدا و گرتییەوه.

–ئۆو، ئەوان زیاتر حەزدەکەن خوێندكارانی بەتەمەن بەشداری بکەن. بەتایبەت ئەوانەی كه ئیشێکی پەسەند و بەنرخیان هەیە. بەدڵنیاییەوه دەبێ یەکەی قسەکردن تێپەڕێنی. بەڵام بۆچی كه نا، بۆچی؟ ئێستە چی بووه كه لەکەللەی داویت و دەتەوێت بخوێنیت؟

–نازانم. ویل ماوەیەك لەمەوبەر پێی گوتم كه دەبێت کارێك بۆ ژیانی خۆم بکەم.

–باشه، ئێ دواتر؟

–ئێستە خەریکم بیر دەکەمەوه... لەوانەیە ئیتر کاتی ئەوه بێت کەمنیش ئەمکارەی تۆ بکەم و دەستبکەمەوه به خوێندن. ئێستە كه باوکم دەرەقەتی خەرجی ماڵەوه دێت. لەوانەیە ئیتر تۆ تەنها کەسی شیاو نەبیت كه کارێك بۆ ژیانت دەکەیت.

–دەبێت مانگانه پاره بدەیت.

–دەزامم، پاشەکەوتم هەیە.

–وابزانم کەمێك لەوپارەیه زیاتر بێت كه تۆ توانیت پاشەکەوتی بکەیت.

–دەشتوانم یارمەتی وەربگرم. لەوانەیه قەرز وەربگرم. بۆ ئەوەی دەستپێبکەم. لەگەڵ خاتونێکدا ئاشنا بوم كه نوێنەری ئەنجومەن بوو. ئەو گوتی كه کۆمەڵێك دۆست و ئاشنای هەیە كه دەتوانن یارمەتیم بدەم. کارتەکەی خۆی پێداوم.

کاترینا لەناو کورسییەکەدا سوڕێکی خوارد و گوتی:

–بوەستە، بەباشی تێنەگەیشتم. وامدەزانی دەتەوێت لەلای ویل بمێنیتەوه. تەنها لەبەر ئەوەی كه دەتەوێت به زیندویی بیهێڵیتەوه.

چاوم بڕییه سەقفەکە.

–بەڵێ...بەڵام...

–بەڵام چی؟

–زۆر ئاڵۆزە.

–سادەیە. وادیارە دراوی کاغەزیش چاپ دەکەیت.

لەسەر کورسییەکە هەستایەوە و چو دەرگای ژورەکەی داخست. دەنگی نزمکردەوە بۆ ئەوەی دەنگی نەچێتە دەرەوە.

–وادیارە پێتوایە خەریکە کارەکەت لەدەست دەدەیت. ئەریێ؟ ئەیەوێت بڕوات...

خێرا گوتم:

–نەخێر، هەرگیز بەوجۆرە نییەو وا بیرناکەمەوە. تەنها کۆمەڵێك بەرنامەم بۆ خۆم هەیە. بەرنامەگەلێکی گەورە، دواتر نیشانت دەدەم.

–بەڵام.....

دەستم بەرزکردەوە بۆ سەر سەرم و پەنجەکانم لەیەکتری ئاڵاند.

–بەڵام من زۆر عاشقی ویل بوون.

بە وردی سەیری کردم. قیافەیەکی بیرمەندانەی لەخۆی گرتبوو. هیچ شتێك ترسناکتر لە قیافەی بیرمەندانەی خوشکەکەم نەبوو کاتێك ڕاستەوخۆ منی نیشانە دەگرتەوە.

–ئای....

–نەخێر....

گوتی:

–مەسەلەکە سەرنج ڕاکێش بووە!

دەستم هێنایە خوارەوە.

–دەزانم.

کارت دەوێت تاوەکو...

–ئەمە قسەیەکە کە ئیفلیجەکان بەیەکتری دەڵێن. ئەو ئیفلیجانەی کە لەناو ئینتەرنێتدا بەیەکەوە قسە دەکەین. ناکرێت هەردوکیان بیت. ناتوانیت هەم پەرستار بیت و هەمیش...

دەستم بەرزکردەوە و گرتم بە دەموچاومەوە.

هەستم بە قورسی نیگاکانی دەکرد.

–خۆی دەزانێت؟

–نەخێر. نازانم. من تەنها...

بەدەما خۆم فرێدایە سەر سیستەمەکە. بۆنی تۆماس و بۆنی مارمایتی دەدا.

–بەهیچ شێوەیەك نازانم بیر لەچی دەکەمەوە. بەڵام ئەوەندە دەزانم کە زۆربەی کاتەکان لەگەڵ ئەودابم تاوەکو کەسێکیتر.

–تەنانەت پاتریکیش!

هەروایش بوو. واقیعیەت و ڕاستیەك کە دانپێدانانی بەلای خۆیشمەوە زۆر سەخت بوو. هەستمکرد کوڵمەکانم سوربونەوە. لەناو لێفەکەدا گوتم:

–بەڵێ، هەندێکجار بەڵێ.

چەند ساتێك هیچی نەگوت، بەڵام دواتر گوتی:

–بۆگەن بکەیت باشە! وامدەزانی ئەوە تەنها منم کە ئەمەوێت خۆم بخەمە ناو دەردەسەرییەوە.

ئەویش لەسەر سیستەمەکە و لەتەنیشتمەوە ڕاکشاو هەردوکمان چاومان بڕییە سەقفەکە. لەخوارەوە دەنگی نارێکی فیقەنەکەی بابەگەورە دەهات. لەگەڵ قیژە و دەنگەدەنگی تۆماسدا کە خەریکبوو لەعابە کۆنترۆڵەکەی لەدوورەوە بەرودوا پێدەکرد. نازانم بۆچی چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك. چەند ساتێك دواتر هەستم بە دەستی خوشکەکەم کرد کە پێچای بەدەوری کەمەرمدا.

–ئەی شێتە!

هەردوکمان دەستمانکردە پێکەنین. دەموچاوم سڕی و گوتم:

–خەمت نەبێت بەبێ پەردەباز نادەم بەناو ئاودا.

–زۆر باشە. چونکە هەرچی زیاتر بیر دەکەمەوە، دەبینم بابەتەکە زۆر جیدییە.

–یانی چی؟

–باشە، مەسەلە ژیان و مردنە. تۆ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ توش و گیرۆدەی ژیانی ئەم پیاوە دەبیت، گیرۆدەی ئەم ڕازو نهێنیە سەیرو سەمەرەیەی ئەو دەبیت. بەجۆرێك لەجۆرەکان نزیکی و خۆشەویستیەکی درۆینە هاتبویە پێشەوە. لەوانەیش جەوگیر بویت و دەتەوێت لاسایی پەرستاری ئینگلیزی (فلورانس نایتینگل)[٣١] بکەیتەوە.

---

[٣١] پەرستارێکی ئینگلیزییە و دامەزرێنەری پیشەی پەرستاری مۆدێرنەیە. (١٨٢٠ - ١٩١٠).

-باوەڕبکە بەهیچ شێوەیەك بەمجۆرە نییە.

هەروا ڕاکشاین و چاومان بڕیبویە سەقفەکە.

-بەڵام کەمێك بێ ئەقڵانەیە. بیرۆکەی عەشق و عاشقی لەگەڵ کەسێکدا کە ناتوانێت... مەبەستم ئەوەیە کە عەشقت پێبدات. لەوانەیە لەو ڕاستیەی کە خەریکە تۆو پاتریك بەیەکەوە دەژین، حەپەساویت و ئێستە بەمشێوەیە کاردانەوە نیشاندەدەیت.

-دەزانم. تۆ ڕاست دەکەیت.

-ئێوە هەردوکتان ماوەیەکی دوورودرێژە کە بەیکەوە بوون، تۆ پابەندیت هەیە و نابێت دڵ بەکەسێکی تر بدۆڕێنیت.

-بەتایبەت کاتێك کە ناوبراو سەرقاڵی ڕاهێنانەکانییەتی و هەموو خەم و خەیاڵێکی بووەتە ئەوەی کە ببێتە قارەمانی ماراسۆن.

-دەبێت دڵ لە ویل هەڵبکەنیت. مەبەستم ئەوەیە، لەبیرمە کە دەتگوت چەندە کەسێکی خوێڕی و بێتامە.

-ئێستەیش هەندێکجار ئەوە دەڵێم.

خوشکەکەم کلێنسێکی هەڵگرت و چاوی بۆ سڕیم. دواتر پەنجەگەورە هێنا بەسەر کوڵمدا.

-چون بۆ زانکۆ بیرۆکەیەکی زۆر باشە. چونکە-وەرە با ڕوڕاست و ڕاشکاوبین- چ دەستت لە کلکی ویل ببێتەوە یان نەبێتەوە، تۆ پێویستت بە ئیشێکی ڕێکوپێك و باش هەیە. خۆ ناتەوێت تاوەکو کۆتایی تەمەنت بڕۆیت بۆ ماڵی خەڵکی و پەرستاری بکەیت.

-دەستم بە کلکی ویلەوە بەرنابێت. کێشەکەی چارەسەر دەبێت.

-یاخوا وابێت!

دایکم تۆماسی بانگدەکرد. گوێم لە دەنگی بوو کە لەقاتی خوارەوە گۆرانی دەگوت. تۆماس. توم توم توماس....

ترینا ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا و دەستێکی هێنا بەچاویدا.

-ئەمشەو دەگەڕێتەوە بۆلای پاتریك؟

-بەڵێ.

–دەتەوێت بچینە دەرەوە و شتێك بخۆین و تۆیش بەرنامەکەتم نیشانبدەیت؟ جاری بزانم دایکم دەتوانێت لەبری من تۆماس بخەوێنێت. وەرە بابڕۆین. ئێستە کە ئەوەندە پارەت هەیە کە بتوانیت بچیتە زانکۆ دەبێت دەعوەتێکم بکەیت.

***

چارەکی ئەویست بۆ دە ئەوکات گەیشتمە ماڵی پاتریك.

بەرنامەکانم بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و لەسەدا سەد جێگەی پەسەندی کاترینا بوون. تەنانەت وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی نەیگوت: (بەڵێ.. بەڵام باشتروایە کە....) لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە لەبەر ئەوەی کە ئەیویست ڕەچاوی بارودۆخم بکات هیچی نەگوت، چونکە بەتەواوەتی دیاربوو کە موشتاقی ئەم سەفەرو گەشتەم. چەندجارێکیش دووبارەی کردەوە: (ئۆو، باوەڕم نەدەکرد کە شتێکی لەمشێوەیە بدۆزیتەوە! دەبێت لەوکاتەدا بە پەت خۆی هەڵدەدات وێنەیەکی زۆری بگریت). یان گوتی: (قیافەی بهێنەرە پێشچاوی خۆت کاتێك دەتەوێت باسی چەتر بازی بۆ بکەیت. زۆر نایابە).

مرۆڤەکانی ناو بارەکە بەدڵنیاییەوە وایانزانی ئێمە دوو هاوڕێی خۆشەیستی یەکترین و زۆریش یەکترمان خۆشدەوێت.

چومە ناو ئاپارتمانەکەی پاتریکەوە، لەدەرەوە تاریك و بێدەنگبوو. بەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بوبوم. لە خۆمم پرسی یانی پاتریك شەوانیش ڕاهێنانی هەیە. لەناو ڕێڕەوەکەدا جانتاکەم داناو دەرگای ژوری دانیشتنەکەم کردەوە. خەریکبوم لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە و دەمگوت چەندە باشە کە گڵۆپەکەی نەکوژاندوەتەوە.

دواتر بینیم لەسەر مێزەکە دانیشتووە و مێزەکەیشی بۆ دوو کەس ڕازاندبویەوە. لەناوەڕاستی مێزەکەدا مۆمێك داگیرسابوو. هەرکە دەرگاکەم لەدوای خۆمەوە داخست، هەستایەوە. نیوەی زیاتری مۆمەکە سوتابوو گەیشتبویە بنەکەی. گوتی:

–داوای لێبوردن دەکەم.

سەیرێکیم کرد.

–من بێئەقڵ بووم تۆ ڕاست دەکەیت. ئەم کارەی تۆ تەنها بۆ شەش مانگە. هەڵسوکەوتم منداڵانە بوو. دەبێت شانازیت پێوە بکەم کە بەم نرخ و بەهایەوە کارەکەت ئەنجام دەدەیت و

ئەوەندە بەجیدی وەرت گرتووە. کەمێك... تەنها کەمێك... گێژو وێژ بووم. داوای لێبوردن دەکەم.

دەستی ڕاکێشاو منیش گرتم.

—زۆریش باشە کە یارمەتی دەدەیت. ئەمە جێگەی دەستخۆشی و ئافەرینە.

دەستیم توند گوشی.

—سوپاست دەکەم.

هەناسەیەکی کورتی هەڵکێشاو دووبارە دەستیکردەوە بە قسەکردن. هەروەك بڵێی پێشتر ڕاهێنانی قسەکانی بەباشی کردبوو.

—نانی ئێوارەم دروستکرد. شەرمەزارم کە دیسانەوە زەلاتەیە. بەلامدا تێپەڕی لەناو بەفرگرەکەدا دوو قاپی دەرهێنا.

—پەیمان بێت لەپاش پێشبڕکێکە بچینە دەرەوەو خواردنێکی شاهانە بخۆین. یان کاتێك سنوورداریيەتی خواردنی کاربۆهیدراتم نییە. من تەنها....

فوی کردە گوپەکانی و لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—ئەم ڕۆژانە هەروەك بڵێی ناتوانم بیر لە شتێکیتر بکەمەوە. لەوانەیە کێشەکە لێرەدا بووە، تۆ ڕاست دەکەیت. چ بیانویەك هەیە کە بەشوێنمدا بێیت. ئەوە مەسەلەیەکی تایبەت بە خۆمە. لەبەرامبەردا تۆیش مافی خۆتە کە بەکارەکانی خۆتدا ڕابگەیت.

من گوتم:

—پاتریك....

—لو، هەرگیز نامەوێت لەوبارەیەوە قسەم لەگەڵدا بکەیت. تەنها داوات لێدەکەم لەبیری بکە.

بۆنی قۆلانی دەدا و چاوەکانی نغرۆی موشتاقی بوون. هەروەها واقیعیەت و ڕاستیەك کە بارێکی دەخستە سەرشانەکانم.

—ئێستە دانیشە. وەرە با نان بخۆین. دواتریش... نازانم. وەرە با دڵخۆش بین. باباسی وەرزش نەکەین، لەبریدا باسی شتانێکیتر بکەین.

دواتر پێکەنینێکی بەزۆری کرد.

دانیشتم و چاوم بڕییە مێزەکە.

زەردەخەنەم کرد و گوتم:

-چەندە باشە.

پاتریك شارەزایی ئەوەی هەبوو کە بە سنگی قەل نزیکەی سەدجۆر خواردن دروستبکات.

زەلاتەی کاهو، زەلاتەی پاستا، زەلاتەی دەریایی و زەڵاتەیەکی بەتامی میوە کە بۆ پودیمگ ئامادەی کردبوو خواردمان. من شەرابم خواردەوە و پاتریکیش ئاوی کانزایی. ماوەیەك تێپەڕی و ئێمەش گەیشتینە ئارامی. لەوێدا و لەبەرامبەر منەوە، پاتریك دانیشتبوو، کوڕێك کە ماوەیەکی زۆربوو هیچ سەرنج و گرنگییەکم پێنەدەدا. زۆر نازدارو میهرەبان بوو. بە هەموو بون و وجودی خۆیەوە ئاگاداربوو کە باسی وەرزش و پێشبڕکێ نەکات. هەرکاتێك قسەو گفتوگۆکان بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچون، یەکسەر پێدەکەنی. لەژێر مێزەکەوە قاچێکی لەقاچم دەدا و پێیەکانمان لەیەکتری ئاڵابوون. وەختێ کەمێك کات تێپەڕی، بەجۆرێك لەجۆرەکان جەستەم هاتەوە یەك و هەستمکرد زۆر بێتاقەتم.

خوشکەکەم ڕاستی دەگوت. ژیانی لەڕەوڕەوەی ئاسایی دەرچوبوو پەیوەندیم لەگەڵ کەسانی دەوروبەرمدا پچڕابوو. بارودۆخی خەمبارو پڕ داخ و پەژارەی ویل و ڕازەکانی منیان لەناو خۆیاندا نغرۆ کردبوو. دەبوایە ئاگاداربومایە کە لە خەڵکانیتر بەجێ نەمێنم و لێیان بێئاگا نەبم.

وردە وردە لەبارەی ئەو قسانەی کە بە خوشکەمم گوت هەستم بە گوناح و تاوان دەکرد. پاتریك نەیدەهێشت هەستمەوە، تەنانەت نەیهێشت یارمەتی بدەم بۆ ئەوەی مێزەکە کۆ بکەینەوە. کاتژمێر یازدە و پازدە خولەك بوو، پاتریك هەستایەوە و دەفرەکانی کۆکردەوە و بردنی بۆ چێشتخانەکەو خستنیە ناو غەسالەی قاپشۆرەکەوە. منیش دانیشتم و گوێم بۆ ئەو گرتبوو کە قسەی بۆ دەکردم. هەموو ئەو ماوەیەش بەردەوام دەستم دەهێنا بە نێوان شان و ملمدا و هەوڵمدەدا ئەو گرژبونی دەمارەی کە لەو شوێنەدا هەستم پێدەکرد، نەیهێڵم و لەناوی بەرم. چاوەکانم داخست بۆ ئەوەی کەمێك هێمن ببمەوە. هەربۆیە چەند خولەکێك تێپەڕی تاوەکو تێگەیشتم کەپاتریك بێدەنگبووە.

چاوەکانم کردەوە. پاتریك چاوی بڕیبویە من. چەند لاپەڕەیەکی بەرزکردەوە و گوتی:

-ئەمانە چین؟

-بەرنامەی گەشتەکە، هەر ئەوەی کە بۆم باسکردبویت.

دانەدانە ئەو یاداشتانەی هەڵدایەوە کە نیشانی خوشکەکەم دابوو. بەرنامەی گەشتەکە، وێنەکانم و کەناری کالیفۆرنیاو هەموو شتەکانی بینی. کاتێك دەستیکردە قسە کردن، بەشێوەیەکی زۆر نامۆ نائاسایی بوو.

—من وامدەزانی.... من وامدەزانی مەبەستت لوردە.

—چی؟

—نازانم... یان ستوك مندویل.... یاخود ئەمجۆرە شوێنانە. کاتێك گوتت ناتوانی لەگەڵ مندا بێیت، وامزانی بەڕاستی کارێکت هەیە. کە پەیوەندی بەداوو دەرمان و ئەمجۆرە شتانەوە هەیە. خۆ ئەمە وەك....

بە ناباوەڕییەوە سەری ڕاوەشاند.

—خۆ ئەمە سەفەرێکی گەشتیاری و گەڕانە.

—بەجۆرێك لەجۆرەکان بەڵێ. بەڵام نەك بۆمن. بەڵکو بۆ خۆی.

برۆکانی چونەوە یەك و نێوچاوای گرژ بوو.

—نەخێر...

سەری ڕاوەشاند.

—خۆ بەهیچ شێوەیەك بۆتۆ خۆش نییە! جاکوزی پڕ لە ئاوی گەرمی ژێر ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە، مەلەکردن لەگەڵ دۆلفینەکاندا....ئۆو.... سەیری ئێرە بکە، ئوتێلی پێنج ئەستێرە و خزمەتگوزاری شەوو ڕۆژی و بیست وچوار کاتژمێری.

سەیرێکی منی کرد.

—خۆ ئەمە گەشتیاری نییە. هەر بەڕاستی مانگی هەنگوینیە.

—بێئەقڵ مەبە!

—خۆت بێئەقڵی.... هەر بەڕاست تۆ چاوەڕێ دەکەیت من لێرەدا دابنیشم و تۆیش لەگەڵ پیاوێکی تردا بڕۆیت بۆ وەها گەشت و گەڕان و پشویەك؟

—پەرستارەکەیشی دێت.

—ئۆو، ئۆو، بەڵێ. مەسەلەکە چارەسەر بوو.

—پاتریك واز بهێنە. بابەتەکە کەمێك ئاڵۆزە.

—دەی باشە ئەو زەحمەتە بکێشە و بۆمی ڕوونبکەرەوە.

یاداشتەکانی بەئاراستەی من گرتبوو.

–لو، ئادەی بۆم ڕونبکەرەوە. بەجۆرێك کە بەباشی حاڵیم ببێت و تێبگەم.

–بۆ من گرنگە کە ویل دووبارە و سەر لەنوێ ژیانی خۆش بوێتەوە و ڕۆژانێکی خۆش و باشی لەبەرچاودا بێت.

–وە تۆیش لەناو ئەم ڕۆژانەدا زۆر باش بیت؟

–بێ ویژدانی مەکە. سەیرکە، تاوەکو ئێستە بووە کە من داوات لێبکەم واز لە کارێك بهێنیت کە زۆر حەزت لێیەتی؟

–ئاخر کارەکەی من جاکوزی ئاوی گەرم و ژنانی غەریبە ناگرێتەوە.

–ئەگەریش وابوایە، ئەوا گرنگیم پێنەدەدا. تۆیش دەتوانی لەگەڵ ژنانی غەریب و نەناسراودا بچیتە ناو جاکوزی ئاوی گەرمەوە! هەرکاتێك حەزت لێی بوو! هەر ئەوەندە!

زۆرم لە خۆم دەکرد کە زەردەخەنە بەسەر لێوەکانمەوە بێت، بەهیوای ئەوەی کە پاتریکیش زەردەخەنە بکات. بەڵام هیچ زەردەخەنەیەکی نەکرد.

–باشە لو، چ هەستێکت هەبوو ئەگەر بمویستبایە لەگەڵ – چوزانم– بۆ نمونە لەگەڵ ئەم (لین)ەدا کە بارودۆخی ڕۆحی تێکچووە، بڕۆم بۆ گەشت و سەفەر، چونکە ئەم ژنە پێویستی بە شادی هەیە؟

–پێویستی بە شادی هەیە؟

بیری لینم کەوتەوە. ژنێکی قژ زەردی پڕ چرچ و تێکشکاوو باڵابەرزو جوان. ناخودئاگا ئەوەم بەلاوە سەیر بوو کە باشە بۆچی پێش هەموان ناوی ئەم ژنە بەسەرزاریدا هات؟

–باشە چ هەستێکت دەبێت ئەگەر بڵێم ڕۆژانە بەیەکەوە نانی نیوەڕۆو ئێوارە دەخۆین و لەناو جاکوزی ئاوی گەرمدا دادەنیشین و بەیەکەوە دەچین بۆ پیاسە. ئەوەش بۆ سەفەرو گەشتی ڕێگەی دوور. تەنها لەبەر ئەوەی کە کەمێك بێتاقەتە. باشە بەڕاستی ئەم شتانەت پێناخۆش نییە؟

–پاتریك، ویل (کەمێك بێتاقەت) نییە. ئەیەوێت خۆی بکوژێت. ئەیەوێت بڕوات بۆ دیگنیتاس و کۆتایی بە ژیانی فەلاکەتباری خۆی بهێنێت.

لێدانەکانی دڵی خۆمم دەبیست.

-نابێت بابەتەکە پێچ بدەیت و بەجۆرێکیتر باسیبکەیت. تۆ خۆت کەسێك بوویت کە پێت دەگوت نەخۆش و داماو. تۆ خۆت دەتگوت کە وەك شقارتەیەکی بێ مەترسییە. پێت دەگوت (سەرۆکی ڕاستەقینە) کەسێك کە ناتوانێت ببێتە مایەی نیگەرانی.

یاداشتەکانی دانا.

-لو، بەلآم ئێستە مایەی نیگەرانییە.

دەستم گرت بەدەموچاومەوە و چەند ساتێك بەوحاڵەوە مامەوە. لەناو ڕێڕەوەکەدا دەنگی قسەو کرانەوە دەرگاکە دەهات، دواتر بە داخرانی دەرگاکە. بێدەنگی بەرقەرار بوو.

پاتریك بە هێمنیەوە دەستی دەهێنا بەقەراخی مێزەکەدا. دەماری چەناگەی دەجولآیەوە.

-دەزانی مرۆڤ چ حاڵێکی بۆ دروست دەبێت؟ هەروەك ئەوە وایە کە خەریکبیت پێشبڕکێی ڕاکردن بکەیت، بەلآم هەمیشە بە مەودایەکی زۆر کەم لەدواوەیت....هەستدەکەم....

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، هەروەك بڵێی ئەیوست بەسەرخۆیدا زاڵ ببێت.

-هەست دەکەم مەترسییەك لە لۆفەی دواتردا هەیە کە وادیارە بێجگە لەخۆم هەموو کەسێك دەیبینێت.

سەیری چاوەکانی کردم.

-پێموانیە مامەڵەکردنم نالۆژیکی بێت. بەلآم حەزناکەم بڕۆیت. کێشە نییە، حەزناکەیت لەگەڵ منیشدا مەیە. بەلآم حەزناکەم لەگەڵ ئەودا بچیت بۆ ئەم گەشتە...

-بەلآم من...

-ئەوە نزیکەی حەوت ساڵە کە بەیەکەوە هاوڕێین. تەنها پێنج مانگە کە لەگەڵ ئەم کابرایەو مەسەلەکانیدا ئاشنا بوین. پێنج مانگ. ئەگەر تۆ ئێستە لەگەڵیدا بڕۆیت، ئەوە خەریکیت لەبارەی پەیوەندیمانەوە پەیامێك دەدەیت. لەبارەی ئەو هەستەوە کە سەبارەت بەم هاوڕێیە هەتە پەیامێکی ڕوون و ئاشکرا بەمن دەگەیەنیت.

نارەزایەتیم دەربڕی.

-هیچ مانایەکی تایبەتی نییە.

-با هەیەتی، ئەگەر من بڵێم مەڕۆ، بەلآم تۆ بڕۆیت، با مانای هەیە...

ئەو ئاپارتمانە بچوکەی کە لەناویدا بوین زۆر بێدەنگ و خامۆش بوو. پاتریک بەقیافەیەکەوە چاوی بڕیبویە من کە هەرگیز بەوشێوەیە نەمبینیبوو. کاتێك دەستمکردە قسە کردن، دەنگم لە چپەیەك زیاتر بەرز نەبوو.

–بەڵام ئەو پێویستی بەمن هەیە.

هەرکە ئەم قسەیەم کرد و ووشەکانم بیست کە چۆن لەناو فەزادا خولیان خوارد و دووبارە هاتنەوە ناویەك، تێگەیشتم ئەگەر ئەم قسەیە ئەو بیکردایە، ئەوکات من چ هەستێکم بۆ دروست دەبوو.

تفی دەمی قوتدایەوە، بەجۆرێك سەری ڕاوەشاند هەروەك بڵێی بەباشی لەمانای قسەکەم تێناگات. دەستی خستە سەر مێزەکە. دواتر سەیری منی کرد.

–من هەرچییەك دەڵێم، دیسانەوە تۆ هەر قسەی خۆت دەکەیت.

شتێك لەبارەی پاتریکەوە هەبوو. زۆر لەم قسانە هۆشیارتر بوو کە من بیرم لێدەکردەوە.

–پاتریك من....

چاوەکانی داخست، تەنها یەك چرکە. دواتر گەڕایەوە و بەرەو لای ژوری دانیشتنەکە ڕۆیشت. پاشماوەی دەفرە پیسەکان هەروا لەسەر مێزەکە بوون.

{٢١}

## ستیڤن

کۆتایی هەفتە کچەکە شتومەکەکانی هێناو لەوێ مایەوە. ویل هیچی بە من یان کامیلا نەگوت. بەیانی ڕۆژی شەممە لەبەر ئەوەی کە نیتن درەنگ هاتبوو، بە جلوبەرگی ئیسراحەتی خەوەوە چوم بۆ بەشی ناسەرەکی و فەرعی ماڵەکە، بۆ ئەوەی بزانم ویل کارێکی هەیە یان نا کە ئەوم بینی. خەریکبوو لە ڕێڕەوەکەوە دەهات، بەدەستێکی دەفرێکی پڕ لە چەرەزات و دەستەکەیتریشی ڕۆژنامەی هەڵگرتبوو. بە بینینی من سوربویەوە. بەباشی لەبیرمە، لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە تاوەکە ئەم چەند ساڵەی دواییش چەندە ئاسایی بوو بەیانیان کچە گەنجەکان ببینم کە لە ژوری نوستنەکەی ویل بێنە دەرەوە.

نامەکەم بەرزکردەوە و گوتم:

—نامەکەیم بۆ هێناوە.

—هێشتا خەبەری نەبووەتەوە. دەتانەوێت بانگی بکەم؟

دەستێکی خستە سەر سنگی و ڕۆژنامەکەی گرت بە سنگییەوە. بلوزو پانتۆڵی لەبەردا بوو. پانتۆڵەکە لەو جۆرانە بوو کە گوڵداربون و لەوانە بون کە زیاتر لە هۆنگ کۆنگ لەبەری ژناندا دەیانبینن.

—نەخێر، ئەگەر خەوتووە هەقت بەسەرەوە نەبێت. وازی لێبهێنە با بخەوێت.

کاتێك بابەتەکەم بە کامیلا گوت، وامزانی خۆشحاڵ دەبێت، چونکە کاتێك ئەم کچە ژیانی هاوبەشی لەگەڵ ئەم کوڕە هاوڕێیەیدا دەستپێکردبوو، زۆر بێتاقەت بوو. بەڵام کامیلا سەرەتا سەری سوڕما. دواتر بە حاڵەتی دەموچاویدا دیاربوو بیر لە پاشهاتە نەخوازراوەکانی دەکاتەوە. قسەیەکی زۆری نەکرد، منیش بەتەواوەتی دڵنیابوم کە لوئیزا کلارکی خۆشناوێت. هەر

بەڕاستی دیار نەبوو کە لەم ڕۆژانەدا کێ بەدڵی کامیلایە. وادیاربوو هەروەك دڵێن لەسەر گێڕی دژبەر بوو.

ئێمە هیچکاتێك نەمانزانی لەکۆتاییدا چ شتێك بویە هۆی ئەوەی کە لوئیزا بگوازێتەوە بۆ ماڵی ئێمە. ویل تەنها گوتی بەهۆی (کێشەی خێزانیەوە)یە. هەرکاتێك ویل لەگەڵ لوئیزادا کارێکی نەبوو، کچەکە خۆی بە ئیش و کارەکانی ماڵەوە سەرقاڵ دەکرد. دەیشۆرد و پاکیدەکردەوە. بەم دەست و بەودەست تەلەفۆنی بۆ کۆمپانیاو ئاژانسە گەشتیارییەکان دەکرد و دەچوو بۆ کتێبخانە. لە هەرشوێنێکی شاردا بمبینیایە، یەکسەر دەمناسییەوە، چونکە قیافەو سەروفەساڵی لەدورەوە هاواری دەکرد. هیچکەسێکم وەك ئەو نەبینیبوو کە بەوشێوەیە ڕەنگی زاق لەبەر بکات. کۆمەڵێك جلوبەرگی بە جۆرەها مت و مورووەوە لەبەر دەکرد و پێڵاوەکانی هەمیشە ڕواڵەتێکی سەیرو سەمەرەیان هەبوو.

بە کامیلام گوتبوو ئەم کچە ڕۆحێکی نوێی بەم ماڵە بەخشیوەتەوە. بەڵام لەمە زیاتر نەدەکرا ئەمجۆرە بیرو بۆچونانە بۆ کامیلا دەرببڕیت.

دەمزانی ویل ڕێگەی بە لوئیزا داوە کە کۆمپیوتەرەکەی بەکار بهێنێت. بەڵام لوئیزا قبوڵی نەکردبوو پێی باشتر بوبو بڕوات بۆ کتێبخانەو لەوێ کۆمپیوتەر بەکار بهێنێت. نەمزانی هۆکارەکەی چی بوو. لەوانەیە نەیدەویست کە ئێمە بزانین نمرەی باشی وەرگرتووە، یان نەیدەویست ویل بزانێت کە چی دەکات.

بە هەرحاڵ، کاتێك لوئیزا لەماڵەوە بوو، ویل شادومان و کەیفخۆش بوو. یەك دووجاریش لەپەنجەرەی کراوەی ژورەکەمەوە دەنگیانم بیست، دڵنیاش بووم کە دەنگی پێکەنینی ویلم بیست. قسەم لەگەڵ بێرنارد کلارکدا کرد بۆ ئەوەی دڵنیاو بێخەم بم کە لە بابەتەکە ڕازییە. ئەویش گوتی کە لە تێکچونی هاوڕێیەتی چەندین ساڵەی کچەکەی لەگەڵ کوڕە هاوڕێکەیدا کەمێك بێتاقەتە. بارودۆخی ماڵەوەشیان هەروەك دەڵێن تەق و لەق بوو، کلارك تەنانەت ئاماژەی بەم بابەتەیش کرد کە لوئیزا دەستپێشخەری کردووە بۆ ئەوەی بەردەوامی بە خوێندنەکەی بدات. بڕیارمدا هیچ شتێك لەمبارەیەوە بە کامیلا نەڵێم. نەمدەویست بیرو فیکری بۆ هەزار شت بڕوات. ویل گوتبوی کە لو حەزی لە مۆدە و ئەمجۆرە شتانەیە. لو بەژن و باڵاو قیافەیەکی خراپی نەبوو، لەش و لاری باش بوو. بەڵام ڕاستیەکەیتان بوێت چ کەسێك ئامادەبوو لەو جۆرە جلوبەرگانە بکڕێت کە ئەو لەبەریان دەکات.

شەوی دووشەممە، لو داوای لە من و کامیلا کرد کە لەگەڵ نیتندا بچین بۆ بەشی فەرعی خانووەکە. کتێبە بچوکەکەی ڕێنمای گەشت، بەرنامەی کات بۆ دیاریکراو، بەڵگەکانی بیمە و شتەکانیتر کە لە ئینتەرنێتەوە وەریگرتبون، هەموویانی خستبویە سەر مێزەکە. بۆ هەریەکە لەئێمە نوسخەیەکی ئامادە کردبوو خستبویە ناو فایلێکی جیاوازەوە. هەموو شتێکی بەتەواوەتی ڕێکوپێك کردبوو دانابوو.

گوتی ئەیەوێت بەرنامەی گەشت و سەفەرەکە بە ئێمە و ویل بڵێت. (لو پێشتر کامیلای ئاگادار کردبویەوە بەرنامەکە بەجۆرێك ڕێکدەخات کە خۆی بەشدار نەبێت، بەڵام کاتێك خەریکبوو وردەکارییەکانی بەرنامەی سەفەرەکەی ڕووندەکردەوەو گوتی کە چ جۆرە شتانێکیان پێشتر بۆ خۆیان گرتووە، دەبینم کە قیافەی کامیلا گۆڕدرا و حاڵەتێکی بەبرشتانەی لەخۆی گرت).

گەشتێکی نائاسایی بوو کۆمەڵێك چالاکی نائاسایشی لەخۆی دەگرت، کۆمەڵێك کار کە تەسەورم نەدەکرد ویل پێش دەعمەکەیش ئەنجامیبدابن. هەرجارێك کە ئاماژەی بۆ شتێك دەکرد، سواربونی کەڵەك بەئاراستەی ڕەشەبا، خۆ هەڵدان بە پەت. بەڵگەیەکی دەخستە بەردەمی ویلەوە کە نیشانی دەدا پیاوانی زیانبەرکەوتوی مێشك و دەمار بەشدارییان تێدا کردووە. دەیگوت (ئەگەر پێم بڵێیت دەبێت هەموو ئەمانە تاقیبکەمەوە، ئەوکات خۆیشت دەبێت لەگەڵ مندا بێیت).

دەبێت دانبەوەدا بنێم کە بەهەموو بون و وجودمەوە کەوتبومە ژێرکاریگەرییەوە. بەڕاستی کچێك بوو کە بیرۆکەی زۆر باشی هەبوو.

ویلیش گوێی بۆ قسەکانی گرت و بەڵگەکانی خستە بەردەمی.؟ ئەویش هەڵیسەنگاندن. لە کۆتاییدا گوتی:

——ئەم زانیاریانەت لەکوێوە دەستکەوتوە؟

لوئیزایش برۆکانی بەرز کردەوە و گوتی:

—ویل، خواستن بریتیە لە توانین.

کوڕەکەی منیش زەردەخەنەیەکی کرد. هەروەك بڵێی ئاماژەی بە نوکتەیەکی خۆش کردووە. لوئیزا پاش ئەوەی کە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە، گوتی:

—دەبێت هەشت ڕۆژیتر بڕۆین. خاتوو ترینەر، خۆ کێشەیەك نییە؟

ئەم ڕستەیەی بە ئاوازێکی کێشەوبەرە خوازانەوە دەربڕی، هەروەك بڵێی ئەیویست بوێری دژایەتیکردن بە کامیلا بدات. کامیلا گوتی:

—ئەگەر کارێك هەیە کە بەڕاستی حەزدەکەیت ئەنجامی بدەیت، ئەوا بەلای منیشەوە هیچ ڕێگرییەك نییە.

—نیتن هێشتایش بۆچونت گونجاوو لەبارە؟

—لەسەدا سەد.

—ئەی تۆ ویل؟

هەمومان سەیری ویلمان کرد. تاوەکو ماوەیەك لەمەوبەر، هیچکام لە چالاکیانە پێویستیان بە بیرکردنەوە نەبوو. هەندێکجاریش ویل حەزی بە گوتنی نەخێر بوو، ئەویش تەنها بۆ بێتاقەت کردنی دایکی بوو. کوڕەکەی ئێمە هەمیشە هەروابوو دەیتوانی بە پێچەوانەوە بجوڵێتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی کە هیچکەسێك وانەزانێت خەریکە گوێڕایەڵی بەرامبەرەکانی دەکات. نازانم ئەم سیفەتەی چوەتەوە سەر کێ. لەوانەیە لەبەر ئەمەبوو کە سەوداو مامەڵەکارێکی شارەزاو لێزان بوو لەکارەکانیدا و هەمیشە سەرکەوتو دەبوو.

ویل سەری بەرزکردەوە و چاوی بڕییە من. نەدەکرا هیچ شتێك لەچاوەکانییەوە بخوێنیتەوە. هەستمکرد ماسولکەی دەموچاوم هاتەوەیەك، دواتر سەیرێکی لوی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد.

—بۆچی کە نا؟ بێ سەبرانە موشتاقی ئەوەم کە کلارك ببینم خۆی فرێدەداتە ناو ئاوەوە.

ماسولکەکانی کچەکە کە هاتبونەوەیەك، کرانەوە. هەناسەیەکی ئیسراحەتی هەڵکێشا، هەروەك بڵێی بە هەمان ئەندازە چاوەڕوانی بیستنی وەڵامی نەخێر بووە.

گاڵتەجاڕانەیە. لەو سەرەتایەوە کە ئەم کچە قاچی خستە ناو ژیانمانەوە، نەمدەتوانی متمانەیەکی ئەوتۆی پێبکەم. ویل سەرەڕای هەموو بەزم و ڕەزمەکانی، زۆر هەستیارو زیانوەرگر بوو، هەربۆیە نیگەرانی ئەوەبوم کە مەبادا نەکرێت کاری لەگەڵدا بکەین. ویل لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، گەنجێکی بەتوانا بوو. بەڵام کاتێك ئەو ئالیسیا قوزەڵقورتە لەگەڵ هاوڕێکەی ویلدا دەستی تێکەڵ کرد، ویل زۆر زیانی بەرکەوت و هەستی بەبێ نرخی خۆی دەکرد، هیچ کەسێکیش لەبارودۆخی ئەودا نەیدەتوانی هەستێکی لەمەخراپتری هەبێت.

بەڵام ئەو ڕۆژەی کە لوئیزا بەرنامەی سەفەرەکەی دەخستەڕوو، بینیم کە چۆن سەیری ویل دەکات، بەشێوەیەکی زۆر سەیرو نامۆ لەدەموچاویدا هەستێکی ئاوێتە بە لەخۆباییبون و قەدرناسی بوونی هەبوو، منیش کتوپڕ لەناخی دڵەوە خۆشحاڵ بووم کە ئەم کچە لەلای ئێمەیە. کوڕەکە لە سستترین پێگەو بارودۆخدا بوو. هەرچەندە ئێمە بەهیچ شێوەیەم باسی شتێکی لەمجۆرەمان نەدەکرد. ئەم کچە ئێستە هەرچییەکی دەکرد، بەڕواڵەت ئارامی بە ژیانی ویل بەخشیبوو، هەرچەندە کەمێکیش بێت.

تاوەکو چەند ڕۆژێ دواتر، جەوی ماڵەکە پڕجۆش و خرۆش بوو. کامیلا زۆر هیوادار دەهاتەپێشچاو، هەرچەندە دانیبەوەدا نەدەنا کە ئەم بەرنامەیە دەتوانێت کارێك بەرەو پێشەوە ببات. لە نیگاکانیەوە لە پەیامەکانی تێدەگەیشتم: باشە دەبێت ئاهەنگ بۆ چی بگێڕین کاتێك لە ڕاستیدا هەموو قسەکان کراون و هەموو کارەکانیش ئەنجامدراون؟ کاتێك لە کۆتاییەکانی شەودا خەریکبوو قسەی لەگەڵ جورجینادا دەکرد، دەنگیم دەبیست، خەریکبوو بەڵگە و دەلیلی بۆ دەهێنایەوە کە لەبەرچی ڕازی بووە بەو گەشتە. جورجینا کچی هەمان دایکبوو بەدوای ئەوەدا دەگەڕا کە بیسەلمێنێت لوئیزا ئەیەوێت زۆرترین کەڵك و سود لە پێگەو بارودۆخی ویل وەربگرێت و سود و کەڵکی خراپی لێوەربگرێت. کامیلا گوتی:

—جورجینا، خۆی گوتویەتی کە خەرجی سەفەرەکەی خۆی دەیدات. نا ئازیزم، باوەڕناکەم بێجگە لەمە چارەیەکیترمان هەبێت. کاتێك کەمێکمان هەیە و ویلیش قبوڵی کردووە، من زۆر هیوادارم. پێموابێت ئێستە تۆیش دەبێت هەر ئەمە بکەیت.

دەمزانی بەرگریکردن لە لوئیزا چەندە بەلایەوە سەختە، تەنانەت ئەوەی کە بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا بکات. بەڵام حەوسەڵەو خۆڕاگری لە خۆی نیشاندەدا، چونکە دەیزانی تاکە چانسی ئێمەیە بۆ ڕۆحیەت بەخشین بەکوڕەکەمان. تەنانەت ئەگەر نیوەو نیوە چڵیش بێت.

هەر بەڕاستی لوئیزا کلارك تاکە چانسی ئێمە بوو بۆ بەزیندوهێشتنەوەی کوڕەکەمان، هەرچەندە هیچکاممان ئاماژەمان بە شتێکی لەم چەشنە نەدەدا.

***

شەوی پێشوی لەگەڵ (دلا)دا ڕۆشتم و شتێکم خواردەوە. کامیلایش چوبو بۆ لای خوشکەکەی. هەر لەبەر ئەمە بوو کە من و دلا بە پیادە گەڕاینەوە. هەروا کە خەریکبوین بە پیاسەکردن لەدەوری ڕوبارەکەدا دەگەڕاین، گوتم:

–بڕیار وایە ویل بچێت بۆ گەشت.

دلایش وەلآمیدایەوە:

–ئۆو، چەندە باشە!

دلای داماوم دەبینی کە زۆر لە خۆی دەکات بۆ ئەوەی لەبەرامبەر هەستە غەریزیەکەیدا بوەستێت و هیچ شتێك لەبارەی داهاتومانەوە نەپرسێت. –ئەم پێشکەوتنە چاوەڕواننەکراوە چ کاریگەرییەکی لەسەر ئەو هەبوو–بەلآم من پێموانەبوو کە بتوانێت تاوەکو مەسەلەکە چارەسەر دەبێت و ئەو وەلآمەکەی وەردەگرێت، خۆی بگرێت و هیچ شتێك نەپرسێت.

پیاسەمان دەکرد و سەیری (قو)ە[٣٢]کانمان دەکرد، هەروەها سەیری ئەو گەشتیارانەمان دەکرد کە لەژێر ڕووناکی دەمەوئێوارەدا، سواری بەلەم بوبون و شڵپەشڵپیان دەکرد و پێدەکەنین. دلا باسی ویلی دەکرد و ئەوەی کە گەشت و سەفەرێکی لەمشێوەیە دەتوانێت بۆ ئەو زۆر باش بێت و فێر ببێت چۆن لەگەڵ هەلومەرجەکاندا ڕابێت. ئەم قسەیە لە گەورەیی خۆیەوە بوو، چونکە من کۆمەڵێك لایەنم دەزانی کە دەبوو حەزی بکردایە خێرا باسەکە ببڕێنینەوە. بە ڕێککەوت ویل بوو کە نەخشە و پلانەکانمانی بۆ داهاتوو ژیانی هاوبەش کردە بڵقی سەرئاو. لەوانەیە لەناخی دڵییەوە ئەوەی دەخواست کە ڕۆژێك لەڕۆژان ئەرکەکانم سەبارەت بە ویل کۆتاییان بێت و من ئازاد ببم.

لە تەنیشتیەوە پیاسەم دەکرد و هەستم بە ئانیشکی دەکرد کە جارجارێك دەیدا لە دەستم و گوێم بۆ دەنگە ئاوازدارەکەی گرتبوو. نەمدەتوانی ڕاستیەکەی بڵێم، ئەو حەقیقەت و ڕاستیەی کە ئێمە هەر پێنج کەسەکەمان دەمانزانی. ئەگەر ئەم کچە شکستی بهێنایە و نەیتوانیایە لە کێڵگە و خۆ هەڵدان بە پەت و جاکوزی ئاوی گەرم و ئەمجۆرە شتانەدا قسەکانی بباتە سەرو بیانسەلمێنێت. ئەوکات بارودۆخەکە بەجۆرێکی لێدەهات کە سەرئەنجامەکەی ڕزگاری من بوو. چونکە تەنها لەیەك کاتدا بوو کە دەمتوانی خانەوادەکەم بەجێبهێڵم، ئەوەش بریتی بوو لە مردنی ویل! چونکە ویل هەروا سور بوو لەسەر ئەوەی کە بچێت بۆ ئەو شوێنە دۆزەخییە لە سویسرادا.

---

[٣٢] باڵندەیەکی ئاوییە کە بە جەستە گەورەو گەردنی بەرز و دەندوکی تەختەو مەلەیەکی زۆر جوان دەکات.

منیش دەمزانی و کامیلایش هەر دەیزانی. لەگەڵ ئەوەی کە هیچکاممان ئاشکرامان نەدەکرد و بەڕووی خۆماندا نەدەهێنا. تەنها بەمردنی کوڕەکەم بوو کە ئازاد دەبووم و دەمتوانی ژیانی خۆم بەپێی خواست و ئارەزوم بەرەوپێشەوە بەرم. دلا کە دەرکی بە هەستەکانم کردبوو گوتی:

—نەخێر.

دلای ئازیز دەیتوانی پێمبلێت کە لەبیرو زەینمدا چی دەگوزەرێت، تەنانەت کاتێك کە خۆیشم نەمدەزانی.

—ستیڤن، ئەمە هەواڵێکی باشە. بەڕاستی. بەدڵنیاییەوە دەزانی کە شتێکی لەمشێوەیە دەتوانێت بۆ ویل وەك دەستپێکردنی ژیانی داهاتوو بێت.

دەستم خستە سەردەستی. ئەوەندەش ئازاو بوێر نەبوم کە هەموو بیرو خەیاڵەکانمی بۆ هەڵبڕێژم. من ئەگەر پیاوێکی ئازا بومایە، ماوەیەك لەمەوبەر مۆڵەتی ڕۆیشتنم بەو دەدا، تەنانەت بە ژنەکەی خۆیشم.

زەردەخەنەیەکی بەزۆرم کرد و گوتم:

—تۆ ڕاستدەکەیت. وەرە با هیوادار بین کە ویل بە کۆمەڵێك چیرۆك سەبارەت بە خۆ هەڵدان بەپەت و هەر هەیەجان و سەرکێشیەکیترەوە دەگەڕێتەوە کە گەنجەکان حەزدەکەن بۆ یەکتری بگێڕنەوە.

دلا بە ئانیشك کێشای بە کەلەکەمدا.

—وات لێدەکات کە دانەیەك لەناو قەلاکەدا دابنێت.

گوتم:

—سواری کەڵەك لە ڕێڕەوی پەت لەناو خەندەقدا؟ بۆ هاوینی داهاتوو دەیکەمە بەشێك لە بەرنامە گریمانییەکانم کە لەوانەیە ئەنجامیان بدەم.

هەروا کە بیرمان لەم بابەتە دوور لە بیرو زەینە دەکردەوە و جارجارێکیش لەبەرخۆمانەوە پێدەکەنین، هەموو ڕێگەکەمان تاوەکو هێلانەی بەلەمەکە بە پیادە ڕۆیشتین.

دواتر ویل توشی ئازارو هەوکردنی سییەکانی بوو.

## {٢٢}

بەرەو بەشی فریاکەوتنەکە ڕامکرد. ناچار بووم سێجار بپرسم تاوەکو لەکۆتاییدا کەسێك ڕێڕەوی ڕاست و دروستی نیشاندام. سەرئەنجام بە هەناسە بڕکێ لە دەرگای هەواگۆڕکێ و باوەشێنی سی ١٢ ەوە تێپەڕیم. نیتنم بینی کە دانیشتوەو ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە. هەرکە نزیکبومەوە سەری بەرز کردەوە.

—حاڵی چۆنە؟

—لەژێر ئۆکسجیندایە، باشە.

تێناگەم. خۆ شەوی شەممە حاڵی باش بوو. بەیانی شەممە کەمێك کۆکەی هەبوو بەڵام... بەڵام ئەمە ئیتر چی بوو؟ چی ڕوویداوە؟

دڵم تەپەتەپی دەکرد. ساتێك دانیشتم بۆ ئەوەی هەناسەم بێتەوە شوێنی خۆی. لە یەك سەعات لەمەوبەرەوە کە نامەکەی نیتنم پێگەیشت، بەردەوام خەریکبووم ڕامدەکرد. نیتنیش ڕێك دانیشت و ڕۆژنامەکەی قەد کرد.

—لو، جاری یەکەم نییە. هەندێکجار سییەکانی توشی بۆگەن و هەوکردن دەبن. بەباشی ناتوانێت بەڵغەم بتفێتەوە. زوو چاك دەبێتەوە. شەممە دوای نیوەڕۆکەی هەموو هێزی خۆم بەکار هێنا بۆ ئەوەی کارێکی بۆ بکەم، بەلاّ ئازاری زۆری هەبوو. بێ هۆ توشی تابووە. ئیشێکی توندی لەناو قەفەسەی سینەیدا هەبوو. کاتێك شەوداهات، ناچار بوین بانگی ئامبولانس بکەین. دەبوایە تەلەفۆنت بۆ بکەم، بەڵام ویل پێداگری کرد کە بێزارت نەکەم.

چەمامەوە.

—تف لەم چانسە. ئای، دەتوامم بچمە ژورەوە؟

—ئێستە بێحاڵە. ناتوانێت قسە بکات. خاتوو ترینەریش لەلایەتی.

جانتاکەم لەلای نیتن داناو دەستم بە دەرمانی دژە بەکتریا پاککردەوە. دواتر پالّم بەدەرگاکەوەناو چومە ژورەوە.

ویل لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشابوو. بەتانییەکی شینیان دابو بەسەریدا. زینچکاوی خوێنی هەبوو جۆرەها ئامێرو کەرەستەی پزیشکی لە چواردەوریدا بوون. دەمامکی ئۆکسجین لەسەر دەموچاوی بوو چاوەکانی داخستبوو. پێستی خۆڵەمێشی لەگەڵ سپییەکی مەیلەوشین دەهاتەبەرچاو. بە بینینی ئەوە جەستەم هاتەوە یەك. خاتوو ترینەر لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو. دەستی لەسەر دەستی داپۆشراوی ویلەوە بوو سەیری دیواری بەرامبەری خۆی دەکرد و ماتی کردبوو.

گوتم:

–خاتوو ترینەر.

لەشوێنی خۆی ڕاپەڕی و سەری بەرز کردەوە.

–حالّی چۆنە؟

حەزم دەکرد بچمە پێشەوە و دەستی بگرم. بەلاّم هەستم دەکرد توانای دانیشتنم نییە. هەر لەوێدا و لەتەنیشت دەرگاکەوە وەستام. دەموچاوی خاتووترینەر وەها خەمبارو نیگەران بوو کە تەنانەت وەستانیش لەو ژورەدا هەستێکی بێتاقەتی بەمرۆڤ دەبەخشی.

–کەمێك دواتر ئانتی بایۆتیکی زۆر بەهێزیان پێدا.

–کارێك هەیە کە من ئەنجامیبدەم؟

–نەخێر، باوەڕناکەم. تەنها و تەنها دەبێت چاوەڕوان بین. پزیشکی ڕاوێژکار نزیکەی کاتژمێرێکیتر دێت و سەردانی دەکات. هیوادارم زانیاری زیاترمان پێبدات.

هەروەك بلّێی دوونیا وەستابوو. کەمێك زیاتر وەستام. دەنگی یەك شێوازی دەزگاکە لەگوێمدا دەزرنگایەوە.

–دەتانەوێت من کەمێك لەلای ویل بمێنمەوەو ئێوە بڕۆن و پشوبدەن؟

–نەخێر. ئەمەوێت خۆم لەلای بمێنمەوە.

بەشێك لە بوون و وجودم ئارەزوی دەکرد کە ویل دەنگم ببیستێت. بەشەکەیتر ئومێدەوار بوو کە چاوەکانی ویل لەسەرو ئەو دەمامکە پلاستیکیەوە بکرێنەوە و لەبەر خۆیەوە بلّێت (کلارك، توخودا وەرەو دانیشە، باش نییە لەوێدا بوەستیت).

بەلاّم ئەو تەنها ڕاکشابوو.

دەموچاوم سڕی و گوتم:

—دەتانەوێت خواردنەوەتان بۆ بهێنم؟

خاتوو ترینەر سەیری کردم.

—سەعات چەندە؟

—چارەکی دەوێت بۆ دە.

—بەڕاست؟

سەری ڕاوەشاند و باوەڕکردن بەکاتەکە بۆ ئەو سەخت بوو.

—لوئیزا مەمنونم. لوتفت هەیە. ئەمەوێت کەمێك زیاتر بمێنمەوە.

ڕۆژی هەینی مۆڵەتم وەرگرتبو. بەشێکی لەبەر ئەوەی کە خانەوادەی ترینەر پێداگرییان کرد کە ڕۆژێك مۆڵەتم لەلایان هەیە، بەلاّم زۆربەی لەبەر ئەوەبوو کە بۆ وەرگرتنی پاسپۆرت بێجگە لە چوون بۆ لەندەن بەشەمەندەفەرو وەستان لە ڕیزی پتی فرانسدا، هیچ چارەیەکیترم نەبوو. شەوی شەممە لەکاتی گەڕانەوەمدا، سەرێکم لە ماڵی ترینەردا، بۆ ئەوەی دەستکەوتەکانم نیشانی ویل بدەم و پێی بڵێم کە پاسپۆرتەکەی خۆی هێشتا بەسەر نەچووە و کاری پێدەکرێت. وا هاتە بەرچاوم کە کەمێك بێدەنگە، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك باوەڕم نەدەکرد کە کێشەیەك هەبێت. هەندێك ڕۆژ حاڵی زۆر باش نەبوو، هەربۆیە منیش وامزانی ئەوەش یەکێکە لەو ڕۆژانە. ڕاستیەکەتان بوێت هێندە بیرو زەینم بە بەرنامەکانی گەشتەکەوە سەرقاڵ بوو هەرگیز بیرم لە شتێکیتر نەدەکردەوە.

بەیانی شەممە لەگەڵ باوکمدا ڕۆیشتم بۆ ماڵی پاتریك و شتومەکەکانم کۆکردەوە. دوای نیوەڕۆیش لەگەڵ دایکمدا چومە دەرەوە و مایەو شتومەك و پێداویستیەکانی خۆم بۆ سەفەرەکە کڕی. شەممە و شەوی یەکشەممە لەلای خانەوادەکەی خۆم مامەوە. تریناو تۆماسیش لەوێ بوون و بە ئاستەم خۆمان ترنجاندە یەکتری بۆ ئەوەی بۆ خەوتن جێگەمان ببێتەوە. بەیانی دووشەممە سەعات حەوت لەخەو هەستام و بۆ کاتژمێر هەشتی ڕێك لەبەردەم ماڵی ترینەردا بووم. کاتێك گەیشتمە ئەوێ دەبینم کەس لەماڵەوە نییە. دەرگای پشتەوە و دەرگای چونەژورەوەی سەرەکیش داخرابون. هیچ یاداشتێکیان بەجێنەهێشتبوو. لەبەردەم دەرگاکەدا وەستام و سێجار تەلەفۆنم کرد بۆ نیتن، بەلاّم وەلاّمینەدایەوە. ژمارەکەی خاتوو

تریندریشم لێدەدا، بەڵام یەکسەر دەچویە سەر پەیامگیر. تاوەکو لە کۆتاییدا و لەپاش چل و پێنج خولەك کە هەروا بێ ئیش لەسەر پلیکانەی بەردەم دەرگای دەروەیان دانیشتبوم، نامەی نیتن گەیشت.

*(ئێمە لەناو نەخۆشخانەی ناوچەییداین و ویل توشی هەوکردنی سییەکان بووە. بەشی سی ۱۲).*

کاتێك من گەیشتم، نیتن نەخۆشخانەکەی بەجێهێشت. زیاتر لە یەك سەعات لەدەرەوەی ژورەکەی ویلەوە دانیشتم. چەند گۆڤارێکی ساڵی ۱۹۸۲ لەسەر مێزەکە بون کە وادیاربوو کەسێك لەوێدا دایانابون، سەیری لاپەڕەکانیانم کرد. دواتر کتێبێکم لەناو جانتاکەم دەرهێناو دەستمکردە خوێندنەوە. بەڵام تەرکیز کردن نەگونجاو بوو نەمدەتوانی بەباشی ئاگام لە خوێندنەوەکەم بێت.

پزیشکی ڕاوێژکار گەیشتە لامان. بەڵام هەستمکرد کە ئێستە دایکی لەژورەوەیە، باشتر وایە نەچمە ژورەوە. پازدە خولەك دواتر پزیشکی ڕاوێژکار هاتە دەرەوە. خاتوو تریندریش بەدوایدا هاتە دەرەوە. خاتوو تریندر بە دەنگێکی گرەوە و بە ئاوازێکی ئاسودەوە بە منی گوت کە پزیشکی ڕاوێژکار دڵنیای کردینەوە کە هەوکردنەکەی کۆنترۆڵ کردووە. نازانم بۆچی ئەوەی بە من گوت، لەوانەیە تەنها لەبەر ئەوەبوو کە ئەیویست ئەو شتە بە یەکێك بڵێت، بێجگە لە منیش کەسیتر لەوێدا نەبوو. ئەو جۆرە بەکتریایە کە ویل توشی بوبو زۆر مەترسیدار بوو. خۆشبەختانە ویلیان گەیاندبویە نەخۆشخانە، وەگەرنا...

ئەم وەگەرنایە لەنێوان من و خاتوو تریندردا و لەناو بێدەنگیدا بە هەڵواسراوی مایەوە.

من گوتم:

—باشە، ئێستە دەبێت چی بکەین؟

شانەکانی هەڵتەکاند.

—حەزدەکەن نانی نیوەڕۆتان بۆ بهێنم؟ یان ئەگەر دەتانەوێت من لەلای ویل دانیشم و ئێوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و شتێك بخۆن.

تەنها هەندێکجار ئەوە وەپێش دەهات کە من و خاتوو تریندر بگەینە هەست و دەرکێکی هاوبەش. دەموچاوی کەمێك مولایم بویەوە. ئێستە کە قیافەی وەك هەمیشە جیدی ووشك

نەبوو، دەمبینی کە چەندە خەستە و ماندوو دێتە بەرچاو. وابزانم لەچاو یەکەم ڕۆژدا کە ئەوم بینی دە ساڵ پیرتر بوبو.

گوتی:

–مەمنونم لوئیزا. ئەگەر کێشەیەك نییە دەتوانیت لەلای ویل بمێنیتەوە، منیش بەلامەوە خراپ نییە کە بچمەماڵەوە و سەرخەوێك بشکێنم و جلوبەرگەکانم بگۆڕم. حەزناکەم ئەم ساتانە ویل بەتەنیا بێت.

لەپاش ڕۆشتنی نابوبراو، چومە ناو ژورەکەی ویلەوە و دەرگاکەم لەدوای خۆمەوە داخست. لەتەنیشتیەوە دانیشتم، بەتەواوەتی ئاگای لە خۆی نەبوو. ئەو ویلەی کە من دەمناسی ڕۆیشتبوو ویلێکیتر هاتبویە جێگەکەی. بیرم لەوە دەکردەوە یانی مرۆڤەکان بەمشێوەیە دەمرن. دواتر خۆم ئاگادار کردەوە کە بیر لە مردن نەکەمەوە.

هەروا دانیشتم و گوێم بۆ کرچە کرچی کاتژمێرەکە گرت. هەندێکجار لەدەرەوە دەنگی قسەیەك دەهات و دەنگی هەنگاوانێك کە لەسەر فەرشی ڕێڕەوی نەخۆشخانەکە هەڵدەگیران دەهاتە بەرگوێ. پەرستارەکە دووبارە هاتەوە و هەموشتێکی کۆنترۆڵکرد، فشاری خستە سەر یەك دوو دوگمە، پلەی گەرمای جەستەی بۆ گرت. بەلام ویل تەنانەت جوڵەیەکیشی نەکرد. پرسیم:

–حاڵی باشە، ئەی وانییە؟

پەرستارەکە بە دڵنیاییەوە گوتی:

–خەوتووە، لە ئێستادا ئەمە بۆ ئەو باشترین شتە. خەمت نەبێت.

گوتنی زۆر ئاسان بوو. بەلام من، هەروا کە لەناو ژوری نەخۆشخانەکەدا دانیشتبوم، بیرو هۆشم بەهەزار شوێندا دەڕۆیشت. بیرم لە ویل دەکردەوە و ئەوەی کە چەندە ئاوەها بەو شێوە توندە نەخۆش کەوت. بیرم لە پاتریك کرەوە، هەروەها بیرم لەو ڕاستیە دەکردەوە کە تەنانەت کاتێك شتومەکەکانم لەناو ئاپارتمانەکەیدا کۆ دەکردەوە و ڕۆژژمێرەکەی دیوارەکەم لێدەکردەوەو لولم دەکرد، هەروەها ئەو جلوبەرگانەی کە بەوپەڕی وردەکارییەوە لەناو چەکمەجەکاندا دەقم کردبوون و لەسەر یەکم هەڵچنیبون و کۆم دەکردنەوە، یەك تۆسقاڵیش هەستم بە خەمو پەژارە نەکرد و چاوەڕوانیشی نەبووم. نارەحەت و خەمبار یان دڵشکاوو بێتاقەت نەبووم. یان هەر هەستێکیترم نەبوو کە کاتێك مرۆڤ لەناو خۆشەویستیەکی چەند

ساڵەدا دێتە دەرەوە هەیەتی و سروشتیشە کە ئەو هەستەی هەبێت. زۆر هێمن بووم، بەڵام تەنها کەمێك بەداخ بووم. لەوانەیشە هەندێجار هەستم بە گوناح دەکرد. بەشێکی لەبەر ئەوەی کە بوومە هۆکاری جیاوازی و بەشێکیشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە بەوجۆرەی کە دەبوایە و پێویستبوو بارودۆخەکانم دەرك نەکرد. دوو نامەم بۆ پاتریك نارد و گوتم کە لەناخی دڵەوە داوای لێبوردن دەکەم. هیوای سەرکەوتنم بۆ خواست لە پێشبڕکێکەدا. بەڵام پاتریك وەڵامی نەدایەوە.

یەك سەعات دواتر بەرەوپێشەوە چەمامەوە و بەتانییەکەم لەسەر دەستی ویل لابرد. دەستی قاوەیی و بێڕەنگ کە زۆر دژ بوو لەگەڵ سپییەتی چەرچەفەکەدا. کانولایان لەپشتی دەستیدا بۆ دانابوو لەزگەی پزیشکیان لێدابوو. کاتێك دەستیم هەڵگێڕایەوە کوتراوی و شین و مۆری شوێنی برینەکە هەروا لەسەر مەچەکی دەبینرا. سەرم سوڕدەما کە ئایا تۆ بڵێی نەمێنێت یان بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە، ئەوەش یادخەرەوەی کارێکبوو کە ویل بەخۆی کردووە.

بەهێمنیەوە دەستیم خستە ناو دەستی خۆمەوە و گوشیم. گەرم بوو، دەستی مرۆڤێکی زیندوو، کە گیانی تێدا بوو. هەستێکی وەهای بەمن دابوو کە هەروا بەردەوام لەناو دەستمدا هێشتمەوە. سەیری پینەکانی دەستیم کرد، کە باسی کۆمەڵێك هیواو ئاواتاین دەکرد کە بەداخەوە تەنها لەسەر مێز بوون و لەوئاستە تێنەپەڕین. سەیری نینۆکە پەمەییە سەدەفیەکانیم دەکرد، کە هەمیشە دەستەکانی ئارایشتگەرەکە بەرێکوپێك و پاکوخاوێنی ڕایدەگرتن.

دەستەکانی ویل دەستی پیاوێکی پاکوخاوێن بوون. جوان و پێکەوتە بە پەنجەگەلێکی چوارگۆشەوە. نەدەکرا سەیری بکەیت و وابزانیت کە هێزیان نییە، یان ئەوەی کە ئیتر ناتوانێت شتێك لەسەر زەوی هەڵبگرێت، دەستێك بلاوێنێتەوە یان بیخاتە مشتیەوە و بیگرێت.

دەستم هێنا بەسەر جومگەی پەنجەکانیدا. حەزم دەکرد بزانم ئەگەر ویل هەر ئێستە چاو بکاتەوە، ئایا دەستەپاچە و شپرزە دەبم، بەڵام هیچ گومانێکم نەدەبرد. تەنها بیرم لەوە دەکردەوە کە تەنها ئەوە بۆ ئەو باشە کە هەست بکات دەستی لەناو دەستی مندایە. بە جۆرێك لە جۆرەکان ئارەزوم دەکرد کە تەنانەت ئێستەیش کە بە دەرمانی خەوهێنەر خەوتووە، شتێکی لەمجۆرە هەست پێبکات. چاوەکانم داخست و چاوەڕێ بووم.

***

کەمێك لە سەعات چوار لایدابوو، لە کۆتاییدا ویل خەبەری بویەوە. لە دەرەوەو لەناو ڕێڕەوەکەدا و لەسەر کورسییەکە دانیشتبوم و ئەو ڕۆژنامەیەم دەخوێندەوە کە کەسێك لەسەر کورسیەکە دایتابوو ڕۆیشتبوو. کاتێك خاتوو ترینەر هات و هەواڵی بۆ هێنام. لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم. گوتی: ئێستە قسە دەکات و ئەیەوێت من ببینێت، ئێستە دەموچاوی خاتوو ترینەر هێمنتر بوبویەوە. خاتوو ترینەر گوتی دەچێتە قاتی خوارەوە و تەلەفۆن بۆ کاك ترینەر دەکات.

هەروەك بڵێی بەدەستی خۆی نەبوو بە نائاگاییەوە گوتی:

—بێزەحمەت ماندوی مەکە.

—بەسەرچاو، بێخەمبە.

دەمزانی زەردەخەنەیەکی شیرینم بەسەر لێوەوەیە.

سەرم کێشایە ناو ژورەکەوەو گوتم:

—هێی سڵاو...

بە هێمنیەوە ئاوڕیدایەوە بۆلام.

—هێی ئەوە تۆیت.

دەنگی گرەیەکی لەگەڵدا بوو، هەروەك بڵێی سیی و شەش سەعاتی ڕابوردو نەخەوتوەو بەس هاواری کردووە. دانیشتم و سەیریم کرد. چاوی بەرەو خوارەوە دەجوڵایەوە.

—دەتەوێت چەند ساتێك دەمامکە لەسەر دەموچاوت لاببەم؟

بە ڕاوەشاندنی سەری ڕەزامەندی خۆی دەربڕی. بە خۆپارێزی و هێمنیەوە دەمامکەکەم بەرەو لای سەرەوەی دەموچاوی ڕاکێشا. لەو شوێنەی کە دەمامکەکە دەکەوتە سەر پێستەکەی، خەتێکی باریك لە ئارەق دروست بوبو. کلێنسێکم هەڵگرت و بە هێمنیەوە دەموچاویم بۆ سڕی.

—چۆنی؟

—باشترم.

بێئاگا دڵم پڕ بوو بوغز گرتمی. بەڵام هەوڵمدا قوتی بدەمەوە.

—ویل ترینەر، بەڕاستی سەردەرناکەم، لەوانەیە ئەمکارانە بۆ سەرنجڕاکێشانی دەوروبەرت دەکەیت. گرەو دەکەم تەنها لەبەر....

چاوی داخست و نەیهێشت بەردەوامی بەقسەکانم بدەم. دواتر کاتێك کردییەوە تۆپەڵەیەك لە پۆزش لەناو ئەودات بوونی هەبوو.

—ببورە کلارك. وادیارە ئەمڕۆ حەوسەڵەی گاڵتەو گەپم نییە.

لەناو ئەو ژورە بچوکە سەوزە کاڵەدا دانیشتین و من قسەم کرد. هەروا کە قسەم دەکرد و باسی کۆکردنەوەی شتومەکەکانم بۆ دەکرد لەماڵی پاتریکدا و ئەوەی کە چەندە ئاسان توانیم سیدیەکانی خۆم لەناو سیدیەکانی ئەودا جیابکەمەوە. هۆکارەکەیشی ئەوەبوو کە پاتریك پێداگری دەکرد کە پێڕست بۆ سیدیەکان دابنێت. کاتێك بێدەنگبوم ویل گوتی:

—ئەی تۆ باشیت؟

هاودڵی و هاودەردی لەچاوەکانیدا شەپۆلی دەدا. وایدەزانی من زۆر بێتاقەتم.

شانەکانی بەرز کردەوە.

—بەڵێ، بێخەمبە. زۆر قورس نەبوو. شتانێکیترم هەبوو کە بیرو هۆشم بەخۆیانەوە سەرقاڵ بکەن.

ویل بێدەنگ بوو. دواتر گوتی:

——ئەم شتانەی تر... دڵنیانیم بەمزوانە بتوانم بە پەت خۆم هەڵبدەم و بفڕم.

خۆم دەمزانی. لەو ساتەوەی کە نامەکەی نیتنم بەدەست گەیشت، دەتوانم بڵێم کە تاوەکو ئاستێکی باش دڵنیاو بێخەم بووم.؟ بەلاَم بیستنی لە زمانی ویلەوە بۆ من وەك گورزێکی کوشندە بوو. گوتم:

—خەمت نەبێت. کێشە نییە. کاتێکیتر دەچین.

هەوڵمدا بە ئاوازێکی باشەوە قسە بکەم.

—شەرمەزارم. دەزانم شەوق و زەوقێکی زۆرت بۆ ئەم گەشتە هەبوو.

دەستم خستە سەر نێوچاوانی و قژەکانیم بۆ لادا.

—هۆش..! بەهیچ شێوەیەك گرنگ نییە. تۆ تەنها چاك بەرەوە.

چاوەکانی داخست و مۆنێکی کەم لەسەر نێوچاوانی دەرکەوتبوو. من مانای ئەو چرچانەی دەوری چاوو ئەو قیافە لێبوردەیەم بەباشی دەزانی. دەیانگوت کە بە گریمان بڕیار نییە کاتێکیتر بوونی هەبێت. هەروەها دەیانگوت ئەو باوەڕی بەوە نییە کە هەرگیز چاك ببێتەوە.

***

کاتێك لە نەخۆشخانە دەگەڕامەوە، سەرێکم لەماڵی ترینەردا. باوکی ویل کە هێندەی خاتوو ترینەر ماندو شەکەت دەهاتەپێشچاو، فەرموی لێکردم بۆ ژورەوە. قەمسەڵەیەکی کۆنەی بەدەستەوە بوو وادیاربوو دەچویە دەرەوە. گوتم کە خاتوو ترینەر لەلای ویل ماوەتەوە. ئەنتی بایۆتیکەکەیش کاریگەری باشی هەبووە. خاتوو ترینەر داوای لەمن کردبوو کە بە هاوسەرەکەی بڵێم شەو لەلای ویل دەمێنێتەوە. نازانم بۆچی خۆی ئەوەی پێنەگوت. لەوانەیە زۆر زیاتر لەمە سەری قاڵ بوبێت.

—ویل چۆنە؟

—لە بەیانی باشتر بووە. کاتێك لەلای بووم خواردنەوەی خواردەوە. بەپاشملە باسی یەکێك لە پەرستارەکانیشی کرد.

—هێشتایش هەر خۆیەتی.

—بەڵێ، هێشتایش هەر خۆیەتی.

بۆ ساتێك بینیم کە دەمی جەنابی ترینەر کرایەوە و چاوەکانی بریسکانەوە. ڕوی خۆی وەرگێڕاو سەیری دەرەوەی پەنجەرەکەی کرد، دواتر دووبارە ئاوڕیدایەوە بۆلای من. لەوانەیە پێی باشتر بوو کە سەیری نەکەم. نازانم.

—دوو هێرش لەماوەی دوو ساڵدا.

ساتێکی خایاند تاوەکو لەمەبەستەکەی تێگەیشتم.

—نەخۆشی هەوکردنی سییەکان؟

سەری ڕاوەشاند.

—ئەو قوزەڵقورتە نەگبەتیە! ویل بە هەموو ئەو هەڕەشەو گوڕەشەو هاش و هوشەیەوە، بەلام کەسێکی زۆر ئازایە.

تفی دەمی قوتدایەوەو سەرێکی ڕاوەشاند، هەروەك بڵێی لەگەڵ خۆی بوو.

—لوئیزا، چەندە باشە کە تێدەگەیت.

نەمدەزانی چی بڵێم. دەستم برد و خستمە سەر قۆڵی.

—بەڵێ تێدەگەم.

دووباره سەری ڕاوەشاندەوە. دواتر کڵاوە حەسیرییەکەی لە شوێنی جلەکان و لەناو هۆڵەکەدا هەڵگرت. لەبەر خۆیەوە شتێکی گوت کە بەگریمان سوپاسکردن بوو یان خوداحافیزی. لە تەنیشتمەوە تێپەڕی و لە دەرگای سەرەکیماڵەکەوە چویە دەرەوە.

بەشی ناسەرەکی و فەرعی ماڵەکە بەبێ ویل چۆڵ و خامۆش و نامۆ بوو. ئێستە دەمزانی کە چەندە لەگەڵ ئەوەدا ڕاهاتوم کە لەدورە دەنگی کورسیە تایەدارە ماتۆڕدارەکەی ببیستم کە پێش و پاش دەکات. چپەکردنەکانی کاتێك کە قسە لەگەڵ نیتندا دەکات، لەگەڵ گیزە گیزی ڕادیۆکەیدا. ئێستە ماڵەکە کش و مات بوو. هەستم دەکرد ماڵەکە خەریکە دەمخوات.

شتومەکەکانیم کۆ کردەوە، ئەو شتانەی کە بۆ خەوو ڕۆژی دواتر پێویستی بوون، هەمویانم ئامادەکرد و دواتر خستنمە ناو جانتاوە. لەوانەیش جلوبەرگی پاك، فلچەو مەعجونی دەموددان، مەکینەی ریش تاشین و دەرمانەکان و تەنانەت تەلەفۆنەکەیشم برد بۆ ئەوەی ئەگەر حاڵی باشتر بوو گوێ بۆ گۆرانی بگرێت. هەروا کە خەریکی کۆکردنەوە بووم، ترسێکی سەیر کەوتە گیانمەوە. دەنگێکی وێرانکەر لە دەرونمدا خولی دەخوارد و دەیگوت (ئەگەر بمرێت هەروا دەبێت)، دەنگەکەم لەناو خۆمدا خەفەو کپکردەوە. ڕادیۆکەم داگیرساند و هەوڵمدا دەنگە دەنگێك دروستبکەم و ڕەنگ و ڕویەك بە ماڵەکە ببەخشم. کەمێك پاکوخاوێنیم کرد، چەرچەفەکانی قەرەوێڵەکەی ویلم گۆڕی، دواتر چەند لقە گوڵێکم لەنا باخچەکەدا لێکردەوە و لەناو ژوری دانیشتنەکەدا دامنا. دواتریش هەموو شتەکانم ڕێکوپێك کرد، سەیرێکی دەورووبەرم کرد. چاوم بە فایل و ئێزبارەی گەشت و سەفەرەکەمان کەوت.

ڕۆژی دواتر دەبوو بە شوێن کارەکانی نوسینگەیەکدا بچومایە و گەشت هەر بەرنامەیەکی گەشتیاری کە دامنابوو هەڵیوەشێنمەوە. هەرگیز نەدەکرا پێشبینی ئەوە بکرێت حاڵی ویل ئەوەندە باش ببێت کە بتوانێت سەفەرو گەشت بکات. پزیشکە ڕاوێژکارەکەی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ویل پێویستی بە پشویەکی زۆر هەیە و دەبێت ڕەچەتەی ئەنتی بایۆتیکەکە تاوەکو کۆتایی بەکار بهێنێت. دەبێت هەمیشە بە ووشك و گەرمی بمێنێتەوە. سواری کەڵەك لەبەرامبەر ڕەشەبادا و غەواسی بە دەمامکی ئۆکسجین، نەدەکرا کە بەشێکبن لە بەرنامەکانی قۆناغی تازە چاکبونەوە لە نەخۆشییەکەی ناوبراو.

چاوم بڕییە فایلەکە. سەیری هەموو ئەو هەوڵ و کۆشش و هیواو ئومێدانەم کرد. چاوم بڕییە پاسپۆرتەکەم کە بۆ دەرهێنانی لەناو ڕیزدا وەستام. بیرم هاتەوە کە لەناو شەمەندەفەردا کە

دانیشتبوم بەرەو لەندەن دەچووم، چەندە زەوق و شەوقم هەبوو. یەکەمینجار بوو کە بەپێی بەرنامە دەجولآمەوە. هەستی خەموپەژارەو نائومێدیم بۆ دروستبوبو. تەنها سێ هەفتە مابوو منیش تاوەکو ئێستە نەمتوانیبوو هیچکارێك بەرەوپێشەوە بەرم. کۆتایی بڕیارنامەکەم نزیکبوبویەوەو نەمتوانیبوو کارێك بکەم کە ویل بیرورای خۆی بگۆڕێت. کتوپڕ هەستم بە داماوی کرد. لەناو بێدەنگی ئەو فەزا بچوکەدا دانیشتم و هەردو دەستمگرت بەملاو ئەولای سەرمەوە.

—ئێوارە باش.

سەرم بەرز کردەوە. نیتن لەبەرامبەرمەوە وەستابوو. هەیکەلە گەورەکەی فەزای بچوکی چێشتخانەکەی پڕ کردبوو. کۆڵەپشتێك بەشانییەوە شۆڕبوبویەوە.

—دەرمانەکانیم هێناوە، بۆ ئەوکاتەی کە گەڕایەماڵەوە. تۆ باشیت؟

خێرا چاوم سڕی و گوتم:

—بەڵێ، بەڵێ... تەنها خەمبارو نیگەرانی تێکچونی سەفەرو گەشتەکەم.

نیتن کۆڵە پشتەکەی لەشانی هێنایە خوارەوە لەبەرامبەر منەوە دانیشت.

—بەڵێ، زۆر خراپ بوو.

فایلەکەی هەڵگرت و لاپەڕەکانی ناوی هەڵدایەوە.

—بەیانی یارمەتیت دەوێت؟ نەخۆشخانە پێیوستیان پێم نییە. بەیانی دەتوانم یەك سەعات بێم و یارمەتیت بدەم و تەلەفۆن بۆ ئەملاو ئەولا بکەم.

—لوتفت هەیە. نەخێر خۆم کارەکان دەکەم. ئەگەر خۆم هەمویان ئەنجامبدەم ئاسانترو ئیسراحەتترە.

نیتن چای لێناو لەبەرامبەر یەکەوە دانیشتین و خواردمانەوە. وابزانم ئەوە یەکەمینجار بوو کە من و نیتن بەیەکەوە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد، بەلایەنی کەمەوە بەبێ ئامادەبونی ویل. نیتن باسی ئیشە پێشوەکەی خۆی بۆ دەکردم. کە نەخۆشێکبووە و بڕبڕەکانی ٣ و ٤ ی زیانیان بەرکەوتوە و بە دەستگا هەناسەی داوە. لەوماوەیەی کە کاری بۆکردبوو بەلایەنی کەمەوە مانگی جارێك نەخۆش کەوتووە. نیتن باسی جاری پێشوی کرد کە ویل توشی هەوکردنی سییەکان بوبو شتێکی نەمابوو کە بمرێت و گیان لەدەستبدات. دواتریش چەند هەفتەیەکی پێچووە تاوەکو چاکبوەتەوە.

—کاتێك نەخۆشییەکەی جیدیی بێت، چاوەکانی بەمجۆرەیان لێدێت. زۆر ترسناکە. بەجۆرێك هەروەك بڵێی پاشەکشەی کردوە هەروەك بڵێی بوونی نییە.

—دەزانم. خۆیشم زۆر ڕقم لەو نیگاو سەرکردنەیەتی.

—ویل یەك....

دواتر کتوپڕ نیگای لێوەرگێڕام و دەمی داخست.

هەروا دانیشتین و پەرداخی چاییەکان بەدەستمانەوە بوو. لەژێرچاوەوە سەیری نیتنم دەکرد. سەیری ئەو دەموچاوە پان و میهرەبانەیم دەکرد کە زۆر مەحزون و خەمبار بوو.

ئەمویست شتێك بپرسم کە خۆم وەڵامەکەیم دەزانی.

—تۆ ئاگاداری، ئەی وانییە؟

—ئاگاداری چی؟

—ئەوەی کە... ئەوەی کە ئەیەوێت خۆی بکوژێت.

بێدەنگییەکی کتوپرو ڕەها بەرقەرار بوو.

نیتن بەوردی سەیری منی کرد، خەریکبوو لەبەر خۆیەوە هەڵسەنگاندنی دەکرد بۆ ئەوەی چ وەڵامێك بداتەوە. گوتم:

—من دەزانم. بەڕێککەوت زانیم. هەر لەبەر ئەمەبوو کە ئەم گەشتەم ڕێکخست. هەر لەبەر ئەمەبوو کە بەرنامەی گەڕانم دادەنا. زۆرو لەخۆم دەکرد بۆ ئەوەی لەبڕیارەکەی پاشگەز ببێتەوە.

نیتن پەرداخەکەی خستە سەرمێزەکە. گوتی:

—سەرم سوڕ دەما، هەردەگوت لە ئەرکدایت.

—بەڵێ، لە ئەرکدا بووم.

سەری ڕاوەشاند. نازانم مەبەستی لەو سەر ڕاوەشاندنە چی بوو، لەوانەیە ئەیوست بڵێت نابێت واز بهێنم و تەسلیم ببم، یان ناکرێت هیچکارێکی بۆ بکرێت.

—نیتن، دەتەوێت چی بکەیت؟

چەند ساتێکی خایاند تاوەکو وەڵامیدایەوە.

—لودەزانی، من لەناخی دڵەوە خۆشم دەوێت. هەرگیز بەلامەوە گرنگ نییە کە پێتی بڵێم. هەربەڕاستی خۆشم دەوێت. دووساڵە کە کاری بۆ دەکەم. حاڵ و بارودۆخی خراپ و نالەباریم

بینیوە. ڕۆژە خۆشەکانیشیم بینیوە. تەنها دەتوانم بڵێم ئەگەر هەموو دوونیایان بدایە بەمن، هەرگیز ئامادە نەبووم لە شوێنی ویلدا بم و وەك ئەو ئیفلیج بم.

قومێك لە پەرداخە چاییەکەی خواردەوە.

—چەندینجار کەشەوانە لێرە خەوتوم، دەبینم بەیانی بە هات و هاوارەوە خەبەری بووەتەوە. دەزانی بۆچی؟ چونکە خەوی بەوەوە بینیبو کە خەریکە دەڕوات بەڕێگادا و خلیسکێنەی سەر بەفر دەکات. هەندێکجاریش کە بێتاقەت دەبێت و کەمێك حاڵی خراپ دەبێت، بەهۆی بیرکردنەوە لەوەی کە ئیتر ناتوانێت ئەمکارانە بکات بەتەواوەتی شێت دەبێت. تامڵی ئەمەی نییە. منیش لەلای دادەنیشم و هیچ قسەیەکم نییە بۆگوتن. هیچ قسەیەك کە بتوانێت هێمنی بکاتەوە. بەراستی شانسێکی زۆر خراپی لە ژیاندا هەبووە. ئیتر لەمە خراپتر نابێت. دوێنێ شەو چاوم تێبڕی و بیرم لە ژیانی کردەوە، ئەوەی کە بەگریمان... لەگەڵ ئەوەی کە گەورەترین ئارەزوم لەم ژیانەدا شادی و خۆشی ئەم پیاوەیە، بەڵام لەبارەی کارێکەوە کە ئەیەوێت بیکات بیرو بۆچونی خۆم دەربڕم، یان داوەری بکەم. هەر خۆی دەبێت هەڵبژێرێت و هەر خۆیشی دەبێت بڕیار بدات.

هەناسەم دەرنەدەهات.

—بەڵام.... ئەمە پەیوەندی بە پێش هاتنی منەوە هەیە. هەموتان گوتتان کە هی پێش ئەوکاتەیە کە من هاتوم بۆ ئێرە. ئێستە گۆڕدراوە. ئێستە کە من لەلایم زۆر گۆڕدراوە. ئەی مەگەر بێجگە لەمەیە؟

—بەڵێ، لەسەدا سەد بەڵام....

—ئەگەر باوەڕمان بەوە هەبێت کە هەستێکی باشتر پەیدا دەکات و تەنانەت حاڵیشی باش دەبێت، چۆن خۆی باوەڕ بەوە بکات کە ژیان دەتوانێت ڕوی خۆش و شادی خۆی پێ نیشانبدات؟

نیتن پەرداخەکەی لەسەر مێزەکە دانا. ڕێك سەیری نێوچاوانی کردم.

—لو، حاڵی باشتر نابێت.

—تۆ چۆن دەزانیت.

—دەزانم. ئیتر مەگەر لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەخانە بونیادییەکان پێشکەوتنێکی گەورە بەخۆیانەوە ببینن. بەلایەنی کەمەوە ویل دەبێت دە ساڵیتر لەسەر کورسی تایەدار دابنیشێت.

لەوانەیە دایکو باوکی باوەڕییان بەوە نەبێت، بەڵام خۆی ئەوە دەزانێت. نیوەی کێشەکە لێرەدایە. دایکی ئەیەوێت بە هەر نرخێك بووە بەزیندویی بمێنێتەوە. بەبڕوای جەنابی ترینەر بێجگە لەوەی کە ویل خۆی بڕیار بدات چارەیەکی تریان نییە.

—نیتن، ئەڵبەتە خۆی دەبێت بڕیار بدات. لەلایەکیتریشەوە دەبێت هەموو هەڵبژاردەکانی بەباشی هەڵبسەنگێنێت.

—گەنجێکی هۆشیارە. خۆی بەوردی دەزانێت کە چ هەڵبژاردەیەکی بۆ باشەو لەبەرژەوەندییەتی.

دەنگم لەو فەزا بچوکەدا بەرز بویەوە:

—نەخێر، هەڵە دەکەیت. هەڵە دەکەیت کە دەڵێی هەمان ئەو مرۆڤەیە کە پێش هاتنی من بووە. تۆ دەڵێیت لەوکاتەوە کە من هاتوم تەنانەت هێندەی تۆسقاڵ و سەرەدەرزییەك بیرکردنەوەی نەگۆڕاوە.

—لو، خۆ من نازانم چی لەبیرو مێشکیدایە.

—تۆ دەبینی کە شێوازی بیرکردنەوەیم گۆڕیوە.

—بەمشێوەیە نییە. من دەزانم هەمووی لەبەر خۆشحاڵ کردنی تۆیە.

چاوم بڕییە نیتن.

—تۆ وادەزانی لابردنی ئەرکی سەرشانە، تەنها لەبەر ئەوەی کە من خۆشحاڵ ببم؟ لە دەستی نیتن تورە بووم. بەڕاستی لەدەستی هەمویان تورە بووم.

—کەوابوو ئەگەر وادەزانیت ئەمکارانە هیچکامیان سودیان نییە، باشە بۆچی دەتویست لەگەڵ ئێمەدا بێیت؟ باشە بۆچی قبوڵت کرد بێیت؟ تەنها لەبەر ئەوەی کە بچیت بۆ گەشت و سەفەر؟

—نەخێر، تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەو بەزیندویی بمێنێتەوە.

—بەڵام....

—بەڵام ئەمەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە، ئەگەر خۆیشی ئەیەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە. خۆ ئەگەر خۆی نەیەوێت، بەزۆر نابێت، ئیتر هیچ گرنگیش نییە کە من و تۆ خۆشماندەوێت یان نا. ئەوکات دەبین بەیەکێك لەو مرۆڤە قوزەڵقورتانەی کە مافی خۆیمان لێوەرگرتووە.

قسەکەی نیتن لەناو فەزای ماڵەکەدا دەنگیدایەوە. فرمێسکی سەر گۆناکانم سڕی و هەوڵمدا لێدانەکانی دڵم ئاسایی ببنەوە. دیاربوو کە نیتن بە بینینی فرمێسکەکانم دەستەپاچەو شپرزە بووە. بەبێ ویستی خۆی دەستێکی هێنا بەسەرو ملی خۆیدا، لەپاش خولەکێك و بێ ئەوەی کە قسەیەك بکات کلێنسێکی دابەدەستمەوە.

—نیتن، من ناهێڵم شتێکی لەو شێوەیە ڕووبدات.

هیچی نەگوت:

—دڵنیابە من ناهێڵم.

سەیری پاسپۆرتەکەی خۆمم کرد کە لەسەر مێزەکە دانرابوو. زۆر بەئازار دەهاتە پێشچاو. هەروەك بڵێی مرۆڤە و هەستی هەیە. مرۆڤێك کە ژیان و بوون و وجودی هەروەك من بەڕاستی هیچ شتێك نەبوو فروشێك نرخی نەبوو. لەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بوبم و ماتم کردبوو.

—نیتن؟

—بەڵێ؟

—ئەگەر گەشت و سەفەرێکیتر ڕێکبخەم. بەوشێوەیەی کە پزیشکەکان ڕازی بن. هێشتا ئامادەیت بێیت لەگەڵماندا؟ هێشتایش ئامادەی یارمەتیمان بدەیت؟

—بەڵێ، ئەڵبتە کە تاوەکو کۆتایی لەگەڵتاندام.

هەستایەوە و ئاوێکی لە پەرداخەکەی خۆی ڕادا. کۆڵەپشتەکەی کردەوە شانی. پێش ئەوەی لە چێشتخانەکە بچێتە دەرەوە. هاتە پێشەوە و لەبەرامبەرمەوە وەستا.

—بەلآم لو، دەبێت ڕاستیەکەی بڵێم. دڵنیانیم تەنانەت بتوانی بەرنامە نوێیەکەیشت پیادە و جێبەجێ بکەیت.

## {٢٣}

ڕێك دە ڕۆژ دواتر، باوكی ویل بە ئۆتۆمبیل ئێمەی گەیاندە فڕۆكەخانەی (گت ویك)[٣٢]. نیتن بە ڕاكێشان جانتاكانی خستە سەر عەرەبانەیەكی دەستی و منیش چەندینجار لە ویلم پرسی كە ئایا ئیسراحەتە، بەجۆرێك تووڕە بوو.

جەنابی ترینەر دەستی خستە سەرشانی ویل و گوتی:

--ئاگاتان لە خۆتان بێت. گەشتێكی خۆشتان هەبێت.

چاوێكی لەمن داگرت و گوتی:

-زۆریش هاروهاجی مەكەن.

خاتوو ترینەر نەیتوانی مۆڵەت لە كارەكەیدا وەربگرێت و لەگەڵماندا بێت. منیش لەبەر خۆمەوە گوتم لەوانەیە نەتوانێت لەگەڵ مێردەكەیدا دوو سەعات بە تەنیا بێت.

ویل سەرێكی ڕاوەشاند بەڵام هیچی نەگوت. بەدرێژایی ڕێگاكە بێدەنگی هەڵبژاردبوو. چاوی بڕیبویە دەرەوەی پەنجەرەكە و نەدەكرا شتێك لە نیگاكانییەوە بخوێنرێتەوە. كاتێك سەبارەت بەو شتانەی كە بەهۆی قەرباڵغی ترافیك و بێئاگاییەوە لەگەڵ خۆماندا نەمانهێنابوو لەبیرمان چوبون قسەمان دەكرد، هیچ ئاگای لە من و نیتن نەبوو.

تەنانەت كاتێكیش لە هۆڵەكەدا دەڕۆیشتین، هێشتایش دڵنیا نەبوو كە كارێكی ڕاستو دروستمكردووە. خاتوو ترینەر لە دڵەوە بەم سەفەرە ڕازی نەبوو. بەڵام لەو ڕۆژەی كە ویل بەبەرنامەی گەشتە نوێیەكە ڕازی بوو، دەمزانی كە خاتوون بوێری ناڕەزاتی دەربڕینی نییە. بەگشتی ئەو هەفتەیە دیاربوو كە لە قسەكانی ئێمە واهیمەی هەبوو. لەتەنیشت ویلەوە دادەنیشت و تەنها سەبارەت بە مەسەلە پزیشكیەكان قسەی دەكرد. هەندێجاریش خۆی لەناو

---

[٣٢] فڕۆكەخانەیەكە لەناو شاری لەندەندا.

باخچەکەیدا سەرقاڵ دەکرد، بە حرسێکی زۆرەوە گەڵاو گوڵ و گیاو لقەکانی دەبڕی. کاتێك خەریکبوین دەڕۆیشتین بۆ ئەوەی کارت و بلیتی فڕینەکە وەرگبرین، هەروا کە خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی دەفتەرە بچوکەکەی یاداشتەکە بووم، گوتم:

—بڕیاروایە کارمەندانی فڕۆکەکە بێن و یارمەتیمان بدەن.

نیتن گوتی:

—زۆر بە کەمی کەسێك دەنێرنە بەردەم دەرگای هاتنە ژورەوە.

—بەڵام خۆ کورسی تایەدار(کەرەستەیەکی پزیشکیە و دەشکێت). خۆم سێجار ئەوەم بەو ژنە گوت کە تەلەفرنم لەگەڵدا کرد. دەبێت دڵنیابین کە لەکاتی بردنی کەرەستە پزیشکیەکانی ویلدا بۆناو فڕۆکەکە گاڵتەجاڕی وەرێناخەن.

کۆمەڵگەی ئینتەرنێتی ئیفلیجەکان. زانیاری و ئاگاداریگەلێکی زۆریان لەگەڵ پێڕستێکدا پێدابووم. مافە یاساییەکانیشی تێدا شەرح کرابوو. منیش سێجار کارمەندانی هێڵە هەواییەکەم ئاگادار کردبویەوە کە کورسییەکی ڕوبەدیوارمان پێبدەن، یەکەمجاریش دەبێت ویل سواری فڕۆکەکە ببێت، تاوەکو ئەو کاتەی ئێمە نەگەینە لای دەرگای چونەژورەوەی فڕۆکەکە، نەدەبوو لە کورسییەتایەدارەکەیەوە بگوازرێتەوە. دواتر نیتن سوکانی کورسییە تایەدارەکەی دەکردە سوکانێکی دەستی. بە وردی کۆی دەکردەوە و قوفڵی دەکردن. خودی خۆی چاودێری ئەوەی دەکرد و ئاگادار بوو کە کورسییە تایەدارەکە زۆر بە هێمنی و خۆپارێزییەوە باربکرێت بۆ ئەوەی هیچ دەگەیەکی بەرنەکەوێت. بۆ ئاگارکردنەوەی حەماڵەکان لەزگەی تایبەتیان لێدەدا بۆ ئەوەی بە ئەسپاییەوە هەڵبگیرێت. سێ کورسیان لە یەك ڕیزدا تایبەت کردبوو بە ئێمەوە، هەربۆیە لەکاتی پێویستدا نیتن دەیتوانی بەبێ ئەوەی کەس سەیرمان بکات و بمانبینێت کارە پزیشکیەکانی ویل ئەنجامبدات. کارمەندانی هێڵە هەواییەکە دڵنیایی ئەوەیان دابوو کە دەسکی کورسییەکە بەرز دەبێتەوە. هەربۆیە لەکاتی گواستنەوەی ویل لە کورسییە تایەدارەکەیەوە بۆ سەر کورسی فڕۆکەکە ناکێشێت بە دەسکەکەیداو شین و مۆری بکاتەوە. بەدرێژایی گەشتەکە ویل لەنێوان من و نیتندا دادەنیشت. لەلایەکیتریشەوە ئێمە لە پێش هەموو سەرنشینەکانیترەوە پیادە دەبوین و دادەبەزین.

من ئەمشتانەم لەناو پێڕستی فرۆکەخانەکەدا نوسیبو، لاپەڕەی پێڕستی ئوتێلەکە لەدوای ئەوەوە بوو، بەرنامەی گەشتی لاپەڕەی پێڕستی ڕۆژێك پێش گەشتەکەیش لەپێش ئەمەوە بوو. لەگەڵ بوونی هەموو ئەم ڕێوشوێنانەدا دیسانەوە هەر دڵەخورپەم هەبوو.

هەرجارێك کە سەیری ویلم دەکرد، لە خۆمم دەپرسی ئایا کارێکی ڕاست و دروستم کردووە. ویل تازە بە تازە شەوێکی پێش گەشتەکە مۆڵەتی لە پزیشکەکەی وەرگرتبوو. خواردنێکی کەمی خواردبوو، لەڕۆژانی تریش زیاتر خەوتبوو. بەڕواڵەت بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە خەستە و ماندو نەبوو. بەڵکو زیاتر لە ژیان ماندو خەستە بوو. ماندو لە مامەڵەکانی ئێمە، ماندو لەو هەولانەی کە لەناو قسەکانماندا دەماندا بۆ ئەوەی هیواداری بکەین. ماندو لەو عەزم و ئیرادەیەی کە بەخەرجمان دەدا بۆ ئەوەی هەلومەرجەکانی بۆ باشتر بکەین. ویل هەمیشە تاملی دەکرد. بەڵام زۆربەی کاتەکان هەستم دەکرد حەزدەکات بەتەنیا بێت و وازی لێبهێنم. بەڵام نەیدەزانی ئەوە تەنها کارێکە کە من ناتوانم بیکەم.

بە بینینی کچە بەدلە لەبەرەکە کە ئیزبارەیەکی بەدەستەوە بوو، بە زەردەخەنەوە و بەخێرایی بەرەو لای ئێمە دەهات گوتم:

—هات.

نیتن لەبەر خۆیەوە گوتی:

—باشە، ئێستە هاوکاریمان دەکات بۆ ئەوەی بە ئیسراحەتتر سواری فرۆکەکە ببین.

—خۆ ئەمە زۆر لەڕو لاوازە و خەریکە دەمرێت.

منیش گوتم:

—کێشەیەك دروست نابێت. بێخەمبە کە هیچ کێشەیەك نایەتە پێشەوە.

لەوکاتەوەی کە بڕیاری خۆمم دابوو زانیم کە ئەمەوێت چ کارێك بکەم، ئەو ڕستەیەی پێشوو بوبویە پاڵپشت و پشتیوانە بۆ قسەکانم. لەپاش ئەو قسەو باسەی کە ئەو ڕۆژە لەماڵەوە و لەگەڵ نیتندا کردم، بە هەموو بون و وجودمەوە ئەمویست بەوانی بسەلمێنم کە هەڵە دەکەن. ئێستە کە نەماندەتوانی بچین بۆ ئەو گەشتەی کە ڕێکمانخستبو، بەو مانایە نەبوو کە ویل ناتوانێت کارێکیتر ئەنجامبدات.

دووبارە لە ئینتەرنێتدا پەیامم دانایەوە و پرسیم کە لە قۆناغی چاکبونەوە لە نەخۆشییەکەیدا چ شوێنێکی گونجاو بوونی هەیە؟ ئایا کەسێك دەزانێت بۆ کوێ بچین باشە؟

پلەی گەرماو سەرمای هەوا گرنگترین خاڵ بوو. کەشو هەوای ئینگلیز زۆر خێرا گۆڕانکاری بەسەردا دەهات، (هیچ شتێك لەوە خراپتر نەبوو کە لە کەنار دەریادا بیت و کتوپڕ باران بباریێت). کۆتاییەکانی مانگی ژوئیە، کەش و هەوای هەموو ئەوروپا تاوەکو ئاستێکی باش گەرمە، هەر بەو هۆیەوە ئیتالیاو یۆنان و باشوری فەرەنسا و ناوچە کەنارییەکان بۆ ئێمە قەدەغە بوون. تێڕوانینێکی تایبەتم نەبوو. دەمزانی کە ویل حەزی لە دەریایە. بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کاتمان نەبوو دەبوایە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا سەفەرەکەمان ڕێکبخستایە. هەربۆیە شانسێکی کەم بۆ بەکرداری بوونی لە ئارادا بوو.

زۆرێك لە زۆری ئینتەرنێتەکەدا داخ و هاودەردی و خەموپەژارەی خۆیان دەربڕیبوو هاوخەمی خۆیان بۆ چیرۆك و بەسەرهاتی ویل نیشاندابوو، داستانگەلێکی زۆریان سەبارەت بە نەخشی هەوکردنی سییەکان گێڕابویەوە! دڵ و دەرونیان سەرقاڵی داستانەکەی ویل بوبو. چەند شوێنێکیان پێشنیار کردبوو کە دەمانتوانی بچین بۆیان. بەڵام هیچکامیان بەلای منەوە سەرنجڕاکێش و خۆش نەبوون. یان لەمەیش گرنگتر باوەڕم نەدەکرد بەلای ویلەوە خۆش بن. بەڕاستی نەمدەزانی دەبێت چی بکەم. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا چەندینجار پێڕستی پێشنیارەکانم هەڵسەنگاند و دەمزانی کە هیچکامیان باش نین.

ریچی، لایەنگرو پشتگیری ئاگرین و گەرم و گوڕی ئێمە بوو لەناو زۆری گفتوگۆ ئینتەرنێتیەکەماندا، ئەوەبوو لە کۆتاییدا هات بۆ یارمەتیدانمان. پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی کە ویل نەخۆشخانەی بەجێهێشت، ریچی نوسی:

***(ناونیشانی پۆستە ئەلیکترۆنیەکەتم پێبدە. کوڕە مامەکەم ئاژانسی گەشتیاری هەیە. قسەم لەگەڵدا کردووە).***

تەلەفۆنم بۆ ئەو ژمارەیە کرد کە پێیدابوم. لەگەڵ پیاوێکی تەمەن مامناوەنددا کە شێوەزراێکی خەستی (یورکشر)ی هەبوو قسەم کرد. کاتێك گوتی کە چ بەرنامەیەکی لە بیرو زەیندا هەیە، منی والێکرد زۆر سوپاسگوزاری بم. لەماوەی دوو کاتژمێردا هەموشتێکمان ڕێکخست. ئەوەندە دڵم خۆش بوو سوپاسگوزاری بووم کە فرمێسك لە چاوەکانم هاتنە خوارەوە. گوتی:

–ئازیزەکەم، من کارێکم نەکردووە. تۆ تەنها ئاگاداری ئەوە بە کە ئەم گەنجە کاتێکی خۆش بەسەر بەرێت.

کاتێك بەڕێکەوتین، منیش هێندەی ویل بێ حاڵ و بێ گیان بووم.

ڕۆژانە سەرقاڵی ئەوە بووم کە شتومەك و پێداویستیەکانی ویل ئەوەندە باش بێت کە بتوانێت لەگەڵماندا بێت. ئێستە کە بە جانتاوە لەناو فڕۆکەخانە قەرەباڵغەکەدا دانیشتبوم و سەیری ویلی بێدەنگ و ڕەنگ پەڕیوم دەکرد، دووبارە لەخۆمم پرسییەوە ئایا من هەڵە بیرم کردوەتەوە. دڵم داچڵەکی و لەبەر خۆمەوە دەمگوت باشە ئەگەر دووبارە نەخۆش بکەوێتەوە چی بکەم؟ ئەی باشە ئەگەر وەك ئەسپسوارییەکە هەر حەزی لێنەکرد چی؟ یان ئەگەر بەباشی لە بارودۆخی تێنەگەیشتبم چی؟ لەوانەیە ویل پێویستی بە گەشتێکی حەماسی نەبوبێت. ئایا باشتر نەبوو لە ماڵەوە بمێنێتەوە و دە ڕۆژێك لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆی پشوو بدات؟

بەڵام هیچ هەلێك لەبەردەمماندا نەمابویەوە بۆ ئەوەی بێمانا دوو ڕۆژی بە فیڕۆ بدەین. کۆتا هەل بوو تاکە شانسی منیش.

نیتن لە بەشی لێخۆشبونی گومرگەوە دەگەڕایەوە، گوتی:

–فرینەکەی ئێمەیان ڕاگەیاند.

سەیری منی کرد و برۆکانی بەرز کردەوە. منیش هەناسەیەکم تازە کردەوە و گوتم:

–بڕۆین.

***

خودی فڕینەکە، جیا لەو دوازدە کاتژمێرە دوورودرێژەی کە بە ئاسمانەوە بوین، ئەوەندە کە من لێی دەترسام قورس و ترسناك نەبوو. نیتن گۆڕینە هەمیشەییەکانی لەژێر بەتانیەوە ئەنجامدەداو سەلماندی کە پەرستارێکی بە ئەزمون و شارەزایە. کارمەندی فڕینەکە موشتاق و زۆر تێبینیکار بوو، هەموو هەست و هۆشی لەلای کورسییەتایەدارەکەی ویل بوو. هەربەوجۆرەی کە پەیمانیاندابوو، یەکەمجار ویلیان لەسەر کورسییەکەی دانیشاند. بەبێ هیچ کێشە و گرفت و ئازارێك ناوبراویان خستە سەر کورسییەکەی خۆی. دواتر ئێمەش لەملاو ئەولایەوە دانیشتین.

لەپاش ئەوەی کە نزیکەی یەك کاتژمێر بە ئاسمانەوەو لەسەر هەورەکانەوە بوین، تازە سەرنجی ئەوەمدا کە ئەگەر کورسییەکەی ویل لار ببێتەوە، جێگەکەی ویل هێندە تۆکمە و

بەهێزە کە هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدات. ویلیش هێندەی گەشتیارەکانیتر لە ئاسایش و بێوەییدا بوو. شوێنەکەی لەبەرامبەر شاشەی تەلەفیزیۆنەکەوە بوو، نە دەیتوانی شتێك بکات و نە بجولێتەوە. لەو سەرەوە و لەوبەرزاییە سیی هەزار پێیەوە شتانێکی زۆر زۆر کەم هەبوون کە ویل لەوانیتر جیابکاتەوە. ویل شتێکی خوارد و سەیری فیلمی کرد، زۆربەی کاتیش دەخەوت.

من و نیتنیش بە خۆپارێزییەوە زەردەخەنەمان بۆ یەکتری دەکرد و هەوڵماندەدا وای نیشانبدەین کە بارودۆخ زۆر باشە. من چاوم بڕیبویە دەرەوەی پەنجەرەکە. بیرو خەیاڵم وەك هەورەکانی خوارەوەمان تێکەڵ و پێکەڵ و شپرزە بوون. هەرکارێکم دەکرد نەمدەتوانی ئەم خەیاڵە لە خۆم دوور بخەمەوە کە ئەمکارەی من بۆ پشتیوانی لە ویل نەبووە. بەڵکو تەنها بەشوێن گێچەڵ سەری خۆمەوە بووم. من لوئیزا کلارك، بەڕاستی خەریکبوم بەرەو ئەوسەری گۆی زەوی دەفڕیم. توانای ئەوەم نەبوو کە دەرکی بکەم. چونکە بێجگە لە ویل نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێکیتر بکەمەوە. هەستی خوشکەکەمم هەبوو کاتێك تۆماسی هێنایە دونیاوە. چاوی بڕیبویە کۆرپەکەی و گوتبوی (هەردەڵێی سەیری ناو ڕەحەتیەك دەکەم، دوونیا لەمن و ئەم منداڵەدا کورت بووەتەوە).

کاتێك لەناو فڕۆکەخانەکەدا بوین نامەی بۆ ناردبوم.

***(دڵنیابە سەرکەوتو دەبیت، زۆر شانازیت پێوە دەکەم. ماچ).***

مۆبایلەکەم داگیرساند و دووبارە نامەکەم خوێندەوە. کتوپڕ هەیەجانزەد بووم. لەوانەیە لەبەر هەڵبژاردنی بوو لە ووشەکاندا. لەوانەیشە ماندو بێت و ترسابێت. باوەڕکردنی بۆ من زۆر سەخت بوو کە تاوەکو ئەم شوێنەی کارەکە هاتووم. سەرئەنجام بۆ ئەوەی کە بیر زەینم ئازاد بکەم، تەلەفیزیۆنەکەی بەرامبەرم داگیرساند و بە بێئاگاییەوە سەیری فیلمێکی کۆمیدی ئەمریکیم دەکرد. تاوەکو ئاسمانی چواردەورمان تاریکی کرد.

ویل چاوی کردەوە، گارسۆنی فڕۆکەکەم لەسەرسەرمانەوە بینی کە نانی بەیانی بۆ هێنابوین. ویل لەگەڵ نیتندا سەبارەت بە فیلمێك کە بەیەکەوە سەیرییان کردبوو قسەی دەکرد. دواتر سەرەڕای ئەو هەموو کێشەو گرفتانەی کە هاتبونە ڕێگامان، بەوپەڕی سەرسامییەوە دەبینم تەنها یەك کاتژمێرمان ماوە تاوەکو لە (موریس)[٣٤]دا بنیشینەوە.

---

[٣٤] دورگەیەکە لە ئۆقیانوسی هیندی، کە کەوتوەتە ٢٠٠٠ کیلۆمەتری باشوری خۆرهەڵاتی کیشوەری ئەفریقاوە.

باوەڕناکە تاوەکو قاچمان نەخستە ناو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی (سر سیووسگر رمگول)ەوە باوەڕم کردبێت کە بەڕاستی هاتبین بۆ گەشت و سەفەر.

بە ماندوبونێکی تەواوەوە لەبەشی چونە ژورەوە تێپەڕین، جەستەمان بەهۆی ئەو فڕینەوە هەروا ووشك و ماندو بوو. بە بینینی ئەو تەکسییە تایبەتەی کە بۆ ئێمەیان ئامادە کردبوو، هەناسەیەکی ئیسراحەتمان هەڵکێشا. لە یەکەم بەیانی گەیشتنمان، هەروا کە تەکسییەکە بەخێراییەوە تێدەپەڕی و ئێمەی بەرەو شوێنی ژورەکەمان دەبرد، کەمێك لەگەڵ دورگەکەدا ئاشنایەتیم پەیدا کرد. ڕەنگەکانی ئەو شوێنە درەوشاوەتر بوون لە ئینگلستان، ئاسمانەکەی ساماڵتر بوو. ئاوی نیلگون کە لە بێ بنیدا دیارنەدەماو دواتر وردە وردە فراواندەبوو و ڕەشتر ڕەشتر دەبوو. دورگەکە سەرسەوزو جوان بوو، پڕ بوو لە گوڵ و گیا لەگەڵ خشەخشی قامیشی شەکر لەکەنارەکانیەوە. دەریاکەیش هەروەك هێڵێك لە جیوە لە نێوان تەپۆڵکەکانی بورکانەکەدا دیمەنێکی تایبەتی هەبوو. فەزاکە تەماوی و پڕ بوو لە بۆنی شتێکی وەك زەنجەفیل. خۆر لە ئاسمان و لەسەری سەرەوە بوو ڕوناکییە تیژەکەی بوبویە هۆی ئەوەی کە کوێرانە سەیر بکەم. ماندو بوون و بێتاقەتیەکەی من وەك ئەوە وابوو کەسێك لە خەو بێداری کردبمەوە و خەریکە لاپەڕەکانی گۆڤارێکی لوکس و شیکم نیشاندەدا.

تەنانەت لەو ساتانەشدا کە چاوو گوێم دەرگیری دیمەنە نەناسراوەکانی دەورووبەرم بوو، بەڵام دیسانەوە بێئاگا نەبووم لە ویل و بەتەواوەتی هەست و هۆشم لەلای ئەو بوو. سەری دەموچاوی ڕەنگ پەڕیوو ماندویم دەکرد. هەروەك بڵێی سەری کەوتبو بەسەرشانیدا.

دواتر چوینە ناو ڕێڕەوی ئۆتۆمبیلەوە کە لەملاو ئەولایەوە ڕیزێك لە درەختی خورمای هەبوو. لەبەرامبەر خانویەکی یەك قاتدا وەستاین. شۆفێرەکە خێرا دابەزی و شتومەکەکانی ڕادەست کردین.

چای سەهۆڵیان بۆ هێناین و گوتیان کە گەشتێك بەدەوری ئوتێلەکەدا بکەین، بەڵام ئێمە ڕەتمان کردەوە. چوین بۆ ژورەکەی ویل و جانتاکەیمان خاڵی کردەوە. ناوبراومان لەسەر سیستەمەکەی خۆی پاڵخست. پێش ئەوەی کە پەردەکە دابدەینەوە، ویل خەوی لێکەوت و ئێمەش لەوێ بوین. لە کۆتاییدا سەرکەوتنم بەدەستهێنابوو. لەدەرەوەی ژورەکەیدا وەستام و هەناسەیەکی ئیسراحەت و بێخەمم هەڵکێشا. نیتنیش وەستابوو سەیری دەرەوەی دەکرد. چاوی بڕیبویە شەپۆلە سپییەکان کە بەسەر تاشەبەردە مەرجانییەکەوە تلیان دەخوارد. کتوپڕ

چاوەکانم پڕ بون لە فرمێسك. نازانم لەبەر ئەوە بوو کە یەکەم سەفەرم بوو، یان لەبەر ئەوەبوو لە تەمەنمدا نەچوبوم بۆ شوێنێکی جوانی لەمشێوەیە. نیتن بە بینینی قیافەی من گوتی:

—خۆ هەموو شتێك باشە.

دواتر لەوپەڕی سەرسامیمدا هاتە پێشەوە و باوەشی پێدا کردم.

—لو، بێخەم و ئیسراحەت بە. هەموو شتێك بەباشی دەڕوات. بەجیدیمە کارەکەت زۆر باش و نایاب بوو.

***

نزیکی ڕۆژی سێیەم دەمانتوانی هیوامان بە ویل هەبێت. ویل چل و هەشت سەعاتی سەرەتا هەر خەوتبوو. دواتر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، حاڵ باشتر بوو. ڕەنگی پێستی کرایەوە و ئیتر سێبەرو شینایییەکانی دەوری چاوەکانی دیار نەمان. ڕەقبونی ماسولکەکانی جەستەی نەمابوو دووبارە دەستیکردبویەوە بە نانخواردن. کورسییە تایەدارە کەی بە هێواشی لەناو مێزە بێکۆتایییەکانی پڕ لە جۆرەها خواردن لێدەخوڕی و پێی دەگوتم کە چی بکەمە ناو دەورییەکەیەوە. کاتێك بەزۆر داوای لەمن دەکرد ئەو خۆراکانە بخۆم کە هەرگیز نەمخواردبون، دەمبینی کە ئێستە ئیتر ئەو ویلە شاد و گەشەی جارانە. خواردنی پڕ لە داوو دەرمان بە لێنانی ئەفریقایی و ئەورووپایی و خۆراکانێکی دەریایی کە ناوەکانیانم نەدەزانی. ویل زۆر خێراتر لەمن خۆی لەگەڵ ژینگەکەدا گونجاند و هەستی بە ئیسراحەت کرد. ئەڵبەتە شتێکی سەیر نەبوو.؟ نەدەبوو ئەوەم لەبیر بچێت کە ناوبراو زۆربەی تەمەنی لە گەشتی و سەفەردا گوزەراندبوو هەموو شوێنێکی ووشکانی ئەم گۆی زەوییە و هەموو ئەم کەنارانە قەڵەمڕەوی ئەو بوون. نەك بەشی ناسەرەکی و فەرعیماڵەکەی باوکی و لەژێر سێبەری ئەو قەڵایەدا.

ئوتێلەکە بەپێی ئەو پەیمانەی کە دابویان، کورسی تایەداری تایبەتی تایە پانیان بۆ ئێمە ئامادەکردبوو. بەیانیان زیاتر نیتن ویلی سوار دەکرد و هەرسێکمان بەدرێژایی کەنارەکە پیاسەمان دەکرد. من هەمیشە چەتری خۆریم پێبوو بۆ ئەوەی ئەگەر تیشکی خۆرەکە تیژ بوو لەسەر سەری ویلەوە بیگرم. بەڵام هیچکات ئەوە ڕوینەدا. ئەو بەشەی باشوری دورگەکە بەهۆی ئەو شنەبا دەریاییەوە زۆر بەناو بانگ بوو کە پلەی گەرما لە ٢٤ پلەی سانیتگراد بەرزتر نەدەبویەوە، ئەمەش بۆ ئەو وەرزە شتێکی سەیر بوو. دەمانتوانی لەکەناری بچوکی تەنیشت تاشەبەردەکەدا کە لەدوری بینای سەرەکی ئوتێلەکەوە بوو لەوێوە نەدەبینرا، بوەستین و چێژ

لە کەشوهەواکە وەربگرین. کورسییەکەی خۆمم دەکردەوە و لەتەنیشت ویلەوە و لەژێر سێبەری دارخورماکەدا دادەنیشتین و بەیەکەوە سەیری نیتنمان دەکرد کە سواری شەپۆلەکان دەبوو خلیسکێنەی سەر ئاوی دەکرد. هەندێکجار لەو شوێنەوە کەلەسەر لمەکە دانیشتبوین، بەهەیەجانێکی زۆرەوە هات و هاوارمان دەکرد و هانی نیتنمان دەدا، هەندێکجار بە جێنو هاندانەکەمان چێژدارتر دەکرد.

سەرەتا کارمەندانی ئوتێلەکە هەوڵێکی زۆریان دەدا کە یارمەتیمان بدەن، خولکیان دەکردین کە لەبری ئێمە پاڵ بە کورسییە تایەدارەکەی ویلەوە بنێن. بەزۆریش پەرداخی ئاوی ساردیان پێدەدا. دواتر ئێمە بۆمان ڕونکردنەوە کە پێویست بەمکارانە ناکات. ئەوانیش بە ڕویەکی خۆشەوە وازیان هێنا. هەرچەندە پێمخۆش بوو لەو ساتانەی کە لەگەڵ ویلدا نیم، کارمەند یان کارگوزارەکانی پێشوازی لەگەڵیدا دەوەستان و قسەیان لەگەڵدا دەکرد. یاخود باسی ئەو شوێنانەیان بۆ دەکرد کە پێیانباشبوو ئێمە بچین و بیانبینین. گەنجێکی باڵابەرز هەبوو ناوی (نیدیل) بوو، کە لەکاتی نەبوونی نیتندا هەستی بە ئەرك و لێپرسراوییەتی دەکرد و خۆی بە پەرستاری ویل دەزانی. ڕۆژێکیان هاتم و دەبینم نیدیل و کەسێکیتر بە خۆپارێزییەوە ویلیان لەسەر کورسییە تایەدارەکە بەرز کردەوەو خستیانە سەر سیستەمی دۆشەکەداری تایبەتی بەرخۆر، کە پێشتر خستبویانە ژێر درەختەکەمانەوە. کاتێك لەسەر کەنارە لمیەکە پیاسەم دەکرد و بەرەو لای ئەوان دەچوم، نیدیل پەنجە گەورەی وەك نیشانەی پشتگیری بەرزکردەوە و گوتی:

—ئێستە باشتر بووە. هەرکاتێك جەنابی ویل ویستیان بچنەوە سەر کورسییە تایەدارەکەیان، تەنها هەواڵمان پێبدەن، یەکسەر دێم.

ویستم ڕەخنەبگرم و بڵێم کە نەدەبوو بیانجوڵاندایە، بەڵام ویل چاوەکانی داخستبوو بە جۆرێك ئیسراحەت و بێخەم ڕاکشابوو کە دەمم داخست و تەنها سەرم ڕاوەشاند.

کاتێك لەبارەی ویلەوە خەم و نیگەرانیم نەما، وردە وردە هەستمکرد کە بەڕاستی لە بەهەشتدام. لە خەویشدا نەمبینیبو کە ڕۆژێك پێ بخەمە شوێنێکی لەمشێوەیە. بەیانیان بە دەنگی شەپۆلەکانی دەریا کە بەهێمنیەوە لە کەنارەکەیان دەدا و دەنگی باڵندە نەناسراوەکان کە لەسەر لقی درەختەکان یەکتریان بانگدەکرد، خەبەرم بێتەوە. سەیری سەقفی ژورەکەم دەکرد کە بە ڕوناکی خۆر ڕۆشن بوبویەوە. لە ژورەکەی تەنیشتەوە دەنگی قسەم دەبیست و

دەمزانی کە نیتن و ویل پێش من خەبەریان بوەتەوە. سارونگ[٣٥] و مایەم لەبەر دەکرد و چێژم لەگەرمای خۆرەکە وەردەگرت کە دەیدا لەشان و ملم. وردە وردە پێستم خەریکبوو ووردەخاڵی قاوەیی لەسەر دروستدەبوو. نینۆکم سپی بوبویەوە. خەریکبوم لەو خۆشییە بچوکانەی ئەو شوێنە چێژێکی زۆرم وەردەگرت، پیاسەکردن لەکەنار دەریا، خواردنی خۆراکە نوێیەکان، مەلەکردن لەناو ئاوی گەرم و زولاڵدا، شوێنێك کە ماسی ڕەش لەپشتی تاشەبەردە بورکانییەکانەوە سەرەتاتکێیان دەکرد و زۆر سەیرو سەمەرە بۆیان دەڕوانیم. یاخود بینینی خۆری سوتێنەر کە ئاوا دەبوو لە ئاسۆوە دەچویە خوارەوە. وردە وردە تاڵی و سەختییەکانی ئەم چەند مانگەی ڕابوردوی کاڵکردەوە و بەوپەڕی شەرمەزارییەوە دەبێت بڵێم زۆر بەکەمی پاتریکم بیر دەکەوتەوە.

ئێستە ئیتر ڕۆژەکانمان وەك یەك تێدەپەڕین. بەیەکەوە نانی بەیانیمان دەخوارد، هەر سێکمان بەیەکەوەو لەسەر مێزە کەپردارەکانی قەراخ حەوزەکە. ویل بەزۆری زەلاتەی میوەی دەخوارد کە من بەدەست دەمکرد بەدەمییەوە. دواتر کە حەزی بۆ خواردن زیاتر بوو، هەندێکجار لەدوایەوە کێکی مۆزی دەخوارد. دواتر دەچوین بۆ کەنارەکە و لەوێدا دەماینەوە. من کتێبم دەخوێندەوە، ویلیش گوێی بۆ گۆرانی دەگرت. نیتنیش ڕاهێنانی وەرزشە ئاوییەکانی دەکرد. ویل هەمیشە بە منی دەگوت کارێك بکەم. سەرەتا دەمویست بڵێم نەخێر. تەنها ئەمویست لەلای خۆی بم. بەلاّم دواتر کاتێك پێداگریم بینی، ڕۆژێکیان بەیانیەکەی چوم بۆ سواری بەلەم و سواری شەپۆلەکان. بەلاّم زیاتر حەزم دەکرد لەدەوروبەری خۆیدا بم.

هەندێکجار کە نیدیل لەوێ بوو شوێنی پشودانەکە چۆڵ بوو، نیتن و نیدیل ویلیان دەخستە ناو ئاوی گەرمی حەوزەکەوە. نیتن دەستی دەخستە ژێر ویل بۆ ئەوەی لەسەر ئاوەکەوە بمێنێتەوە. کاتێك لەناو ئاوەکەدا بوون، ویل بەزۆی قسەیەکی ئەوتۆی نەدەکرد، بەلاّم ڕەزامەندی لەدەموچاوییەوە دەباری، هەروەك بڵێی جەستەی ئەو جۆش و خرۆشەی کە ماوەیەکی زۆرە فەرامۆشی کردبوو بەبیری دەهاتەوە. جەستەی کە ماوەیەکی زۆرە بێ ڕەنگ بوو، ئێستە وەك ئاڵتونی لێهاتووە و شوێنی برینەکە لەسەر جەستەی سپی بووە و خەریکە دیار نەمێنێت. ئەگەر بلوزی لەبەردا نەبوایە هەستی بە ئازار نەدەکرد.

---

[٣٥] پارچە قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگی وەك دەرقاچەیە کە دەیبەستن بەدەوری کەمەرەوە.

کاتی نانی نیوەڕۆ دەچوین بۆ یەکێك لەو سێ شوێنەی کەنارەکە کە تایبەت بوون بە پشودانی میوانانی ئوتێلەکەوە. زەوی هەموویان فەرش ڕێژکرابوو پلیکانەو ڕەمپای کەمی هەبوو، هەربۆیە ویل بەئازادی جوڵە و هاتوچۆی هەبوو دەیتوانی بە کورسییە تایەدارەکەی بێت و بڕوات. لەوانەیە خاڵێکی بچوك بوبێت، بەڵام ئەم هەلە بۆ ویل فەراهەم دەبوو کە بەبێ هاوڕێیەتی یەکێك لە ئێمە بڕوات و داوای خواردنەوە بکات بۆ خۆی. شتێکی لەمجۆرە یەکێك لە هۆکارەکانی توڕەیی و بێزاری ویلی دادەمرکاندەوە، کە بریتی بوو لە پێویستی بە خەڵکانیتر. ئەڵبەتە هیچکاممان زۆر ئەملاو ئەولامان نەدەکرد. لە هەر شوێنێك کە بوینایە، لەکەنارەکە یان لەقەراغ حەوزەکە یان تەنانەت جاکوزییەکە، هەمیشە سەروکەللەی یەکێك لەو کارمەندە ڕۆخۆشانە دەردەکەوت کە خواردنەوەی بۆ هێنابوین. ئەو خواردنەوەیەی کە بەخەیاڵی خۆی حەزمان لێیەتی، بەزۆری بە گوڵێکی بچوکی پەمەییش ڕازاندبویەوە. تەنانەت کاتێکیش لە قەراخ کەنارەکەدا ڕاکشابوین، یەك جار دەیدا بەلاماندا و پێشکارەکە بە زەردەخەنەوە خوڵکی ئاوی کانزایی و شەربەت یان شتێکی تری دەکردین.

دوای نیوەڕوان کە پلەی گەرما بەرزتر دەبویەوە، ویل دەگەڕایەوە بۆ ژورەکەی خۆی و یەك دوو سەعاتێك دەخەوت. منیش یان لەناو حەوزەکەدا مەلەم دەکرد، یان کتێبم دەخوێندەوە. شەو دیسانەوە دەگەیشتینەوە بەیەك و دەچوین بۆ ڕێستورانی کەنار دەریاکە و نانی ئێوارەمان دەخوارد. چێژی کۆکتێلەکە زۆر زوو کەوتە دەممەوە و لەسەر خواردنی ڕاهاتم. نیدیل زانیبوی ئەگەر بێت و قەسەبێکی گونجاو بە ویل بدات و پەرداخێکی درێژ بخاتە شوێنی تایبەتی پەرداخی کورسییەتایەدارەکەیەوە، ئیتر پێویستناکات من و نیتن یارمەتی ویل بدەین. شەوانە سێ قوڵی دادەنیشتین و باسی سەردەمی منداڵی خۆمان دەکرد. باسی کوڕ و کچە هاوڕێکانمان دەکرد. باسی یەکەمین کارمان، باسی خێزان و خانەوادەکانمان و ئەو گەشتانەمان دەکرد کە ئەنجاممان دابوون. منیش سەرنجی ویلم دەدا و دەمبینی کە هێدی هێدی لەناو کەلاکی خۆیدا دێتە دەرەوە.

ویل گۆڕدرابوو. بەڕواڵەت ئەو شوێنە ئارامشێکی بەو دابوو کە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە ناوبراوم دەناسی بەو شێوەیە نەمبینیبوو.

جارێکیان کاتێك لەسەر بۆفەی نانی ئێوارە وەستابوین و خواردنمان تێدەکرد. نیتن گوتی:

—وادیارە جەوەکەی پێخۆشە، ئەی وانییە؟

—بەڵێ منیش پێمواية.

نیتن بەرەولای من چەمایەوە، حەزی نەدەکرد ویل بزانێت باسی ئەو دەکەین.

—لو، دەزانیت ئەو کێڵگەیەی کە پێشتر بڕیار بوو بچین بۆی و ئەو گێچەڵ سەریانەی کە بڕیاربوو ئەنجامیانبدەین، زۆر خۆش و نایابن، بەڵام وابزانم شوێنێکی لەمشێوەیە کاریگەرییەکی زیاتر هەبێت.

بە نیتنم نەگوت کە ڕۆژی یەکەم چ حاڵ و ڕۆژێکم هەبوو، هەمان ئەو کاتەی کە ژورەکانمان وەردەگرت، زۆر دڵەخورپەم هەبوو هەروا لەبەر خۆمەوە حیسابم دەکرد کە تاوەکو چند ڕۆژێکیتر دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. هەربۆیە ناچار بووم ئەم دە ڕۆژە ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششی خۆم بدەم بۆ ئەوەی لەبیرم بچێتەوە کە بەڕاستی بۆچی لێرەین. بڕیارنامە شەش مانگییەکەو هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویاندابوو بەوردی لە ڕۆژژمێرەکەدا نیشانەم کردبوون، دەبوایە لەو ساتەدا بژیم و هانی ویلم بدایە کە وەك من بجوڵێتەوە. دەبوایە شاد بم بەوهیوایەی کە ویلیش شاد و کامەران و خۆشحاڵ بێت.

قاژێکیتری خەربوزەم هەڵگرت و زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم:

—ئەی باشە دواتر چی دەکەین؟ کارائوکە[٣٦] دەکەین؟ یاخود هێشتا لە دوێنێ شەوەوە گوێمان نەگەڕاوەتەوە جێگەی خۆی؟

***

شەوی چوارەم، نیتن بە کەمێك دەستەپاچەیی و شپرزەییەوە، ئەوەی ڕاگەیاند کە مەوعیدی بینینی کەسێکی هەیە. کارن کە خەڵکی زلاندنو بوو لە ئوتێلەکەی تەنیشتماندا دەمایەوە و نیتن ئەیویست لەگەڵ ئەودا بچێت بۆ شار.

—تەنها بۆ ئەوەی کە بێخەم بم. دڵنیانیم شوێنێکی بێوەی و ئاسایش بێت، تاوەکو بەتەنهایی بڕوات.

ویل گوتی:

—بەڵێ.

---

[٣٦] کارائوکە کەرەستەیەکی سەرگەرمکردنە، بۆ خوازیاران و گۆرانیبێژان (چ میللی و چ پیشەگەر بن) کە لەڕێگەی یەك لاپەڕەی نمایش و یەك مایکرۆفۆنەوە ئەوە بۆ مرۆڤە موشتاقەکان فەراهەم دەکات کە لەکاتی پەخشی مۆسیقای بێ قسەدا، ئاوازە بەناوبانگەکانی شیعرەکان لەسەر لاپەڕەی نمایشەکە ببینن و لەڕێگەی مایکرۆفۆنەکەوە دەنگی خۆیان تۆمار بکەن.

بە ویقارەوە سەرێکی ڕاوەشاند و لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

–نیتن پیاوەتی و ئازایەتی بەخەرج دەدەیت!

منیش پشتگیریم کرد و گوتم:

–چ هەستکردنێك بە لێپرسراوییەتی! دیارە کە گرنگی بە ئاسایشی کۆمەڵگە دەدەیت!

–من هەمیشە لەبەر جۆری هاوڕێیەتیەکەی نیتم ئافەرین دەکرد، بەتایبەتی سەبارەت بە ڕەگەزی ناسك.

نیتنیش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

–ئێوە دوو کەس بڕۆن وونبن!

دواتر لێیداوو ڕۆیشت.

کارن بە خێرایی لەلامان جێگیر بوو، نیتن زۆربەی شەوەکان لەگەڵ ئەوو جیمدا بوو، هەرچەندە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی بەکارەکانی شەوانەی ویلدا ڕابگات. ئێمەیش بەبێ ئەوەی کە دەری ببڕین زۆرترین هەل و کاتمان پێدەدا بۆ ئەوەی کاتەکانی بەخۆشی بەسەر بەرێت و خۆشحاڵ و شادومان بێت.

منیش لەناخی دڵەوە خۆشحاڵ بووم. نیتنم خۆشدەویست و سوپاسگوزاری بووم کە لەگەڵماندا هاتووە. بەڵام زیاتر پێمباشتر بوو کە لەگەڵ ویلدا بەتەنیا بم. کاتێك دوو بەدوو بوین و کەسمان لەلای نەبوو، لەیەکتری نزیکتر دەبوینەوە و خۆشەویستی و هاوڕێیەتیەکی نزیك لەنێوانماندا بەدیدەهات. زۆرم پێشخۆش بوو کاتێك ئاوڕیدەدایەوە و بە زەردەخەنەوە سەیری دەکردم، هەروەك بڵێی بەجۆرێکم لێهاتووە کە ئەو چاوەڕوانی ئەوەی نەکردووە.

یەك شەومان مابوو بۆ کۆتایی گەشتەکە، بە نیتم گوت هیچ کێشەیەك نییە ئەگەر بێت و کارن لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە بۆ ئوتێلەکەی خۆمان. نیتن شەوان لەئوتێلەکەی ئەودا دەمایەوە، منیش دەمزانی کە بۆ ئەو زۆر قورسە، چونکە دەبوایە هەموو جارێك بیست خولەك بە پێ بهاتایەو کارە شەوانەکانی ویلی ئەنجامبدایە و بگەڕایەتەوە.

–هیچ کێشەیەکی تێدا نییە کە بۆ تۆ ئاسانتر و ئیسراحەتترە.

نیتن زۆر خۆشحاڵ بوو. سەراپای کەمەندکێشی ئەو شەوە بوبو کە لەبەردەمیدا بوو. هەربۆیە یەکسەرو بەوپەڕی شەو زەوقێکی فراوانەوە و بەسوپاسەوە پێشنیارەکەی قبوڵ کردم.

–مەمنونم هاوڕێ گیان.

دواتر که بۆ ویلم باسکرد، گوتی:

—لەرێزو چاکەی خۆتە.

من گوتم:

—لە بنەڕەتدا رێزو چاکەی تۆیە. لەبەر ژورەکەی تۆ بوو کە من بەخشندەیم نواند.

ئەو شەوە ویلمان هێنا بۆ ژورەکەی من. نیتن یارمەتیداین و ویلمان لەسەر سیستەمەکە پاڵخست. دەرمانەکانیشی پێدا. کارن لەودیوی دەرگاکەوە چاوەڕێ بوو، لەناو گەرماوەکەدا بلوزو لیباسەکەی ژێرەوەم گۆڕی. دواتر دەرگای گەرماوەکەم کردەوە و هەروا سەرینەکەم لەبندەستمدا بوو بەرەو لای قەنەفەکە رۆیشتم. هەستم بە قورسی نیگاکانی ویل دەکرد. بەشێوەیەکی سەیرو نامۆ هەمووی ئەوەم بەبیردەهاتەوە کە هەموو هەفتەی رابورد بە بێمانایی بەدەوروپشتیدا سوڕابومەوە. سەرینەکەم خستە سەر دەسکی قەنەفەکە.

—کلارك؟

—بەڵێ؟

—تۆ ناچار نیت شەو تاوەکو بەیانی لەوێدا بخەویت. سیستەمەکە ئەوەندە گەورەیە کە تیپێکی یاریکردنیش جێگەی دەبێتەوە.

خاڵێك هەبوو کە تەنانەت بیریشم لێ نەکردبویەوە، ئەویش بریتی بووە لەوەی کە تاوەکو ئەوکاتە باروذۆخ چۆن بوو. لەوانەیە ئەو رۆژانەی کە نیوەڕوت لەکەنارەکەدا سوڕابمەوە بوبویە هۆی ئەوەی کە هەست بە ئیسراحەتیەکی زیاتر بکەین بەیەکەوە. یان لەوانەیە لەبەر رەچاوکردنی حاڵی نیتن و کارن بوبو کە لە یەکەوە دوور بوون، بەڵام ئێستە لەودیوی ئەو دیوارەوە لەباوەشی یەکیتریدا بوون. یان لەوانەیە هەر ویستبێتم لەلای ئەودا بم. بەرێکەوتم و بەرەو لای سیستەمەکە رۆیشتم. بەڵام کتوپڕ لەبەر قیژەی کتوپڕی هەورەبروسکە راچڵەکیم. ئاسمان بریسکەیەکی دایەوە و دەنگی هەورە گرمە هات. لەژورەکەی تەنیشتمانەوە دەنگی نیتن و کارن دەهات کە پێدەکەنین.

بەرەو لای پەنجەرەکە رۆیشتم و پەردەکەم لادا. هەستم بە شنەبایەکی کتوپڕ کرد کە لێیدام. پلەی گەرماو سەرما دابەزی بوو دەریا تۆفانی بوبو. ئاسمان بەتوندی بروسکەی دەدا و هەورەبروسکەیەکی چەند لقی ئاسمانی ئەو ناوەی رووناك دەکردەوە. دواتر باران دەستی پێکرد و خرەی تەپڵ ئاسای باران دەیدا بەسەر سەقفی بچوکی ویلا بچوك و یەك قاتەکەی

ئێمەدا. سەرەتا ئەوەندە توند و بەهێز بوو کە هەموو دەنگەکانی داپۆشی و بێجگە لە دەنگی باران هیچ دەنگێکیتر نەدەبیسترا.

گوتم:

-باشتر وایە پەنجەرەکە دابخەم.

گەڕامە دواوە.

ویل سەری بەرەو لای پەنجەرەکە ڕاوەشاند و گوتی:

-دەرگاکان بکەرەوە، ئەمەوێت سەیری دەرەوە بکەم.

کەمێك وەستام، دواتر چوم و دەرگا شوشەییەکەی بەرهەیوانەکەم کردەوە. باران بەسەر ویلاکانی ئوتێلەکەدا دەباری و دەڕژا بەسەر سەقفی ویلاکەی ئێمەدا، لەناو بەرهەیوانەکەدا ڕووبارێك دروستبوبو، دەڕژایە لایەکی دەریاکەوە. هەستم بە کارەبای هەواو ڕادەی شێ دەکرد بەسەر دەموچاومەوە، مووەکانی دەستم گرژ بوبونەوە.

ویل لە دوامەوە گوتی:

-دەبینی؟

-هەر دەڵێی کۆتایی دوونیایە.

هەر لەوێدا وەستام. هەورە بروسکە بەناو بوون و وجودمدا دەڕۆیشت و بروسکە سپییەکان لەسەر برژانگی چاوەکانم نەخشیان دەبەست. هەناسەم توند بوبو. گەڕامەوە و بەرەو لای سیستەمەکە ڕۆیشتم. کاتێك سەیری کردم، چەمامەوە و بە هێمنییەوە گەردنی خۆرسوتاندوی ویلم بەرەو لای خۆم ڕاکێشا. ئێستە ئیتر دەمزانی چۆن بیجولێنم، یان چۆن قورسی جەستەی لە کۆنترۆڵی خۆمدا بهێڵمەوە. توند گوشیم بەخۆمەوە، چومە پێشترەوە و پاڵپشتە سپییە گەورەکەم خستە پشتیەوەو دواتر خستمە سەر نەرمی پاڵپشتەکەوە. بۆنی خۆری لێوە دەهات، هەروەك بڵێی تاوەکو قوڵاییەکانی بون و وجودی چوبویە خوارەوە. دەبینم خەریکم ناوبراو وەك شتێکی بۆنخۆش بۆن دەکەم.

دواتر لەتەنیشتیەوە ڕاکشام، هێشتا تەڕایی هەواکە لەسەر پێستم بوو. هێندە نزیکی بوبومەوە کە قاچم بەرقاچی دەکەوت. دووقۆڵی سەیری دەرەوەمان دەکرد، سەیری سپییەتی و شینی ئەو سوتانەوەمان دەکرد کاتێك هەورە بروسکە دەیدا لە دەریاکە. سەیری خەتە زیوی و

پلیکانییەکانی بارانمان دەکرد. دەریا شەپۆل فیروزەییەکە تەنها چل مەتر لە ئێمەوە مەودای هەبوو.

دوونیای چواردەورمان چوبویە ئاوو بچوکبوبویەوە، بچوک بوبویەوە و تەنها لەناو دەنگی تۆفانەکەداو لەناو پەردە شەبەکەییەکاندا کە بەهێمنیەوەتلیاندەدا و ئەو هەناسە پچڕ پچڕانەی کە من دەمدا کورت دەبویەوە. شنەباو نەسیمی شەوانە، بۆنی گوڵی نیلوفەڕی لەگەڵدا بوو، لەدورەوە دەنگی جریکە جریکی جامی شەراب و خشەخشی ئەو کورسیانەی کە بە هەڵەداوان لەکەنار دەریاکەوە بەرەو دواوە دەهێنرانەوە دەهاتە بەرگوێ. لە شوێنێکدا ئاهەنگ بوو دەنگی گورانی دەهات. هەستم بە ڕزگار بوون دەکرد. دەستم برد و دەستی ویلم گرت. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە هەرگیز بەمجۆرەی کە ئێستە هەستم پێدەکرد، بەوتوند و تیژییەوە پەیوەست نەبوبوم بە دوونیاو بە مرۆڤێکیترەوە.

ویل بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

—کلارک، خراپ نییە، نا؟

دەموچاوی لەبەرامبەر زریان و تۆفانەکەدا ئارام و نەلەخشاو بوو. ئاوڕیدایەوە بۆلام و زەردەخەنەیەکی بۆ کردم. شتێك لەچاوەکانیدا بوو، شتێکی سەرکەوتوانە.

گوتم:

—نەخێر، بەهیچ شێوەیەك خراپ نییە.

بێدەنگ و خامۆش ڕاکشام و گوێم بۆ هەناسەکانی گرت، هێمن و قوڵ بوون، دواتریش دەنگی باران بوو. هەستم بە پەنجە گەرمەکانی دەکرد کە لە پەنجەکانی من ئاڵابوون. نەمدەویست بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، وامدەزانی ئیتر هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. لێرەدا من و ویل لە ئارامی و ئاسایشدا بوین، لەناو بەهەشتی بچوکی خۆماندا بوین و دەرگاکەی بەڕوی دوونیای دەرەوەدا داخرابوو. هەرکاتێك کە بیری گەڕانەوەم بۆ ئینگلستان دەکەوتەوە، هەموو بوون و وجودم دەهاتە لەرزە و ترس دەکەوتە گیانمەوە.

*(بارودۆخەکان باش دەبن)*. هەوڵم دەدا قسەکەی نیتن لەبەر خۆمەوە دووبارە بکەمەوە. *(بارودۆخەکان باش دەبن)*.

تەپاوتلێکمدا و پشتم کردە دەریاکە، ئێستە ئیتر سەیری ویلم دەکرد. ویلیش سەری لارکردەوە بۆ ئەوەی لەبەر ڕووناکییە لاوزەکەدا سەیرم بکات. هەستمکرد ئەویش هەمان قسە

بۆ من دەکات *(بارودۆخەکان باش دەبن)*. لە تەمەنمدا بۆ یەکەمینجار هەوڵمدا بیر لە داهاتوو نەکەمەوە. تەنها ئەمویست هەست و جۆش و خرۆشی ئەو ساتانە لە هەموو بون و وجودمدا بێت و بڕوات. نازانم ماوەی چەندێك بەوشێوەیە ڕاکشاین و تەنها سەیری یەکتریمان کرد. دواتر وردە وردە پێڵوی چاوەکانی ویل قورس و قورستر بوون، تا ئەوەبوو بە ئاوازێکی پۆزشکارانەی چپە ئاساوە گوتی کە پێیوایە دەبێت... هەناسەکانی قوڵتر بوون، ئیتر یەکلایی بوویەوە و خەوی لێکەوت. دواتر تەنها من مامەوە کە سەیری دەموچاوی بکەم، سەیری مژەی چاوەکانی کە چۆن لە سوچێکی چاوییەوە لەیەکتری جیادەبونەوە، هەروەها سەیری پەڵە قاوەییە وردە نوێیەکانی سەرلوتی بکەم.

بەخۆمم گوت دەبێت بگەمە ئەنجامێك. هەر دەبێت بگەمە ئەنجامێك.

کاتژمێر یەکی شەو بوو کە لە کۆتاییدا تۆفان و زریانەکە وەستایەوەو لە شوێنێکی دەریاکەدا دیار نەما. دەنگی هەورە بروسکەکەیش وردە وردە کز بوو لەپاشان لەئاسمانی ئەو شوێنەدا نەماو ڕۆیشت بۆ ئەوەی لە شوێنێکیتردا بارانی خۆی ببارێنێت. وردە وردە ئاسمان هێور بویەوە و پەردەکە لە جوڵە کەوت. دەنگی هاتنەخوارەوەی دڵۆپە کۆتاییەکانی بارانەکە گۆڕدرا بۆ سۆزەیەکی زۆر کەم. کاتی بەیانی هەستامەوە و دەستم لەناو دەستی ویلدا هێنایە دەرەوە و بە پسکە پسك لەناو بێدەنگی ژورەکەدا چومە پێشەوە و پەنجەرە مۆدێل فەرەنسییەکانم داخست. ویل خەوتبوو، خەوێکی ئارام و بێ کەموکوڕی کە زۆر بە کەمی لەماڵەوە خەوێکی لەو شێوەیەی دەکرد.

من نەخەوتم، پاڵکەوتم و سەیریم کرد، هەوڵمدەدا بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە.

***

ڕۆژی کۆتایی دوو ڕووداو ڕویاندا. یەکێکیان ئەوەبوو کە بە پێداگری ویل ڕازی بووم بە دەمامکی ئۆکسجینەوە بچمە بنی دەریاوە. هەموو ڕۆژەکانی ڕابوردو چەلەحانێی لەگەڵ مندا دەکردە و دەیگوت باشە دەکرێت ئەم هەموو ڕێگەیان بریبێت و هاتبن بۆ ئەم شوێنە، بەڵام نەتوانم بچمە ژێر دەریاوە. کاتی شەپۆلسوارییەکە بێ غیرەتی زۆرم لە خۆم نیشاندابوو. بە سەختی دەمتوانی چارۆکەکە بەسەر شەپۆلەکانەوە بەرز بکەمەوە. کاتی خلیسکێنەی سەر ئاوەکە هەروا کە بەدرێژایی دورگەکە دەچووم، بەردەوام تەختەکە دەیکێشا بە دەموچاومدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ویل هەروا پێداگری دەکرد و ڕۆژێك پێش گەڕانەوە و کاتی نیوەڕۆ

ئەوەی ڕاگەیاند کە ناو منی بۆ خولی نیوەڕۆژەی ژێرئاوی سەرەتاییەکان نوسیوە. منیش بەناچارییەوە ڕۆیشتم. دەستپێکێکی باشم نەبوو. ویل و نیتن لەتەنیشت حەوزەکەوە دانیشتن، ڕاهێنەرەکەیشم هەموو هێزی خۆی بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی کە باوەڕم پێبهێنێت دەتوانم لەژێر ئاودا هەناسە بدەم. بەڵام کاتێك دەمبینی ئەوان سەیرم دەکەن دەستەپاچە و شپرزە دەبووم. بێئەقڵ نیم دەمزانی کەپسولەکەی کۆڵم هەوای پێویستم پێدەدات و کەرەستەکان کاری خۆیان بەباشی ئەنجامدەدەن. دەمزانی غەرق نابم. بەڵام هەرجارێك کە سەرم دەچویە ژێر ئاوەکەوە، یەکسەر دەترسام و دەهاتمەوە سەرئاوەکە. هەروەك بڵێی جەستەم نەیدەتوانی ئەوە قبوڵبکات کە لەژێر چەندین هەزار گالۆن ئاوی کلۆراوی دورگەی (موریس)یشدادەتوانم هەناسە بدەم.

کاتێك بۆ جاری حەوتەم هاتمەوە سەر ئاوەکە بە هەناسە بڕکێوە گوتم:

—باوەڕناکەم بتوانم.

جیمزی ڕاهێنەرم، سەیری نیتن و ویلی کرد کە لەدوامەوە بوون.

بە توندی گوتم:

—ناتوانم کاری من نییە.

جیمز پشتی لە نیتن و ویل هەڵکرد و کێشای بەسەرشانمدا. ئاماژەی بۆ دەریاکە کرد و بە ئاوازێکی گونجاوەوە گوتی:

—هەندێك دەڵێن بەڕاستی ناو دەریا ئیسراحەتترە.

—ناو دەریا؟

—هەندێك لەناو ئاوی قوڵدا خۆیان زۆر ئاسانتر بەردەدەن. وەرە، وەرە بابڕۆین و سواری بەلەم ببین.

سێ چارەکە سەعات دواتر، چومە ژێر ئاوەکەوە و سەیری ئەو دیمەنە ڕەنگاو ڕەنگانەم دەکرد کە لەسەرەوە نەدەبینران. ترسم شکابوو ئیتر خەمی لەکارکەوتنی کەرەستە و جیهازەکانم نەبوو. بیرو خەیاڵی غەرقبون لەسەرمدا نەمابوو بەتەواوەتی لەبیری خۆمم بردبویەوە. زۆر بەتوندی کەمەندکێشی نهێنیەکانی دوونیا نوێکەم بوبوم. لەناو بێدەنگییەکدا کە تەنها بە دەنگی هەناسەکانم دەشکێنرا، پۆل پۆل ماسییە وردە پەلکە زێڕینیەکان و ماسییە گەورە ڕەش و سپیەکانم دەبینی کە بە دەموچاوێکی بێ حاڵ و خاوو خلیچکەوە سەیری منیان دەکرد. ماسیە گوڵاڵە سورە دەریاییەکانم دەبینی کە بە تەکان تەکان و لەنجەولارەوە خۆراکی

نەبینراو وردی خۆیان لەڕەوتی هێمنی ئاوەکەدا ڕاو دەکرد. دیمەنەکانی ژێر ئاو بەڕەنگینتر و جۆراوجۆرتر لە دیمەنەکانی سەر ووشکانی دەهاتنە پێشچاوم. ئەشکەوت و کون و کەلەبەرگەلێکم دەبینی کە بۆسەی بوونەوەرە نەناسراوەکان بوون. لەدورەوە شێوەگەلێکم دەبینی کە بەهۆی تیشکی خۆرە پڕ لە ڕەنگی جوانی مەرجانی بوون. حەزم نەدەکرد بگەڕێمەوە بۆ سەر ئاوەکە، دەمتوانی بۆ هەمیشە لەوێداو لەناو ئەو دونیا بێدەنگ و خامۆشەدا بمێنمەوە. بەڵام دواتر کاتێك بینیم جیمز ئاماژەی بۆ کاتژمێرەکەی دەستی کرد، زانیم کە هەلێکی ئەوتۆمان لەبەردەمدا نەماوە.

لە کۆتاییدا کاتێك دەم بە خەندە هاتمەوە سەر کەنارەکە و بەرەو لای ویل و نیتن ڕۆیشتم، نەمدەتونی قسە بکەم. بیرو زەینم دەرگیری ئەو دیمەنە خەیاڵیانە بوو کە بینیبوم. هێشتایش دەست و قاچەکانم بەجۆرێك لە جۆرەکان بەرەو ناو ئاوەکە ڕایاندەکێشام.

نیتن گوتی:

—باش بوو، نا؟

پێڵاوە غەواسیەکەم داکەند و خستمە بەردەمی ویل لەسەر لمەکە.

—ویل، باشە بۆچی پێت نەگوتبوم؟ بۆچی زوتر ناچارت نەکردم؟ زۆر باش بوو! بێوێنە، لەمە باشتر نەدەبوو. ڕێك لەبەرچاوانم بوون!

ویل بە خوێنساردییەوە سەیری کردم، سەرەتا هیچی نەگوت. بەڵام وردە وردە دەموچاوی بە زەردەخەنەیەك کرایەوە.

—کلارك، تێناگەم، وادیارە نابێت بە هەندێکەس بگوترێت.

***

دووەم ئەوەی کە ئەو شەوە بەباشی مەست و نەشە بووم. نەك لەبەر ئەوەی کە ڕۆژی دواتر دەگەڕاینەوە. چونکە یەکەمینجار بوو کە بەڕاستی هەستمدەکرد حاڵی ویل باشە و دەمتوانی بێخەم و هیوادار بم. کراسێکی کەتانی سپیم لەبەر کردو پێڵاوێکی قاپ قاپی نقێم زیویم لەپێکرد، (ئێستە ئیتر هەستم دەکرد مەفرەغی بووم و هەربۆیە وەك ئەوە نەبوو کە کفنیان کردبێتە بەری تەرمەوە). دواتریش کاتێك نیدیل لقە گوڵێکی سوری پێدام و گوتی بیکە بە قژتەوە، پێنەکەنیم. دەبوایە یەك هەفتە لەمەوبەر ئەو کارەم بکردایە.

کاتێك چوم بۆ بارەکە و چوم بۆلای نیتن، ویل گوتی:

–سلاو کارمن میراندا[37]. بەهیچ شێوەیەك دڵرفێن نەبویت.

ویستم وەڵامێکی دەمکوتکەر بدەمەوە، بەڵام دەبینم بە شەوق و زەوق و بێ کینە واقی بەمندا ورماوە.

–مەمنونم بەڵام تۆ خۆت زۆر داغان نایەیتە پێشچاو.

کۆمەڵگەی بنەڕەتی ئوتێلەکە دیسکۆی هەبوو، کەمێك پاش سەعات دە دەکرایەوە.

کاتێك نیتن چو بۆ ئەوەی لەگەڵ کارندا بێت، من و ویل گوێمان بۆ گۆرانی موبایلەکە گرتبوو دەنگی درنگ درنگی سێ کۆکتێل کە لەگەڵماندا بوو قاچەکانمی هێنابویە سەما و بەرەو کەنارەکە ڕۆیشتین.

ئۆو چەندە جوانە! شەوێکی گەرم بوو شنەباکە لەگەڵ خۆیدا بۆنی کەباب و بۆنی ڕۆنی گەرمی سەر پێست و بۆنی سوێری دەریای دەهێنا. من و ویل لەلای درەختە خۆشەویستەکەی خۆمان وەستاین. ئەو کەسەی کە لەکەنارەکەدا ئاگری کردبویەوە، کە لەوانەیە بۆ کەبابی کردبێتەوە، هێشتا تۆپەڵەیەکی گەشاوەی لێ مابویەوە و نەکوژابویەوە.

هەروا کە لەناو تاریکیدا بوین من گوتم:

–حەزناکەم بگەڕێمەوە بۆماڵەوە.

–زۆر قورسە کە لێرە دڵ هەڵکەنی.

ئاوڕمدایەوە و بەجۆرێك کە لەبەرامبەریەوە وەستام.

–وامدەزانی ئەمجۆرە شوێنانە تەنها لە ناو فیلمەکاندا دەتوانی بیانبینی. خەریکبوم لەبەر خۆمەوە بیرم لێدەکردەوە کە بەدڵنیاییەوە ئەو شتانەی کە لەبارەی شوێنەکانیترەوە گوتوتە ڕاستن.

ویل زەردەخەنەی بەسەر لێوەوە بوو. دەموچاوی هێمن و شادومان دەهاتەپێشچاو، قەراخی چاوەکانی کە واقیان بەمندای ورمابوو، چرچ بوبون. منیش سەیرم کرد، بۆ یەکەمینجار ترس و لەرزێکم لەخۆمدا نەدەبینی. بەوپەڕی خۆپارێزییەوە پرسیم:

–خۆشحاڵی کە هاتویت.. نا؟

سەرێکی ڕاوەشاند.

---

[37] هونەرمەندێکی پورتوگالییە (١٩٥٥ – ١٩٠٩).

–ئۆو، بەڵێ.

بە خۆشحاڵییەوە دەستم بەناو هەوادا ڕاوەشاند و گوتم:

–ئۆو، چەندە باشە!

دواتر لەناو یانە و بارەکەوە دەنگی مۆزیك هات. منیش پێڵاوەکەم داکەند و دەستمکردە سەماکردن. بە بێئەقڵانە دەهاتە پێشچاو. ڕەفتارو هەڵسوکەوتێك کە ئەگەر لە هەرکاتێکیتردا ئەنجامم بدایە مایەی شەرمەزاریم بوو. ئێمە لەوێدا و لەناو تاریکایی ئەنگوستەچاودا، نیوە مەست و بێ خەو. لەتەنیشت ئاگری دەریای بێ بن و ئاسمانێکی بێ کۆتاییدا، بەو مۆزیکەی کە دەهاتە گوێمان و ویلێك کە دەمی تاوەکو بناگوێی کرابویەوە و دڵی بێ قەراری من، هەموو شتێك جیاوازی هەبوو، منیش دەرکێکم سەبارەت بە بارودۆخەکان نەبوو، تەنها ئەمویست سەما بکەم. سەمام کرد، پێکەنیم، هەر لەخۆمەوە و بەبێ ئەوەی کە نیگەرانی ئەوەبم کەسێك بمانبینێت. هەستم بە نیگاو سەیرکردنی ویل کرد لەسەر خۆم و دەمزانی کە دەزانێت ئەمە تەنها کاردانەوەیەکە بەرامبەر بەم دە ڕۆژی گەشت و ماوەی ئەم شەش مانگەی کارکردنی منە.

–تۆ...

زەردەخەنەیەکی هاروهاجانە بەسەر لێوەکانمەوە بوو گوتم:

–چی..؟

زۆر هەیەجانزەدە بووم و هەستم بە لەش سوکی دەکرد. ئیتر خەمی ئەوم نەبوو. ویل سەری ڕاوەشاند.

هەستامەوە و بە پێخاوسی وەستام، دواتر بەرەو لای کورسییە تایەدارەکەی ڕۆیشتم، لەسەر قاچی دانیشتم، بەجۆرێك کە دەموچاوی تەنها چەند سانتیمەترێك لەگەڵ دەموچاومدا مەودای هەبوو. لەشەوی پێشوو بەملاوە، کارێکی لەمجۆرە بەجۆرێك لەجۆرەکان بە نائاسایی نەدەهاتە پێشچاو.

–تۆ....

چاوە شینەکانی لەبەر ڕوناکی ئاگرەکەدا دەدرەوشانەوەو نیگای لە نیگای من ئاڵابوو. بۆنی خۆر، بۆنی ئاگر، بۆنی شتێکی تیژی وەك عەتری تێکەڵەی دەدا.

لەناخەوە هەستم بە ئارامش دەکرد.

–کلارك، تۆ لەگەڵ هەمواندا جیاوازیت هەیە.

بیرم تەنها بەلای شتێکدا ڕۆیشت. نزیکتر بومەوە و لێوم خستە سەر لێوی. ساتێك وەستاو لەپاشان قبوڵی کردم. چەند ساتێك هەموو شتێکم لەبیری خۆم بردەوە، بەڵام بە هەزارو یەك بەڵگە و بیانو نەدەبو هیچ شتێك لەبیری خۆم بەرمەوە، نەدەبوو ترسی خۆم و ئەو هۆکارەی کە لەپێناویدا لەوێ بوین لەبیرم بچێتەوە. بەڵام هەموشتێك لەبیرکرا، سڕایەوە و ئیتر نەما. تەنها من بووم و ویل، لەناو دورگەیەکی دەورەدراو بە ئاوی دورە دەست و لەژێر هەزاران ئەستێرە کە لەئاسمانەکەیەوە چاویان لەمرۆڤ دادەگرت.

دواتر خۆی کێشایە دواوە.

—ببورە... من...

چاوەکانم کردەوە. دەستم بەرزکردەوە و خستمە سەر دەموچاوی و دەستم هێنا بە کوڵمە جوانەکانیدا. لەژێر پەنجەمدا هەستم بە وردە خوێ دەکرد.

گوتم:

—ویل، تۆ دەتوانی. تۆ...

—نەخێر.

ئەم ووشەیە وەك پیکێك بوو کە لەسەرم بدرێت.

—تێناگەم.

—نامەوێت بچمە ناوییەوە.

—من پێموایە هیچ کێشەیەکی تێدا نییە.

—ناکرێت، من ناتوانم....

تفی دەمی قوتدایەوە.

—ناتوانم ئەو پیاوە بم کە خۆم حەزدەکەم بۆ تۆ بم. ئەمەش مانای ئەوەیە کە...

سەیری چاوەکانی کردم.

—واتە دووبارە بیری شتێکم دەخاتەوە کە من ئەو شتە نیم.

دەموچاویم بەرنەدا. نێوچاوانی خۆم بردە پێشەوە و لکاندم بەنێوچاوانییەوە. ئێستە ئیتر هەناسەکانمان تێکەڵ بوبون. دواتر هاتمەوە قسە. هێندە بە هێواشی قسەم دەکرد کە تەنها خۆی دەیتوانی بیبیستێت.

—بەلامەوە گرنگ نییە، گرنگ نییە کە تۆ بیردەکەیتەوە کە چ کارێك دەتوانیت بکەیت یان نا. خۆ شتێکی زەرد و سور نییە. ڕاستیەکەت بوێت لەگەڵ چەند کەسێکدا قسەم کردووە کە ئەم بارودۆخەی تۆیان هەیە... دەکرێت شتانێکی زۆر ئەنجامبدەن.

کەمێك توشی تەتەڵەکردن بوبوم لە قسەکانمدا.

سەیری چاوەکانیم کرد. هێمن و ئارام گوتم:

—ویل ترینەر. دەکرێت، بە بڕوای من دەکردێت...

—نەخێر کلارك.

—بەبڕوای من دەتوانین زۆر شت بکەین. خۆم دەزانم کە داستانێکی خۆشەویستی ئاسایی نییە. دەزانم بە هەزارو یەك بیانوو بەڵگە نابێت ئەم قسەیە بکەم، بەڵام من عاشقی تۆم...! هەر ئەوکاتەی کە لە پاتریك جیادەبومەوە ئەمەم دەزانی. هەروەها پێموایە کە تۆیش عاشقی من بیت، ئەگەر یەك تۆسقاڵیش بێت.

شتێکی نەگوت. بەچاوەکانی منی دەپشکنی. قوڵی خەمو پەژارەم لەناویاندا دەبینی. قژەکانیم لە پێشی سەریەوە لادا، هەروەك بڵێی دەمتوانی خەمو پەژارەی لێ دوربخەمەوە. سەری لارکردەوە بۆ ئەوەی بنی سەرم ببینێت. دواتر سەری خستە سەر سەرم.

تفی دەمی قوتدایەوە.؟

—دەبێت شتێکت پێبڵێم.

بە چپەوە گوتی:

—دەزانم، من هەموو شتێك دەزانم.

بێدەنگبوو. کەشو هەوای چواردەورمان زۆر هێمن دەهاتە پێشچاو.

—من مەسەلەکەی سویسرا دەزانم. دەزانم.... بۆچی بڕیارنامەی شەش مانگیتان لەگەڵ مندا واژو کرد.

سەری لەسەر سەرم بەرز کردەوە. سەیری کردم، دواتر سەری بەرز کردەوە و چاوی بڕییە ئاسمان. شانەکانی هێنایە خوارەوە.

—ویل من هەموو شتێك دەزانم. چەند مانگێکە کە هەموو شتەکان دەزانم. ویل تکایە گوێ بۆ قسەکانم بگرە...

دەستی ڕاستیم گرت و خستمە سەر سنگم.

—دەزانم کە دەبێت. بەڕاستی ناچار نیت کە تەنها ڕێگەچارە لەوکارەدا ببینی. من دەزانم کە دەتوانم خۆشحاڵت بکەم. دڵنیابە کە تۆیش دەتوانی من بەختەر بکەیت... تۆ لەمن مرۆڤێکت دروستکرد کە بەهیچ شتێوەیەك تەسەوریشم نەدەکرد. تەنانەت بەم هەلومەرجەیشەوە کە هەتە دیسانەوە دەتوانیت شادومانم بکەیت. لەناو هەموو مرۆڤەکانی دوونیادا تەنها ئەمەویت لەلای تۆ بم، تۆم لە هەموو کەسێك بەلاوە باشترە، ئەوە تۆیت پێتوایە کە لەدەست دەرچویت و فەوتاویت.

هەستم بە پەنجەکانی دەکرد کە لەناو دەستمدا توند بوونەوە، ئەمەش ئازایەتی بە من دەبەخشی.

—ئەگەر پێتوایە کارێکی ڕاست و دروست نییە کە لەبەردەستی تۆدا بم، باشە دەچم و لە شوێنێکیتردا ئیش دەکەم. ئەمویست پێتبڵێم کە ناوم لە کۆلێژدا نوسیوە و لەناو ئینتەرنێتدا زۆر گەڕاوم. قسەم لەگەڵ تواناویست و پەرستارگەلێکی جۆراوجۆرو جیاوازدا کردوە. شتانێکی زۆرم زانیوە. شتانێکی زۆر فێر بووم کە چۆن بتوانم دەرەقەتی ئەمکارە بێم و تەنها ئەمەویت لەگەڵ تۆدا بم. تێدەگەیت؟ بیری هەموو شتێکم کردووەتەوە. بڕیاری خۆمم داوە. هەڵەکە لە خۆتەوە بوو. تۆ منت گۆڕی.

پێکەنینێکی بچوکم کرد.

—تۆ لەمن کەسێکی وەك خوشکەکەمت دروستکرد. بەلام بە هەستێکی باشترەوە.

چاوەکانی داخستبوو. نەمدەتوانی وازی لێبهێنم و بڕوات، هیچکاتێك بەم ئەندازەیە لە هیچ شتێك دڵنیا نەبوم.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

—ئێستە چی دەڵێیت؟

لەتوانامدا هەبوو کە تاوەکو ئەبەد چاوم ببڕمە نێواچاوانی.

هێندە هێمن و ئارام وەلامیدامەوە کە خولەکێکی خایاند تاوەکو دڵنیابومەوە کە بەباشی گوێم لێبووە.

—چی..؟

—نەخێر کلارك.

—نەخێر؟

—داوای لێبوردن دەکەم بەس نییە.

دەستیم هێنایە خوارەوە.

—تێناگەم.

کەمێك وەستاو تامڵی کرد، دواتر هاتە گۆ. هەروەك بڵێی خەریکبو خۆی بێزارو ماندودەکرد تاوەکو ووشەکان بەباشی بدۆزێتەوەو دەریان ببڕێت.

—ئەوە بۆ من بەس نییە. ئەم دوونیایە، تەنانەت ئەگەر تۆیشی لەناودا بیت، بەس نییە بۆ من. کلارك قسەکەم قبوڵ بکە. لەوکاتەوە کە تۆ هاتویت ژیانم گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتوو زۆر باشتر بوو. بەڵام هێشتا بۆ من بەس نییە. ئەمجۆرە ژیانەم ناوێت.

ئێستە ئیتر نۆرەی من بو کە خۆم بهێنمە دواوە.

—مەسەلەکە ئەمەیە کە من وا هەستدەکەم دەتوانێت ژیانێکی باش بێت. هەستدەکەم لەگەڵ تۆدا لەوانەیە بەڕاستی ژیانێکی زۆر باش بێت. بەڵام ئەمە شێوازی ژیانی من نییە. من وەك ئەوانە نیم کە تۆ قسەت لەگەڵدا کردون. من ئەمجۆرە ژیانەم ناوێت. وەك ژیانی دڵخوازی من نیە و بەهیچ جۆرێك لەو ناچێت.

لەناو ئاوازی دەنگەکەیدا گومان و دودڵی هەبوو، دەنگی پچڕ پچڕ بوو. قیافەی بوبویە هۆی ترس و لەرز بۆم.

تفی دەمم قوتدایەوە و سەرێکم ڕاوەشاند.

—تۆ.... جارێکیان پێتگوتم کە نابێت بهێڵم ئەو شەوەی کە لەناو ڕێڕەوو دالآنە هەزار پێچ و قەمچەکەدا وونبوم، کاریگەری بکاتە سەر ژیانم و چارەنوسم بگۆڕێت. پێتگوتم کە دەبێت خۆم هەڵبژێرم کە چ شتێك چارەنوسسازە بۆم. ئێستەیش من بە تۆ دەڵێم... نابێت بهێڵیت ئەم کورسییە تایەدارە بڕیاری هیچ چارەنوسێك بۆ تۆ بدات و چارەنوست بۆ دیاری بکات.

—کلارك، بەڵام دەیکات. چارەنوسی منی دیاریکردووە. تۆ من ناناسیت، زۆر نامناسیت. تۆ پێشتر منت نەبینیوە. عاشقی ژیان بووم. کلارك، لەناخی دڵەوە عاشقی ژیانی خۆم بووم. عاشقی کارەکەم، گەشت و سەفەر و عاشقی هەموو شتە جوانەکان و عاشقی چالاکییە جەستەییەکان بووم. عاشقی ماتۆڕسواری و خۆهەڵدان لەبەرزایی بووم. حەزم دەکرد لە کارو بازرگانیدا پێشی هەمووان بکەوم. حەزم دەکرد هاوسەرگیری بکەم و ژیانی خۆش و بێوێنەم هەبێت.

ئێستە ئیتر دەنگی بەرز بوبویەوە.

—من مرۆڤی کورسی تایەدار نیم. بەمشێوەیە دروستنەکراوم. ئێستە بە هەر بیانویەك هەیە، ژیانم کەوتوەتە دەستی ئەم کورسییە تایەدارەوە. تەنها ئەمەیە کە دەتوانێت چارەنوسی من دیاریبکات.

لەژێر لێوەوە گوتم:

—بەلاّم تۆ هیچ شانسێك بەخۆت نادەیت.

هەروەك بڵێی دەنگم لەناوچاڵەوە دەهاتە دەرەوە.

—تەنانەت هیچ شانسێکیش بەمن نادەیت.

—مەسەلەکە شانس و هەل و بوار نییە کە بە تۆی بدەم. من دەبینم کە تۆ لەماوەی ئەم شەش مانگەدا بەتەواوەتی بویتە کەسێکیتر. کەسێك کە تازە دەستیکردووە بە بینینی هەلەکانی ژیانی خۆی. تۆ نازانیت ئەم بابەتە چەندە منی خۆشحاڵ کردووە. نامەوێت دیلی دەستی من و ژیانی ناهەمواری من بیت و بەردەوام گیرۆدەی داوودەرمانەکانی من بیت. بەردەوام لەناو کۆت و بەندی ژیانی پڕ لە ناسۆری مندا بیت. نامەوێت لەو شتانە بێبەش بیت کە پیاوێکیتر دەتوانێت پێتی بدات. ئەمەش لەوانەیە خۆ ویستی من بێت، بەلاّم حەزناکەم ڕۆژێك لەڕۆژان سەبارەت بەمن بەزەیی یان نەفرەتت بۆ دروست ببێت کە....

—من هەرگیز بەمشێوەیە بیرناکەمەوە!

—کلارك، تۆ نازانیت. هەرگیز ناتوانیت بیریشی لێبکەیتەوە کە چ شتێك دێتە پێشەوە. تەنانەت ناتوانیت بڵێیت شەش مانگیتر چ هەستێکت هەیە. نامەوێت هەموو ڕۆژێك بتبینم کە بەو جلوبەرگە پێکەنیناویەتەوە لەناو ماڵی مندا بگەڕێیت و نەتوانم ئەو کارەی کە حەزم لێیەتی لەگەڵ تۆدا ئەنجامیبدەم. ئەی هاوار کلارك، خۆزگایە دەتزانی کە ئێستە حەزدەکەم چ کارێکت لەگەڵدا بکەم. من... من ناتوانم بەم بیرو خەیاڵانەوە درێژە بە ژیان بدەم. ناتوانم. ئەمە شێوازی من نییە. من ناتوانم پیاوێك بم کە تەنها... ناتوانم ئەوە قبوڵ بکەم..

سەیرێکی کورسییە تایەدارەکەی خۆی کرد. دەنگی پچڕ پچڕ بوو.

—هەرگیز ناتوانم لەگەڵ ئەم نەفرەتیەدا ڕابێم.

دەستمکردە گریان.

—ویل تکات لێدەکەم. تەنها تۆ، لەناو هەموپیاوانی دوونیادا تەنها تۆ. گوێبگرە چی دەڵێم.... ئەمشەو، شەوێکی بێوێنە بوو. باشترین شەوی ژیانم. ئەو قسانەی کە پێتگوتم، ئەو کارانەی کە کردت بۆ ئەوەی تاوەکو ئێرە بێم... هەموو ئەمانەو بەسەرنجدان لەوەی کە خۆم دەزانم سەرەتا چەندە خوێڕی بووم، بەڕاستی بەلامەوە سەرسوڕهێنەرە کە دەبینم چۆن سەرکەوتو بویت لەوەدا کە عەشق لەناو دڵمدا بچێنیت. بەڵام...

هەستم بە فشاری پەنجەکانی دەکرد لەناو دەستمدا....

—هەر لێرەدا دەبێت تەواو ببێت. نە ئیتر کورسی تایەدار بێت، نە نەخۆشی هەوکردنی سییەکان، نە سوتانەوەی دەس و قاچ. نە ئێش و ئازارو نە ماندوبون. نامەوێت بەیانیان لەخەو هەستم و ئاواتی ئەوە بخوازم کە خۆزگایە کۆتاییان بهاتایە. کاتێك گەڕاینەوە دەچم بۆ سویسرا. کلارك، ئەگەر بەڕاستی عاشقی منیت، هەروەك خۆت دەڵێیت، ئەوشتەی کە پێش هەموو شتێك خۆشحاڵم دەکات، ئەوەیە کە لەگەڵ مندا بێیت بۆ ئەو شوێنە.

سەرم هێنایە دواوە.

—چی..؟

—لەمە باشتر نابێت. مەسەلەکە لێرەدایە کە من ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتر دەبم و ژیانیشم سنوردارتر دەبێت. قسەی دکتۆرەکانە. بارودۆخێکی خراپ چاوەڕێم دەکات. هەر ئێستەیش هەستی پێدەکەم. نامەوێت ئازارێکی زیاتر بکێشم یان دیلی ئەم نەخۆشییە بم، یاخود وابەستەبم بەکەسێکەوە. نامەوێت هەموو ژیانم لە حەول و وەلادا بێت. هەر لەبەر ئەمەیە داوات لێدەگەم ئەگەر بەڕاستی منت خۆشدەوێت و ڕاستدەکەیت کە عاشقی منیت، ئەمکارەم بۆ بکە. لەگەڵما بە. یارمەتیم بدە کە ژیانم بەوجۆرە کۆتایی بێت کە خۆم ئەمەوێت.

بە ترسەوە سەیرم کرد. هەموو بون و وجودن دەلەرزی. بەڕاستی نەمدەتوانی تێبگەم کە چی دەڵێت.

—چۆن داوای شتێکی لەمجۆرە لەمن دەکەیت.

—دەزانم، شتێکی....

—من خەریکم پێتدەڵێم کە عاشقی تۆم و ئەمەوێت ئایندە و داهاتوی خۆم لەگەڵ تۆدا دروستبکەم، بەڵام تۆ داوام لێدەکەیت بێم و سەیرت بکەم کە چۆن خۆت دەکوژیت؟!

—ببورە نەمدەویست ئاوا ڕێك و ڕاست پێتی بڵێم. کاتێکی زۆرم لەبەردەستدا نییە.

—یانی چی؟ باشه بۆدەبێت کاتت وەرگرتبێت؟ خەمی چ شتێکت هەیە کە لەدەستی بدەیت؟

دەمبینی کە ژمارەیەك خەڵك دانیشتون، لەوانەیە گوێیان بۆ ئێمە گرتبێت کە دەنگمان بەرز کردبویەوە. بەلاّم بەلای منەوە گرنگ نەبوو.

ویل لەپاش کەمێك وەستان و بێدەنگی گوتی:

—بەڵێ کلینیکەکە بە هەلومەرجەکانی من ڕازی بووە. باوك و دایکیشم لەسەر ڕۆژی سیازدەی مانگی ئوت ڕەزامەندیان دەربڕیوە. ڕۆژێك پێش ئەوە دەچم.

توشی سەر گێژە بوبوم. واتە یەك هەفتەی تر.

—من ئەمە قبوڵ ناکەم.

—لوئیزا.

—وامدەزانی.... وامدەزانی خەریکم بیرو بۆچونت دەگۆڕم.

سەری داخست و واقی بەمندا وڕما. دەنگی زۆر نەرم بوو چاوەکانیشی زۆر نیان بوون.

—لوئیزا، هیچ شتێك ناتوانێت بیرو ڕای من بگۆڕێت. باوك و دایکم شەش مانگ داوای کاتیان لێکردم، منیش پەیمانم پێدان، پەیمانەکەیشم بردە سەر. تۆ زیاتر لەتەسەوری خۆت ئەم شەش مانگەت بۆ من زۆر بەنرخ کرد. تۆ نەتهێشت ئەم شەش مانگە بگۆڕێت بە تاقیکردنەوەی خۆڕاگری.

—نەخێر!

—چی نەخێر؟

—بیبڕەوە، تەنها یەك ووشەیش مەڵێ.

کەوتبومە حاڵەتی خنکان و خەفە بوونەوە.

—ویل تۆ زۆر زۆر خۆپەرستی. زۆریش بێئەقڵ. یەك تۆسقاڵیش گریمانی ئەوە نییە کە لەگەڵتدا بێم بۆ سویسرا... تەنانەت ئەگەر پێتوابێت لەپاش ئەم هەموو کارەی کە بۆم کردویت، کەسێکم کە بتوانم کارێکی لەوشێوەیە ئەنجامبدەم، دیسانەوە قسەیەکیترت نییە کە بیکەیت؟ دڵت شکاندم. تۆ تەنها دەتوانیت بڵێیت (نا، تۆ بۆ من بەس نیت، ئێستەش دەڵێیت داوات لێدەکەم کە بێیت و شاهێدی کارەساتبارترین دیمەنێك بیت کە دەتوانی تەسەوری بکەیت). مەسەلەیەك

که لەهەمان چرکەساتی تێگەیشتنیەوە، بوبویە کابوسی شەووڕۆژم. باشە تۆ دەزانیت چ داواکارییەك لەمن دەکەیت؟

ئێستە ئیتر زۆر توڕەو ئاگرین بووم. لەبەرامبەرییەوە وەستام و هەروەك ژنە شێتەکان هاوارم دەکرد بەسەریدا.

—نەفرەت لە تۆ بێت ویل ترینەر. ئەی خۆزگایە بەهیچ شێوەیەك ئەمکارەم نەدۆزیبایەوە. ئەی خۆزگایە هیچکاتێك تۆم نەدیبایە.

دەستمکردە گریان. بەدرێژایی کەنارەکەدا دەستمکردە ڕاکردن و دواتر گەڕامەوە بۆ ناو ژوورێکی ئوتێلەکە و لەو دوور کەوتمەوە.

کاتێك دەرگای ژوورەکەم داخست، کاتێك بانگی دەکردم، هەروا دەنگی لە گوێمدا دەزرنگایەوە.

{٢٤}

بۆ ڕێبواران، هیچ شتێك هێندەی بینینی پیاوێك بە كورسی تایەدارەوە كە خەریكە لە ژنێك دەپاڕێتەوە كە بەروالەت پەرستارییەتی، بێتاقەتكەرو بە ئازار نییە. لەمجۆرە كاتانەدا هەمیشە خەڵكی لایەنی مرۆڤە تواناویستەكە دەگرن، بەتایبەت ئەگەر كەسێك بێت كە نەتوانێت بجوڵێت. كەسێك كە بەهێمنیەوە خەریكە دەڵێت:

–كلارك، تكایە وەرە بۆ ئێرە. تكات لێدەكەم.

بەڵام من نەمدەتوانی. نەمدەتوانی سەیریشی بكەم. نیتن شتومەك و كەرەستەكانی ویلی كۆكردەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر هەردوكیانم لەهۆڵی ئوتێلەكەدا بینی. هێشتا لە خوماری شەوی ڕابوردوو نەهاتبویە دەرەوە. لەو ساتەی كە دووبارە هاتینەوە پاڵ یەكتری، خۆم لە هەرجۆرە یارمەتیدانێكی ویل بەدوردەگرت. هەستم بە داماوی و توڕەیی دەكرد. دەنگێكی بە برشت و توڕە هاواری لێدەكردم كە تاوەكو بۆم دەكرێت لە ویل دوور بم. ئەو دەنگە پێی دەگوتم بگەڕێوە بۆ ماڵەوە و ئیتر هەرگیز هەوڵ مەدە چاوت پێی بكەوێت.

نیتن لەدوامەوە دەركەوت و گوتی:

–تۆ باشی؟

لەگەڵ ئەوەی كە چوینە ناو فڕۆكەخانەوە، لەوان جیابومەوە و چوم بۆ بەشی ڕادەستكردنی كۆڵ و بارو شتومەكەكان.

–واز بێنە. نامەوێت لەبارەیەوە هیچ قسەیەك بكەم.

–خوماری بەیانیان؟

–نەخێر.

بێدەنگییەكی كورت بەرقەرار بوو. كتوپڕ قیافەی خەمبار بوو.

–بیركردنەوەكەم ڕاست و دروستە، ئەی وانییە؟ بڕیاری خۆی داوە؟

نەمدەتوانی قسە بکەم. سەیری نیتنم کرد کە چەناکەی توندە بوویەوە. بە هەرحاڵ لە من بەهێزتر بوو. کەسێکی پیشەگەرو شارەزا بوو. چەند خولەکێك دواتر کاتێك لەگەڵ ویلدا گەڕایەوە، خەریکبو ئەو شتەی لە گۆڤارەکەدا بینیبوی نیشانی ویلی دەدا. باسی ئەو تیپی یارییەیان دەکرد کە هەردوکیان دەیانناسی. ئەگەر کەسێك ئەوانی بدیبایە هەرگیز باوەڕی نەدەکرد کە نیتن چەند خولەکێك لەمەوبەر هەواڵێکی بەو گرنگییەی بیستبێت!

هەموو ئەوکاتەی کە لەناو هۆڵەکەدا چاوەڕوان بوین، خۆم سەرقاڵ کرد. سەد ئیش هەبوو کە دەمتوانی ئەنجامیانبدەم—لەزگە لە جانتاکان بدەم، قاوە بخۆمەوە، سەیری ڕۆژنامە بکەم، بچم بۆ توالیت— هەموو ئەمکارانە بەو مانایە بوو کە ناچار نیم سەیری بکەم. نەمدەویست قسەی لەگەڵدا بکەم. بەڵام هەندێکجار نیتن دیارنەدەماو تەنها من ویل بەیەکەوە دەماینەوە. لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوین و ئەو مەودا کەمەی نێوانمان پڕ بوو لەو تۆمەتانەی کە بەبێدەنگ و خامۆشییەوە ئاراستەی یەکتریمان دەکردن.

لە کۆتاییدا ویل هاتە گۆ.

—کلارك...

قسەکەیم پێ بڕی.

—نامەوێت. نامەوێت قسە لەگەڵ تۆدا بکەم.

سەرم لە خۆم سوڕ دەما کە چۆن دەتوانم ڕەفتارێکی لەمشێوەیەم هەبێت. وادیاربوو کارمەندانی فڕۆکەخانەکەیشم توشی سەرسوڕمان کردبوو. کاتێك لەناو فڕۆکەکەدا بوین دەمبینی کە چوتە چوتیان دێت و باسی ئەوە دەکەن کە چۆن لە ویل دور دەکەومەوە، یان بەردەوام تەلەفۆنەکە بەگوێمەوەیە، یان بەبڕشتەوە چاوم بڕیوەتە دەرەوەی پەنجەرەکە.

یەکەمینجار بوو کە توڕە نەدەبوو، ناڕاستەوخۆ قسەی نەدەکرد. سەرەتا بێدەنگ بوو، دواتر چەند ووشەیەك قسەی کرد. نیتنی داماو بوو کە دەبوایە زۆری لە خۆی بکردایە بۆ ئەوەی قسەکان بەردەوامبن. پرسیاری لەبارەی چایی و قاوەوە دەکرد، یان خۆی بە پاکەتی بستەکەوە سەرقاڵ دەکرد. هەندێکجاریش داوای لێبوردنی دەکرد و بەلاماندا تێدەپەڕی و دەچوو بۆ توالیت.

بەدڵنیاییەوە هەڵسوکەوتەکانم زۆر منداڵانە دەهاتنە پێشچاو. بەڵام هیچ گرنگ نەبوو. نەمدەتوانی تامڵی بکەم، نەمدەتوانی تامڵی ئەوە بکەم کە لەدەستی بدەم. زۆر یەك تایم و

بەبرشت بوو بۆ ئەوەی شتە ئەرێنیەکان نەبینێت، نەیدەویست ئەوە قبوڵبکات کە شتانێکی ئەرێنی باشیش بونیان هەیە. هەرگیز نیەت و مەبەستی گۆڕینی بیرو ڕای خۆی نەبوو. نەمدەتوانی قبوڵی بکەم کە کارەکەی لەو بەروارەدا بکاتە کرداری، خۆ وەحییەکی دابەزیوی لای خودا نەبوو. یەك ملیۆن چەلەحانێ بەبیرو مێشکمدا خولیان دەخوارد. (بۆچی بۆ تۆ بەس نییە؟ بۆچی بۆتۆ بەس نییە؟ باشە بۆچی متمانە بەمن ناکەیت؟ باشە ئەگەر هەل و ماوەیەکی زیاترمان لەبەردەستدا بێت، هەلومەرجەکان ناگۆڕدرێن؟). هەندێکجار چاوم بەدەستە برۆنزییەکەی دەکەوت، چاوم بەو نینۆکە چوارگۆشانە دەکەوت کە تەنها چەند سانتیمەترێك لە دەستی منەوە مەودایان هەبوو. باشم لەبیرە کە چۆن دەستمان لەیەکتری ئالأبوو. بیری گەرماکەی جەستەیم دەکەوتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە جوڵەی نەبوو، بەڵام بەجۆرێك لە جۆرەکان بە بەهێزم دەزانی. بوغز بەجۆرێك قورگی گرتبوم، کە دەبینم ناتوانم تامڵ بکەم. دەبوایە بچم بۆ توالیت و لەسەر مەغسەلەکەیدا بچەمێمەوە و لەبەر ڕووناکی تیشکی خۆردا هەنسکە بگریم. کاتێك بیرم لەو کارە دەکردەوە کە ویل ئەیویست ئەنجامیبدات، خۆم کۆنترۆڵ دەکرد کە نەقیژێنم. هەستم دەکرد بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەقڵم لەدەستداوە. حەزم دەکرد لەو شوێنەدا و لەسەر کورسی فرۆکەکە دابنیشم و دەستبکەم بەگریان بۆ ئەوەی کەسێك بێت و بەڵێنم پێبدات کە ئەو ئەمکارە ناکات.

سەرەڕای ئەمەش ڕەفتارو هەڵسوکەوتم زۆر منداڵانە بوو کارمەندی فرۆکەکە تەسەورێکی لەمشێوەیەی سەبارەت بە من هەبوو، (چونکە قسەم لەگەڵ ویلدا نەدەکرد، سەیریم نەدەکرد و خواردنم پێنەدەدا، هەروەك بڵێی دڵڕەقترین ژنی دوونیا بووم. بەڵام گوێنەدانی من بەوو ئەوەی کە وای نیشانبدەم کە بەهیچ شێوەیەك لەوێدا ئامادە نییە، تەنها ڕێگەچارەی تامڵکردنی ئەم چەند سەعاتە بوو کە ناچار بووم لەتەنیشتیەوە دابنیشم. ئەگەر بمزانیایە نیتن بە تەنیا دەتوانێت دەرەقەتی هەموو شتێك بێت، ڕاستگۆیانە بڵێم، فرینەکەی خۆمم دەگۆڕی. دەچوم و خۆم ووندەکرد، بەجۆرێك کە یەك کیشوەر مەودای نێوانمان هەبێت. حەزم نەدەکر لەتەنیشتمەوە دابنیشێت).

هەردوکیان خەوتن و منیش ڕزگارم بوو، وەستانێك هەرچەندە کورتیش بوو، لەو پەستانەی کە لەسەر مێشك و جەستەم هەبوو، بۆ من دروستبوو. سەیری شاشەی تەلەفیزیۆنەکەم دەکرد، هەرچەندە فرۆکەکە زیاتر نزیکی نیشتیمان دەبویەوە، زیاتر دڵم ئازاری پەیدا دەکرد و تورەییم

قوڵتر دەبوو، وردە وردە ئەوە هاتە بیرو زەینمەوە کە ئەم شکستە تەنها من لەناو نابات، بەڵکو دایکوباوکی ویلیش لەناو دەچن و دەفەوتێن. بەگریمان سەرزەنشتیان دەکردم. بەدڵنیاییەوە خوشکەکەی ویلیش سکاڵای لێ دەکردم. لەوەی کە نەمتوانیبوو چاری ویل بکەم و نەمتوانی باوەری پێبیهێنم کە لەوکارەی پەشیمان ببێتەوە. هەرشتێك کە لە توانامدا هەبوو پێشکەشی ئەوم کردبوو، لەوانەیش خۆم. بەڵام هیچکام لەو شتانەی کە پێمبەخشیبوو نەیتوانی باوەڕی پێبهێنێت و نیەت و ئامانج و مەبەستی زیندومانەوەی پێبدات. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە لەوانەیە کەسێکی لەمن باشتر شایەنی ئەم بێت. کەسێکی زیرەکتر، کەسێکی وەك ترینا باشتر دەیزانی کە چی بکات. لەوانەیە بیتوانیایە زانیاری پزیشکی نوێ بەدەستبهێنێت یاخود شتێك کە بتوانێت یارمەتی ویل بدات. لەوانەیە بیتوانیایە بیرو باوەڕی بگۆڕێت. ئەو ڕاستیەی کە پاشماوەی تەمەنم دەبێت بەم بیرو خەیاڵەوە بەسەر بەرم. خەریکبوو شێتی دەکردم.

دەنگی ویل منی لەناو بیرو خەیاڵەکانمدا هێنایە دەرەوە.

—کلارك، خواردنەوەت دەوێت؟

—نەخێر مەمنونم.

—ئانیشکم زۆر هاتوتە سەر کورسییەکەی تۆ؟

—نەخێر، باشە.

تەنها لە کۆتاییەکانی فرینەکەدا بوو کە ڕێگەم بەخۆمدا لەناو ئەو تاریکیەدا سەیری بکەم. نیگام هێدی هێدی ڕێڕەوی خۆی گۆڕی و لەسەر شاشەی داگیرساوی تەلەفیزیۆنەکە دوور کەوتەوە. لەناو ڕوناکی لاوازی فڕۆکەکەدا بە دزییەوە سەیرم دەکرد. کاتێك چاوم بە دەموچاوی برونزی و جوانی کەوت کە هێمن و مەتین خەوتبوو، یەك دڵۆپە فرمێسك لە کەناری چاومەوە خلیسکایە سەر گۆنام. لەوانەیە لەو چرکەساتە هەستیارانەدا کە بە ملوموشەوە سەیرم دەکرد جوڵەیەکی کردبوو، بەڵام خەبەری نەبویەوە. لەدوری نیگای کارمەندانی فڕۆکەکە و نیتنەوە بەتانییەکەم تاوەکو نزیکی گەردنی پێچا بە جەستەیەوە، بۆ ئەوەی سەرمای دەزگای هەوا گۆڕکێکە ئازاری نەدات.

***

لەبەر دەم دەرگای چونەژورەوەکەدا چاوەڕوانمان بوون. بەجۆرێك لە جۆرەکان دەمزانی کە دێن، کاتێك خەریکبوین کورسییە تایەدارەکەی ویلمان لەبەشی کۆنترۆڵی پاسپۆرتدا دەبرد،

غەوغای دڵ و درەونم سات لە دوای سات زیاتر دەبوو سەرانسەری بون و وجودمی دەگرتەوە.

یەکێك لە کارمەندەکان بە خێرخوازی خۆی، ئێمە لە ڕێگەیەکی قەدبڕەوە برد، بەڵام من نزام دەکرد کات بەمشێوەیە تێنەپەڕێت و ئێمە چەندین سەعات و بگرە چەندین ڕۆژیش لەناو ڕیزەکەدا بمێنینەوە. بەڵام نەخێر، هەروا کە من پاڵم بە عەرەبانەی جانتاکانەوە دەنا و نیتنیش کورسییەتایەدارەی پاڵپێوە دەنا بەسەر زەوی لینیولیومی هۆڵەکەدا تێپەڕین. هەرکە دەرگا شوشەییەکە کرایەوە، ئەوانمان بینی. لەوێدا لەودیوی دیوارەکەوە وەستابون. لەتەنیشت یەکەوە و بەڕواڵەت هاودڵ و هاودەردی یەکتری و یەککگرتوو. چاوی خاتوو ترینەرم بینی کە بە بینینی ویل بریسکەیەکی کورتی دایەوە. منیش بە بیرو هۆشێکی شپرزەوە لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە کە ئەڵبەتە، ئەڵبەتە کە بەڕواڵەت باش دێتەبەرچاو. بەوپەڕی شەرمەزارییەوە چاویلکە خۆرییەکەم کردە چاوم، نەوەك لەبەر ئەوەی کە ماندویەتی و بێزاریم بشارمەوە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو نەمدەویست بە قیافەی داماومدا شتێك بزانێت و ئەو شتەی کە ناچار بوم بیڵێم، ئەو بە گریمان و گومان بیزانێت.

خاتوو ترینەر بە دەنگی بەرز گوتی:

–سەیری بکە ! ویل چەندە باش بویت، زۆر زۆر باش!

باوکی ویلیش خۆی قۆز کردبوو لەناو زەردەخەنەدا نغرۆ بوبو، دەستێکی هێنا بەسەر کورسی تایەداری کوڕەکەیدا و دواتر هێنای بەسەر ئەژنۆیدا گوتی:

–کاتێك نیتن گوتی دوو ڕۆژ دەچیت بۆ کەنار دەریاو مەلە دەکەیت، باوەڕمان نەدەکرد! ئاوەکە چۆن بوو؟ گەرم و خۆش؟ لێرە بەجۆرێك باران دەباری هەر دەتگوت سەقفی ئاسمان کون بووە. لە بارانەکانی مانگی ئوت!

نیتن بەردەوام نامەی بۆ دەناردن، یاخود تەلەفۆنی دەکرد. لەگەڵ ئەوەی کە لەگەڵماندا نەبون، بەڵام هەواڵی هەموو کاروبارەکانی ئێمەیان دەزانی.

نیتن گوتی:

–شوێنێکی زۆر خۆش و بێوێنە بوو.

لەم دە ڕۆژەی ڕابوردودا نیتنیش کەوتبویە هێمنی و ئیسراحەتەوە، بەڵام ئێستە هەوڵیدەدا زەرەخەنەی بەسەر لێوەوە بێت و هەمان ئەو نیتنەی پێشوو بێتەبەرچاو.

هەستم دەکرد هەموو بون و وجودم بەستویەتی. بەجۆرێك پاسپۆرتەکەم گرتبوو بەدەستمەوە کە هەروەك بلێی بۆ گەشت و سەفەرێکیتر دەچوم. تەنانەت هەناسەدانیشم لەبیر چوبویەوە.

باوکی ویل گوتی:

–پێمانوایە ئەمشەو حەزبکەن نانێکی تایبەت بخۆن. ڕیستورانێکی قەرەباڵغ ونایاب لەناو ئینترکنتینانتال دا هەیە. تۆ چی دەڵێیت؟ من و دایکت پێمانوابوو کە خۆش بێت بەلاتەوە.

ویل گوتی:

–بەدڵنیاییەوە.

زەردەخەنەی بۆ دایکی دەکرد. خاتوو ترینەریش سەیری دەکرد، بەڵام بەجۆرێك هەروەك بلێیی واهیمەی هەبوو. حەزم دەکرد هاوار بەسەر ویلدای بکەم و بلێم کە ***چۆن دەتوانی؟ چۆن دەتوانیت بەوشێوەیە سەیری دایکت بکەیت، کاتێك دەزانی کە دەتەوێت چی لەدڵی ئەو داماوو چارەڕەشە بکەیت؟***

–وەرن. سەیارەکەم لەناو گەراجی تواناویستەکاندا وەستاندووە. کەمێك لێرەوە مەودای هەیە. دڵنیابوم کە ماندوی فڕین و گەشتەکەتانن، نیتن دەتەوێت یارمەتیت بدەم و جانتاکان بهێنین؟

خۆم فڕێدایە ناو قسەکانیان و گوتم:

–من....

خەریکبوم جانتاکەی خۆم لە عەرەبانەکە دەردەهێنا.

–من لێرەوە دەچم، بە هەرحاڵ سوپاستان دەکەم.

خۆم بە جانتاکەوە سەرقاڵ کردبوو بە ئەنقەست سەیرم نەدەکردن. بەڵام لەگەڵ ئەو هات و هاوارو هەمهەمەیەی کە لەناو هۆڵەکەدا خولی دەخوارد، دەمتوانی هەست بەو بێدەنگییە بکەم کە بەهۆی قسەکەمەوە دروستبوبو. دەنگی جەنابی ترینەر کە لەپێش هەمویانەوە بوو، بێدەنگییەکەی شکاند.

–لوئیزا، واز بهێنە. وەرە با ئاهەنگ بگێڕین، ئاهەنگێکی بچکۆلانە. ئەمانەوێت لە ئەلیفەوە بۆ یای گەشتەکەمان بۆ بگێڕنەوە. بەوردی باسی دورگەکە بکەن. پەیمانت پێدەدەم کە ناچارت نەکەم هەموو شتەکان بگێڕیتەوە.

هەروا بە دەمی داخراوەوە پێدەکەنی.

دەنگی خاتوو ترینەر کەمێك تورە بوو، گوتی:

—بەڵێ، لوئیزا دە تۆیش وەرە.

تفی دەمم قوتدایەوە. هەوڵمدا زەردەخەنەیەکی بچوکیش بووە بیکەم. چاوەکانم لەودیوی چاویلکەکەوە نەدەبینران و لە نیگاکانی ئەو پارێزراو بوون.

—نەخێر، سوپاستان دەکەم، بەڕاستی دەبێت بگەڕێمەوە.

ویل گوتی:

—بۆ کوێ دەچیت؟

تێدەگەم چی دەڵێت. بەڕاستی جێگەیەکم نەبوو کە بۆی بچم.

—دەچمەوە بۆ ماڵی باوك و دایکم، کێشە نییە.

ویل گوتی:

—لەگەڵ ئێمەدا وەرە.

ئاوازی دەنگی زۆر هێمن و ئارام بوو.

—کلارك، تکایە مەڕۆ.

ئەمویست دەستبکەم بەگریان. دەمزانی تواناو تاقەتی ئەوەم نییە کە لەلای بم.

—نەخێر مەمنون، شەوێك خۆش. جانتاکەم خستە سەرشانم و پێش ئەوەی کە بواری قسەکردنی هەبێت، بەڕێکەوتم و لەناو خەڵکەکەی ناو هۆڵەکەدا ونبوم.

تازە گەیشتبوم بە وێستگەی پاسەکان کە دەنگیم بیست. پاژنەی پێڵاوەکەی کامیلا ترینەر لەسەر کاشی پیادەڕەوەکە تەقەتەقی دەهات، کەمێك درۆیشت و کەمێکیش ڕایدەکرد.

—لوئیزا، بوەستە، تکایە، تکات لێدەکەم کەمێك تاملێ بکە.

ئاوڕمدایەوە. دەبینم خەریکە لەناو خەڵکەکەدا بەزۆر ڕێگەی خۆی دەکاتەوە و بەرو لای من دێت. پاڵی بە نەوجەوانانی کۆڵەپشتدارەوە دەناو درزی دەخستە ناو جەماوەرەکەوە. ڕوناکی گڵۆپی فرۆکەخانەکە دەیدا لە قژەکانی و وەك ڕەنگی مسی لێکردبوون. شاڵێکی خۆڵەمێشی جوان بەشێوەیەکی هونەرمەندانە لەسەر شانی بوو. لەبیرمە کە ناخودئاگاو لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە کە لەوانەیە تاوەکو ئەم چەند ساڵەی پێشوو ژنێکی جوان بوبێت.

—بوەستە، تکایە تاملێ بکەو بوەستە.

منیش وەستام و سەیری شەقامەکەی دوای خۆم کرد. ئاواتم دەخواست ئەی خۆزگایە هەر ئێستە پاسەکە بهاتایە و سواربومایەوە و بەخێرایی بڕۆشتمایە. یاخود شتێك ڕوی بدابایە، ئەی خۆزگایە بومەلەرزەیەکی بچوك ڕوبیدابایە.

—لوئیزا؟

—گەشتەکەی بەلاوە خۆش بوو.

ئاوازی دەنگەکەم بەبڕشتانە بوو. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە کە چەندە سەیرە! ڕێك وەك دەنگی خۆی.

لەناو پیادەڕەوەکەدا وەستابوو سەیری منی دەکرد.

—وادیارە باشە. زۆر باش.

سەرەڕای ئەو شەپۆلە خەڵکەی کە لەدەوروبەریدا لە جوڵەدا بوون. کتوپڕ لەشوێنی خۆیدا وەستا.

هەردوکمان بێدەنگبوین و هیچمان نەدەگوت.

دواتر من گوتم:

—خاتوو ترینەر، من ئیتر ناگەڕێمەوە بۆ سەرکار. من ناتوانم.... ناتوانم ئەو ڕۆژانەی دوایی بێمەوە سەر ئیشەکەم. هیچ پارەیەکیشم لە ئێوە ناوێت. لەڕاستیدا موچەی ئەم مانگەیشم ناوێت. هیچ شتێکم ناوێت. من تەنها....

ڕەنگ بەڕوییەوە نەما. دەبینم ڕەنگی دەموچاوی نەماو لەژێر ڕووناکی تیشکی خۆری بەیانیدا کەمێك جولاً. جەنابی ترینەرم بینی کە بەدوایدا هاتبوو. بە چەلەنگییەوە هەنگاوی گەورەی هەڵدەگرت و بە دەستی کڵاوە حەسیرییەکەی توند گرتبوو بەسەرییەوە.

هەریەوجۆرەی کە لەناو خەڵکەکەوە ڕێگەی خۆی دەکردەوە، لەژێر لێوەوە داوای لێبوردنی دەکرد. چاوی لەسەر من و ژنەکەی بوو کە بە مەودایەکی چەند هەنگاوی لەدوری یەکەوە وەستابوین.

—تۆ گوتت.... گوتت کە باوەڕت وایە بەخۆشی دەیباتە سەر، تۆ گوتت کە پێتوایە بیروڕای خۆی گۆڕی بێت.

زۆر داماو دەهاتەپێشچاو. هەروەك بڵێی دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی شتێکیتر بڵێم، قسەیەکی تر بکەم و هەواڵێکی خۆشی پێبدەم. نەمدەتوانی قسە بکەم. ماتم کردبوو سەیری ئەوم دەکرد. تەنها کارێك کە دەمتوانی ئەنجامیبدەم ئەوەبوو کە وەك نیشانەی نەریێ سەرم ڕاوەشێنم.

چپەم کرد:

—شەرمەزارم.

هێندە بە سوکی گوتم کە لەوانەیە نەیبیستبێت.

کاتێك لە هۆشی خۆی چوو، جەنابی ترینەریش گەشتبویە لامان. هەروەك بڵێی قاچەکانی لەژێر جەستەیدا نەبوون. دەستی چەپی جەنابی ترینەر چویە پێشەوە و ناوبراوی گرت، ئاهێکی گەورە لە دەمی خاتوو ترینەرەوە دەرچوو جەستەی کەوت بەسەر جەنابی ترینەردا.

کلاوەکەی جەنابی ترینەر کەوتە سەر شەقامەکە. سەیرێکی منی کرد. مات و سەرسام دەهاتە پێشچاو، سەری لێشێوابوو نەیدەزانی چی ڕوویداوە.

من نەمدەتوانی ئەوان ببینم. بێ هەست و سڕو وڕ. ئاوڕمدایەوە و بەڕێکەوتم. قاچێکم لەپێش ئەویترەوە بوو بەبێ ئاگاییەوە دەجولان و لە فرۆکەخانەکە دوور دەکەوتنەوە. هێشتا نەمدەزانی خەریکم بۆ کوێ دەڕۆم.

{٢٥}

## كاترینا

لوئیزا لەپاش گەڕانەوەی لە سەفەرەکەی نزیکەی سیی و شەش کاتژمێر لەژورەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە. یەکشەممە کۆتایی شەو بوو کە لە فرۆکەخانە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. لەگەڵ ئەوەی کە ڕەنگی برونزی بوبو، بەڵام ڕەنگی وەك گەچ سپی بوو ئێمەش نەمانزانی بۆچی وای لێهاتووە. بە ئێمەی گوت کە تاوەکو بەیانی ڕۆژی دواتر هەقمان بەسەریەوە نەبێت. گوتی: (تەنها ئەمەوێت بخەوم). دەرگای ژورەکەی داخست و ڕاستەوخۆ چوبو سەر سیستەمەکە. کەمێك بەلامانەوە سەیر بوو، بەڵام لە کوێوە بزانین؟ لو بەگشتی هەر لەمنداڵییەوە مرۆڤێکی تایبەت بوو.

بەیانی دایکم چای بۆ برد، بەڵام لێوی لێنەدا. کاتی نانی ئێوارە ئیتر دایك نیگەران بوبو. چوویە سەری و ڕایوەشاند تاوەکو بزانێت زیندووە، (لە حەقیش لانەدەین دایکم کەمێك هەستیارە. ئەو ڕۆژە (پای ماهی)[٣٨] دروستکرد بۆ ئەوەی لو لە ژورەکەی بهێنێتە دەرەوە، چونکە دەیزانی پای ماهی شتێك نییە کە لو هەروا وازی لێبهێنێت و نەیخوات). بەڵام دیسانەوە لو لێوی لێنەدا. لەگەڵ کەسیشدا قسەی نەکرد، بەهیچ شێوەیەك نەهاتە قاتی خوارەوە. هەروا کە دەموچاوی لەناو سەرینەکەدا بوو گوتی: (دایە ئەمەوێت بەتەنیا بم). لە کۆتاییدا دایکم تەسلیم بوو وازی لێهێنا و گوتی:

—زۆر گۆڕدراوە، ئەوە خۆی نییە. یانی ئەمە لەبەر جیابونەوەیە لە پاتریك؟ تازە بەتازە کاردانەوە لەخۆی نیشاندەدات؟ کاردانەوەیەك بەم دواکەوتنەوە؟!

---

[٣٨] جۆرێکە لە شیرینی کە لە میوە دروستدەکرێت.

باوکم گوتی:

–نەخێر، ناکرێت مەسەلەکە پاتریك بێت. وابزانم دڵی لە پاتریك هەڵکەندووە. چونکە کاتێك پێمگوت پاتریك تەلەفۆنی کردووە بۆ ئەوەی بڵێت لە پێشبرکێکەدا بووەتە ١٥٠ هەمین کەس، هیچ گرنگیەکی پێنەدا. هەروەك بڵێیی بەلایەوە گرنگ نەبوو.

قومێکی لە کوپە چاییەکە داو لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

–پێویستە ئەمەش بڵێم، ڕاستیەکەتان بوێت منیش زۆر بەلامەوە خۆش نەبوو کە بووەتە ١٥٠ هەمین کەس.

–ئەی بەبڕوای تۆ نەخۆش کەوتووە؟ هیچکاتێك بەمشێوەیە نەدەخەوت. لەوانەیە لەو شوێنەدا نەخۆشییەکی قورسی گرتووە.

من گوتم:

–هیچ نییە، تەنها ماندوبونی ناو فڕۆکەیە.

هەروەك مرۆڤە خاوەن ئەزمون و بیرو بۆچونەکان ئەم قسەیەم کرد. دەمزانی کە دایکوباوکم هەرقسەیەك کە من سەبارەت بەو شتانەی کە ئەوان نایانزانن بیکەم، بەلایانەوە پەسەندە و قبوڵی دەکەن.

–ماندوبونی ناو فڕۆکە؟ ئەگەر فڕینی زۆر ئاوا لە مرۆڤ بکات، ئەوا من هەرگیز ئامادە نیم لە تنبی بچمە دەرەوە. جوسی ئازیزەکەم قسەکەم ڕاستە؟

دایکم سەری ڕاوەشاند و گوتی:

–نازانم.... کێ باوەڕی دەکرد کە گەشت و سەفەر ئاوا مرۆڤ نەخۆش بخات.

لەپاش نانی ئێوارە چوم بۆ قاتی سەرەوە. تەقەم لە دەرگاکە نەدا. (هێشتا ژورەکە هی من بوو، بەسەرنجدان لەوەی کە هەموو ئەو هەفتەیەی کە پشوو مۆڵەتم هەبوو لەوێدا بووم، ئێستەیش مافی خۆم بوو کە بچم بۆ ئەو ژورە). هەوای ژورەکە قورس و گەرم بوو. پەردە دەڕابەییەکەم لاداو پەنجەرەکەم کردەوە. لوئیزایش بە بێتاقەتیەوە تەپاوتلێکیدا، ڕووناکییەکە دەیدا لە چاوی. گەردیلەکانی تەپوتۆزی ناو هەوا لەودەروبەرەدا خولیان دەخوارد.

پەرداخە چاییەکەم لەسەر مێزی تەنیشت سیستەمی نوستنەکە دانا.

–ئێستە بۆمی باسبکە بزانم چی بووە؟

چاوێکی تروکاند.

—دایکم وادەزانێت توشی ڤایرۆسی ئیبۆلا بویت. زۆر سەرقاڵە و خەریکە هۆشداری دەدات بەو دراوسێیانەمان کە ئەیانەوێت بەو ئاژانسە گەشتیارییە سەفەر بکەن.

قسەیەکی نەکرد.

—لو..؟

بە هێمنیەوە گوتی:

—وازم لەکارەکەم هێنا.

—بۆچی..؟

خۆی هەستاندەوە و بە حاڵەتێکی زۆر توندەوە پەرداخەکەی هەڵگرت.

—پێتوایە بۆچی..؟

قوڵپ قوڵپ چاییەکەی هەڵقوڕاندەوە.

حاڵ و ڕۆژێکی زۆر خراپی هەبوو، هەروەك بڵێی دوو هەفتە لە دورگەی موریس بووە. چاوی بچوك بوبویەوە و زۆریش سور بوبونەوە. پێستی برۆنزی بوبو، بەڵام پڕ بوو لە لەك و پەڵە. قژەکانی بەلایەکدا پژابوون. ئەوە لە قیافەو سەروفەساڵییەوە دیاربوو کە ساڵانێکە نەخەوتبێت. بەڵام لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەبوو کە زۆر دڵتەنگ و خەمبار دەهاتە پێشچاو. تاوەکو ئێستە خوشکەکەمم بەوجۆرە بە خەمگینی نەبینیبوو.

—کەواتە پێتوایە کە بڕیارەکەی دەکاتە کرداری؟

سەری وەك نیشانەی (بەڵێ وایە) ڕاوەشاند. دواتر توند تفی دەمی قوتدایەوە.

—ئاخ... تف لەم ڕۆژگارە! لو، هەر بەڕاستی بێتاقەت بووم و حاڵم خراپ بوو!

ئاماژەم بۆ کرد کەمێك بچێتە ئەو لاوە. دواتر چوم و لەتەنیشتیەوە ڕاکشام. دووبارە پەرداخە چاییەکەی نا بەسەرییەوە. سەری خستە سەرشانم. بلوزەکەی من لەبەریدا بوو. هیچ ڕەخنەیەکم نەگرت. زۆر بێتاقەت بووم بۆی.

—ترینا، ئێستە چی بکەم؟

ئەم ڕستەیەی بە دەنگێکی نزمەوە گوت. هەروەك تۆماس، کاتێك دەکەوت و ئەیویست بە ئازایەتی بمێنێتەوە. لە دەرەوە هات و هاواری سەگی دراوسێکەمان دەهات، کە بەدرێژایی بەرژینەکە بەشوێن پشیلەکانی ماڵە دراوسێکانماندا ڕایدەکرد. دواتر واقە واقی شێت ئاسایم

بیست، ئێستە لەوانەیە ئەو سەگە بە حەسرەتەوە سەری بەرزکردوەتەوە و لە نائومێدیدا چاوەکانی دەرپەڕیون.

–باوەڕناکەم ئیتر بتوانرێت کارێکی بۆ بکرێت. خودایە گیان! تۆ ئەم هەموو کارانەت بۆ کرد، ئەم هەموو هەوڵ و ماندوبونە...

لو، بە دەنگێك کە زیاتر لە چپە دەچوو، گوتی:

–پێمگوت کە عاشقیم و خۆشم دەوێت. بەڵام گوتی کە ئەوە بۆ ئەو بەس نییە.

چاوەکانی گوشاد و خەمبار بوون.

–ئێستە ئیتر چۆن دەتوانم بەردەوامی بە ژیانم بدەم؟

تەنها ئەندامی خێزانەکەم کە لەبارەی هەموو شتێکەوە زانیاریم هەیە. زیاتر لە هەموان ئەهلی خوێندنەوەم. دەچم بۆ زانکۆ، هەر لەبەر ئەمەیە کە چاوەڕێ لە من دەکەن وەڵامی هەموو شتێك بزانم.

سەیری خوشکە گەورەکەم کرد، سەرێکم ڕاوەشاند و گوتم:

–هیچ بیرۆکەیەکم نییە، بەڕاستی نازانم.

***

لە کۆتاییدا و بۆ ڕۆژی دواتر لە ژورەکەی هاتە دەرەوە. حەمامی کرد و جلوبەرگی پاکی لەبەر کرد. منیش بە دایکو باوکم گوتبو کە هیچ قسەیەك نەکەن. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوتم کە مەسەلەکە پەیوەندی بە کوڕە هاوڕێکەیەوە هەیە. باوکم برۆکانی بەرز کردەوە و قیافەیەکی لە خۆی گرت هەروەك بڵێی تاوەکو بنجو بناوانی مەسەلەکەم بۆ باسکردبوو. وایدەزانی زۆر لەلەو دایەنی لوئیزامان کردووە و جڵەومان بۆ شل کردووە و نازمان پێداوە.

لو تیکەیەك بەرکوڵی کرد، (نانی نیوەڕۆی نەخوارد). کڵاوێکی گەورەی نەرم و تایبەت بەخۆری کردە سەری و بە پیاسە چوین بۆ قەڵاکە بۆ ئەوەی تۆماس خواردن بدات بە مراوییەکان. باوەڕناکەم بەهیچ شێوەیەك حەزی کردبێت بچینە دەرەوە. بەڵام دایکم پێداگری کرد کە پێویستمان بە هەڵمژینی هەوایەکی تازە هەیە. ئەم قسەیە بەلای دایکمەوە بەم مانایە بوو کە ئەیەوێت هەوای ژورەکە بگۆڕێت و چەرچەفی نوێ بهێنێت. عەلاکەیەکی پڕ لە وردە نان بە دەستی تۆماسەوە بوو لەپێش ئێمەوە هەلبەزو دابەزی دەکرد. ئێمە هەر لە منداڵییەوە فێر بوبوین کە زۆر بە ئاسانی لەگەڵ گەشتیارەکاندا پەیوەندی دروستبکەین، مامەڵە و هەڵسوکەوت

و خش و پشیان لەگەڵدا بکەین، بەجۆرێك برۆین بە ڕێگادا کە نەکێشین بە کوڵەپشتیەکانیاندا، نەچین بەدەوری هاوسەرو هاورێ و کەپڵەکاندا و خۆمانیان لێ لابدەین و ڕێگەی خۆمان بگۆڕین.

قەڵاکە لەبەر گەرمای هاویندا خەریکبوو دەسوتا. زەوی شەقی بردبوو چیمەنەکەیش تەنك بوبو. ڕێك وەك کۆتا قژو تاڵەموەکانی پیاوە ئیسلاّح و کەچەڵەکان. گوڵی ناو گوڵدانەکانیش ژاکابون. هەروەك بڵێی بەرەو پێشوازی پاییز دەچوون.

من و لو زیاتر بێدەنگ بووین. باشە چ قسەیەکمان بۆ گوتن هەبوو؟

کاتێك خەریکبوین لە گەراجی تایبەتی گەشتیارەکانەوە تێدەپەڕین، دەبینم کە لەژێر قەراخی کلاّوەکەیەوە سەیرێکی ماڵی ترینەری کرد. دیمەنی خشتە سورەکانی بە شکۆ بوو. لەپشتی پەنجەرە باڵا بەرزە سپییەکانیەوە داستانی خەمگینی ژیانی گەنجێك لەئارادا بوو کە خەریکە لەدەست دەردەچێت. لەوانەیە تەنانەت لەم چرکەساتانەیشدا لەوێ نەبێت.

گوتم:

-سودێکی نییە.

پاشماوەکەیم دەزانی، پاشماوەی قسەکەی کە بەدەنگی بەرز نەیکرد، بریتی بوو لەوەی کە (لەوانەیە لەوێ نەبێت و ئێستە ڕۆشتبێت).

بەدەوری قەڵاکەدا سوڕاینەوە. سەیری تۆماسمان دەکرد کە لەبەشە لێژو ڕەمپائاساکانەوە رایدەکردە خوارەوە، یان خەریکبوو وردە نانی فرێدەدا بۆ مراوییەکان. لەم وەرزەی ساڵدا کارمەندانی ئەو شوێنە زۆر ئەزیەتی خۆیان نەدەدا بۆ ئەوەی بێن و ئاگاداربن بۆ ئەوەی مراوییەکان خواردنی بەدەر لە ڕێنمایی و بەرنامە نەخۆن. هەروا کە خەریکبوین پیاسەمان دەکرد، سەیری خوشکەکەمم دەکرد، سەیری پشتە برۆنزنییەکەیم دەکرد کە لە ژێر بلوزە ملیوان کراوە قەیتاندارەکەیەوە دیاربوو، هەروەها سەیری شانە شۆڕەکانیم دەکرد، لەوێدا بوو کە زانیم ژیانی گۆڕدراوە، لەوانەیە تەنانەت هێشتا خۆیشی نەیزانیبێت. ئێستە ئیتر لێرە نەدەمایەوە. هیچ جیاوازییەکیشی نەبوو کە ویل ترینەر چی بەسەر دێت، بەهەرحاڵ خوشکەکەم ڕۆیشتبوو. حاڵ و باڵی خوشکەکەم گۆڕدرابوو ئاشنایەتی لەگەڵ کۆمەڵێك شتی نوێدا پەیدا کردبوو. ئەو شتە نوێیانەی کە بینیبوی، ئەو شوێنە نوێیانەی کە چوبوو، هەموویان ژیانی ئەمیان گۆڕیبوو، لە کۆتاییدا خوشکەکەم تێڕوانینێکی نوێی بەدەستهێنابوو.

کاتێك خەریکبوین دەگەڕاینەوە گوتم:

-ئۆو، لەبیرم چوو بیڵێم. کاتێك لێرە نەبویت، لە کۆلێژەوە نامەیەکت بۆهات. کردمەوە، سەرەتا وامزانی بۆ من هاتووە.

-کردتەوە..؟

من سەبارەت بە یارمەتی خەرجی و قەرزی نوێ، چاوەڕێی هاتنی نامە بووم.

-دەبێت بچیت بۆ چاوپێکەوتن.

چاوێکی داخست و کردیەوە. هەروەك بڵێی هەواڵێکی لە ڕابوردوە دوورەکانەوە بۆ هاتووە. گوتم:

-ئەها...هەواڵی لەمەش گرنگتر ئەوەیە کەچاوپێکەوتنەکە بەیانی دەکرێت. هەر بۆیە پێمباش بوو کەمێك بەیەکەوە کار بکەین، بەتایبەت لەسەر ئەو پرسیارانەی کە بەگریمان لە چاوپێکەوتنەکەدا دەیانپرسن.

سەری ڕاوەشاند و گوتی:

-بەیانی ناتوانم بڕۆم بۆ چاوپێکەوتن.

-ئەی هاوار، باشە بۆچی؟!

بە خەمو پەژارەیەکی زۆرەوە گوتی:

-ترینا، باوەڕ بکە ناتوانم. چۆن دەکرێت لەوەها هەلومەرجێکدا بتوانم بیر لە شتێکیتر بکەمەوە؟

-لوئیزا گوێبگرە، خۆ ئەمە کایەی منداڵانە نییە. ئەقڵت لەدەستداوە؟ تەنها یەکجار شانس لەدەرگای ماڵی مرۆڤ دەدات. ئەوان تۆ بە خوێندکارێکی بەتەمەنتر لە خوێندکارە ئاساییەکان دەزانن، هەر بۆیە لەگەڵ ئەوەی کە ئێستە کاتی پێشکەشکردنی داواکاری نەبوو، بەلام قبوڵیان کرد کە چاوپێکەوتنت لەگەڵدا بکەن. خۆ ئەوان گاڵتەجاڕی تۆ نین.

-گرنگ نییە. لە ئێستادا ناتوانم بیری لێبکەمەوە.

-بەلام تۆ....

-ترینا، تکایە وازم لێبهێنە، باشە؟ ناتوانم!

گوتم:

-هێی...

لەبەرامبەرییەوە وەستام و نەمهێشت بڕوات. چەند هەنگاوێك لەپێشترەوە. تۆماس خەریکبوو قسەی لەگەڵ کۆترەکاندا دەکرد.

—ڕێك ئێستە کاتیەتی کە دەبێت بیر لە خوێندنەکەت بکەیتەوە. ئێستە کاتی خۆیەتی. حەزت لێی بێت یان نا، دەبێت بزانیت کە پاشماوەی تەمەنت چی بکەیت.

ڕێگەکەمان داخستبوو. هەربۆیە گەشتیارەکان ناچار بوون لەیەکتری مەودا وەربگرن بۆ ئەوەی تێپەڕن. هەرواشیان دەکرد. سەریان داخستبوو یان بە کەمێك مڵوموشەوە سەیری دوو خوشکەکەیان دەکرد کە سەرقاڵی چەلەحانێ بوون بەیەکەوە.

—ناتوانم.

—باشە، داوای لێبوردن دەکەم! ئەگەر لەبیرت چوەتەوە دەبێت پێت بڵێم کە ئێستە بێکاریت. خۆ ئیتر پاتریکیش نییە کە سەرو سامانێك بە بارودۆخەکان بدات. ئەگەر نەچیت بۆ ئەم چاوپێکەوتنە، ئەوا بەیانی و دوو بەیانی ناچار دەبیت بچیت بۆ بەڕێوەبەرایەتی کاردۆزی. دەبێت بچیت بۆ کارگەی مریشك یاخود ببیتە سەماکار. لەوانەیشە ناچار بیت و بڕۆیت سمتی خەڵکی پاکبکەیتەوە بۆ ئەوەی خەرجی ڕۆژانەی خۆت پەیدا بکەیت. قبوڵت بێت یان نا ژیانی تۆ بێجگە لەمە شتێکیتر نابێت، چونکە ئێستە تەمەنت نزیکەی سیی ساڵ دەبێت. وە هەروەها ئەوەی کە لەم شەش مانگەی ڕابوردودا فێری بویت هەروا بە فیڕۆ دەچێت.

چاوی بڕییە من، خامۆش و بێدەنگ، بە قیافەو سەروسیمایەکی گرگرتووەوە. هەرکاتێك کە دەیزانی من لەسەر حەقم و وەڵامێکی پێنیە. ئەم قیافەیەی لەخۆی دەگرت. ئێستە ئیتر تۆماس نزیکمان بوبویەوە و دەستی ڕادەکێشام.

—دایە گوتت سمت(کون)؟

خوشکەکەم هەروا واقی بە مندا وڕمابوو. بەڵام دەمبینی کە بەناو بیرو خەیاڵدا نغرۆ بووە. ئاوڕمدایەوە بۆلای کوڕەکەم.

—نەخێر ئازیزەکەم. من گوتم خوێن (خون). ئێستە دەگەڕێینەوە بۆماڵەوە بۆ خواردنی عەسرانە. ئەی وانییە لو؟ دواتر کاتێك دایە گەورە دەتشوات، منیش یارمەتی پورە لو دەدەم کە بە ئەرکەکانیدا ڕابگات.

***

ڕۆژی دواتر دایکم تۆماسی لەلای خۆی گلدایەوە، من و لو سواری ئۆتۆمبیل بوین. هیوایەکی زۆرم بە چاوپێکەوتنەکە نەبوو. هەر لەبەر ئەمەبوو کە هەموو ڕۆژەکەم لەناو کتێبخانەدا بردە سەرو زیاتر نیگەرانی داهاتوی خۆم بووم تاوەکو ئەو. شەو کاتی نانی ئێوارە سەیری لوم دەکرد کە واقی بە قاپەکەدا وڕمابوو ماتی کردبوو. مریشك بە تەنورەکەی خستەلاوە، بەجۆرێك هەروەك بڵێی ئەیەوێت بیشارێتەوە. دایکم شوێنی نیگاکەی من کەوت و گوتی:

—ئازیزەکەم برسیت نییە؟

لو گوتی:

—زۆر نا.

دایکم دانیپێدانا و گوتی:

—هەواکە بۆ خواردنی مریشك گەرمە. تەنها بۆ ئەوە بوو کە بێیتەوە سەرخۆت.

باوکیشم خواردنەکەی لەناو دەمیدا هێشتەوە و گوتی:

—ئادەی ئێستە بۆمان باسبکە بزانین چاوپێکەوتنەکە چۆن بوو؟

لو بەجۆرێکی سەرسوڕهێنەرانە سەیری کرد، هەروەك بڵێی باوکم بابەتێکی باسکردووە کە پەیوەندی بە پێنج ساڵ لەمەوبەرەوە هەیە.

—باشە.

پارچەیەکی بچوکی مریشکی جیاکردەوە و گوتی:

—باش بوو.

باوکم سەیرێکی منی کرد.

شانەکانم هەڵتەکاند و گوتم:

—هەر ئەوەندە؟ بەدڵنیاییەوە پێیانگوتویت کە چۆن بووە.

—کارەکە هاتە ڕاستە.

—چی؟

هەروا سەیری قاپەکەی خۆی دەکرد. تیکەکە لەدەممدا مایەوە.

—گوتیان بەتەواوەتی ئەو کەسەم کە ئەیانەوێت. سەرەتا دەبێت چەند یەکەیەکی پێشنیاز بگوزەرێنم کە نزیکەی ساڵێکیان پێدەچێت.

باوکم پاڵیدا بە کورسییەکەوە.

–چەندە هەواڵێکی باشە!

دایکم دەستێکی هێنا بە شانیدا.

–ئۆو ئازیزەکەم، چەندە باشە، زۆر باشە!

–نەخێر زۆر دڵتان خۆش مەکەن، باوەڕناکەم بتوانم دەرەقەتی خەرجی و تێچوەکەی بێم.

–بەهیچ شێوەیەك نیگەران مەبە، سەیرکە و بزانە ترینا چۆن توانی خەرجیەکەی بدات و دەرەقەتی دێت.

باوکم بە ئانیشك لە ترینای دا و لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

–ڕێگەچارەیەك دەدۆزینەوە. ئێمەی هەمیشە ڕێگەچارەیەك بۆ کێشەکانمان دەدۆزینەوە، ئەی وانییە؟ دواتر زەردەخەنەی بۆ هەموومان کرد.

–کچینە وابزانم ئێستە لەسەر گێڕی شانسین. وابزانم هەموو ئەندامانی خێزانەکەمان ڕۆژانێکی باشمان لەپێشە.

دواتر خوشکەکەم یەکسەر دەستیکردە گریان. فرمێسکە ڕاستەقینەکان، هەروەك هەوری بەهار، هەروەك منداڵەکان شیوەنی دەکرد. ئاوی لوتی بەربوبو، فرمێسکەکان بوون کە دەڕژانە خوارەوە. هەرگیز بەلایەوە گرنگ نەبوو کە کەسانیتر گوێیان لە گریانەکەی بێت. هەنسکە هەنسکی گریانەکانی هەروەك چەقۆ بێدەنگی ژورە بچوکەکەیان دەبڕی.

تۆماس دەمی کرابویەوە و واقی بەودا وڕمابوو. بەجۆرێك کە ناچار بووم بیگرم بەباوەشەوە و سەرقاڵی بکەم، بۆ ئەوەی ئەمیش دەستنەکات بەگریان. دواتر کاتێك من خەریکبوم تۆماسم بە یاری سەرقاڵ دەکرد و دەنگی جۆراو جۆرم لەخۆم دەردەکرد، لو بەدایکو باوکمی گوت.....

هەموو شتێکی باسکرد. لەبارەی ویل و بڕیارنامە شەش مانگیەکە و هەموو ئەو شتانەی گێڕایەوە کە لە دورگەی موریسدا ڕوویاندابوو. کاتێك باسەکەی دەگێڕایەوە دایکم لەسەرسوڕماندا دەستی گرتبوو بە دەمییەوە. بابەگەورەیشم بە قیافەیەکی جیدییەوە گوێی گرتبوو. خواردنەکە سارد بوویەوە، ساسی گۆشتەکە ووشك بویەوە.

باوکم بە باوەڕنەکردنەوە سەری ڕاوەشاند. دواتر خوشکەکەم وردەکارییەکانی فڕینەکەی لە ئۆقیانوسی هیندیەوە گێڕایەوە، کاتێك باسی کۆتا قسەکانی دەکرد لەگەڵ خاتوو ترینەردا دەنگی بەشێوەیەك نزم بوبویەوە هەردەتگوت چپە دەکات. باوکم کورسییەکەی دایە دواوە و

هەستایەوە. بە هێمنیەوە بەدەوری مێزەکەدا سوڕایەوە و خوشکەکەمی لەباوەش گرت، هەروەك ئەو کاتانەی کە منداڵ بوین. هەر لەوێدا وەستاو ناوبراوی توند توند گوشی بەخۆیەوە.

—یا عیسای مەسیح، پیاوی داماو! تۆ زۆر داماوی. یا عیسای مەسیح!

لەبیرم نایەت هیچکاتێك باوکم بەوشێوەیە و بە پەرێشانییەوە بینیبێت.

—چ بارودرخێکی شپرزە و تێکەڵ و پێکەڵ و خراپە!

—هەموو ئەمانەت تێپەڕاندووە؟ بەبێ ئەوەی کە یەك ووشەیش بە ئێمە بڵێیت؟ لە هەموو ئەم شتانەیش تەنها کارتی پستال و بەشداری شەپۆل سواری و ئەمجۆرە شتانە بە ئێمە گەیشت؟

باوەڕکردنی بۆ دایکم زۆر قورس بوو.

—ئێمە وامان دەزانی کە چویت بۆ باشترین سەفەرو گەشتی تەمەنت.

خوشکەکەم سەیری منی کرد و گوتی:

—تەنها نەبووم. ترینا دەیزانی، زۆریش یارمەتیدام.

هەروا کە تۆماسم بەباوەشەوە بوو گوتم:

—کارێکم نەکردووە.

ئێستە کە دایکم پاکەتی چوکلێتەکانی خستبویە بەردەستی تۆماس، ئیتر کوڕەکەم ئاگای لە قسەکان نەبوو.

—من تەنها گوێگر بووم. خۆت هەموو کارەکانت کرد و هەر خۆیشت خاوەنی هەموو بیرۆکەکان بویت.

لو بەرەو لای باوکم چەمایەوە، داماو بێتوانا دەهاتەپێشچاو. گوتی:

—هەندێك لە بیرۆکەکانیش بەباشی جێبەجێ کران.

باوکم چەناکەی لارکردەوە، بەجۆرێك کە لەسنوری بینینی لوئیزادا بێت.

—تۆ هەرکارێکت لەدەست هات ئەنجامتدا و هیچ درێغیت نەکرد.

—بەڵام سەرکەوتوو نەبوم.

باوکم قژەکانی لوی لەنێوچاوانی لادا، دەموچاوی زۆر میهرەبان بوو گوتی:

—کێ دەڵێت سەرکەوتوو نەبویت؟ ئێستە کە بیر لە ویل ترینەر دەکەمەوە، یان بیر لە پیاوێك دەکەمەوە کە هەمان بارودۆخ و هەلومەرجی ئەوی هەیە، شتێکت پێدەڵێم. هیچ کەسێك

لەم دوونیایەدا نییە کە بتوانێت ئەم پیاوە پەشیمان بکاتەوە لەو بڕیارەی کە داوییەتی. ئەوە زاتی خۆی هەروایە. خۆ مرۆڤ ناتوانێت چییەتی و ماهییەتی خەڵکانیتر بگۆڕێت.

دایکم گوتی:

—بەڵام قوڕ بەسەر دایکوباوکی داماوی! خۆ نابێت دابنیشن و سەیری بکەن کە خۆی دەکوژێت، باشە ئەمانە چ جۆرە مرۆڤانێکن؟

—دایە، مرۆڤانێکن وەك مرۆڤەکانیتر، سروشتی سروشتی. بەڕاستی خاتوو ترینەر نازانێت دەبێت چ کارێك بکات؟

—باشە، سەرەتا نابێت بیبەن بۆ ئەو کلینیکە قوزەڵقورتە.

زۆر توڕە بوو. گۆناکانی سوربوبونەوە.

—من بۆ هەردوکتان، بۆ تۆماس، دەجەنگم، تاوەکو کۆتا هەناسەم لەپێناو ژیانی ئێوەدا دەجەنگم.

من گوتم:

—تەنانەت ئەوکاتەیش کە پێشتر هەوڵی خۆکوشتنی دابێت؟ هەربەڕاستی خەریکبوو دەمرد!

—کاترینا، ئەم پیاوە نەخۆشە. بێتاقەتە. نابێت مرۆڤە هەستیارو زیانبەرکەوتوەکان ئەم هەلە بەدەست بهێنن و بتوانن دەستبدەنە کارێك کە....

وردە وردە بێدەنگبوو چاوەکانی بە دەستماڵەکە سڕی.

—ئەم ژنە دڵی نییە. دڵی نییە. لویان توش کردوو خۆیان ڕزگار کرد. ئای خودایە گیان، تۆ وەك دادوەریت! دادوەرەکان دەزانن ڕاست و هەڵە چییە. حەزدەکەم هەر ئێستە بچم و بیهێنم بۆ ئێرە.

—بابەتەکە زۆر ئاڵۆزە. بەم سادەییانەیش نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.

—نەخێر، بەو شێوەیە نییە. ئەم گەنجە هەستیارە، دایکیشی هەرگیز ئاگاداری مەسەلەکە نییە. بەڕاستی من توشی شۆك بووم. پیاوی داماو. پیاوی بێچارەو داماو!

دایکم لەسەر مێزەکە هەستایەوە و بەلەمی خواردنەکەی هەڵگرت و بە هەنگاوانێکی گەورەوە چو بۆ چێشتخانەکە.

کاتێك دایکم دەڕۆیشت بۆ چێشتخانەکە لو سەیری دەکرد. قیافەی کەمێك پەشۆکاو بوو. دایکم هەرگیز توڕە نەدەبوو. وابزانم کۆتاجار کە بیستم دەنگی بەرزبکاتەوە ساڵی ١٩٩٣ بوو.

باوکم سەری ڕاوەشاند. وادیاربوو بیرو هۆشی لەلایەکیتر بوو.

—ئێستە بیرم هاتەوە. سەیر نییە کە جەنابی کاك ترینەرم نەبینیوە. نەمدەزانی لە کوێیە. وامزانی بە خێزانەوە چوون بۆ گەشت و سەفەر.

—لێرە نین؟ لێرە نین؟

—دوو ڕۆژی ڕابوردو نەمبینیوە.

لو تڵپەی هات و توند کەوتە سەر کورسییەکەو دانیشت.

من گوتم:

—ئاخ، کارێکی خراپی کرد!

یەکسەر دەستم گرت بە گوێکانی تۆماسەوە.

—بەیانییە.

لو سەیری منی کرد، دواتریش سەیرێکی ڕۆژژمێری دیوارەکەی کرد.

—سیازدەیەمی مانگی ئوت. بەیانی سیازدەیەمی ئوتە.

***

ئەو ڕۆژەی کۆتایی لو هیچ کارێکی نەکرد. لە پێش منەوە لە خەو هەستاو لە پەنجەرەی چێشتخانەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. باران دەباری. دواتر بارانەکە وەستایەوە و هەوا خۆشی کرد. دووبارە باران دەستیکردەوە بەبارین. لەسەر قەنەفەکە و لەتەنیشت بابەگەورەوە ڕاکشا. دایکم چای بۆ هێنا. هەر نیوسەعات جارێك دەمبینی کە سەیری کاتژمێرەکەی پێشەوەی زۆپاکە دەکات. چرکەساتانێکی زۆر سەختی بوون. هەر لەبەر ئەمەبوو کە تۆماسم برد بۆ مەلە کردن. زۆریش هەوڵمدا کە لو ڕازی بکەم بۆ ئەوەی لەگەڵماندا بێت، بەدایکمم گوت ئەگەر دواتر لو قەناعەتی کرد کە لەگەڵمدا بێتە دەروە بۆ کڕین، تۆماس لەلای خۆی گلبداتەوەو ئاگای لێی بێت تاوەکو دەگەڕێینەوە. گوتم لەگەڵ خۆمدای دەبەم بۆ قاوەخانە. تەنها خۆمان دوو بەدوو. بەڵام لو ڕەزامەندی بەرامبەر بە هیچکام لە پێنشارەکانم دەرنەبڕی.

لو بە چپەوە کە تەنها من گوێم لێی دەبوو گوتی:

—ترینا، نەکا هەڵەم کردبێت؟

سەیرێکی بابەگەورەم کرد. بەڵام ئاگای لە پێشبڕکێکە بوو. وابزانم باوکم لەسەر ئەو پێشبڕکێیە گرەوی لەگەڵدا کردبوو. هەرچەندە خودی باوکم بەدایکمی دەگوت کە گرەوی نەکردووە، بەڵام دڵنیابوم کە ئەوکارەی کردبوو.

—مەبەستت چییە؟

—واتە دەبوایە بچومایە لەگەڵیدا؟

—بەڵام....بەڵام خۆتۆ گوتت کە ناتوانیت.

لە دەرەوە ئاسمان خۆڵەمێشی بوو. لو لە پەنجەرە پاکو خاوێنەکەی ماڵەوە چاوی بڕیبویە ئەو ڕۆژە خەمبارو دڵگیرەی کە لەدەرەوەی ماڵەکەدا لە ئارادابوو سات لەدوای سات تێدەپەڕی.

—دەزانم چیم گوت. بەڵام ئەوەی کە هیچ هەواڵێکم لێی نەبێت، زۆر ئازارم دەدات. ناتوانم تاملّی ئەمە بکەم. کەمێك دەموچاوی چویەوە بەناو یەکدا.

—ناتوانم تاملّی ئەوە بکەم کە ببینم تەنانەت ماڵئاواییشم لێنەکردووە.

خۆ ئێستە ناکرێت بڕۆیت؟ لەوانەیە هەوڵبدەیت کە بەیەکەمین فڕین بڕۆیت، ها؟

ئەویش گوتی:

—تازە درەنگە.

دواتر چاوەکانی داخست.

—لەکاتی خۆیدا ناگەمە ئەوێ. تەنها دوو سەعاتی ماوە بۆ... تاوەکو کاتەکەی کۆتایی بێت. لەناو ئینتەرنێتدا بینیم.

هیچم نەگوت و چاوەڕێم کرد.

—لەپاش کاتژمێر پێنج و نیو ئیتر ئەمکارە ناکەن، دەیهێڵنەوە بۆ ڕۆژی دواتر.

بە سەرلێشێواوییەوە سەرێکی ڕاوەشاند.

—پەیوەندی بە بەرپرسان و لایەنی فەرمی سویسراوە هەیە کە دەبێت لەوێدا ئامادە بن. حەزناکەن لەپاش کاتەکانی دەوام واژۆ لەسەر خۆکوشتنە فەرمییەکان بکەن.

گاڵتەجاڕانە بوو! نەمدەزانی چی بڵێم. لەگەڵ زانینی ئەوەی کە شوێنێك هەبوو کە وەها ڕوداوێکی تێدا ڕویدەدا، نە مدەتوانی تەسەوری بکەم کە دابنیشم و چاوەڕێ بم، هەروەك ئەوەی کە ئەو چاوەڕێی دەکرد. من هیچکاتێك وەك لو کە عاشقی ویل بوو، عاشقی هیچ پیاوێك نەبوبوم. ئەڵبەتە پیاوانێك هەبوون کە خۆشم دەویستن، بەڵام نەك بەو شێوەیە، حەزیشم

دەکرد هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەم. هەندێکجار بیرم دەکردەوە و لەبەر خۆمەوە دەمگوت لەوانەیە کەمێك هەستیاری خۆمم لەدەستدابێت. بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی تەسەوری ئەوە بکەم کە بۆ کەسێك بەمشێوەیە ئەژنۆی خەم لەباوەش بگرم. تەنها لەبەر تۆماس ئەوکارەم دەکرد. بیرکردنەوە لەوەی کە تۆماس لە وولاتێکی بێگانەدا چاوەڕێی مردن دەکات، تەنانەت بیرکردنەوەشی شێتی دەکردم. بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبووم بیر لە شتێکی لەم بابەتە بکەمەوە.

لە تەنیشت خوشکەکەم و لەسەر قەنەفەکە بە خامۆشی و بێدەنگی دانیشتم، سەیری پێشبڕکێکەی کاتژمێر سێ و نیومان کرد. دواتر سەیری پێشبڕکێی کەمئەندامەکانمان لە کاتژمێر چواردا کرد. لەپاش ئەوانیش چوار پێشبڕکێی تریان نیشاندا. خەڵکانێك کە پارەیەکی زۆریان لەسەر ئەسپەکان خستبویە گرەوە و جۆش و خرۆشێکی زۆریان لەخۆیان نیشاندەدا.

دواتر جەرەسیماڵەکە لێدرا.

لو یەکسەر لەسەر قەنەفەکە بازیدایە خوارەوە و ڕۆیشت بۆ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە. دڵم لەو حاڵەتەی کە دەرگاکەی کردەوە خەریکبوو بوەستێت.

بەڵام ئەمجارەیان ویل نەبوو کە لەچوارچێوەی دەرگاکەدا وەستابوو. ژنێکی گەنج بوو کە ئارایشتێکی بێوێنەی کردبوو. قژەکانی دەگەیشتنە خوار چەناکەیەوە. چەترەکەی قەد کردبوو زەردەخەنە بەسەر لێوەکانیەوە بوو. دەستی برد بۆ جانتاکەی کە بەشانییەوە هەڵیواسی بوو. من لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە و گوتم لەوانەیە خوشکەکەی ویل ترینەر بێت.

—لوئیزا کلارك.

—بەڵێ، بۆ خۆمم فەرموون.

—من لە گلوبەوە دێم. دەکرێت گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ تۆدا بکەم؟

—گلوپ؟

بە ئاوازی دەنگی قسەکانی لودا دیاربوو کە سەری سوڕماوە. چومە پێشەوە، دەبینم دەفتەرچەیەك بەدەستی ژنەکەوەیە. گوتم:

—ڕۆژنامەی گلوپ؟

—دەکرێت بێمە ژورەوە؟ تەنها ئەمەوێت گفتوگۆیەکی بچوك لەبارەی ویلیام ترینەرەوە لەگەڵ ئێوەدا بکەم. تۆ ئیش بۆ ویلیام ترینەر دەکەیت، ئەوە ڕاستە؟

منیش گوتم:

—ئێمە هیچ قسەیەکمان لەوبارەیەوە نییە.

هەربۆیە پێش ئەوەی کە ژنەکە هەلێکی دەستبکەوێت و قسەیەك بکات، بەتوندی دەرگاکەم داخست.

خوشکەکەم مات و مەلول لەناو ڕێڕەوەکەدا وەستا، کاتێك دووبارە جەرەسی دەرگاکە لێدرایەوە دەستی کردە لەرزین. بە هێمنیەوە گوتی:

—وەلآمی مەدەرەوە.

—بەلآم چۆن....

بەرەو لای قادرمەکان پالّمپێوە نا، ئەی هاوار خودایە گیان چەندە بێ حالّ و بێ گیان بوو.

هەروەك بلّێی لە خەودا بوو، هاوارم کرد:

—بابە گەورە دەرگاکە مەکەرەوە.

کاتێك گەیشتینە سەحنی قادرمەکان، گوتم:

—باشە لە کوێوە زانیویانە؟

—لەوانەیە کەسێك بەوانی گوتبێت، کێ دەیزانی؟

دەنگی ژنەکە لەودیوی دەرگاکەوە دەهات، دەریچەو درزی تایبەتی نامەکانی پۆستەی دەرگاکەی لادابوو لەوێوە قسەی دەکرد.

—خاتوو کلارك تەنها دە خولەك.... دەزانین بابەتێکی هەستیارە. حەزدەکەین لە زمانی ئێوەوە کۆمەلّێك بابەت ببیستین....

چاوەکانی لو پڕ بوون لە فرمێسك.

—واتە کۆتاییهات و خۆی کوشت؟

—نەخێر تەنها وولآخێك هاتووە و ئەیەوێت لەم نێوەندەدا پارەیەکی دەستبکەوێت.

خەرکیبوم لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردوەوە. دەنگی دایکم لە قادرمەکەوە دەهاتە بەرگوێ.

—ئەوە کێ بوو ڕۆلّە؟

—هیچ کەسێك نییە، دەرگاکە مەکەرەوە.

لەسەر قادرمەکانی سەربانەوە سەیرێکی خوارەوەم کرد. دەستی دایکم لە دەستماڵێك پێچرابوو سەیری جەستەی شاراوەی ژنەکەی دەکرد کە لە شوشەی دەرگای هاتنەژورەی ماڵەکەوە دیار بوو.

–وەڵامی مەدەرەوە.

دەستی خوشکەکەمم گرت.

–لو.... خۆ هیچت بە پاتریك نەگوتووە؟ گوتوتە؟

پێویستی نەدەکرد کە شتێك بڵێت. قیافەی کارەساتباری گۆیای هەموو شتێك بوو.

– باشە ئێستە نایەوێت کە نیگەران ببیت. تەنها مەڕۆرە بەر دەرگا. وەڵامی تەلەفۆنیش مەدەرەوە. یەك ووشەیش قسە مەکە. باشە؟

دایکم سەرەتا زۆر گرنگی و سەرنجی نەدا. تەنانەت کاتێکیش تەلەفۆنەکە جەرەسی لێدا، هەر هێندە گوێی پێنەدا. لەپاش پێنجەم پەیوەندی بوو کە پەیامگیرەکەمان کردەوە، بەڵام هەروا ناچار بوین گوێ بۆ قسەکانیان بگرین. دەنگیان بەناو ڕێڕەوی بچوکی ماڵەکەماندا خولی دەخوارد. چوار پێنج کەسێك تەلەفۆنیان کرد. هەمویان وەك یەك بوون. هەمویان داوایان لە لو دەکرد کە بەسەرهاتەکە لەزمانی خۆیەوە ببیستن. ئێستە ویل ترینەر بوبویە کاڵایەك کە ئەیانویست بەدەستی بهێنن. تەلەفۆنەکە بەردەوام جەرەسی لێدەدا، جەرەسی ماڵەکەش بەردەوام لێدەدرا. بەڵام پەردەکانمان دادایەوە و دانیشتین و گوێمان بۆ ئەو ڕیپۆرتەرانە گرت کە لەناو پیادەڕەوەکەدا کۆ بوبونەوە و بە مۆبایلەکانیان بەیەکەوە قسەیان دەکرد.

هەروەك بڵێی لەژێر گەمارۆدا بوین. هەرکاتێك یەکێکیان بوێری ئەوەی دەدایە بەرخۆی کە بێتە پشتی دەرگاکەوە، دایکم لەبەر ناڕەحەتی و بێتاقەتی دەستەکانی دەسوی بەیەکدا و لە دەریچەو درزی تایبەتی نامە پۆستیەکانەوە هاواری دەکرد بەسەریاندا و دەیگوت بڕۆن و لێرە وونبن. تۆماسیش لە پەنجەرەی توالیتەکەی قاتی سەرەوە سەیری دەرەوەی دەکرد و ئەیوست بزانێت بۆچی خەڵکی لەدەوری ماڵی ئێمە کۆبونەتەوە. چوار لە دراوسێکانمان تەلەفۆنیان کرد، ئەیانویست بزانن چ شتێك ڕویداوە. باوکم ئۆتۆمبیلەکەی لەناو شەقامی (ئیوی)دا وەستاندبوو لەدەرگای پشتەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە. بەیەکەوە دانیشتین و لەبارەی قەڵاکەوە قسەمان کرد.

دواتر که زیاتر لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە. تەلەفۆنم بۆ پاتریك کرد و پرسیم لەبەرامبەر ئەمەدا چەندێکی وەرگرتووە. وەستانە کورتەکەی پێش ئەوەی وەڵامم بداتەوە، هەموو شتێکی بۆ ڕونکردمەوە.

هاوارم کرد:

–خوێڕی بێنرخ! مەگەر چاوم پێتنەکەوێت. وەها لەقەیەك لەو قاچە ڕاکەرە ماراسۆنیانەت بدەم کە وابزانی بەڕاستی شاکارت کردووە کە بویتە ۱۵۰ هەمین کەس.

لو تەنها لەناو چێشتخانەکەدا دانیشت و دەگریا. نەوەك گریانێکی ڕێك و پێك، بەڵکو تەنها هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت، فرمێسکە بێدەنگ و خامۆشەکان کە دەڕژانە سەر کوڵمەکانی و ئەمیش بە لەپی دەست دەیسڕین. نەمدەزانی دەبێت چی بڵێم. بەڵام قسەی زۆرم لەگەڵ خەڵکانیتردا هەبوو کە بیانکەم.

تاوەکو کاتژمێر حەوت و نیو، هەموو پیپۆرتەرەکان ڕۆیشتن و تەنها یەکێکیان مایەوە. نازانم لە کۆتاییدا بێ هیوا بوبون یان ئەوەی کە لەدەستی تۆماس بێزار بوبون. چونکە هەرجارێك کە یاداشتێکیان لە شوێنی نامە پۆستیەکانەوە دەخستە ئەمدیوی دەرگاکە، تۆماس دەیدڕاند و بە پارچە پارچەیی بۆ دەخستنەوە ئەودیو. داوام لە لو کرد لەبری مندا تۆماس ببات بۆ حەمام. زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە ئەمویست لە چێشتخانەکە بچێتە دەرەوە. ئەمویست بە ئیسراحەت گوێ بۆ پەیامە تەلەفۆنییەکان بگرم و پەیامەکانی پەیوەست بە ڕۆژنامەکان بسڕمەوە، لەلایەکیتریشەوە لەناو گەرماوەکەدا ئیتر دەنگی منی نەدەبیست. بیست و شەش مرۆڤی خوێڕی، بیست و شەش کەسیتر کە هەمویان خەڵکانێکی بە ئەدەب، هەمویان میهرەبان و دڵسۆز. تەنانەت هەندێکیان پێشنیاری بەخشینی پارەیان کردبوو.

یەك لەدوای یەك پەنجەم دەنا بە دوگمەی سڕینەوەکەدا. تەنانەت نامەی ئەوانەشی کە پێشنیاری بەخشینی پارەیان کردبوو. هەرچەندە دەبێت دانبەوەدا بنێم کە کەمێك وەسوەسەم بۆ دروستبوبو لەوەی کە حەزم دەکرد بزانم ژمارەی ئەو پارەیەی کە پێشنیارکرابوو چەندە. بەدرێژایی ئەو ماوەیە گوێم لە دەنگی لو بوو کە لە گەرماوەکەدا قسەی لەگەڵ تۆماسدا دەکرد. دەنگی قیژەی تۆماس و شڵپە شڵپی ئاوەکە دەهات. تۆماس یاری بە ئاوەکە دەکرد و سەیارە لەعابەکەی لەناو کەفی سابونەکەدا بەسەردا دەهاتە خوارەوە.

شتانێك هەیە کە مرۆڤ تاوەکو خۆی نەبێتە خاوەنی منداڵ، هەرگیز نایانزانێت.

–گەرماو، میکانۆ، قەباڵەو لەفەی ماسی. ئەمانە ناهێڵن زۆر بیر لە خەم و خەفەت بکەیتەوە.

دواتر کۆتا پەیامم بیست:

–لوئیزا؟ من کامیلا ترینەرم. تکایە بەخێرایی پەیوەندم پێوە بکە.

ماتم کرد و واقم بە پەیامگیرەکەدا وڕما. دیسانەوە پەیامەکەم بیستەوە. بەپەلە لە قاردمەکانەوە چومە سەرەوە و بەجۆرێك بەخێرایی تۆماسم لە گەرماوەکە هێنایە دەرەوە کە خۆیشی نەیزانی چی بووە. تۆماس خاولی پێوەپێچرابوو وەستابوو. هەروەك بلێی بەتوندی و بەپەت بەستبویان. لویش کە کش و مات و دۆش دامابوو، تاوەکو نیوەی پلیکانەکان چوبوو گوتی:

–ئەگەر لە دەستم تورە بێت چی؟

–لە قسەکانیدا تورە دیار نەبوو.

–باشە ئەگەر ڕۆژنامەکان دەورەیان دابن چی؟ باشە ئەگەر وابزانن من ڕۆژنامەکانم بانگکردووە چی؟

چاوەکانی لەگلێنەکەیانەوە دەرپەڕیبون و ترساوو تۆقیو بوون.

–ئۆو لو! بۆ خاتری خودا واز بهێنە. بەلایەنی کەمەوە بۆ یەکجاریش بووە لە ژیانتدا خۆت کۆنترۆڵ بکە و بەسەر خۆتدا زاڵ ببە. تاوەکو تەلەفۆن نەکەیت هیچ شتێك دیاری نادات. دەی هەر ئێستە تەلەفۆ بکە. هەر ئێستە. بێجگە لەمە هیچ ڕێگەیەکیترت لەبەردەمدا نییە.

خۆم گەڕامەوە بۆ گەرماوەکە بۆ ئەوەی جل بکەمە بەری تۆماس. گوتم کە دایەگەورە بسکیتی بۆ داناوە و خێرا بڕوات بۆ چێشتخانەکە. لە دەرگای گەرماوەکەوە سەرێکم کێشایە دەرەوە بۆ ئەوەی خوشکەکەم لەناو ڕێڕەوەکەدا ببینم کە خەریکە تەلەفۆن دەکات.

ئەو پشتی لەمن بوو. بەهێمنیەوە دەستێکی دەهێنا بە قژەکانی پشتی سەریدا و خەریکبوو دەیگوت:

–بەڵێ، ڕاستە، بەدڵنیاییەوە.

لەپاش چەند ساتێك دووبارە گوتی:

–بەڵێ.

کاتێك تەلەفۆنەکەی داخست، بۆ ماوەی یەك خولەك هەروا سەیری زەوییە کەی کرد. منیش گوتم:

–چی بووە؟

سەری بەرز کردەوە. هەروەك بڵێی تازە بە منی زانی کە لەوێدا وەستاوم.

–هیچ پەیوەندییەکی بە ڕۆژنامەکانەوە نییە.

لەبەر ئەو شۆکەی کە بەسەریدا هاتبوو، دەنگی زۆر بێ هەست بوو.

–هێشتا زیندووە.

لو بە حاڵەتێکی لەرزۆکەوە زەردەخەنەی کرد.

–داوای لەمن کرد و لێم پاڕایەوە کە بڕۆم بۆ سویسرا. تەنانەت گوتی کە ئەمشەو لە کۆتا فریندا بلیتی بڕیوە و جێگەی بۆ گرتوم.

## {٢٦}

ئەگەر بارودۆخەکان بەدەر لەمە بونایە، بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمان بوو کە من، لو کلارك، کچێك کە لەبیست ساڵی ڕابوردودا تەنها سواری پاسی شارەکەی خۆی بوبو، لەماوەی کەمتر لەیەك هەفتەدا بۆ سێیەمینجار گەشت بۆ وولأتێکیتر بکات. کەرەستە و شتومەکی پێویستم کۆ کردەوەو جانتاکەم بۆ یەك شەوی گەشتێك ئامادە کردو دامخست. ترینا لە دەوروبەرمدا بوو هەرشتێك کە پێیوابوو بە کەڵکم دێت، بێدەنگ دەیخستە ناو جانتاکەوە. دواتر لە قادرمەکانەوە چوینە خوارەوە. چوین بۆ قاتی خوارەوە. کاتێك نیوەی پلیکانەکانمان بڕی وەستاین، دایکوباوکمان لەناو هۆڵەکەدا وەستابون، حاڵەتیان ترسناك وەك ئەو شەوانە بوو کە درەنگ دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە.

دایکم سەیری جانتاکەی دەستی کردم و گوتی:

—چی بووە؟

ترینا کە یەك پلیکانە لەپێش منەوە وەستابوو گوتی:

—لو ئەیەوێت بڕوات بۆ سویسرا، هەر ئێستەیش دەبێت بڕوات. ئەمشەو تەنها یەك فڕین ماوە.

هەرکە دووبارە بەڕێکەوتینەوە، دایکم هاتە پێشەوە.

—نەخێر!

دەستی گرتبوو بە سنگیەوە و دەمی حاڵەتێکی تایبەتی هەبوو کە بەلامەوە زۆر نامۆ بوو.

—نەخێر، بەهیچ شێوەیەك نامەوێت خۆت تێکەڵی ئەم بابەتە بکەیت. ئەگەر بەوشێوەیە بێت کە من بیری لێدەکەمەوە، نابێت بڕۆیت.

ترینا سەیرێکی منی کرد کە لەدوایەوە بووم و گوتی:

—بەلأم....

دایکم گوتی:

–گوتم نەخێر.

بڕشتیەکی تایبەت لەناو ئاوازی دەنگەکەیدا هەبوو.

–بەڵام ئەگەری ناوێت. لەبارەی ئەو شتانەی کە گوتت زۆر بیرم لێکردووەتەوە. ئەمە هەڵەیە. لەڕوی ئەخلاقیەوە هەڵەیە. ئەگەر خۆت تێکەڵی ئەم بەسەرهاتە بکەیت و یارمەتی گەنجێك بدەیت کە خۆی بکوژێت. دواتر دیارنییە کە خۆت دەکەویتە چ بارودۆخێکەوە.

باوکم گوتی:

–دایکت ڕاستدەکات.

–لو، لەناو ڕۆژنامە و هەواڵەکانی تەلەفیزیۆندا بینیم، ئێمە دەزانین ئەمە ژیانت دەشێوێنێت. ئەی کۆلێژەکەت چی لێدێت؟ ئەگەر پێشینەی خراپت هەبێت، ئەوا هیچکاتێك ناتوانیت خوێندنەکەت تەواو بکەیت، یان کارێکی باشت دەستبکەوێت و زۆرێك شتی تریش...

ترینا قسەکەی بڕی.

–داوای لێکردووە کە بڕوات. خۆ ناتوانێت گوێی پێنەدات و نەڕوات.

دەتوانێت. بەڵێ، بەڵێ. شەش مانگی تەمەنی بۆ ئەو خێزانە سەرف کرد. باشە ئەگەر هەموو شتەکان لەبەرچاو بگرین، چ شتێکی دەستکەوتووە؟ لەمماڵەوە سود و قازانجێکی زۆرمان پێگەیشتووە، خەڵکی لەدەوری ماڵەکەمان کۆبونەتەوەو لەدەرگاکەمان دەدەن، لەوانەیە دراوسێکانیش وابزانن فرۆفیڵمان کردووە و خەڵکمان خەڵەتاندووە و ئەمجۆرە شتانە، ئەی وانییە. لو لە کۆتاییدا ئەم هەڵەی بەدەستهێناوە کە بڕوات بۆ کۆلیژ، ئێستە ئەمانە داوای لێدەکەن بڕوات بۆ ئەو شوێنە دۆزەخییەو خۆی توشی شتێك بکات کە تەنها خودا ئاگای لێیەتی. باشە، من دەڵێم نەخێر، لو تۆ ناتوانیت بڕۆیت.

ترینا گوتی:

–بەڵام دەبێت بڕوات.

–نەخێر، ناڕوات. بەپێی پێویست هەوڵی خۆی داوە. دوێنی شەو خۆی ئەمەی گوت. هەرکارێکی لەدەستهاتووە کردویەتی.

دایکم سەری ڕاوەشاند.

—با ئەم ترینەرانە هەر غەڵەتێك دەتوانن بەرامبەر بەژیانی خۆیان بیکەن. بەرامبەر بە کوڕەکەیان بیکەن. ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە و نامەوێت لو خۆی توشی ئەم بابەتە بکات. نامەوێت ژیانی خۆی تێکبدات.

من گوتم:

—وابزانم خۆم دەتوانم بڕیار بدەم.

—دڵنیانیم کە بتوانی. لو، ئەمە تەنها هاوڕێیەکە. ویل پیاوێکە کە ژیانی پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە، تۆ ناتوانیت خۆت تێکەڵی ژیانی بکەیت. من سەرم سوڕ دەمێنێت کە دەبینم تەنانەت بیریشی لێدەکەیتەوە!

بڕشتیەکی توند لە ئاوازی قسەکانی دایکمدا بوونی هەبوو، کە لەگەڵ پێشتردا زۆر جیاوازبوو.

—گەورەم نەکردویت بۆ ئەوەی یارمەتی خەڵکی بدەیت خۆیان بکوژن! تۆ دەتوانی یارمەتی بدەیت بۆ ئەوەی بابە گەورەت بمرێت؟ بەبڕوای تۆ دەبێت بابەگەورەیشت ببەین بۆ ئەو کاولبووە؟

—بابە گەورە جیاوازە.

—نەخێر، چ جیاوازییەکی هەیە؟ ئەو کارانەی کە پێشتر ئەنجامیدەدان، ئێستە ناتوانێت بیانکات. بەڵام ژیانی بەنرخە. هەروا کە ژیانی ویل بەنرخە.

—دایە، من بڕیارێکی لەمشێوەیەم نییە. ئەوە بڕیاری ویلە. من تەنها مەبەستم یارمەتیدانی ئەوە.

—یارمەتی؟ تاوەکو ئێستە قسەیەکی ئاوا بێمانام نەبیستبوو. لو، تۆ هێشتا گەورە نەبویت. هیچت نەبینیوە، گەرمی و ساردی ڕۆژگارت نەچەشتووە. تۆ نازانیت شتێکی لەمشێوەیە چی لە تۆ دەکات؟ توخوا پێمبڵێ ئەگەر یارمەتی بدەیت بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت، شەوانە چۆن دەتەوێت بخەوی؟ تۆ دەتەوێت یارمەتی گەنجێك بدەیت بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت. باشە تۆ دەزانی ئەمە مانای چییە؟ تۆ دەتەوێت یارمەتی ئەو ویلە نازدارو زیرەکە بدەیت بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت!

—شەوانە خەوم لێدەکەوێت، چونکە باوەڕم بە ویل هەیە کە خۆی دەزانێت چ شتێك باشە بۆی. لەبەر ئەوەی کە شتێك بۆ ئەو خراپترینە، ئێستە ئیتر ئەوەندەش خراپ نییە بەلایەوە کە بیەوێت بڕیارەکەی بگۆڕێت و کارێك بۆ خۆی بکات.

سەیری دایکو باوکم کرد. هەموو هەوڵی خۆمم دەدا بۆ ئەوەی تێیانبگەیەنم.

—من منداڵ نیم. من عاشقی ئەو پیاوەم. عاشقی ئەو پیاوەم. نابێت بەتەنیا بەجێی بهێڵم. تامڵم نییە لەویٚ نەبم و نەزانم.... نەزانم کە.....

تفی دەمم قوتدایەوە.

—کەواتە هەر دەڕۆم. هیچ پێویستم بەوە نییە کە بەدوامدا بێن، یاخود لێم تێبگەن و دەرکم بکەن. خۆم دەرەقەتی هەموو شتەکان دێم. دەچم بۆ سویسرا. ئێستە ئیتر هەرچییەکتان پێخۆشە بیڵێن.

ڕێڕەوی بچوکی ماڵەکە بەناو بێدەنگیدا ڕۆچوو. دایکم بەجۆرێك سەیری دەکردم هەروەك بڵێی باوەڕی نەدەکرد ئەوە خۆم بم. یەك پلیکان چومە خوارترەوە. ئەمویست دڵی بدەمەوە، بەڵام ئەو یەك پلە چویە خوارەوە.

—دایە، من قەرزاری ویلم. ئەوە ئەرکی سەرشانمە کە بڕۆم. تۆ وادەزانی کێ بیرۆکەی چون بۆ کۆلێژی خستە مێشکمەوە؟ تۆ پێتوایە کێ بوو هانیدام کارێك بۆ ژیانم بکەم؟ بڕۆم بۆ گەشت و سەفەر و کۆمەڵێك هیواو ئارەزوم بۆ خۆم هەبێت..ها؟ باشە تۆ دەزانیت کێ شێوازی بیرکردنەوەی منی گۆڕی؟ تەنانەت لەبارەی خۆیشمەوە. هەموی کاری ویل بوو. لەم بیست و حەوت ساڵەی تەمەنمدا، تەنها لەم شەش مانگەی تەمەنمدا بوو کە توانیم کارێك بکەم، توانیم بەڕاستی بژیم. کەوابوو ئێستە ئەگەر داوای لە من کردووە کە بڕۆم بۆ سویسرا، ئەوا دەڕۆم. ئیتر دەرئەنجامەکەی هەرچیەك بێت.

وەستابوین و چاومان بڕیبویە یەکتری. تریناو باوکیشم سەیری یەکترییان دەکرد. هەروەك بڵێی چاوەڕێی یەکتری بوون بۆ ئەوەی یەکێکیان قسەیەك بکات.

بەڵام دایکم بێدەنگییەکەی شکاند.

—لوئیزا، ئەگەر ڕۆیشتیت ئیتر مەگەڕێرەوە بۆ ئەم ماڵە!

ووشەکان هەروەك وردە لم و زیخ لە دەمی دەهاتنە دەرەوە. بە باوەڕنەکردنەوە چاوم بڕییە دایکم. نیگاکانی سازشیان قبوڵ نەدەکرد. چاوەڕێ بوو کاردانەوەی من ببینێت. هەروەك بڵێی کتوپڕ دیوارێك لەنێوانمان قوت بویەوە کە پێشتر بونی نەبوو.

–دایە..؟

–ئەمە قسەی کۆتاییمە. ئەمکارەی تۆ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کوشتنندا نییە.

–جوسی...

–بێرنارد، ئەمە ڕاستیەکەیە. من ناتوانم دەستم بەم تاوانە ئالودە بکەم.

لەبیرمە لەبەر خۆمەوە بیرم کردبویەوە کە هیچ کاتێك کاترینام بە دوودڵی نەبینیبوو. دەستی باوکم بینی کە کەوتە سەرقۆڵی دایکم، نازانم ئەیویست هێمنی بکاتەوە یان مەبەستی سەرزەنشت کردنی بوو. ئیتر بیرو مێشکم کاری نەدەکرد. دواتر بەبێ ئەوەی کە بەڕاستی بزانم چی دەکەم، بەهێمنیەوە لە پلیکانەکان چومە خوارەوە وە و بەلای دایکوباوکمدا تێپەڕیم و بەرەو لای دەرگای ماڵەکە ڕۆیشتم. ساتێك دواتر خوشکەکەم هات بە دوامدا.

گۆشەی دەمی باوکم هاتە خوارەوە، هەروەك بڵێی لەگەڵ خۆیدا لە کێشمەکێشمدا بوو. دواتر ئاوڕدایەوە بۆ لای دایکم و دەستی خستە سەرشانی. چاوەکانی دایکم دەموچاوی باوکمیان دەپشکنی، بەجۆرێك کە هەروەك بڵێی دەیزانی ئەیەوێت چی بڵێت.

دواتر باوکم کلیلەکەی بۆ ترینا فڕێدا. ترینایش بە دەستێکی گرتییەوە. باوکم گوتی:

–لە دەرگای پشتەوە بڕۆن. لەناو حەوشەی ماڵی خاتوو داهرتییەوە. بە پاس بڕۆن. ئەگەر سواری پاس بن ئەوکات پێتان نازانن. ئەگەر ئێستە بچن و ترافیکیش قەرەباڵغ نەبێت، لەوانەیە لەکاتی خۆیدا بگەنە ئەوێ.

***

کاترینا گوتی:

–هیچ بیرۆکەیەکت هەیە کە بارودۆخەکان چۆن بەرەو پێشەوە بچن؟

بەپەلە سەیرێکی کردم. بەخێراییەکی زۆرەوە لە ڕێگە ئازادەکەدا دەڕۆیشتین.

–هەی هەی.

ئاگام لە کارەکەی خۆم بوو، خەریکبوم سەیری ناو جانتا دەستیەکەمم دەکرد بۆ ئەوەی بزانم شتێکم بەجێنەهێشتوە یان نا. بەردەوام دەنگی خاتوو ترینەرم لە گوێمدا دەبیست کە

دەیگوت: (لوئیزا؟ تکایە دێیت؟ دەزانم جیاوازیمان بەیەکەوە هەبووە. بەڵام تکات لێدەکەم وەرە... هاتنت لە ئێستادا مەسەلەیەکی ژیانییە).

ترینا لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی:

—قوزەڵقورت! تاوەکو ئێستە دایکم بەوشێوەیە نەبینیبوو.

پاسپۆرت، کیفی پارە، کلیل؟ کلیل بۆچی؟ بۆچی؟ من ئیترماڵێکم نەبوو. کاترینا دووبارە لەژێر چاوەوە سەیری کردم.

—مەبەستم ئەوەیە کە زۆر خراپ تێکەڵی کرد و تورە بوو. لە ڕاستیدا توشی شۆك بوو. بەڵام دواتر واز دەهێنێت، ئەی وانییە؟ کاتێك هاتمەوە ماڵەوە و پێمگوت کە سکم بووە، وامزانی تاوەکو کۆتایی تەمەنم قسەم لەگەڵدا ناکات. بەڵام تەنها دوو ڕۆژی خایاند، دواتر قسەی لەگەڵدا کردم.

دەنگیم دەبیست کە لە تەنیشتمەوە زۆر بڵێیی دەکرد، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئاگام لەو نەبوو. تەرکیزی هەستەکانم نەبوو. پەستانێکی عەسەبی توندم لەسەر بوو. چونکە خەریکبوم دەچوم بۆ بینینی ویل. هەرچی بوو ئێستە کاری خۆم کردبوو دەچوم بۆ بینینی. تەنانەت هەستم دەکرد کە سات لەدوای سات مەودای نێوانمان کەمتر دەبێتەوە، وەك پەت ڕکێشان وابوو کە ئێمە لە هەردوو سەرەکەیەوە بوین.

—ترینا؟

—بەڵێ.

تفی دەمم قوتدایەوە و گوتم:

—کارێك بکە کە لە فڕینەکە بەجێنەمێنم.

تایبەتمەندی بنەڕەتی خوشکەکەم بریتیە لە عەزم و جەزمی قوڵ و بەهێز. ئەو بەبێ ئەو عەزم و جەزمە هیچە. تەنانەت ڕەچاوی پێشکەوتنیشمان نەکرد و لە هێڵی ناوەڕاستدا بە خێراییەکەی تەواوەوە لێمانخوڕی. ترینا پێینا بە بەنزیندا و خێرایی ڕێگەپێدراوی تێپەڕاند. ڕادیۆکەمان کردەوە بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی هاتوو چۆ ببیستین. لە کۆتاییدا فرۆکەخانەکە دەرکەوت. ترینا ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت و منیش نیوە و نیوەچڵ دابەزی بووم کە دەنگیم بیست.

—هێی! لو!

—ببورە.

گەڕامەوە و چەند هەنگاوێك بەرەو پیری چووم.

باوەشی پێدا کردم و توند گوشیمی بە خۆیەوە.

–کارێکی زۆر ڕاست و دروست دەکەیت.

خەریکبوو فرمێسکەکانی بڕژێنە خوارەوە.

–دەی بڕۆو خێرا وونبە! تازە خۆ مۆڵەتەکەم شەش سەرپێچی لەسەر تۆمار کراوە، ئەگەر بێت و فریای فڕینەکەت نەکەوی، ئیتر نە من و نە تۆ..

سەیرێکی دواوەی خۆمم کرد. هەموو ڕێگەکە ڕامکرد و خۆم گەیاندە بەردەم مێزی پێشوازی هێڵی فڕینی سویسرا. سێجار ناوەکەی خۆمم دووبارە کردەوە تاوەکو توانیم ناوەکەم بەڕونی بڵێم و بلیتەکەم وەربگرم.

***

کەمێك پێش نیوەشەو گەیشتمە زویرخ. لەبەر ئەوەی کە کات درەنگ بوو، خاتوو ترینەر بەپێی ئەو پەیمانەی کە دابوی لەناو ئوتێلی فرۆکەخانەکەدای ژوری بۆ دابینکردبوم. بڕیاروابوو بەیانی ڕۆژی دواتر کاتژمێر ۹ ئۆتۆمبیل بنێرێت بە دوامدا. وامدەزانی تاوەکو بەیانی ناتوانم چاولێك بنێم و بخەوم، بەڵام خەوتم، خەوێکی قورسی چاوەڕواننەکراو، بەردەوامیش خەونی بێسەروبەرم دەبینی. کاتێك بەیانی کاتژمێر حەوت لەخەو هەستام، نەمدەزانی لە کوێم.

بە بێتاقەتیەوە چاوم بڕییە ئەو ژورەی کە بەلامەوە غەریب و نامۆ بوو. سەیری پەردە قورسە شەرابیەکەیم دەکرد کە بەجۆرێك دورابوو کە بەردەمی ڕووناکیەکەی دەگرت، هەروەهای سەیری تەلەفیزیۆنە شاشە تەختە گەورەکەم دەکرد، سەیری جانتاکەم دەکرد کە تەنانەت هیچ زەحمەتێکم نەدابویە بەرخۆمەوە بۆ ئەوەی بیکەمەوە. سەیری کاتژمێرەکەم کرد کە بەکاتی سویسرا چەند خولەکێك لە حەوت لایدابوو. هەرکە بەبیرم هاتەوە لە کوێم، خەریکبوو دڵ و جەرگ و ڕیخۆڵەم بێتە دەرەوە و ئێڵنجێکمدا.

لەکاتی خۆیدا لە سەر جێگەکەم ڕاپەڕیم و خۆم گەیاندە توالیتەکە. حاڵەتی ڕشانەوەم هەبوو. لەسەر سیرامیکەکانی ناو توالیتەکە دانیشتم. قژەکانم ڕژان بەسەر دەموچاومدا. دەموچاون لەبەرامبەر کاسەی توالیتەکەوە بوو. دەنگی دایکم لە گوێمدا دەزرنگایەوە کە دژایەتی ئەمکارەی دەکرد. ترسێکی شاراوە سەرانسەری بون و وجودی گرتبومەوە. ئەوە کاری

من نەبوو. نەمدەویست دووبارە نائومێد ببمەوە. نەمدەویست مردنی ویل ببینم. دووبارە ئێلنجێکی گەورەمدا و ڕشامەوە.

نانی بەیانی لە قورگم نەدەچویە خوارەوە. تەنها توانیم یەك کوپ قاوەی بێ شیر بخۆمەوە، حەمامێك بکەم و جلوبەرگ لەبەر بکەم. کاتژمێر هەشتی نیشاندەدا. سەیری کراسە سەوزە کاڵەکەم دەکرد کە شەوی ڕابوردوو ئاخنیبومە ناو جانتاکەمەوە. لە خۆمم پرسی ئایا گونجاوە بۆ ئەو شوێنە لەبەری بکەم کە بۆی دەچم؟ یانی هەموویان ڕەش دەپۆشن؟ ئایا باشتر وانییە کە جلوبەرگێکی شادتر لەبەر بکەم. هەروەك ئەو کراسە سورەی کە ویل پێی خۆش بوو؟ باشە خاتوو ترینەر بۆچی بانگی کردووم بۆ ئێرە. سەیرێکی موبایلەکەم کرد، نەمدەزانی ئایا دەکرێت تەلەفۆن بۆ کاترینا بکەم یان نا. ئێستە لەوێ سەعات حەوت بوو. بەگریمان خەریکبوو جلی دەکردە بەری تۆماسەوە. تاوەکو حەزبکەیت قسەکانی دایکم لەسەر دڵ و دەرونم قورس بوون. کەمێك ئارایشم کرد. دواتر لەقەراخ پەنجەرەکەدا دانیشتم. خولەکەکان بەخاوی تێدەپەڕین.

لە تەمەنمدا هەرگیز بەمشێوەیە هەستم بە تەنهایی نەکردبوو.

کاتێك کاسەی سەبرو خۆڕاگریم کەلاوی کرد و پڕ بوو، ئیتر نەمتوانی لەناو ئەو ژورە بچوکەدا بمێنمەوە. کەرەستەو شتومەکەکانی خولەکی کۆتاییم کۆکردەوە و خستمە ناو جانتاکەوەو لە ژورەکە چومە دەرەوە. ڕۆژنامەم کڕی و لەناو هۆڵی هاتنەژورەوەی ئوتێلەکەدا دانیشتم و چاوەڕوانم کرد. هیچ شتێك لەمە خراپتر نەبوو کە بە بێدەنگی لەناو ژورەکەمدا دابنیشم یان لە سەتەلایتەوە هەواڵەکان ببیستم و لەناو تاریکایی ژورەکەدا و بەو پەردە دادراوانەیەوە هەست بە خنکان بکەم. خەریکبوم لەبەشی پێشوازییەوە تێدەپەڕیم کە چاوم بە کۆمپیوتەرێك کەوت کە لە سوچێکدا بوو زۆر لەبەرچاوان نەبوو. لەسەری نوسرابوو بۆ بەکارهێنانی میوانەکان، تکایە بەشی پێشوازی ئاگادار بکرێنەوە و هاوئاهەنگیان لەگەڵدا بکرێت) .

بە کارمەندی پێشوازییەکەم گوت:

—دەکرێت ئەو کۆمپیوتەرە بەکار بهێنم؟

ئەویش بە ڕاوەشاندنی سەر بەڵێی بۆ کردم. پارەمدا و یەك کاتژمێر کۆمپیوتەرەکە لە بەردەستمدا بوو. زۆر کتوپڕ ئەوە بە بیرو زەینمدا هات کە ئەمەوێت قسە لەگەڵ چ کەسێکدا بکەم. بەتەواوەتی دڵنیابومەوە یەکێکە لەو کەسانەی کە دەتوانم گومانی ئەوە بکەم هەر

ئێستە لە دەستڕەسدا بێت و لە خەت بێت. چومە ناو ژوری گفتوگۆکەوەو دەستمکرد بە نوسینی نامە و پەیامەکەم:

*(ریچی تۆ لەوێیت؟)*

*(بەیانی باش، هەنگ، ئەمڕۆ زوو هاتیت).*

پێش ئەوەی کە وەڵامەکە بنوسم، ساتێك وەستام:

*(سەیرترین ڕۆژی ژیانم دەستپێکردووە، من لە سویسرام).*

دەیزانی مەبەستم چییە. هەمویان دەیانزانی. ئەو کلینیکە بابەتی زۆرێك لە موجادەلە گەرم و گوڕەکان بوو. بۆم نوسی:

*(دەترسم).*

*(ئەی باشە بۆچی لەوێیت؟).*

*(چونکە تاملم نەدەکرد کە لێرە نەبم. خۆی دلوای لێکردبوم. ئێستەیش لەناو ئوتێلدا چاوەڕوانم بۆ ئەوەی بچم و ببینم).*

کەمێك وەستام و دواتر نوسیم:

*( بەهیچ شێوەیەك ناتوانم گومان و پێشبینی بکەم کە ئەمڕۆکە چۆن و بەچ شێوەیەك کۆتایی دێت).*

*(ئەی هاوار هەنگ!).*

*(باشە چی پێبڵێم؟ چۆن تێبپوانینی بگۆرم؟).*

کەمێك دواکەوت تاوەکو وەڵامەکەی بۆ نوسیمەوە. ووشەکان زۆر هێمنتر لە هەمیشە لەسەر شاشەکە دەردەکەوتن. هەروەك بڵێی زۆر بەوردییەوە دەینوسی:

*(هەنگ، ئەگەر ئێستە لە سویسرادایە، باوەڕناکەم لە بڕیارەکەی پاشگەز ببێتەوە).*

بوغزێکی گەورە قورگی قەپات کردم. دڵم کەوتە خوارەوە. ریچی هێشا خەریکبوو دەینوسی:

*( سویسرا هەڵبژاردەی من نییە. هەڵبژاردەی زۆرێکیش لە ئێمە نییە. من عاشقی ژیانم، لەگەڵ ئەوەی کە ئاواتە خوازم ئەی خۆزگایە بەشێوەیەکیتر بوایە، بەڵام تێدەگەم بۆچی ئەم ژیانە بۆ هاورێکەی تۆ بەس نییە. چونکە بەراستی ئەم شێوازەی ژیان زۆر ماندوو بێزارکەرە. ماندوکەرە بەجۆرێك کەخەڵکانیتر هەرگیز ناتوانن بەباشی لێی تێبگەن. ئەگەر بریاری خۆی داوە، ئەگەر بەراستی پێیوایە ئیتر هیچ شتێکی باش بۆ ئەو بوونی نییە. کەواتە بە بروای من باشترین کارێك کە تۆ بتوانی بۆ ئەوەی ئەنجامبدەیت ئەوەیە کە لەوێدا ئامادە بیت. ئیتر هیچ پێویستناکات بیر لەوە بکەیتەوە کە کارێکی راست و دروست دەکات یان نا، تەنها هەوڵبدە لەوێ بیت).*

هەناسە لە سینەمدا قەتیس مابوو.

*(سەرکەوتو بیت هەنگ، دواتر وەرەوە سەر خەت و بزانم چی بووە. دوای ئەوە باروبۆخەکانی بۆ تۆ قورس دەبن. بەڵام من پێویستم بە هاورێیەکی وەك تۆ هەیە).*

پەنجەکانم لەسەر لاپەرەی سەرەکی کەوتنە جوڵەو نوسیم:

*(بەدڵنیاییەوە).*

دواتر کارمەندی پێشوازییەکە ئاگاداری کردمەوە کە ئۆتۆمبیلەکە هاتووە.

***

هیچ تەسەورێکم لەبارەی ئەو شوێنەوە نەبوو کە بۆی دەرۆیشتم. لەوانەیە باڵەخانەیەکی سپی بێت لەکەنار دەریاچەیەکدا، یاخود لە تەنیشت ناوچە کوێستانیە بەفراوییەکاندا بێت. لەوانەیشە بیناوو باڵەخانەیەك بێت بە واجیهەیەکی بەردی مەرمەرو رواڵەت و دیمەنێکی نەخۆشخانەیی و تابلۆی روکەشی ئاڵتونی هەڵواسراو بەدیوارەوە. ئەو شتەی کە چاوەروانی نەبووم ئەوە بوو کە بچین بۆ ناوچەی پیشەسازی و بۆ شوێنێك کە بەراستی لە خانویەکی ئاسایی زیاتر نەبوو، چواردەوری کارگە بوو گۆرەپانێکی یاری تۆپی پێ کە زۆریش سەیرو سەمەرە دەهاتە پێشچاو. قاچم خستە ناو زەوی تەختەرێژکراوی ئەو شوێنەوەو بەتەنیشت حەوزی ماسییە سورەکاندا تێپەریم. دواتر چومە ئەو شوێنە.

ئەو ژنەی کە دەرگاکەی کردەوە یەکسەر زانی بۆچی هاتووم.

-لێرەیە. دەتانەوێت ببینن؟

ئەم پێ و ئەو پێم کرد، سەیرێکی دەرگا داخراوەکەم کرد. زۆر سەیر بوو، هەر لەو دەرگایە دەچوو کە لەو چەند مانگەی ڕابوردوو لە ماڵەکەی ویلدا لەدەرییەوە وەستابوم. هەناسەیەکم تازە کردەوە و بەسەرڕاوەشاندن بەڵێم بۆکرد.

پێش ئەوەی کە خۆی ببینم، سیستەمەکەیم بینی. سیستەم و قەرەوێڵەیەکی دارینی ڕەنگ قاوەیی مەیلەو سور، بە لێفەو سەرینە گوڵدارە جوانەکەیەوە، کە بۆ ئەمجۆرە شوێن و فەزایە زۆر نەگونجاو دەهاتە پێشچاوو هەموو ژورەکەی خستبویە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. جەنایی ترینە لەلایەکیەوە و خاتوو ترینەریش لەولاکەی ترییەوە دانیشتبون.

خاتوو ترینەر وەك مردوی ناو گۆڕەکان ڕەنگ بەڕویەوە نەمابوو. بە بینینی من وەستا.

-لوئیزا.

جورجینایش لەسەر کورسیەکی دارین و لە سوچێکی ژورەکەدا دانیشتبوو چەمابویەوە بەسەر ئەژنۆکانیدا. توند دەستەکانی لەیەکتری ئاڵاندبوو. هەروەك بڵێی سەرقاڵی دوعاو نزاکردن بوو. هەرکە چومە ژورەوە واقی بەمندا وڕما. چاوەکانی لە خەم و پەژارەدا سور بوبونەوە. ژێرچاوەکانیشی ڕەش بوون. زۆر بەزەییم پێیدا هاتەوە.

ئەگەر کاترینای خوشکم لەناو ئەو هەلومەرج و بارودۆخەی ویلدا بوایەو پێداگری بکردایە کە کارێکی لەمشێوەیە بکات، باشە ئەوکات من چیم دەکرد؟

ژورەکە ڕوون و دڵکراوە بوو. هەروەك خانوو ڤێللا شیکەکان بوو. زەوییەکەی بە قاڵیچە گرانەکان فەرشڕێژ کرابوو. لەناوەڕاستی ژورەکەدا و لەبەرامبەر پەنجەرەکەوە قەنەفەیەك دانرابوو کە دەیڕوانییە حەوشەیەکی بچوکەوە. نەمدەزانی چی بڵێم. ئەوەی کە سێ کەس لەوێدا دانیشتون، گاڵتەجاڕانە دەهاتە پێشچاو، زۆریش ئاسایی، هەروەك ئەو خێزانەی کە لەدەوری یەك کۆبونەتەوە بۆ ئەوەی بڕیاربدەن ئەو ڕۆژە بچن و سەردانی کام جێگە و شوێنە سەرنجڕاکێشەکان بکەن. بەرەو لای قەرەوێڵەکە ڕۆیشتم. جانتاکەم بەشانمەوە شۆڕ بوبویەوە، گوتم:

-باشە، وادیارە کە یەکەی پێشوازی ژورەکە خزمەتێکی ئەوتۆ ناکەن. چاوەکانی ویل لەچاوەکانی من ئاڵان. سەرەڕای هەموو مەسەلەکان، سەرەڕای ئەو هەموو ترس و لەرزەی کە هەمبوو ئەوەی کە دووجار ڕشابومەوەو هەردەتگوت یەك ساڵە کە نەخەوتوم. کتوپڕ هەستم

کرد کە چەندە خۆشحاڵم کە هاتووم. باشتروایە بڵێم هەستم بە ئاسودەیی دەکرد. هەروەك ئەوە وابوو کە بەشی بێزارکەرو ئازاردەری خۆمم لێکردبێتەوە و فرێمدابێتە دوورەوە.

دواتر زەردەخەنەی کرد. زەردەخەنەیەکی جوان و دڵنیشن. ناسك و لێوانلێو لە سوپاس و پێزانین.

باوەڕم نەدەکرد کە خۆیشم خەریکم زەردەخەنە دەکەم، گوتم:

–چەندە ژورێکی باش و جوانە!

بەڵام یەکسەر تێگەیشتم کە قسەیەکی چەندە بێئەقڵانەم کردووە. دەبینم جورجینا ترینەر چاوەکانی داخست. لە تەریقیدا دەموچاوم سور بویەوە.

ویل ئاوڕیدایەوە بۆلای دایکی.

–ئەمەوێت بەتەنیا قسە لەگەڵ لودا بکەم، خۆ گرفتێکی نییە؟

خاتوو ترینەر زەردەخەنەیەکی بەزۆری کرد. هەزار شت لەو نیگایەدا هەبوون کە ئاراستەی منی کرد، ڕزگار بوون، حەقناسی و سوپاسگوزاری، هەروەها کەمێك ڕەنج و ئازاریش لەبەر ئەوەی کە چەند خولەکێك لە ژورەکە کردبویانە دەرەوە، لەوانەیشە ئومێدەوار بوبو کە بەڵکو ئامادەبونی من گۆڕانکارییەك دروستبکات. یان لەوانەیە چارەنوس بە ڕێڕەوێکیتردا دەڕۆیشت.

–بەدڵنیاییەوە.

بەلامدا تێپەڕی و بەرەو ڕێڕەوەکە ڕۆیشت. کاتێك چومە دواوە بۆ ئەوەی تێپەڕێت. دەستی هێنایە پێشەوە و بە هێمنیەوە دەستێکی هێنا بە قۆڵمدا. سەیری یەکتریمان کرد. چاوەکانی زۆر گونجاوو مولایم بوون. خاتوو ترینەر بەهیچ شێوەیەك لە خۆی نەدەکرد، هەروەك بڵێی مرۆڤێکیتر بوو. دواتر لەمن دوورکەوتەوە.

خاتوو ترینەر کاتێك بینی کچەکەی هەڵنەستایەوە. گوتی:

–جورجینا وەرە.

جورجینایش بە هێمنیەوە هەستایەوە و بەڕێکەوت. بێدەنگبوو ناچاری لەسەرو فەساڵ و دەموچاوییەوە دەباری. جەنابی ترینەریش هەستایەوە. کاتێك خەریکبون لەژورەکە دەچونە دەرەوە، جەنابی ترینەر دەستی خستە سەرپشتی جورجینا.

ئێستە ئیتر هەردوکمان بەتەنیاو دوو بەدوو بوین.

لای سەری قەرەوێڵەکەی ڤیلیان کەمێك بەرز کردبویەوە، هەربۆیە ڤیل دەیتوانی لە پەنجەرەکەی لای چەپییەوە سەیری دەرەوە بکات. لە تاڤگە دەستکردەکەی ناو حەوشە بچوکەکەوە، بە شێوەیەکی مۆسیقایی جۆگەلەیەکی باریك لە ئاوی پاك و زولاڵ وەڕێکەوتبوو. لەسەر دیوارەکەیش وێنەی گوڵە ئەستێرەیان کێشابوو، بەلاّم چوارچێوەکەیان جوان نەبوو. لەبیرمە کە لەبەر خۆمەوە دەمگوت چ تەسویرو وێنەیەکی بێمانایە بۆ ئەوەی لە کۆتا چرکەساتەکانی ژیانتدا سەیری ئەوانە بکەیت!

—باشە.

—خۆ تۆ ناتەوێت...

—من نامەوێت هەوڵ بدەم بۆ ئەوەی بیروڕای خۆت بگۆڕی.

—ئێستە کە هاتویت، کەواتە ئەوەت قبوڵە کە مافی ئەوەم هەیە خۆم بڕیار لەژیان و چارەنوسی خۆم بدەم. یەکەمین شتێکە کە لە دەعمەکە بەملاوە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆمدایەو بەدەستی خۆمە.

—دەزانم. خاڵێك باس دەکرا کە هەم ویل دەیزانی و هەم منیش، ئەوەیش بریتیە لەوەی کە کارێك نەماوەتەوە من ئەنجامیبدەم.

دەزانن کە چەندە سەختە بێدەنگ بن و هیچ شتێك نەڵێن، ئەمە لەکاتێکدا زەڕە زەڕەی بوون و وجودتان خەریکە دەتەقێتەوە؟ هەموو ڕێگەی فرۆکەخانەکەم تاوەکو ئەوێ لەبەر خۆمەوە ڕاهێنانم دەکرد کە شتێك نەڵێم. بەلاّم هەر بەڕاستی خەریکبوو دەمردم. ویل سەرێکی ڕاوەشاند، لە کۆتاییدا کاتێك توانیم قسە بکەم، دەنگم پچڕ پچڕ و بێ گیان بوو. ئەو ڕستەیەی کە بەسەرزارمدا هات تاکە قسەی باش بوو کە دەمتوانی بیکەم.

—زۆر بیرم دەکردیت.

هەستمکرد خۆشحاڵ بوو.

—وەرە پێشترەوە.

دواتر کاتێك گومان و دوودڵییەکەی بینیم، لە قسەکانی بەردەوام بوو گوتی:

—تکایە وەرە، وەرە ئێرە و لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشە. ڕێك وەرە تەنیشتمەوە.

وادیاریوو دەموچاوی هێمنی و ئارامییەکی هەبوو. هێندە بە بینینی من خۆشحاڵ و ڕازی بوو کە بەڕاستی نەیدەزانی چی دەڵێت. منیش بەخۆمم گوت هەر ئەمە بەسە. داواکارییەکەیم جێبەجێ کردبوو. ئیتر دەبێت ئەمە بەس بێت.

لە تەنیشتیەوە ڕاکشام و باوەشم پێدا کرد. سەرم خستە سەرسنگی، ئێستە ئیتر لەلای دڵی خۆمدا هەستم بە لێدانەکانی دڵی و پەستانی لاوازی دەستەکانی لەسەر پشتم دەکرد. هەناسەی گەرمی دەیدا لە مووە ورد و زەردەکانی جەستەم. چاوەکانم داخست و لەناو بۆنی ئەودا هەناسەیەکم هەڵمژی. سەرەڕای تەڕوتازەیی ژوورەکە و بۆنی دژە هەوکردن و بۆگەنی، بەلاّم هێشتا بۆنی هەمان ئەو عەترە گرانبەهایەی داری سیدری لێ دەهات. هەوڵمدا کە بەهیچ شێوەیەك بیر لە هیچ شتێك نەکەمەوە. تەنها ئەمویست لەلای بم، تەنها هەوڵمدەدا لەڕێگەی هەستەکان و چونە ناو دڵییەوە، ئەو پیاوەی کە عاشقی بووم، کەمەندکێشی خۆمی بکەم. تەنها ئەمویست ئەوەی نیشانبدەم کە چ کاریگەرییەکی کردووەتە سەر من. بێدەنگبووم و هیچ قسەیەکم نەدەکرد. دواتر دەنگیم بیست. هێندە دڵم بۆی تەنگ بوو، کاتێك قسەی دەکرد لە جەستەی خۆمدا هەستم بە هەموو لەرزین و هەیەجانەکانی دەکرد.

—هێی کلارك، قسەگەلی باشم بۆ بکە.

سەیری دەرەوەی پەنجەرەکە و سەیری ئاسمانی ساماڵ و بێگەردی سویسرام دەکرد و چیرۆکی ژیانی دوو کەسم دەگێڕایەوە. ئەو دوو کەسەی کە نەدەبوو بەیەکەوە ئاشنابونایە و یەکترییان بناسیایە. کاتێکیش یەکترییان ناسی سەرەتا یەکترییان زۆر خۆش نەدەویست. بەلاّم دوایی تێگەیشتن و زانیان کە بەگریمان لە دوونیادا تەنها ئەم دوانەن کە دەرك بەیەکتری دەکەن. باسی ئەو باس و بەسەرهاتە هەیەجانیانەم دەکرد کە هەیانبوو، باسی ئەو شوێنانەم کرد کە بۆی چوبون. شتانێکیان بینیبوو کە بەخەیاڵیشیاندا نەدەهات. باسی هەورە بروسکە و دەریای پەلکەزێڕینەیی و شەوەکانی پڕ لە خەندە و پێکەنین و گاڵتە و گەپم بۆ کرد. دوونیایەکم بۆ نەخشاند کە لەدووری ناوچەی پیشەسازی سویسراوە بوو. دوونیایەك کە تێیدا هەمان ئەو کەسە بوو کە خۆی حەزی دەکرد. دوونیایەکم نەخشاند کە خۆی بۆ منی دروست کردبوو. کە پڕ بوو لەشتە سەیرو سەمەرەکان و هەلەکانی ژیان. باسی ئەوەشم بۆ کرد کە هەندێکجار برینەکان بەجۆرێك سارێژ دەبن کە باوەڕ پێنەکراون. هەمیشە و هەردەم بەشێك لە بوون و وجودی من خۆی بە قەرزداری ئەو دەزانێت. هەروا کە خەریکبوم قسەم دەکرد،

دەمزانی ئەم قسانە گرنگترین ووشەن کە لە ژیانمدا بەسەرزارمدا دەهاتن، هەربۆیە زۆر گرنگ بوو کە ووشەگەلی ڕاست و دروست و پڕمانا بەکار بهێنم. دروشمگەلێکی ناوکرۆك پوچ نەبون و بۆ گۆڕانکاری لە بیروڕای ناوبراودا بەسەرزارمدا نەدەهاتن. تەنها لەبەر جێبەجێکردن و ڕێزی قسەکەی ویل بوو.

ئەمانە و چەندین قسەی تری باشم بۆ کرد.

کات خاو بوبویەوە لە جوڵە وەستابوو. تەنها هەردوکمان دوو بەدوو بوین کە لەناو ئەو ژورە چۆڵ و نورگیرییەدا لەبەر خۆمانەوە قسەمان دەکرد. ویل قسەیەکی زۆری نەکرد، وەلامیشی نەدەدایەوە، نە بیرو بۆچونێکی ووشکی دەردەبڕی و نە گاڵتەیشی دەکرد. هەندێکجار وەك نیشانەی بەڵێ سەرێکی ڕادەوەشاند. سەری لکابوو بەسەرمەوە. لەژێر لێوەوەو لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد. کاتێك باسی یادگارییەکی شیرین دەهاتە پێشەوە، دەنگێکی کورت لە دەمییەوە دەردەچوو کە لە دڵخۆشی و بێخەمیەوە بوو، گوتم:

—ئەم شەش مانگە باشترین ڕۆژەکانی تەمەنم بوون.

بێدەنگییەکی دوورودرێژ بەرقەرار بوو.

—کلارك، بەڕاستی سەرنجڕاکێشە. بۆ منیش بەهەمانشێوەیە.

دواتر کتوپڕ دڵم دایە ئێش. دەموچاوم هاتەوە یەك، نەمتوانی پێش بەخۆم بگرم و کۆنتڕۆڵی خۆمم لەدەستدا. ناوبراوم توند گوشی بە خۆمەوە، ئیتر بەلامەوە گرنگ نەبوو کە هەنسکە هەنسکی گریانەکانم ناوبراو دەترسێنێت یان نا، بەڕاستی تامڵکردنی ڕەنج و ئازارو خەموپەژارەیەکی لەمشێوەیە لە دەرەوەی توانای مندا بوو. خەموپەژارەیەك بوو کە منی لەناوبردبوو دڵی پارچە پارچە کردبوم. ڕۆح و دڵ و دەرونمی پەرێشان کردبوم و لە هەستی خستبوم. تامڵم نەدەکرد. هەر بەڕاستی تامڵم نەدەکرد.

هەستم بە لێوی دەکرد لەسەر قژەکانم.

—ئۆو کلارك، وامەکە، تکایە سەیری من بکە.

چاوم داخست و سەرێکم ڕاوەشاند.

—تکایە سەیری من بکە.

—ناتوانم.

—تۆ ئێستە زۆر توڕەیت. تکات لێدەکەم. نامەوێت بێتاقەتت بکەم یان ناچارت....

—نەخێر....

دووبارە سەرم ڕاوەشاندەوە.

—مەسەلەکە ئەمە نییە. نامەوێت....

گۆنام لەسەر قەفەسەی سنگی بوو.

—نامەوێت کۆتا شتێك کە دەیبینی بریتی بێت لە قیافەی داماوو گریاناویم.

—کلارك، تۆ هێشتا لەگەڵ بابەتەکەدا ڕانەهاتویت، قبوڵت نییە، ئەی وانییە؟

لەناو ئاوازی دەنگەکەیدا هەستم بە زەردەخەنە دەکرد.

—قبوڵت نییە و باوەڕیش ناکەیت؟

کەمێکی خایاند تاوەکو بتوانم بەسەر خۆمدا زاڵ ببم. هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا. دواتر لەسەر ئانیشك هەستامەوە وسەیریم کرد. نیگای زۆر خەمبارو ماندوو تیژ بوو. بە شێوەیەکی زۆر سەیرو نامۆ ئارامشێکی تێدا بوو. گوتی:

—زۆر جوانیت.

—گاڵتە مەکە.

دووبارە ڕاکشامەوە. چاوم بە کاتژمێرەکەی سەر دەرگاکە کەوت و کتوپڕ هەستمکرد کە خەریکە کات لەدەست دەردەچێت. بێئاگا فرمێسك لە چاوەکانم هاتنە خوارەوە و لە لوتمەوە کە لەتەنیشت لوتیەوە بوو خلیسکان. هەموو ئەو ماوەیە خامۆش و بێدەنگ سەیری منی دەکرد. هێندە بەوردییەوە چاوی تیَ بڕیبوم هەروەك بڵێی ئەیویست زەڕە زەڕە بوون و وجودی من لەناو خۆیدا کۆگا بکات و هەڵیبگرێت. هەستم دەکرد لە من دوور کەوتوەتەوە. چووە بۆ شوێنێکیتر، ڕۆشتوە بۆ دوونیایەکیتر و ئیتر دەستم پێی ناگاتەوە.

هەوڵمدا هەڵیگێڕمەوە. حاڵێکی زۆر سەیرو نامۆم هەبوو. فرمێسکی چاوەکانم لەسەر دەموچاوی ئەو ووشك بوونەوە. ئەمویست هەر زەڕەییەك لە ژیان کە لە خۆمدا هەستمپێدەکرد، بیدەم بەوو بە زیندویی بیهێڵمەوە.

لەوەی کە دواتر بەبێ ئەو بگەڕێمەوە زۆر دەترسام. حەزم دەکرد بڵێم بە چ حەقێك ژیانی من بەرەو لەناو چوون پەلکێش دەکەیت، بەڵام لە ژیانی خۆتدا هیچ مافێك بەمن نادەیت و ژیانت هەر دەبیَ هی خۆت بێت؟

بەڵام پەیمانم پێدابوو کە لەو جۆرە قسانە نەکەم.

ویل ترینەر، خاوەنی مەسەلە داراییەکان، عاشقی کێچەڵ سەری، وەرزشکار، ئەهلی گەشت و سەفەر و هەمیشە عاشق. ئەم شتانەم بە توندی لەناو سوچێکی دڵمدا پاراست و هیچم نەگوت. لە بێدەنگی و بەو ووشانەی کە بەسەرزاردا نەهاتن، بەناوبراوم گوت کە بەڕاستی عاشقی ئەوم، بەڵێ بەڕاستی عاشقی ئەوم.

نازانم ماوەی چەندێك بەو حاڵەوە ماینەوە. لە دەرەوە دەنگی قسەکردن و خشەخشی بەڕێگادا ڕۆیشتن دەهات. لە شوێنێکی دوورە دەستەوە ناقوسی کڵێسا لێدرا. سەرئەنجام هەستمکرد کە هەناسەیەکی ئیسراحەتی هەڵکێشا، بە جۆرێك لە جۆرەکانیش لەرزەیەکی کرد. کەمێك سەری هێنایە دواوە، بۆ ئەوەی بتوانین یەکتری ببینین.

چاوێکم لێداگرت و ئەویش زەردەخەنەیەکی ناسکی بۆ کردم کە لەناویدا مانای داوای پۆزش و لێبوردنی هەبوو.

بە ئاوازێکی هێمن و ئارام و زۆر مولایمەوە گوتی:

–کلارك، دەکرێت بە دایك و باوکم بڵێیت بێنە ژوورەوە؟

## {٢٧}

خزمەتگوزارییەکانی بەدواداچون و لێکۆڵینەوەی تاوان

بۆ ئاگاداری: داواکاری گشتی.

ڕاوێژی مەحرەمانە.

پەوەندیدار بە: ویلیام ترینەر.

٤ / ٩ / ٢٠٠٩

***بەرپرسانی ئاسایشی نهێنی، لێپێچینەوەو لێکۆڵینەوەیان لە هەموو ئەو کەسانە کردووە کە ئاگاداری ئەو نوسییەی سەرەوە بوون. وەرەقە و بەڵگە و سەنەدە پەیوەندیدارەکان خراونەتە ڕوو.***

***بابەتی لێکۆڵینەوەکە بەڕێز ویلیام ترینەرە. تەمەنی سیی و پێنج ساڵە، خاوەن پشکی پێشوی کۆمپانیای (میدنگلی لوینزە) کە لە شاری لەندەندایە. بەڕێز ترینەر لە ساڵی ٢٠٠٧ لە دەعمێکی ناو شەقامدا توشی زیانێکی توندی مێشك و دەمار بووە، بەپێی دیاریکردنی نەخۆشییەکەی لەلایەن پزیشکەکانەوە لەڕوی بڕبڕەکانی ٥ و ٦ەوە توشی ئیفلیجی بووە، کە تەنها کۆمەڵێك جوڵەی سنورداری هەیە، ئەویشت تەنها لەیەك دەستیدا. کەسی ناوبراو، پێویستی بە چاودێرییە شەوو ڕۆژییەکان هەبوو. نوسییەی پزیشکی هاوپێچکراوە.***

***لەناو لاپەڕەکانی نوسییە پزیشکیەکەیدا نوسراوە کە بەڕێز "ترینەر" پێش ئەوەی بێت بۆ سویسرا هەموو مەسەلەکانی بەیاسایی کردووە. پێشتر دانپێدانانی فەرمی بە واژوی شاهێدەکانەوە لەلایەن پارێزەرەکەیەوە بەناوی مایکل لولەر لەگەڵ چەند نوسخەیەك لە سەنەدە پەیوەندیدارەکان و ڕاوێژە کلینیکیەکان خراوەتە بەردەستی ئێمە.***

خانەوادە و هاورێیانی کاك ترینەر پێشتر دژایەتی خۆیان بەرامبەر بە خواستی ئەو بۆ کۆتاپهێنان بە ژیانی ڕاگەیاندبوو. بەڵام بەسەرنجدان بە پێشینە پزیشکیەکان و ئەو دەستپێشخەرییەی کە بۆ خۆ کوشتن کردویەتی (وردەکارییەکان کە لە ڕاپۆرتەکەی نەخۆشخانەدا هاوپێچکراوە، بوونی هەیە)، لەبەر بەهێزی توانای ئەقڵانی و کەسایەتی بەهێزی ناوبراو، هیچ کەسێك سەرکەوتوو نەبوو کە ئەو لە بڕیارەکەی پاشگەز بکاتەوە، تەنانەت ئەو هەل و ماوە شەش مانگییەی کە لەڕێگەی وتووێژەوە لەگەڵ ئەودا بەدەستهاتبوو، هەر بۆ ئەم مەبەستە بووە، بەڵام دیسانەوە سودێکی نەبووە بۆ پەشیمان بوونەوەی ناوبراو لە بڕیارەکەی.

شایەنی باسە کە یەکێك لە کەسە خاوەن بەرژەوەندییەکان کچێکی پەرستارە کە کاری بۆ بەڕێز ترینەر کردووە کە خاتوو لوئیزا کلارکە. بەسەرنجدان بەوەی کە کەسی ناوبراو ماوەیەکی کەم کاری بۆ بەڕێز ترینەر کردووە، هەربۆیە ئەم سەخاوەت و بەخشینەی بەڕێز ترینەر بۆ ئەم کچە بەم دەست و دڵئاواییەوە جێگەی گومانە. بەڵام هەموو لایەنە بەرژەوەندیدارەکان دەڵێن هیچ ڕەخنە و دژایەتیەکیان بەرامبەر بە داخوازییەکەی بەڕێز ترینەر کە لەڕوی یاساییشەوە پشتگیری کراوە نییە. کەسی ناوبراو چەندینجار خراوەتە بەر لێکۆڵینەوەگەلی دووروودرێژەوە و پۆلیس هاتوەتە سەر ئەو باوەڕەی کە ناوبراو هەموو هەوڵی خۆی داوە بۆ پاشگەزکردنەوەی بەڕێز ترینەرو گێڕانەوەی بۆ ژیان. (تکایە سەیری ڕۆژژمێرو یاداشتەکانی گەشتەکەیان بکەن کە بە هاوپێچی پێشکەش کراوە).

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە بە سەرنجدان بە کەشوهەوای گشتی پەیوەندیدار بەم دۆسیەیە. خاتوو کامیلا ترینەری دایکی بەڕێز ویلیام ترینەر، کە دادوەرێکی بەڕێزو بە ئەزمونن، داواکاری دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کردووە. بەپێی ئەو زانیارییانەی کە بە ئێمە گەیشتون، ئەوە ڕوونبوەتەوە کە خاتوو کامیلا و هاوسەرەکەیان کەمێك پێش مردنی کوڕەکەیان لەیەکتری جیابونەتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە خۆکوشتنەکە بەیارمەتی پزیشك و لە کلینیکەکانی دەرەوەی وڵاتدا ئەنجامدەدرێت. هەربۆیە دەزگای (خزمەتگوزارییەکانی لێکۆڵینەوە و بەدواداچونی تاوانەکان)، پشتگیری لێناکات، بەڵام سەرنجدان بە بەڵگە و سەنەدە کۆکراوەکان، ئەوە

پشتڕاستدەکەینەوە کە کارکردی خانەوادە و پەرستارەکانی کاک ترینەر لە چوارچێوەی ڕێنماییەکانی پەیوەست بە خۆکوشتن بە یارمەتی پزیشك و بەدواداچونی گریمانی کەسانی نزیکی کۆچکردو بووە.

بەڕێز ویلیام ترینەر هەموو مەرجەکانی تێدا بوو، ئاقڵ و باڵغ و بە حەزو ئارەزوو ئیرادەی خۆی و بەوپەڕی ئاگایی تەواوەوە بڕیارێکی لەمشێوەیەی داوە.

هیچ جۆرە بەڵگە و شاهێدێك لەسەر نەخۆشی دەرونی یان زۆر لێکردن نەبینراون. بەڕێز ترینەر بە ڕاشکاوانە و بە ڕوون و ئاشکرایی ڕایگەیاندبوو کە ئەیەوێت خۆی بکوژێت. ئیفلیجی و نەخۆشی بەڕێز ترینەر زۆر توند بووە هیچ هیوایەك بە چاکبونەوەی نەبووە.

هاوڕێکانی بەڕێز ویلیام ترینەر هیچ ڕۆڵێکیان لەم خۆکوشتنەدا نەبووە.

دەتوانین دەستپێشخەرییەکانی هاوڕێیانی بەڕێز ترینەر، بە هاوکاریگەلێك بدەینە قەڵەم، کەبە نیشانەی دژایەتی و بێ مەیلی لەدژی خواستی کۆچکردوی بزانین.

هەموو ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بە لێکۆڵینەوەکانەوە هەیە، هاوکاری پۆلیسیان کردووە.

بە سەرنجدان بە ڕاستیە باسکراوەکان، بەڵگە و سەنەدە هاوپێچکراوەکان و کەسایەتیە ئەرێنیەکانی هەموو کەسەکانی ناو ئەم نوسیەیە، ڕایدەگەیەنم کە ئەم نوسییە بەدواداچون و لێکۆڵینەوەی تاوانەکان نایگرێتەوە.

ئەگەر هەر جۆرە بانگەشەیەك لەمبارەیەوە بوونی هەبێت، ئەوکات سەرۆکی بەدواداچون و لێکۆڵینەوەی تاوان بە فەرمی ڕایدەگەیەنێت کە نوسییە ویلیام ترینەر هیچ جۆرە تێڕوانینێکی داوەری بەدی ناهێنێت. خزمەتگوزاری بەدواداچون و لێکۆڵینەوە، بەجیا لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی بۆ نوسییەکان کردووە، هەربۆیە لەسەر بنەمای هەلومەرج و شیاوییان داوەری دەکات.

بەهیوای بەدیهاتنی باشترین ئومێد و ئارەزوەکان

شیلا مکینون

خزمەتگوزارییەکانی لێکۆڵینەوە و بەدواداچونی تاوان.

## {۲۸}

کۆتایی

۲۹ سێپتەمبەر

موبەمو فەرمانەکانیم جێبەجێ دەکرد.

لەژێر سێبەری سەوزی تێری قاوەخانەکەدا دانیشتم و چاوم بڕیبە درێژایی شەقامی (فرانك بورژوئا). خۆری نیوەگیان و پاییزیی شاری پاریس لایەکی دەموچاوی گەرم دەکردم. چەند خولەکێك لەمەوبەر گارسۆنەکە بە حاڵەتێکی بەتوانایی زۆر تایبەتی فەرەنسییەکانەوە، چکلێت و پەرداخێکی گەورەی قاوەی لەسەر مێزەکە دانابوو. نزیکەی سەد مەتر لە خوارترەوە، دوو ماتۆڕسوار لەپشتی ترافیك لایتە سورەکەوە وەستابون و دەستیانکرد بە قسەکردن لەگەڵ یەکتریدا. یەکێکیان کۆڵەپشتێکی شینی هەبوو کەهەردو گیرفانە شۆڕەکانی دەیاندا لەملاو ئەولای. کەشوهەواکە شێدارو بێ هەوا بوو، بۆنی قاوە و شیرینی دەدا. هەروەها بۆنی تیژی جگەرەیش دەهات.

نامەکەی ترینام تاوەکو کۆتایی خوێندەوە (کە گوتبوی تەلەفۆن دەکات، بەڵام تێچوی تەلەفۆن بۆ شوێنە دورەکان زۆر لەسەری دەکەوێت). وانەی ژمێریارییەکەی بەنمرەیەکی بەرزەوە تێپەڕاندووە و هاوڕێیەکی کوڕی نوێی دۆزیوەتەوە بەناوی (ساندیپ)، کە بیری لەوە دەکردەوە لە کۆمپانیای هەنارده و هاوردەی باوکیدا کە لەدەرەوەی فرۆکەخانەی هیترودا بوو، کار بکات یان نا. توانای مۆسیقایشی تەنانەت لە کاترینایش کەمتر بوو. تۆماسیش بەهۆی ئەوەی کە دەچوو بۆ قوتابخانە زۆر بەشەوق و زەوق بوو. باوکیشم هەروا زۆر سەرقاڵی کارەکەی بوو نامەی بۆ ناردبوم کە خۆشی دەوێم.

ترینا بەتەواوەتی دڵنیابوو کە دایکم بەمزوانە لێمخۆش دەبێت، گوتی: (نامەکەت گەیتشوە بە دەستی و دەزانم خوێندویەتیەوە، تەنها دەبێت کاتی پێبدەیت).

قومێك قاوەم خواردەوە. بیرو زەینم بەرەو شەقامی (ڕن فرو) ڕاکێشرا، بەرەو ماڵێك کە وادیاربوو بە ملیۆنان کیلۆمەتر دوورە. هەفتەی پێشوو نامەیەکم لە خاتوو ترینەرەوە پێگەیشت، کە نوسیبوی:

*(لەوانەیە داماوی وقەرەچۆڵ بڕانەوە بوبێتە هۆی ئەوەی کە ڕەفتارو هەڵسوکەوتم لە ئەدەبەوە دوور بوبێت. بەڵام لوئیزا حەزدەکەم بزانیت کە هەمیشە و هەردەم سوپاسگوزاری هەوڵ و ماندوبونەکانی تۆم. کاتێك ئەوەم بەبیر دێتەوە کە ویل کەسێکی هەبوو کە لەگەڵ ئەودا یەك دڵ بێت، هەست بە ئارامی دەکەم. دەزانم تۆیش هێندەی من دڵتەنگ و بێتاقەتی بۆی).*

هەروا دانیشتبوم و لەبەر ڕووناکی ئەو خۆرەی کە لە خوارەوە بوو، چاوەکانم کۆ کردبویەوە. چاوم بڕییە ئەو ژنەی کە بە چاویلکەی خۆری ڕەشەوە لەبەردەم جامخانەی فرۆشگاکەدا وەستابوو قژەکانی ڕێکدەکرد، بەهۆی بینینی خۆیەوە لە شوشەکەدا کۆکەڵێك ئەداو ئیتواری دەنواند و دەجولایەوە، کەمێك خۆی ڕێککرد و دواتر لەڕێگەی خۆی بەردەوام بوو ڕۆیشت.

پەرداخەکەم دانایە خوارەوە، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا و دواتر نامەی دواترم هەڵگرت. نامەیەك کە نزیکەی شەش هەفتە دەبوو لە هەموو شوێنێکدا پێمبوو. لەسەر زەرفی نامەکە و لەژێر ناوەکەمدا بە پیتی گەورە نوسرابوو:

*(تەنها لەناو قاوەخانەی مارکیدا بکرێتەوە و بخوێنرێتەوە- پاریس شەقامی فرانك بورژۆیا، لەگەڵ کروسان و پەرداخێکی گەورەی قاوەدا).*

کاتێك بۆ یەکەمینجار خوێندمەوە، هەروا کە فرمێسکم دەڕشت، دەستمکردبوە پێکەنین. ئەوە خودی ویل بوو کە تاوەکو کۆتا خولەکەکانی ژیانیشی هەر سەرۆك ئاسایی هەڵسوکەوت و قسەی دەکرد.

گارسۆنەکە بەرەو لای من سوڕایەوە، پیاوێکی بالآبەرزی چاپوك بە دە بۆ دوازدە پارچە کاغەزەوە، کە خستبویە ناو ئەو پەڕۆیەی کە بەستبووی بە کەمەرییەوە. سەیری یەکتریمان کرد. برۆ بەرزبوەکەی دەیپرسی (شتێکت پێویست نییە؟).

بە ئینگلیزی گوتم:

**—نەخێر سوپاست دەکەم.**

دواتر بە کەمێك شەرم و کەمڕوییەوە بە فەرەنسی سوپاسەکەم دووبارە کردەوە.

نامەکە تایپ کرابوو، بە فۆنتێکی هاوشێوەی کارتی پستیل کە ماوەیەك لەمەوبەر بۆی ناردبوم نوسرابوو. پاڵمدا بە پشتی کورسییەکەوە و دەستمکردە خوێندنەوە.

***کلارك:***

***چەند حەفتە لەو بەروارە تێپەڕیوە کە تۆ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە، (سەرەڕای ئەو شارەزایی و لێهاتنە نوێیانەی کە لە بەرنامەڕێژیدا بەدەستت هێناوە، بەلآم دیسانەوە گومانم هەیە کە بتوانی پێش پازدەیەمی سێپتەمبەر بەرەو پاریس سەفەر بکەیت). هیوادارم تامی قاوەکەت بەلاوە خۆش بێتکروسانەکەیش تازە بێت. هێشتا کەشو هەوا ئەوەندە خۆ رو ساماڵە، کە بکرێت مرۆڤ لەفەزای کراوە و لەسەر یەکێك لەو کورسییە کانزاییانەدا کە هەمیشە لەسەر پیادەڕەوەکە دەجوڵێتەوە، دابنیشێت. قاوەخانەی مارکی، خراپ نییە. ئەگەر ویستت بۆ نانی نیوەڕۆ بگەڕێیتەوە،خواردنەکەی زۆر باشە. ئەگەر سەیری لای چەپ بکەیت و بەدرێژایی شەقامەکە بڕوانیت، ئەوا فرۆشگای (لاریتسن پر فیومر) دەبینی، فرۆشگایەك کە لەپاش خوێندنەوەی ئەم نامەیە دەچیت بۆ ئەویێ و عەتری پاپیلونز ئکستریم تاقیدەکەیتەوە. (بەوردی و بەتەواوی ناوەکەیم لەبیر نییە). هەمیشە لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە بۆنەکەی لەسەر پێستی تۆ زۆر خۆش و دڵگیرە.***

***زۆر باشە، فەرمایشتەکان تەواو بوون. چەند شتێك هەیە کە من ئەمویست بە تۆیان بڵێم، بابەتگەلێك کە دەبوایە ڕوبەڕو بە تۆم بگوتایە، بەلآم یەکەم: تۆ توشی هەستیاری دەبویت و هەڵدەچویت، دوەمیش: نەتدەهێشت قسەکەم تەواو بکەم. سەرەڕای ئەمەش تۆ خۆت هەمیشە قسەی زۆرت بۆ کردن هەبوو.***

هەربۆیە لێرەدا ئەو قسانەت بۆ دەکەم: ئەو چەکی پارەیەی کە لە زەرفی یەکەمدا لە مایکل لولەرت وەرگرت، هەموو بڕی پارەکە نییە، ئەوە تەنها دیارییەکی بچوکە بۆ یارمەتیدانی تۆ بۆ ئەوەی حەفتەکانی سەرەتای بێکاریت تێپەڕێنی و گەشت و سەفەر بکەیت بۆ پاریس.

کاتێك گەڕایتەوە بۆ بەریتانیا، ئەم نامەیە ببە بۆ نوسینگەی مایکل. ئەو بەڵگەو سەنەدی پێویستی لەلایە سەبارەت بەو حیسابە بانکییەی کە لەلایەن منەوە بۆ تۆ کراوەتەوەو دەیانخاتە بەردەستت. ئەو بڕە پارەیەی کە خستومەتە ناو حیسابەکەتەوە، ئەوەندە هەیە کە بتوانیت ئاپارتمانێکی باشی پێبکڕی بۆ خۆت و خەرجی کۆلێژەکەتی پێ بدەیت و لەو کاتەی کە هەموو کاتەکان سەرقاڵی خوێندنی، بتوانی ژیانی خۆتی پێ بەڕێوە بەریت.

دایکو باوکم ئاگاداری هەموو شتێکن. هیوادارم ئەم خاڵە و ئەو یارمەتیانەی کە مایکل پێشکەشی تۆیان دەکات کێشەکانت زۆر کەم بکەنەوە.

کلارك، لێرەوە دەتوانم ببینم کە هەناسە برکێت پێکەوتووە. تکایە مەشڵەژێ و مەترسە، هەوڵیش مەدە کە ڕەتی بکەیتەوە. چونکە ئەوەندە نییە کە بتوانی پاشماوەی تەمەنت بە ئیسراحەتەوە ببەیتە سەرو بژیت. بەڵام بەم بڕە پارەیە دەتوانیت ئازادی خۆت بکڕیت، هەم لەو شارە بچوك و خنکێنەرە، کەهەردوکمان پێی دەڵێین زێد و شوێنی لەدایکبون، هەمیش لەو هەلومەرجانە ئازاد بیت و ڕزگارت ببێت کە بەناچاری شانت دابویە بەریان و بەناچاری چوبویتە ژێر باریانەوە.

مەبەستم لە بەخشینی پارە بە تۆ ئەوە نییە کە ئەفسوس بخۆیت یاخود قەرزداری من بیت. هەروەها بەهیچ شێوەیەکیش ئەمە یادگاری نییە.

ئەم پارەیە بەتۆ دەدەم، چونکە ئێستەبێجگە لە تۆ، هیچ شتێکیتر نییە کە من خۆشحاڵ بکات.

ئەوە باش دەزانم کە ئاشنایی و ناسینی من بۆ تۆ پڕ لە ڕەنج و ئازارو خەموپەژارە بووە. هیوادارم ڕۆژێك کە ئیتر لە دەستی من تورەنیت و کەمێك هێمن دەبیتەوە، تێبگەیت کە بێجگە لەوکارەی کە کردم هیچ چارەیەکیترم نەبوو. ئەم مەسەلەیە یارمەتی

تۆ دەدات ژیانی باش بگریتەبەر و ژیانت زۆر لەوکاتە باشتر ببێت کە لەگەڵ مندا ئاشنا نەبوبویت و منت نەناسیبوو.

کاتێك دەچیتە ناو دونیا نوێکەتەوە، سەرەتا کەمێك هەست بە ناڕەحەتی دەکەیت. مرۆڤەکان کاتێك لە ناوچەی ئاسایش و بێوەی خۆیان دێنە دەرەوە، هەست بە سەرگەردانی و سەرلێشیواوی دەکەن. بەڵام هیوادارم تۆیش کەمێك هەست بە شادومانی بکەیت. ئەو ڕۆژە کاتێك لە شەپۆلسواری گەڕایتەوە، قیافەت هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد. کلارك تۆ تینویت. بوێریم لە تۆدا بینی. بەڵام سەرکوتت کردووە. شاردوتەوە، هەمان ئەو کارەی کە زۆربەی مرۆڤەکان دەیکەن.

بەتۆ ناڵێم لە باڵەخانەیەکی چەند نهۆمییەوە باز بدەرە خوارەوە، یان لە تەنیشت نەهەنگەکانەوە مەلە بکە، یان لەمجۆرە کارانە ئەنجامبدە، (هەرچەندە لەناخی دڵمەوە ئەمەوێت ئەمکارانە بکەیت)، بەڵام بوێرانە بژی، لە ژیانتدا ئازایەتی بنوێنە، هەوڵ و کۆششی خۆت بدە. لە شوێنێکدا دامەنیشە. ئەو گۆرەوییە پانتۆڵییە خەت خەتە بەوپەڕی شانازییەوە لەبەر بکە. هەرکاتێکیش ویستت بڕۆیت و لەگەڵ پیاوێکدا بژیت، ئاگادار بە کە بەدڵنیاییەوە بەشێك لەم پارەیە لە شوێنێکدا بشارەوە. ئەوەی کە کۆمەڵێك هەلت لەبەردەستدا بێت مایەی دڵخۆشییە بۆ من. کاتێك دەزانم ئەوەی کە خۆشم ویستوە بە تۆی دەدەم. دڵ ئارامیم بۆ دێت و هێور دەبمەوە.

کلارك، تۆ بۆ هەمیشە لەناو دڵی مندایت. هەر لەو یەکەم ڕۆژەوە کە بەو جلوبەرگە پێکەنیناوی و نوکتە گاڵتەجاڕانەکانتەوە هاتیتە ژورەوەو توانای ئەوەت نەبوو بچوکترین شتێك کە هەستی پێدەکەی ئاشکرای نەکەیت. تۆ ژیانی منت گۆڕی. زۆر، زۆر زیاتر لەم پارەیەی کە لە داهاتودا ژیانی تۆ دەگۆڕێت.

زۆر بیر لەمن مەکەرەوە. بەهیچ شێوەیەك حەزناکەم بزانم کە هەستیار بویت، تەنها پێت دەڵێم بەباشی بژی.

تەنها و تەنها هەوڵ بدە بۆ ئەوەی بەڕاستی بژیت.

لەگەڵ عەشق و خۆشەویستی ویلیام

دڵۆپێك فرمێسك کەوتە سەر مێزە لەقلەقیەکەی بەردەمم. بە دەستم گۆنام سڕی و نامەکەم خستە سەر مێزەکە. لەبەر پڕبونی چاوەکانم لە فرمێسك، چەند خولەکێکی خایاند تاوەکو بتوانم ببینم.

گارسۆنەکە کە لەبەرامبەرمەوە دەرکەتبوو پرسی:

–قاوەت بۆ بهێنم؟

چاوێکم داخست و کردمەوە. زۆر گەنج تر بوو لەوەی کە تەسەورم دەکرد. ئێستە ئیتر هەڵسوکەوتی لە پێشتر زۆر بەڕێزانەتر بوو، لەوانەیە گارسۆنەکانی پاریسیان فێر کردبێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو خاتونانەی کە لەناو قاوەخانەکاندا دەگرین بە میهرەبانییەوە بجوڵێنەوە.

–ئەی خواردنەوەیەکی ترت ناوێت؟

سەیرێکی نامەکەی سەر مێزەکەی کرد، بە هاودەردییەوە زەردەخەنەیەکی کرد. منیش زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم:

–نەخێر، سوپاست دەکەم دەبێت بڕۆم.

پارەکەمدا و بە هێمنیەوە نامەکەم خستە گیرفانمەوە.

لەسەر مێزەکە هەستام و جانتاکەم کردە شانم، بەرەو لای خوارەوەی شەقامە ڕۆیشتم و ڕێگەی عەتر فرۆشییەکەم گرتەبەر و پاریس و یادەوەرییەکانیم بەجێهێشت.....




هەندێك لە كتێبەكان كاتێك دەیانگریت بەدەستەوە و دەست دەكەیت بە خوێندنەوەیان، ناتوانیت دایانبنێیت. هەربۆیە ئێمە پێشنیار دەكەین كە كتێبی (من پێش تۆ) بە پاكەتێك كلێنسەوە بفرۆشرێت.

(ئاسوشیتد پرێس)

(من پێش تۆ) خوێنەر غافلگیر دەكات، سوتێنەر و كاریگەر و ئومێدبەخشە. كتێبێكە كە تاوەكو درەنگانێك، بە بێداری دەمێننەوە و لاپەڕە لەدوای لاپەڕە بەرەو پێشەوە دەچن و ناتوانن دابینێن.

(نوسەری كتێبی (خوشكانی نامۆ)

ڕۆمانێكی سەرنجڕاكێش و شیاوی خوێندنەوەیە، سەرسوڕهێنەر و گونجاو لەگەڵ داخوازییەكانی دونیای ئەمڕۆدا.

(بڵاوكراوەی ئەمریكی (پابلیشرز ڤیكلی).

عەشقێكی پڕ جۆش و خرۆش و نامومكین و ئارمانگەراو ئایدیالیستانە.

(رومنتیك تایمز)

ئەم كتێبە فێرمان دەكات كە هیچكاتێك بۆ ژیان درەنگ نییە.

(گۆڤاری (بوك پیج)

نوسەری ئەم كتێبە، خوێنەر دەخاتە بارودۆخێكەوە كە بە فرمێسك ڕشتنەوە بخوێنێتەوە و بەردەوام بەرەو پێشەوە بڕوات و واز لە خوێندنەوەی نەهێنێت.

(نیۆیۆرك تایمز)

بخوێننەوە و فرمێسك بڕێژن

(گۆڤاری (گود هاوسینگ).



لە بڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ ( ١٠٠٠٠) دینار